# چیرۆکە قورئانیەکان




نووسینی
احمد فرید

ئامادە کردن و وەرگێڕانی
عبدالجبار قەرەداغی

# چیرۆکە قورئانیەکان

نووسینی

احمد فرید

وەرگێڕانی

عبدالجبار قەرەداغی

کتێبخانەی هەورامان

ناوی کتێب: چیرۆکە قورئانیەکان
نووسینی: احمد فريد
ئامادە کردن و وەرگێڕانی: عبدالجبار قەرەداغی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ۲۰۱۰ ز.
ژمارەی سپاردن: 1051
بڵاوکار: کتێبخانەی هەورامان

سلێمانی بەرانبەر مزگەوتی گەورە قەیسەری را پەڕین کتێبخانەی هەورامان.

۰۰۹۶۴۷۵۰۱۲۲۰۰۳۴ -۰۰۹۶۴۷۷۰۲۴۶۰۸۵۴

## فهرست

بسم الله الرحمن الرحیم

**پێشەکی:**

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کەڕازی بوو ئیسلام دینمان بێت، درودو سڵاویش بۆ سەر گیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان و گشت پێغەمبەران (درودو سەلامی خوایان لەسە ربێت)

سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەڵگە جوانەکانی خستە پێش چاومان و کردییە چرای رووناکی رێگا، رێگای نیشاندایین تا وێڵ و سەرگەردان نەبین، شارەزای رێگاکەی خۆی کردین، خوای گەورە دینێکی ناردو پەسەندی کرد پێغەمبەران و فریشتە پاکەکانیش پەسەندیان کرد.

باشترین ووتەو گوفتار لە کتێبی خوادایەو باشترین دیارییش محمد (ﷺ) هێنای.

بێگومان خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا جوانترینی چیرۆکەکانی بۆ گێڕاوینەتەوە، بە جوانترین شێوە دایڕشتووەو وەك خۆی دەفەرموێت:
﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَـٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴾(یوسف ٣)

گومانی تێدا نییە بێ ئاگاییمان لە قورئان و ورد بوونەوە لە قورئان و پەندو ئامۆژگاری لایەنێکی گەورە لە قورئان دیاریدەکات، کە لایەنی چیرۆکە قورئانییەکان. کە پێویستە باوەڕداران گرنگی زۆری پێ بدەن. سونەتی خوا بۆ بەندەکانی ناگۆڕێت، پاشەڕۆژی چاك لە دونیاو قیامەتدا بۆ باوەڕدارانە.

بە وورد بوونەوەو تێڕامان لە چیرۆکی پێغەمبەران پیاو چاکان ئەم سونەتە ڕەبانییە گەورەیە دەردەکەوێت، لە کۆتایی هەموو چیرۆکێکدا سەرکەوتن بۆ باوەڕداران بوو، لە ناوچوون بۆ درۆزن و خراپە کاران بوو.

بەڕاستی ئەم چیرۆکە گەورەیە یادکردنی پیاو چاك و دانایانە سود بە دڵە بە ئاگاکان دەگەیەنێت، وەك خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَـٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (یوسف ١١١)

ئەو سەرکەوتنەی کە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە بۆ باوەڕداران هەمیشە لە سەرەتا لەگەڵ کافران بە دەست نایەت، بێ ئەوەی خوای گەورە دڵی لایەنگران و خۆشەویستانی خۆی لە باوەڕداران تاقی بکاتەوەو پاڵفتەی بکات، بەڵکو



هەندێك جار سەرکەوتنەکە ئەوەندە زۆر دوادەکەوێت تا پێغەمبەرو باوەڕداران دەڵێن: کەی سەرکەوتنی خوایی دێت؟ ئەمەش سونەتی خوایە بۆ خۆشەویستانی وەك فەرمویەتی:﴿ حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَاءهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَاء وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ ﴾یوسف ١١٠

چیرۆکە قورئانییەکان پەروەردەی نەتەوە دەکات، سونەتەکانی خوایش بە بەندەکانی دەناسێنێت.

سەرەتا بەچیرۆکی پێغەمبەرانی (الولی العزم) دەستمان پێکردووە، کە لە ڕێزو گەورەیی پێغەمبەرانو چیرۆكو بەسەر هاتی ژیانیانو پاشان پەندو سودە ئیمانییەکان پێکهاتووە، هەروەها هەڵوێستە ئیمانییەکانیشمان روون کردۆتەوە، خوای گەورە پێغەمبەرانی (اولی العزم)ی بە داوای یەکدا لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سورەتی (الاحزاب)دا باس کردووە. کە دەفەرموێت:﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا ﴾

سەرەتا چیرۆکی نوح ئینجا ئیبراهیم، ئینجا موسا، ئینجا عیسا (سەلامی خوایان لێبێت) دەستمان پێکردووە.

## ﴿ سودی چیرۆکە قورئانییەکان ﴾

مامۆستا (مناع القطان) دەڵێت : ڕووداوەکان پەیوەندن بە هۆکارو ئەنجامەکانەوە کە دەبیسرێن، ئەگەر بە شوێن پەندو ئامۆژگاری دەنگو باسی پێشیناندا چوویت زۆر حەز بە زانینیان دەکەیت، کە گەورەترین هۆکارن لە دڵەکاندا جێگەی خۆیان بکەنەوە، هەروەها ئامۆژگارییەکانیش، عەقڵ ناتوانێت هەموو لایەنەکانی کۆبکاتەوەو لە هەمووشی بە ئاگا نییەو تێناگات، بەڵام کاتێك وێنەیەك لە ژیانی ڕاستی وەردەگریت، ئامانجەکانی بۆت ڕوون دەبنەوە، ئینسان بە بیستنیان دڵ ئارامو ئاسودە دەبێت، بە شەوقو بە ئاگاییەوە گوێیان لێدەگرێت، پەندو ئامۆژگارییەکانی کاری تێدەکات.

١) لە سودی چیرۆکە قورئانییەکان باوەڕو ئیمانی بە پێغەمبەرانی خوا پێ تەواو دامەزراو دەبێت، ئێمە بە شێوەیەکی گشتی باوەڕمان بە هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) هەیە، بەوەی کە لە چیرۆکەکاندا دەست کەوتووەو بە راستگۆو دادپەروەری باسی کردوون کە بەرزترین وەسفە، پێغەمەبەران چاکەو رێزیان بەسەر گشت مرۆڤەکاندا هەبووە، بەڵکو چاکەی ئەوان گەیشتووە بە هەموو ئاژەڵەکانیش، باوەڕبوون بە پێغەمبەران بەندە دەگەیەنێتە ئیمانی تەواو کە هۆکاری زیادبوونی ئیمانە.

٢) لە چیرۆکی پێغەمبەراندا داننان بە ئیمان بوون بە خواو یەکتاپەرستیو بە دڵسۆزی کارکردنی تیایە، باوەڕ بوون بە رۆژی دواییو دەرخستنی واجب بوونی یەکتاپەرستیو ناشیرین کردنی هاوەڵ دانانی تیایە، کە هۆکاری تیاچوونە لە دنیاو قیامەتدا.

٣) پەندو ئامۆژگاری بۆ بڕواداران تیایە، کە پەیڕەوی پێغەمبەران دەکەن، لە هەموو مەقامەکانی دنیدا: لە مەقامی یەکتاپەرستیو بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، لە مەقامی بانگەوازو ئارامگرتنو دامەزراوی لە هەموو بوارەکاندا، رووبەڕوو بوونەوەی ئەوانەش بە دڵئارامیو دامەزراوییەوە. هەروەها لە مەقامی راست گۆییو دڵسۆزی بۆ خوا لە هەموو جموجولێکی ژیاندا، چاوەڕوانی ئەجرو پاداشتن لە خوای گەورە، پێغەمبەران داوای ئەجرو پاداشتو سوپاس لە خەڵکی ناکەن، تەنها کاری بە سودیان بۆ خەڵکی هەیە.

چیرۆکەکان (فیقهی) تێگەیشتن لە دینو بڕیارە شەرعییەکان،و نهێنی بڕیارەکانی تیایە، شتیکی گەورەیە کە هەموو زانستخوازێك پێویستی پێیان دەبێت.

٤) هەروەها ئامۆژگاریو یاد خستنەوەی تیایە، (الترغیب والترهیب) خۆشەویست کردنو ترساندنو دەرولێکردنەوەی دوای ناڕەحەتی تیایە، ئاسان کردنیو پاش قورسیو ناڕەحەتییان، چارەنوسی باش لە دونیادا، سوپاسو ستایشو خۆشەویستی لە دڵی خەڵکیدا کە دەبێتە توێشو بۆ لە خوا ترسانو دڵخۆشی بۆ بەندەکان، دڵدانەوە بۆ خەفەتباران، ئامۆژگاری بۆ باوەڕداران، مەبەست لە چیرۆکەکانیان بۆ دەمەتەقێی شەو نییە، بەڵکو مەبەستی گەورە بۆ ئەوەیە یاد خەرەوەو پەندو ئامۆژگاری بێت.



٥) هەروەها بۆ جێگیرکردنی راستی‌و حەقە بۆ سەر پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) (وەك خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ (هود ٤٩)، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کتێبە پێشووەکانی نەبینیوەو نەخوێندۆتەوە.

٦) هەروەها دڵدانەوە بوو بۆ پێغەمبەری خواو باوەڕداران لەوەی کە توشیان دەهات لە بە درۆخستنەوەو ئازاردان‌و تۆمەتبارکردنیان بە ساحیرو شێت، پێغەمبەرانی پێشوو بە درۆ دەخرانەوەو باوەڕیان پێ نەدەکرا، هەمان قسەیان روو بەڕوو کرابوویەوە، ئارامیان گرت تا سەرکەوتنی خوا هات‌و لەناو چونیش بۆ درۆزنان هات. خوای گەورە فەرمووی :﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴾ الانعام ٣٤.

٧) لە ئامانجی چیرۆکە قورئانییەکان دەرخستنی راستی بیروباوەڕ، کە لە گێڕانەوە مێژوویەکاندا دەردەکەوێت، کە بریتییە لەوەی گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بە یەك وشەو مەبەستەوە هاتن، لە هەموو نەتەوە بە داوی یەکەکاندا، کە ئەویش وشەی (لاالەالاالله)بوو، یەك مەبەستیش کە بریتیبوو لە : تەنها (الله) خوا بپەرستن کە هیچ پەرستراوێك لە غەیری ئەو نییە. بە یەك خوا زانین (الالوهية) مەسەلەیەکی گەورەو گرنگە لە جیهانی بەشەردا، کە گشت پێغەمبەران لە پێناوی ئەو مەبەستەدا هاتوون، هەموو شتێك دوای ئەوە دامەزراوو رێك‌وپێك دەبێت. کە ئەمەش یەك بوون‌و یەك دەستەیی بە گشت نەتەوە یەك لە دوای یەکەکان ەبەخشێت: ﴿إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ (الانبياء)

٨) لە سودەکانی دەرخستنی ئەوەی کە تاقیکردنەوەو نارەحەتی بۆ باوەڕداران روودەدات، تێڕوانینی نەزانەکان بۆ ئازاردانی باوەڕداران بە چەند جۆرێك بوو، وە باوەڕداران ماوەیەك لەو سزایەدا دەمانەوەو خوای گەورە سەری نەدەخستن مۆڵەتی دەدا بە یاخی بوان تا زیاتر یاخی ببن لە کاری ئازاردان‌و زاڵ بوون بەسەر باوەڕداراندا، تا ئەو کاتەی فەرمانی سەرکەوتنی خوایی بۆ باوڕداران بە قەدەرێك لە لایەن خواوە هات، کافرانیش بە قەدەرێکی خوایی لە ناو چوون.

٩) لە سودەکانی دەرخستنی ئەوەی کە کاری پێغەمبەران بریتییە لە کاری گەیاندنی وەحی خوایی بۆ بەندەکانی، پێغەمبەران دوای ئەمە سودێکی تریان پێ نییە، نە سودی دینی وەك ئیمانیو تەقوا نە سودی دنیایی وەك رزقو رۆزیو تەندروستی ناشتوانن هیچ زیانێکیان لەسەر لابەرن، بێگومان باوکی ئیبراهیمو کورەکەی کورەکەی نوحو ژنەکەیو، ژنەکەی لوط لە کافران بوون.

١٠) هەروەها لەم چیرۆکانەدا دەرخراوە کە لێکچوونێك لە نێوان پێغەمبەرانو قەومەکانیاندا هەبووە کە بەشەر بوونو بەوەش تۆمەتباریان کردوون کە نیشانەکانیان سیحرە، داوایان کرد فریشتەیان لەگەڵدا دابەزێت نیشانەی بوونەوەری هەست پێکراویان هەبێت، وەڵامی پێغەمبەرانیش بریتی بووە لەوەی کە نیشانەکانیان لە لایەن خواوەیەو کاری خواییەو بە تواناى خۆیان دەستیان نەکەوتووە.

١١) هەروەها لەم چیرۆکانەدا پێغەمبەران روونیان کردۆتەو وەکە رێنمایی دین هۆکارێکە بۆ زیاد کردنی نازو نیعمەتو پاراستنی، هەروەك ئەوەی بەمە دەگەنە بەختەوەری قیامەت.

١٢) لە سودەکانی، سوندمەند بوون بە ئامۆژگاریو رێنمایی پێغەمبەران، ئامۆژگاریو رێنمایی تایبەتیان بۆ هەموو قەومێك، بە پێی حاڵی خۆیان هەبووە، وەکو قەومەکەی نوح لەسەر کەشیو غروری یاخی بووندا، ئالی فیرعەونو کەسە دیارو ناودارەکانیان لە سامانداریو یاخی بوونیان، قەومی لوط لە فاحیشەدا. عاد لە هێزو زۆر دارياندا، و ثمود لە شەڕو داپۆشینی حەقدا، مەدیەن لە کێشانەو پێوانەو زیان گەیاندن بە خەڵکیدا، بنی ئیسرائیل لە یاخی بوونو هەڵگەڕانەوەو دەق بەستوییاندا.

١٣) دەرخستنی سونەتی خوایی لە ئامادەبوونی نەفسیو عەقڵی خەڵکیدا بۆ ئیمانو کوفرو خەیرو شەڕو هیدایەتو گومرایی، خۆ بەگەورە زانینی سەرکردەو زۆر دارانو خۆشگوزەرانەکانو ئەو کەسانەی چاو لە باوكو باپیریان دەکەن لە ئیمانو چاکەدا، یەکەم کەس لاوازو هەژارەکان بوون، باوەڕیان هێناوەو هیدایەتیان وەرگرتووە.

١٤) لە سودی لێکۆڵینەوەو گەڕان بە چیرۆکە قورئانییەکاندا بە راست زانینی پێغەمبەرانی پێشین‌و زیندوو راگرتنی یادیان‌و بە زیندوویی‌و هێشتنەوەی شوێنەوارەکانیان.

١٥) هەروەها هەڕەشەکردن لە خاوەن کتێبەکان بەو بەڵگە ئاشکرایەی کە شاردوویانەتەوەو لە نیشانەکانی خواو رێنمایی‌و (تحدي)یە بۆ ئەوان کە لە کتێبەنیاندا بێت پێش دەستکاری کردن‌و گۆڕینیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ (ال عمران٩٣)

١٦) هەروەها خۆشەویستی پێغەمبەران‌و پشتیوانی کردنیان، ئەمەش لە تەواو کاری ئیمانە پێیان، هەروەها دژایەتی‌و رق بوون لە دوژمنانیا، گومانی تێدا نییە خۆشەویستی پێغەمبەران گەورەترین هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( المرء مع من احب). واتە: (مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی ویستووە.)

١٧) هەروەها کەسی شایەت دەگونجێت لێکۆڵینەوەی ئەو شتە بکات بیزانێت کە رۆژی قیامەت شایەتی لەسەر دەدات، ئەم ئۆمەتە لە رۆژی قیامەتدا شایەتی بۆ هەموو پێغەمبەران دەدات، چونکە پەیامی گشتی پێغەمبەرانی پێگەیشتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) شایەتی لەسەر هەموویان دەدات.

١٨) لە (ابی سعید الخدری) (خوای لێی رازی بێت) فەرموویەتی: ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: یدعی نوح یوم القیامة فیقول: لبیك و سعدیك یارب فیقول: هل بلغت؟: فیقول: نعم، فیقال لامته: هل بلغکم؟ فیقولون: ما اتانا من نذیر، فیقول: من یشهد لك؟ فیقول محمد و امته،

فیشهدون انه قدد بلغ و یکون الرسول علیهم شهیدا، فذلك قوله عز وجل : ﴿وکذلك جعلناکم امة و سطا لتکونوا شهداء علی الناس و یکون الرسول علیکم شهیدا﴾[1] البقرة ١٤٣ احمد ابن ماجة ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە. واتە لە رۆژی قیامەتدا نوح (علیه السلام) بانگ دەکرێت، ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئامادەو گوێڕایەڵی فەرمانی تۆم وا هاتم، خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا پەیامەکەت گەیاندە قەومەکەت؟ دەڵێت: بەڵێ. بە ئومەتەکەی دەڵێن: ئایا پێی راگەیاندن؟ دەڵێن کەسێکی ئاگادار کەرەوەمان بۆ نەهاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نوح کێ شایەتیت بۆ دەدات؟ دەڵێت: محمد (ﷺ)و ئومەتەکەی شایەتی دەدەن کە پەیامەکەی گەیاندووە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دەبێتە شایەت لەسەریان، وك خوای گەورە دەفەرموێت: (ئێوەمان کردووە بە ئومەتێکی میانڕەوو داد پەروەر تا ببنە شایەت لەسەر خەڵکی و پێغەمبەری خواش لەسەر ئێوە شایەت بێت).

١٩) هەروەها مامۆستا (مناع القطان) فەرمووی: قورئانی پیرۆز کۆمەڵێکی زۆر چیرۆکی تیایە کە هەندێکیان لە چەند شوێنێکا دوو بارە بوونەتەوە، یەکێك لەو چیرۆکانە لە چەند شوێنێکی جیاجیا بە کورتی و درێژی باس کراوە وە هەروەها پێش خستن و دوا خستن لە هەندێکیاندا کراوە، لە حیکمەتی ئەوانەش بریتییە لە:

- دەرخستنی رەوانبێژی قورئان لەبەرزترین ئاستدا: لە تایبەتمەندی رەوانبێژی دەرخستنی یەك مانا بە چەند شێوەیەکی جیاواز، چیرۆکی دووبارە بویش لە هەر شوێنێکدا بە شێوازێکی جیاواز دێت لەوانی تر، لە قاڵبێکی غەیری ئەواندا داڕێژراوە، ئینسان لە دووبارە بوونەوەیان بێزراو بێتاقەت نابێت، بەڵکو لە نەفسیدا مانای تازە سەر هەڵدەدەن کە لە خوێندنەوەی شتی تردا ئەوانە دەست ناکەون.

---

[1] (بوخاری) لە (اللانبیاء)دا ریوایەتی کردووە، لە (ئەبی هورەیرە)وە فەرمویەتی (یجيء نوح و امته..)واتە رۆژی قیامەت نوح (علیه السلام) بانگ دەکرێت ........................

- هێزی ئیعجازی: هاتنی مانایەك لە چەند شێوازیکدا لەگەڵ بێ دسەلاتی عەرەبدا هێنانی نموونەیەك لەو شێوەیە.
- گرنگی دان بە پێکهاتەی چیرۆکەکە بۆ جێگیر کردنی پەندەکانی لە نەفسدا، دووبارە کردنەوە بۆ دڵنیا کردنەوەیە، نیشانەی گرنگی پێدانە وەك لە چیرۆکی موسا لەگەڵ فیرعەوندا، کە ململانێ لە نێوان حەق‌و ناحەقدا پێك دێت، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکەکە لە سورەتێکدا دووبارە نابێتەوە با زۆریش دوبارە بوبێتەوە لە قورئاندا.
- جیاوازی ئامانجەکان کە چیرۆکەکە لە پێناویدا دێت: هەندێك مانا بۆ مەبەستێك باس دەکرێت، هەندێك مانای تریش لە شوێنەکانی تردا دەردەکەون بە پێی مەبەست‌و حاڵەتە دیارەی کراوەکان.

﴿ چیرۆکی ( نوح ) علیه السلام ﴾

**ڕێزو گەروەیی نوح:**

١. ستایشی خوا لەسەر نوح (علیه السلام)

خوای گەورە فەرمویەتی: (ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ) الاسراء ٣، واتە: (موساو (بنی ئیسرائیل) نەوەی ئەو کەسانەن کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵ نوحدا هەڵمانگرتن، تا سوپاس گوزار بن‌و قەدری نازو نیعمەت‌و بەخششەکان بزانن) چونکە بەراستی نوح بەندەیەکی زۆر سوپاس گوزار بوو.

(االزمخشری) وتوویەتی: وتراوە: کە نوح خواردنی دەخوارد دەیوت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردنی پێدام‌و تێری کردم، ئەگەر بیویستایە برسی دەکردم، ئاوی بخواردایەتەوە دەیوت: سوپاس بۆ ئەوە خوایەی ئاوی پێدام‌و تێر ئاوی کردم ئەگەر بیویستایە تینوی دەکردم، بەرگی بپۆشیایە دەیوت: سوپاس بۆ ئەوە خوایەی پۆشتەی کردم ئەگەر بیویستایە روت‌و بێ بەرگی دەکردم.[1]

---

[1] الكشاف (٢/ ٦٤٨) بە کورتی

٢. یەکەم پێغەمبەر بووە بۆ مرۆڤایەتی:

بێگومان لە نێوان نوح‌و ئادەمدا (نەوە) هەبووە، کە هەموویان لەسەر یەکتاپەرستی بوون، بۆ ئەوەش خوای گەورە فەرمویەتی: (وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ) الاسراء ١٧

واتە: (چەندەها نەوەمان لە دوای نوح لە ناو بردووە).

لە (ابی هریرە)ەوە لە فەرموودەی (شەفاعەتدا) هاتووە: (فيأتون نوحاً، فيقولون: يا نوح انت اول الرسل الى اهل الارض و سمّاك الله عبدا شكورا اما ترى ما نحن فيه)[١]

واتە: رۆژی قیامەت خەڵکی دێن بۆ لای نوح دەڵێن: ئەی نوح تۆ یەکەم پێغەمەبەر بویت بۆ خەڵکی سەر زەوی‌و خوای گەورە ناوی ناویت بەندەیەکی سوپاس گوزار ئایا نابینیت ئێمە لە چ حاڵێکدا ین؟).

(الحافظ ابن حجر)ابن جابر ووتویەتی: (بوونی نوح بە یەکەم پێغەمبەر کارێکی ئاڵۆز بووە، بەوەی کە ئادەم پێغەمبەربوو، ئەوەش زانراوە کە ئادەم لەسەر شەریعەتێك خوا پەرستی کردووە، منداڵەکانیشی لەویان وەرگرتووە، کەواتەپێغەمبەر بووە بۆ ئەوان دەبێت یەکەم پێغەمبەر بوبێت رەنگە یەکەمیش بە پێی قسەی کەسە خاوەن هەوڵویستەکان بۆ نوح بوبێت کە بۆ خەڵکی سەر زەوی هاتووە، چونکە لەسەر دەمی ئادەمدا خەڵك لەسەر زەویدا نەبووە یان پەیامی ئادەم بۆ کوڕو نەوەکانی وەك پەروەردە کردن بوبێت، هەندێکی تر بە ئیدریس لێیان ئاڵۆز بووە، ئەویش رەت ناکرێتەوە، چونکە جیاوازی هەیە کە باپیری (نوح) بوبێت).[٢]

---

١(بخاری) لە (التوحيد)و (مسلم) لە (الايمان) دا ریوایەتیان کردووە

٢لە فتح الباری (٦/ ٣٧٢- ٣٧٣) بە کورتی.



٣. یەکەم پێغەمبەری (اولى العزم)ە لە پێغەمبەرانی باسکراو لە هەردوو ئایەتی سورەتەکانی (الشورى ، الاحزاب)دا: خوای گەورە فەرمویەتی: (شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ) الشورى ١٣.

واتە: ( رێبازی ئاینو بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، هەروەك بۆ (نوح) ی دانابوو، هەر بەو شێوەیەش قورئانیشی بۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ) وەحی کردووە، بە ئیبراهیمو موساو عیسایشی راگەیاندووە، کە رێبازی ئاینو یەك خوا ناسی بەرنەدەن لەسەری پایەدار بن).

هەروەها فەرموودەی: (وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا) الاحزاب ٧.

واتە: ( ئەی محمد بیریان بخەرەوە کە ئێمە پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکتاپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بە تایبەت لە تۆ ئەی محمد (ﷺ)و لە نوحو ئیبراهیمو موساو عیسای کوڕی مەریەم، بێگومان پەیمانێکی بە هێزو پتەومان لێوەرگرتوون).

٤. خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی نوحی دایەوەو لە ناڕەتی گەورە رزگاری کرد نەوەکانی بۆ هێشتنەوە. خوای گەورە فەرمووی : (وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ (٧٥) وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (٧٦) وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ (٧٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (٧٨) سَلَامٌ عَلَى نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ (٧٩) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (٨١) ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ) الصافات(٧٥، ٨٢).

٥. (الالوسي) دەڵێت: هاناو هاوار بردنی نوح (علیه السلام) بۆ خوای گەورە بریتی بوو لە دوعا لە کافرانی قەومەکەی، داواکەشی بریتی بوو لە رزگار بوونو سەرکەوتن بەسەریاندا، خوای گەورە فەرمووی: بەڕاستی نوح هاواری لێکردین کا تێك نا ئومێد بوو لە ئیمانی قەومەکەی پاش ئەوەی چەند ساڵێکی دوورو درێژ بانگەوازی کردن، ئەوانیش تەنها هەڵدەهاتنو دوور دەکەوتنەوە، ئێمەش بە جوانترین شێوە وەڵاممان دایەوە، بێگومان خوای گەورە باشترین وەڵام دەرەوەیە، خوای گەورە نوحو قەومەکەی لە نوقم بوونو خنکاندن رزگار کرد، کافرانی بە دوعاکەی نوح لە ناو برد کە فەرموویەتی: (لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا) (نوح ٢٦).

٦. ریوایەت کراوە کە هەرچی لە ناو کەشتییەکەدا بوو مرد تەنها سێ کوڕەکەی نوح مانەوە، ئەوانیش (سامو حامو یافث بوون) لەگەڵ خێزانەکانیان ئەمان مانەوە بۆ ئەوەی نەوەکانیان تا رۆژی قیامەت بەردەوام بن. (ترمذي) لە (سمرة)وە هێناویێتی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:
( سام ابو العرب، حام ابو الحبش، يافث ابو الروم).

واتە: (سام باوکی عەرەبە، حام باوکی حەبەشەو، یافث باوکی رۆمە).بوونی خەڵك هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەمان کە کوڕی نوح (عليه السلام) بوون.

مانای پاش بەندی ئایەتەکان بەم جۆرەیە : هەروەها بەسەر هاتی نوحمان بۆ تەوەکانی داهاتوو هێشتەوە (تاپەندی لێ وەربگرن)، سڵاو لەسەر نوح لە لایەن هەموو ئیماندارانەوە لە هەموو شوێنو کاتێکدا، بەڕاستی ئێمە بەو شێوەیە پاراستنی چاکە کاران دەهێڵینەوە، بەراستی نوح لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە.

٥. خوای گەورە لە نەوەکانیدا پێغەمبەرو کتێبی ئاسمانی دابەزاندووە:

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ) الحديد ٢٦.

(ابن كثير) دەڵێت: خوای گەورە هەواڵ دەدات لەوکاتەی نوحی ناردووە لە دوای ئەو تەنها پێغەمبەری ناردووە، لە داوای ئەو تەنها پێغەمبەری لە نەوەکانی ئەو ناردووە، هەروەها ئیبراهیمیش (عليه السلام) لە ئاسمان کتێبێك دانەبەزیوەو پێغەمبەرێك نەنێردراوەو وەحی بۆ کەسێك نەکراوە تەنها بۆ نەوەی ئەو بووە.



﴿بانگەوازی نوح (علیه السلام) و ئارامگرتنی لەسەر بێباوەڕیو کەللە ڕەقی قەومەکەی﴾

لە نێوان ئادەمو نوحدا (دە) نەوە هەبووە هەموویان لەسەر یەکتاپەرستی بوون.[1] . بەڵام پاش ئەو (دە) نەوە چاکە کارە، چەند کارێکی تازە روویاندا کە بریتی بوو لە بت پەرستن، لە ئیبنو عەباس (خوای لیٚ رازی بیٚ) ریوایەت کراوە. کە (ودّ و سواع، یغوثو نسر): ناوی پیاو چاکان بوونو لە ناو قەومەکەی نوح کا تێك لە ناو چوون، شەیتان بە قەومەکەی گەیاند کە لە شوێنی دانشتنەکانیاندا پەیکەریان بۆ دروست بکەنو دایبنێن، ئەوانیش کردیان، بەڵام نە پەرستران تا ئەو کاتەی ئەو کەسانەی سەردەمی ئەوان لە ناو چوون، پاشان دوای ئەوان لە بیریان چوویەوە پەرستیانن)[2]

خوا گەورە لە سورەتی (نوح)دا: فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١) قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ (٢) أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ (٣) يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ نوح (١-٤).

(ابن کثیر) دەڵێت: (خوای گەورە هەواڵ دەدات بە نوح (علیه السلام) کە ناردوویەتی بۆ قەومەکەیو فەرمانی پێکرد لە سزای خوایی ئاگا داریان بکاتەوە پێش ئەوەی پێیان بگات، ئەگەر تەوبەیان کردوو گەڕانەوە خوا لەسەریان هەڵدەگرێت)[3]

بەڵێنی پێدان کە خوای گەورە چۆن بە لێنی بە تەوبەکاران داوە ﴿لَيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَـــمًّى﴾ پاداشتی وەڵامدانەوەکەشی بۆ بانگەوازی خواو خوا پەرستیو لە خوا ترسان گوێڕایەڵی پێغەمبەر بوو کە بریتی بوو لە لیٚ خۆش بوون دوا خستنی لێپرسینەوەش بۆ کاتێکی دیاریکراو لە زانستی خوادا کە ڕۆژی قیامەتە، لە دونیادا نایانگرێت.

---

١اخرجه ابن جرير في جامع البيان و الحاكم ص ٤٧

٢(بوخاری) لة (التفسير)دا ريوايةتی كردووة.

٣(تفسير القران العظيم)



پاشان بۆیان روون دەکاتەوە کە ئەو کاتە دیاریکراوە لە کاتی خۆیدا هەر دێت و دوا ناکەوێت، خوای گەورە فەرمووی: (مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاء لا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) (نوح ٤)

نوح (علیه السلام) راپۆرتێك بۆ پەروەردگارە بەرز دەکاتەوە دەربارەی بانگەوازەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَارًا (٥) فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلاَّ فِرَارًا (٦) وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا﴾

(القاسمي) دەڵێت (نوح پاش ئەوەی ئەوپەڕی توانای خۆی خستەکار هەموو رێگایەکی گرتە بەر لەو ماوە درێژەدا ﴿رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَارًا﴾ واتە : بە بەردەوامی بە شەوو بە ڕۆژ قەومەکەم بۆ یەکتاپەرستی و کردەوەی چاك بانگ دەکرد، ئەوانیش لەو حەقەی کە منی پێ نێرابووم دوور دەکەوتنەوەو هەڵدەهاتن، هەرکاتێك بۆ ئیمان هێنان بانگم بکردنایە گوێیان لە بانگەوازەکە دادەخست، ﴿وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ﴾ واتە جل و بەرگەکانیان دەدا بەسەر دەم و چاوی خۆیاندا بۆ ئەوەی رووی ئەو کەسە نەبینن کە ئامۆژگارایان دەکات بۆ دین، لەسەر شەڕو خراپەو کوفر سور دەبوونرخۆین بە گەورە دادەنا خوای گەورە لە نوح دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا (٨) ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا (٩) فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾ (نوح ٨،١٢)

(االزمخشري) دەڵێت: نوح (علیه السلام) ئەو کارەی کرد هەروەك چۆن فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە دەکات، سەرەتا لە کارە سوك و ئاسانەکانەوە پاشان بۆ بەرزترو قورسەکان پلە بە پلە، کارەکانی بە ئامۆژگاری لە نهێنیدا کرد، کاتێك وەریان نەگرت، بە ئاشکرا کردی، کا تێك کاریگەری نەبوو، هەردوکیانی (نهێنی و ئاشکرا) بە یەکەوە کۆکردەوە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا (ثم)ی بەکار هێنا، بەڵگەیە لەسەر دوورو درێژی ماوەکە چونکە بانگەوازی ئاشکرا قورسترە لە بانگەوازی نهێنی، کۆکردنەوە هەردووکیان پێکەوە لە یەکێکیان بە تەنها قورسترە.

(الالوسي) دەڵێت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ﴾، واتە: پێم وتن بە تەوبە کردن داوای لێخۆش بوون بکەن لەو کوفرو سەر پێچییەی کە کردووتانە، چونکە خوای گەورە لە کاری هاوەڵدانان خۆش نابێت، وە فەرمووی (ربکم) بۆ ئەوەی بیانجوڵێنێت بۆ داوای لێخۆش بوون، (إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا) هەمیشە لێخۆش بووە بۆ ئەوکەسانەی تەوبە دەکەن.

(يُرْسِلِ السَّمَاء) ئەو کارانەیان خۆش دەویست کە لەسەری راهاتبوون، کە لەکارە خۆشەکانی دنیا بوو، نەفس حەزی بە خۆشییەکی پەلەیە، (قتادة) دەڵێت: ئەوان ئەهلی خۆشەوستی دنیا بوون، نوح (علیه السلام) لە رێگای ئەو خۆشەویستییەیانەوە بانگی کردن، وتراوە کاتێك باوەڕیان پێ نەکردوو بە درۆیان خستەوە کەچەند جارێك بانگەوازی کردبوو، خوای گەورە بارانی لێگرتنەوەو بۆ ماوەی ٤٠ساڵ ئافرەتەکانی نەزۆكو بێ سك کرد، وتراوە: ئەگەر باوەڕ بهێنن خوا رزقیان بۆ دەنێرێتو زەویان بە پیت دەکات،و لەو حاڵەتەی کە تیایدا رزگاریان دەکات وەك فەرمووی: (يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا).

زانا (محمد متولي الشعراوي) دەڵێت: پاش ئەوەی نوح (علیه السلام) گفتوگۆی لەگەڵ قەومەکەی کرد کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەنو هەواڵی پێدان کە داوای کرێیان لێ نەکات، ئەوان وتیان: (قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ) (الشعراء ١١١ )

وشەی (الأَرْذَلُونَ) کۆی (رَذلَ)ە واتە خراپ بووی شتێکی بێ کەڵك، بە نوحیان وت: ئێمە چۆن باوەڕت پێ بکەین کە خەڵکی لاوازو هەژارو بێ کەڵك شوێن تۆ کەوتون؟ لە ئایەتێکی تردا وتیان:﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾(هود،٢٧). مەبەستیان لە خەڵکی فەقیرو خاوەن پیشەی لاواز ئەوانەبوون کە گێژنو نوح گوێیان پێنادات، هەر ئەم کەسانە سەربازی شوێن کەوتووی ئەو نامانە بوون لە سەرەتاوە، چونکە مافیان پێشێل کرابوو، دە چوونە لای هەر کەسێك کە هاوسەنگی کۆمەڵگا رابگرێت.

(ابن كثير) دەڵێت:کات درێژی خایاندو قسەو مناقەشە لە نێوان نوحو قەومەکەیدا بەردەوام بوو وەك خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلاَّ خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾ (العنكبوت ١٤) واتە: بۆ ماوەی ٩٥ ساڵ نوح لە ناویاندا مایەوەو بانگەوازی کردن، خوای گەورەش بە لافاو تۆفان گرتنی، ئەوان قەومێکی ستەم کار بوون، لەگەڵ ئەو ماوە درێژەدا تەنها چەند کەسێکی کەم باوەڕیان هێنا.

هەرکاتێك (جیل) نەوەیەك لە ناو بچونایە، ئامۆژگاری ئەوانەی دوای خۆیانیان دەکرد کە ئیمان نەهێنن‌و دوژمنایەتی نوح بکەن‌و سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن، کاتێك باوکێك کوڕەکەی بگەیشتایەتە تەمەنی ژیری‌و قسەی وەربگرتایە ئامۆژگاری دەکرد کە هەرگیز باوەڕ بە نوح نەهێنێت، هەتا ئەو زیندوو بێت، سروشتیان وابوو ئیمان‌و شوێن کەوتنیان رەت کردەوە، بۆ ئەمەش فەرمووی: (وَلاَ يَلِدُوا إِلاَّ فَاجِرًا كَفَّارًا) (نوح ٢٧)

واتە: ( لە نەوەی تازە تەنها خراپەکارو بێ باوەڕیان لێ دەبێت)، (قَالُواْ يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتَنِا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ()قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ) (هود ٣٢ -٣٣)

واتە: (قەومەکە وتیان: ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چویت‌و زیاد لە پێویست بەربەرکانی‌و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین، دەی ئەو سزایەمان بۆ بێنە هەڕەشەی پێدەکەیت‌و هەمیشە باسی دەکەیت و دەمانترسێنێت پێی ئەگەر تۆ لە راست گۆیانیت)،نوح (عليه السلام) لە وەڵامدا وتی: ئەوە بە دەست خوایە، ئەگەر بیەوێت ئێوە ناتوانن خوا دەستە وەستان بکەن (کە ئەستەمە دەرباز بوونتان).

(وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (هود ٣٤)

واتە: (ئەگەر خوا ویستی یەکێك توشی فیتنە ببێت بەهۆی خراپەی خۆیەوە کەس ناتوانێت هیدایەتی بدات، خوای گەورە هیدایەتی هەرکەس دەدات کە خۆی بیەوێت‌و گومڕایشی دەکات ئەگەر خۆی بیەوێت، ئەو جێبەجێکەری هەر کارێکە خۆی بیەوێت، ئەو خوایەکی بە هێزەو بەدەسەڵات‌و کار بەجێ‌و زانایە بە هەرکەسێك کە شایستەی هیدایەت بێت‌و هەرکەسێك شایستەی گومڕایی بێت ئەو خاوەنی حیکمەتی تەواوو بەڵگەی یەك لا کەرەوەیە).

## ﴿ پەندو وانە ئیمانییەکانی چیرۆکەکە ﴾

زانا (عبدالرحمن بن ناصر السعیدی) دەڵێت: لەم چیرۆکەدا ئەم خاڵانە سود وەردەگریت:

١. هەموو پێغەمبەران لە نوحەوە تا محمد (ﷺ) ڕێکەوتوون و یەك دەنگن لەسەر ئەوەی بانگەوازی یەکتاپەرستی خاوێن بکەن، نوح و پێغەمبەرانی تریش یەکەم کەس بوون بە قەومەکانیان وت: ﴿اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ﴾ (الاعراف ٥٩) بە ڕێگاو شێوازی زۆر ئەم بنەمایەیان دووبارە کردۆتەوە.

٢. لەوانە: ئادابەکانی بانگەوازو بە جێگەیاندیان، نوح (علیه السلام) بە شەو ڕۆژو نهێنی و ئاشکرا بانگەوازی قەومەکەی دەکرد، لە هەموو کات و بە هەموو شێوازێك، دڵنیابوو بانگەوازەکەی سەرکەوتوو دەبێت، قەومەکەی دڵخۆش دەکرد بە پاداشتی پەلەو ڕزگار بوون لە سزاو لەزەت بینین لە ماڵ و منداڵ و ڕزق و ڕۆزی ئەگەر ئیمان بهێنن، بە پاداشتی دوا خراو بۆ ڕۆژی دوایی لە پێچەوانەی ئەمانە ئاگاداری دەکردنەوە، لەسەر ئەمەش ئارامی دەگرت، هەروەك پێغەمبەرانی غەیری خۆی، بەنەرمی لەگەڵیان دواو هەموو وشەیەکی کاریگەری بۆ کەمەند کێشی دڵەکانیان بەکارهێنا، نیشانەکانی ڕاگرت و بەڵگەکانی بۆ ڕوون دەکردنەوە.

٣. لەوانە : ڕێزو گەورەیی پێغەمبەران و بەڵگەی پەیامەکانیان و دڵسۆزی تەواویان بۆ خوا، لە پەرستنیشدا بۆ خوا چڕ بوو بوویەوە، لە بەندایەتیدا تێپەڕی بوو بۆ سود گەیاندن بە خەڵکی، وەك بانگەواز کردن و فێر کردن لێکچووەکانیان بۆ قەومەکانیان ئاشکرا دەکرد بۆ ئەوەی گوێیان لێبێت. دەیان وت: ﴿يَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي﴾ (هود ٥١)

واتە: ئەی قەومەکەم داوای پاداشت و کرێ لە ئێوە ناکەم، کرێ و پاداشتی من لای ئەو کەسەیە کە بەدیهێناوم) لە ڕێزو گەورەیی پێغەمبەران ئەوەبووە ئەوان چاویان لێدەکردن و هەنگاوەکانیان هەڵدەگرتن خوای گەورە لە بەر ڕێزیان لە دونیاو قیامەتدا بەرزیان دەکاتەوە، لەوە گەورەتریان دەداتێ کە لە دنیا ویستیان پێشبڕکێی بۆ دەکەن.

٤. (القرطبي) دەڵێت: لەم ئایەتەدا: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ﴾ (نوح ١٠) ئایەتی ﴿وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ وَلاَ تَتَوَلَّوْاْ مُجْرِمِينَ﴾ هود ٥٢. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە داوای لێخۆش بوون دە بێتە هۆی دابەزینی رزق و رۆزیو باران.

٥. (الشعبی) دەڵێت: رۆژێك (عومەری کوڕی خەتاب) چوویە دەرەوە داوای باران بارین بکات تەنها داوای لێخۆش بوون (استغفار)ی کرد هەتا گەڕایەوە، بارانیان بۆ باری،ووتیان نەمان بینی داوای باران بارین بکەیت؟ عومەر (رەزای خوای لێبێت) فەرمووی بێگومان من لەو ئەستێرانەی بارانیان لیٚ دەست دەکەوێت داوای بارانم کرد (کە ئەو ئەستێرانەیان شوبهاندووە بە (ستغفار) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (استغفر ربكم)

(ابو صبیح) دەڵێت: پیاوێك سکاڵای خۆی لای (الحسن الجدوبة)کرد ئەویش پێی وت: (استغفرالله الله) بکە، یەکێکی تر سکاڵای هەژاری کرد بە ویشی وت (استغفرالله الله) بکە، کەسێکی تر پێی وت دوعام بۆ بکە خودا کوڕێکم بداتیٚ، پێی ووت: (استغفرالله الله) بکە، کەسێکی تر سکاڵای وشکبوونی باخ و بێستانەکەی لا کرد بەویشی وت: (استغفرالله الله) بکە، ئێمەش پێمان وت، بۆچی بۆ هەموومان یەك شت؟ فەرمووی من لە لایەن خۆمەوە هیچم پیٚ نەووتوون چونکە خوای گەورە لە سورەتی (نوح) دا دەفەرموێت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾

٦. الحافظ لە (فتح الباري)دا دەڵێت: (الواقدي) گێڕاویەتییەوە دەڵێت: (ودّ) لە شێوەی پیاودا بووە، وە (سواع) لە شێوەی ئافرەتدا بووە، وە (یغوث) لە شێوەی شێردا بووە، وە (یعوق) لە شێوەی ئەسپدا بووە، وە (نسر) لە شێوەی باڵداردا بووە، ئەمەش شتێکی شازو نا باوە، ئەوەشی ناوبانگی داوەتەوە بریتی بووە لەوەی هەموویان لە شێوەی بەشەردا بوون ئەوە تەواو گونجاو ترە لەو شوێنەوارەی کە هۆکار بووە بۆ پەرستنیان.

٧. (ابن القیم) دەڵێت: یەکەم شت کە شەیتان فێڵی پیٚ کرد بریتی بوو لە بت پەرستن لە شێوازی سوڕانەوە بە دەوری گۆڕداو وێنە کێشانی کەسەکان لە بەر چاو تا یادیان بکەن، وەك خوای گەورە لە قورئاندا چیرۆکە کەیانی گێڕاوەتەوە فەرمووی: ﴿وَقَالُوا لا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ﴾، واتە: خەڵکینە نەکەن واز لە خواکانتان بهێنن.

پاشان دەڵێت: یاری کردنی شەیتان بە بە هاوەڵ دانەرەکان لە بت پەرستیدا چەند هۆکارێکی هەیە، بە پێی تێگەیشتنی خۆیان یاری بە هەموو قەومێك دەکەکاتو، دەیانخەڵەتێنن، کۆمەڵێکیان بانگ دەکات بۆ پەرستنی مردووەکانو بە گەورە زانینیان کە پەیکەریان لە شێوەیاندا دروست کردووە وەك قەومی نوح، پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی کردووە لەو کەسانەی کە گۆڕی مردووەکان دەکەن بە مزگەوتو چراو گڵۆپی لەسەر دادەنێن، منەهی کردووە نوێژی لەسەر بکرێت، پێغەمبەر (ﷺ)داوای لە خوای گەورە کردووە کە گۆڕەکەی نەکرێتە بتو بپەرسترێت، فەرمانی کرد کە گۆڕەکان یەکسان بکرێنەوەو بەرز نەکرێنەوە پەیکەرەکان لە ناو ببرێنو بەلام هاوەڵ دانەران رەتیان کردەوە لە هەموویدا سەرپێچیان کرد.

٨. زانا (محمد متولي الشعراوي) دەڵێت: قەومەکەی نوح یەکەم کەس بوون بەرەنگاری بانگەوازی نوحیان دەکرد، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿قَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ﴾ (الاعراف ٦٠)

وشەی (الملا) واتە: کەسە دیارو گەورەو بەڕێزەکانی قەومەکە بوون کە چاوەکانو دڵەکانیان پڕ دەکرد لە ترسو هەیبەتی خۆیانو سەرپەرشتی کۆڕو کۆبوونەوەکانیان دەکرد، خەڵکی لە دەسەلاتو هەیبەتیان دەترسان، دەربارەی بەرنامەی حەقو راست دەیانوت بەراستی ﴿ضلال مبين﴾ەە، واتە حەقیان دەشاردەوە، ئەی نوح چی بە قەومەکەی وت؟ فەرمووی : ﴿قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي ضَلاَلَةٌ﴾ (الاعراف ٦١)

کاتێك ئەوان بە نوحیان وت: ئێمە تۆ لە گومڕایدا دەبینین، پێویست بوو نوح لە وەلامدا بڵێت، من لە گومڕایدا نیم بەلام فەرمووی: ﴿لَيْسَ بِي ضَلاَلَةٌ﴾ بۆچی خوای گەورە وشەی ﴿ضَلاَلَةٌ﴾ی لە باتی ﴿ضَلاَل﴾ بەکار هێنا؟ بۆ ئەوەی بزانن کە هەر پیتێك لە قورئاندا دێت، مانای تەواوی خۆی دەدات، چونکە (ضَلاَل) زۆرێك لە گومڕایی دەگرێتەوە، نوحیش نایەوێت ئەم هەمو (ضَلاَل)ە لە خۆی دوور بخاتەوەو بەس بەڵکو دەڵێت: من تەنها گومڕاییەکیشم نییە، بەم جۆرە تەنها دانەیەکیش لە خۆی دوور دەگرێت، خاوەنی بەرنامەکە خوای گەورە بووە، کەواتە ناگونجێت (ضَلاَلَة) تاکە گومڕاییەکیشی تیا بێت، یان لە (ضَلاَلَةٌ) چوبێت لەبەر ئەوە نوح (عليه السلام) بۆ گەیاندنی ئەو بەرنامەیە بۆ

خەڵك نێردراوە، دەفەرموێت: ﴿وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (٦١) أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (الاعراف ٦٢)

نوح لە لایەن خواوە راسپێردراوە بەرنامەکەی بۆ هیدایەت بووە، نوح نوێنەری پاشایان حاکم یان کەسێکی گەورەو بەر پرس نەبوو، بەڵکو پێغەمبەری خوا بوو، نوح (علیه السلام) دوای ئەوەی ئەو شتانەی رەت کردەوە کە خەڵکی دابویانە پاڵی وتی: ئەم قسانەی دەیکەم هی خۆم نین، بەڵکو لەلایەن خواوەیەو لەسەرمە بیگەیەنم، وشەی (البلاغ) بریتییە لە کۆتا فەرمان بیگەیەنێت بە خاوەنی) واتای (ابلغتكم) بریتییە لە: من ئەو حەقەی خوای گەورە پێی سپاردووم لە بەرنامەی رێنمایی بۆ کارو باری ژیان لەسەر ئێوە کۆتایی پێدێنم، ئایا بەوە دەبێت (رسالات ربي) نامەکانی پەروەردگارم؟ دەڵێین: هەریەکە لە پێغەمبەران بە بەرنامەیەکەوە دێت کە فەرمانە نەگۆڕەکانی بەرنامەی پێغەمبەرانی پێش خۆی تیایە، تا خەڵکی نەڵێن: پێغەمبەرەکە لەگەڵ پێغەمبەرەکەی پیش خۆیدا نەدەگونجا، ئەوەی کە ئادەم وتی، نوحیش هەر ئەوەی وت، هەروەها (شیث و ئیدریس و پێغەمبەرانی تریش) کە بریتی بوو لە (لا اله الا الله).

٩. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ (هود ٤١) زانا (محمد متولي الشعراوي) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ئەمە قۆناغی کۆتایی کەشتییەکەی نوحە، کە قۆناغەکانی بریتی بووە لە:

قۆناغی یەکەم: فەرمانێك بوو لە خواوە بۆ نوح کە کشتیی یەکە دروست بکات.

قۆناغی دووەم: نوح هەستا بە دروست کردنی کەشتی یەکە، بێگومان نوح (علیه السلام) چەند ساڵێکی پێ چووە، تا کەشتییەکەی دروست کردوو تەواوبوو

قۆناغی سێیەم: ئەو نیشانەیە بوو کە ئاو لە تەنورەکەوە دەر بچێت لە شوێنی نان کردنەکە لە شارەکەدا کە لەلای ئەوان زانراو بوو.

قۆناغی چوارەم: نوح خۆیی و کەس و کارەکەی و لە هەموو جۆرە شتێك جوتێك لەگەڵ خۆی لە کەشتییەکەدا سەر بخات.

قۆناغی پێنجەمو کۆتایی: بۆ هەموو یەکێك کە ئامادەی کرد بۆ ناو کەشتییەکە: ﴿ وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ وتەی نوح بریتی بوو لە: (وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا) کە فەرمانێك بوو لە خواوە، کە فەرمانیان پێ بکات سەر کەشتی یەکە بکەون، کە شتییەکە بۆ هەمو کەس بوو خوا ڕامی کردبوو کە خزمەتی نەفەرەکان بکات ئەوانیش گوێڕایەڵی بن.

﴿دوعای نوح (علیه السلام) له قەومەکەی و وەڵامی خوا بۆ نوح و لە ناو بردنی کافران﴾

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلاَّ مَن قَدْ آمَنَ فَلاَ تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ (٣٦) وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلاَ تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ (٣٧) وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلأٌ مِّن قَوْمِهِ سَخِرُواْ مِنْهُ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ (٣٨) فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ (٣٩) حَتَّى إِذَا جَاء أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ (٤٠) وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ (٤١) وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ (٤٢) قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاء قَالَ لاَ عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ إِلاَّ مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ (٤٣) وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٤٤) وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ (٤٥) قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلاَ تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ (٤٦) قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ (٤٧) قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلاَمٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ هود (٣٦-٤٨)

(ابن كثير) دەڵێت: ئەم ئایەتە دڵ دانەوەبوو بۆ (نوح) علیه السلام، کەس باوەڕ ناهێنێت تەنها ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان هێناوە، واتە نا ئومێدو بێ تاقەت مەبە هەرچی روو دەدات چونکە بێ گومان سەرکەوتن نزیکە، هەواڵەکەیش سەیرە.

﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلاَ تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ هود ٣٧.

نوح (علیه السلام) کا تێك لە چاك بوون و سەرفراز بوونی قەومەکەی نا ئومێد بوو، بینی کە خەیریان تیا نییە، ئەوانیش ئازاری نوحیان داو سەرپێچییان کردو باوەڕیان پێ نەکرد بە هەموو شێوەیەك لە کرداو لە وتن، نوح (علیه السلام) دوعای لێ کردن و خوای گەورەش خەشمی خۆی لێ گرتن، خوای گەورە دوعاکەی بیست و وەڵامی داواکەی نوحی دایەوە.

﴿وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلأٌ مِّن قَوْمِهِ سَخِرُواْ مِنْهُ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ (٣٨) فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ (هود ٣٨- ٣٩)

خاوەنی (المنار): دەڵێت: نوح دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتی وەك فەرمانی پێکرا، هەرکاتێك کۆمەڵێك لە قەومەکەی بە لایدا تێپەڕینایە گاڵتەیان پیێ دەرکردو پێی پیێ دەکەنین‌و ناو ناتۆرەیان لیێ دناو وا یان دادەنا کە توشی شێتی‌و تێك چوون هاتووە. گێڕاوەتەوە: ئەوان کە لە نوحیان دەپرسی چی دروست دەکات دەیوت: خانویەك دروست دەکەم کە بەسەر ئاودا بڕوات، ئەمەش زانراوە چاوەڕ وان کراو نەبوو، کەسێکی سەردەمی خۆی نەمابوو لەسەرو عەقڵ‌و تێگەیشتنی خۆیانەوە لە کردن یان وتندا گاڵتە بە نوح نەکات، پێش ئەوەی لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بێت.

نوح (علیه السلام) وتی: ئەگەر ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن، ئێمەش گاڵتە بە ئێوە دەکەین بە نەزانی‌و نەفامیتان سبەینێش کە چیتان بەسەر دێت، ئەگەر ئێوە ئەمڕۆ نەزانن چی دەکەین‌و چی دەبێت‌و دواتر چارەنوستان چی دەبێت، بێگومنا دواتر دەیزانن دوای تەواو بوونی. دەیزانی کیێ سزای توش دێت‌و سوك‌و رسواو سەر شۆڕ دەبێت لە دنیاو پاشتر لە قیامەتدا سزای لە دنیا قورس ترو نە بڕواوەی بۆ دەبێت.

﴿حَتَّى إِذَا جَاء أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ (هود ٤٠)

کاتێك فەرمانی خوا هات لە زەوی‌و ئاسمانەوە ئاو هات پاشان خوای گەورە بە نوحی فەرموو لە هەموو جۆرێکی نێررو میێ جوتێك بخە ناو کەشتییەکەوە لەگەڵ خۆت بیانبە، بۆ ئەوەی نەوەکانیان بمێنێتەوە.

(الشیخ محمد رشید رضا ) دەڵێت: کەس‌و کارەکەی خۆت لە رەگەزی نێرو میێ بۆ ناو کەشتییەکە سەر بخە، کە بریتی بوون لە ئافرەت‌و منداڵ‌و خێزانەکانیان، تەنها بیێ بێباوەڕەکانیان جیا کردەوە. چونکە دەچنە ناو لە ناو چوان، وك خوای گەورە فەرمووی: ﴿ولاتُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُم مُّغْرَقُون﴾.

﴿وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ (هود٤٠)

لە (المنار) دا دەڵێت: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەشیان روونیان نەکردۆتەوە ژمارەیان چەند کەس بووە، ئەوەی زانایانی تەفسیر دەڵێن رەت کراوەتەوەو بەڵگەی لەسەر نییە، (ابن جرير الطبري) دەڵێت: بۆی روون نەکردوینەتەوە کە جۆری ئاژەڵەکان چی بوون کە هەڵی گرت، چۆن سەری خستن بۆ ناو کەشتییەکە، ئەمانە لە (سفر التكوين)دا بە درێژی باس کراوەزانایای تەفسیر (اسرائيليات) یان هێناوە کە پێچەوانەی راستییەو لێکۆڵینەوەیان تەمەن بە زیادە ئەدات، پێویست ناکات خۆمان بە خوێندنەوەیان سەرقاڵ بکەین.

﴿وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (هود ٤١)

(االزمخشري) دەڵێت: واتە سورای کەشتییەکە بېن‌و ناوی خوا بێنن‌و یان بڵێن: ( باسم الله) لە کاتی رۆیشتن‌و لە کات وەستانەوەیدا.

﴿وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە ئەگەر لێخۆشبوونی خوایی بۆ گوناهەکانتان‌و بەزەیی ئەو نەبێت رزگار نابن.

﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾ (هود ٤٢)

(القاسمي )دەڵێت: ئەوەش کاتێك بوو کە دەروازەکانی ئاسمان بە رووی ئاودا کرانەوەو سەرچاوەکانی سەر زەوی تەقین، ئاوەکە زۆر بوو بەرز بوویەوەو هەموو لاکانی زەوی داپۆشی‌و بەرز بوویەوەو چیا بەرزەکانیشی داپۆشی، کاتیك ئاوەکە بەرز دەبوویەوە لە هەڵچونیدا شەپۆلەکانی وەك چیای لێدەهات.

﴿وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ﴾ واتە (دوور کەوتبوویەوەو کەناری گرتبو لە باوکی ﴿يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا﴾ واتە وەرە ناو دینەکەمان‌و واتە لە ناو کەشتییەکەدا هاورێمان بە. ﴿وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾ واتە لەسەر دینی بێ باوەران مەبەو کەنارگیر مەبە بۆ ئەوەی لە کۆمەڵی لە ناو چوان نەبیت.

﴿قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاء﴾ واتە:( پەنا دەبەم بۆ بەرزایی شاخێك لە ئاوی لافاو دەمپارێزێت‌و نوقم نابم‌و ناخنکێم.)

﴿قَالَ لاَ عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ إِلاَّ مَن رَّحِمَ﴾ واتە: ئەمڕۆ ڕێگرێك بۆ تاقیکردنەوەی خوایی نییە کە بریتییە لە (الطوفان) باران‌و لافاو، تەنها خوای گەورە رەحم‌و بەزەیی دەنوێنێت، یان داڵدەو پەنا دان نییە تەنها شوێنێك بێت

بۆ باوەڕدارانە، واتە ناو کەشتییەکە، یان ﴿لاَ عَاصِمَ﴾ واتە: خاوەن پەنایەك نییە مەگەر خوا رەحمی پێ بکات.

﴿وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾ واتە: لە ناو چوان بە نوقم بوون. بەڵگەی تیایە بۆ لە ناو چوونی هەموو بێباوەڕان، فەرمانێك بوو روودانی بڕابووییەوە، پێویستی بە روونکردنەوە نییە.

﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(هود ٤٤)

(ابن كثير) دەڵێت: خوای گەورە هەواڵمان دەداتێ کاتێك خەڵکی سەر زەوی بە نوقم بوون لە ناو برد تەنها هاوەڵانی ناو کەشتییەکە نەبێت.فەرمانی کرد بە زەوی کە ئاوەکەی هەڵمژێتەوە، فەرمانی کرد بە ئاسمان ئاوەکەی خۆی بەرێتەوە (وَغِيضَ الْمَاء) واتە: ئاوەکە دەیتی کرد بە کەم بوونەوەو دابەزین، (وَقُضِيَ الأَمْرُ) زەوی لە خەڵکەکەی سەری بە تاڵ بوویەوە، ئەو کەسانەی کە بێباوەڕ بوون بە خوا شوێنەواریان نەمایەوە، پاشان کەشتییەکە بە سەر نشینەکانییەوە لەسەر کێوی (جودی) مراوەستایەوە. (مجاهد) دەڵێت: جودی شاخێکە لە ناوچەی (الجزیرة).

﴿وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ (٤٥) قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلاَ تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾.

(القاسمي) دەڵێت: ئەوە دەگەیەنێت نوح (عليه السلام) سۆزی باوکایەتی بۆ کوڕەکەی پاڵی پێوە ناوە رەحمو بەزەیی نزیکیشی هۆکارێك بوو داوای کرد کە خوا رزگاری بکات چونکە زۆر خۆشی دەویستو بایەخی پێ دەدا، رەچاوی ئەدەبی جوانی لە داواکارییەکەیدا کرد بە وتنی: ﴿وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ﴾ واتە: بەڕاستی وەعدو بەڵێنی تۆ حەقو راستە، نەیوت: بە رزگارکردنی کەسو کارەکەم وعدەکە پێچەوانە بکەرەوە، بە تێگەیشتنی خۆی ئەمەی وت، لەبەر بڵاو بوونەوەی داخو خەفەتەکانی بێ ئاگابوو لە کوڕەکەی کە بەفەرمانی خوا جیا کرابوویەوە، ﴿إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ﴾ جێگیر نەبووبوو کە کوڕەکەی ئەو کەسەبوو پێشتر فەرمانەکەی لەسەر درا، بە سۆزو شەفەقەوە داوای بەزەیی لە پەروەردگار کردو ووتی: ﴿وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ﴾ کە زانایەکی کار بەجێیت فەرمانت دوا ناکەوێتو رەت ناکرێتەوە.

﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ واتە: بڕیار ڕزگار بوونیانە بەڵام کوڕەکە لەگەڵ دەستەی کافرانە، یان کەس‌و کارت نییە لە بنە ڕەتدا. چونکە بازنەی کەس‌و کار بریتییە لە نزیکی لە دیندا، هیچ پەیوەندیەك لە نێوان باوەڕدارو کافردا نییە.

﴿إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ خوای گەورە ڕوونی کردەوە کە کوڕەکەی لە کەس‌و کارەکەی نەفی کرد، چونکە چاکە کار نەبوو، ئاگادار کردنەوەیەك بوو کە کەس‌و کارەکەی چاکە کارن، ئەهلی دین‌و شەریعەتن، مانەوەی ئەو لە ناو خراپەو سەرپێچیدا وەك ئەوەیە کردەوەکانی نا چاك بێت.ئاماژە دانیش بوو کە هۆکاری ڕزگار بوون تەنها چاکەیە نەك نزیکی لە تۆ، هەرکەس چاکەی نەبێت ڕزگاری نابێت.

﴿فَلاَ تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ واتە: لێم مەکەوە یان داوای شتێك مەکە کە نازانیت ئایا گونجاو وتەواوە یان نەگونجاو و ناتەواوە.

﴿إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ واتە: من نەهی ئەوەت لێدەکەم کە لە نەزانەکان بیت بەوەی کە داوا لە من بکەیت‌و نەتزانیوە، بێگومان نوح (علیه السلام) لەو کاتەدا بە ئەدەبێکی جوان ئاگاداری کردەوە: بەم وتە جوانەش داوای پەنا دانی کرد: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (هود ٤٧)

واتە: ئەی پەروەردگار واتە من پەنا دەگرم بە تۆ کە داوای شتێکت لێبکەم زانستم پێی نییە، ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبیت‌و ڕەحمم پێنەکەیت، بەڕاستی من لە خەسارەت مەندان دەبم.

﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلاَمٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (هود ٤٨)

(الزمخشري) دەڵێت: واتە: سەلام لە خواوەو بەرەکات بۆسەر نوح‌و نەتەوەی باوەڕداران ئەو کەسانەی لەگەڵ نوحدا پێیان دەگەیەنێت‌و گەشەیان پێدەدات، لەوانەی کە لەگەڵتاندان ئەی نوح کۆمەڵێکیان ئەهلی ڕابواردنی دنیان دەچنە ناو ئاگرەوە.نوح (علیه السلام) باوکی پێغەمبەران بوو، خەڵکی دوای لافاوەکە لەو بوون، لەو کەسانەی ناو کەشتییەکە کەلەگەڵ نوحدا بوون.

**﴿پەندو وانە ئیمانییەکانی چیرۆکەکە﴾**

١. مامۆستا (سید قوطب) دەڵێت: ئەو خزمایەتیو تێکەڵییەی خەڵکی لەسەر کۆدەبێتەوە بۆ ئەم دینە شتێکی بێ هاوتایە سروشتی ئەم دینەی پێ جیا دەکرێتەوە. ئەم خزمایەتیو تێکەڵاویە. لە خوێنو نەسەبەوە نییە، لە پەیوەندی زەویو نیشتیمانەوە نییە لە پەیوەندی قەومو عەشیرەتەوە نییە، هەروەها لە پەیوەندی رەنگو زمانو رەگەزو پیشەو چینەوە نییە، چونکە ئەم خزمایەتیو تێکەڵاویە پەیدا دەبنو پاشان پەیوەندی لە نێوان تاکەکاندا دەپچڕێتو نامێنێت، وەك خوای گەورە بە بەندەی خۆی نوحی فەرموو: (ان ابني من اهلي) خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ پاشان بۆی روون کردەوە کە بۆچی کوڕەکەی لە ئەهلو کەسو کاری ئەو نییە. ﴿إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ ئەی نوح بێگومان نزیك یو پەیوەندی ئینسانن لە نێوانتاندا پچڕاوە، ﴿فَلاَ تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ بەڵام دانانیکی هەڵەیە، ئەوە زانراوەو دڵنیاییە هەرچەندە کە ئەو لە پشتی تۆش هاتووە.

٢. مامۆستا (سید قطب)دەڵێت هەڵوێستەی کۆتایی لەگەڵ چیرۆکی نوحدا دەکەین تا نرخی ئەو کۆمەڵەکەمە باوەڕدارە لە تەرازووی خودادا ببینین. هەندێك ریوایەت وا باس دەکات کە ئەو کۆمەڵە کەمە موسوڵمانە دوانزە کەس بوونو کە لە بانگەوازی نوح لە ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵدا بەرهەم هاتووە، بێگومان ئەو کۆمەڵە کەمە بەرهەمی ئەو تەمەنە درێژوو هەوڵە زۆرە بووە، کە حەقی خۆی بوو خوای گەورە سونەتی دیاردەکانی بونەوەریان بۆ بگۆڕێت، ئەو (طوفان) بارانو لافاوەیان بۆ هەڵبکات کە هەموو شتێك دادەپۆشێت. هەموو زیندەوەرێکی زیندووی سەر زەوی لە ناو دەبرد، پاشان ئەوە خوای گەورە ئەو کۆمەڵە کەمە بکاتە میراتگری زەویو تۆوی ئاوەدانکردنەوە،و جێنشینی سەر زەوی.

٣. (القاسمي) دەڵێت: هەندێکیان لە راپۆرتی لافاوەکە کۆمەڵێك شوێنەواری سەیری لە چینەکنی زەویدا جێهێشتووە، لە هەندێك شوێندا نیشتووی دەریای تێکەڵ بە مادەی کلسی دەبینرێت، تەنانەت لەسەر لوتکەی شاخەکانیش لە دەشتو تەخیاییەکانیشدا پاشماوەی ئاژەڵیو رووەکی تێکەڵ بەماددەی دەریایی دەبینرێت، هەندێك لە کەنارەکانیدا دیارەو هەندێکیش لە نزیکی ئەوان ژێر زەوی کەوتووە و داپۆشراوە، لە ئەشکەوتەکانیشدا ئێسکی ئاژەڵی

سروشت جیاواز دۆزراوەتەوە، پێکهاتەیان لە هی ئێستا جیاوازو دوورە، لەگەڵ ئەمانەشدا پاشماوەی هەندێك ئامێرو شوێنەواری مرۆیی هەن، ئەوە دە گەیەنێت کە لافاوەکە هێناونی بۆ ئەو شوێنانە، وکۆی کردونەتەوەو لە ناوی بردوون‌و پاشان چوونەتە ناو چینەکانی قوڕی زەوی‌و بوونەتە مادەی بەردین، ماونەتەوە وەك شایەتییەك کە بەفەرمانی خوا بووە.

٤. زانا (السعدی) دەڵێت: دەگونجێت پشت بە خوا ببەسترێت‌و لە کاتی سەرکەوتن‌و دابەزین‌و هەموو جوڵەیەکدا ناوی خوا بهێنرێت، سوپاسی ستایشی وا بکرێت‌و لەسەر نیعمەتەکانی یادی زۆری بکرێت، بە تایبەتی لەکاتی رزگار بوون‌و لەکاتی ناڕەحەتییەکان، وك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ و فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانَا مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ دەگونجێت دوعای بەرەکەت لە شوێنەکانی دابەزین بکرێت وەك شوێنی سەفەرو گەشت‌و گوزارو شوێنە جێگیرەکان، وەك شوێنی نیشتە جێبوون، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلاً مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾ ئەمانە هەمووی پێویستی بە یادی خوا هەیە.

٥. لە چیرۆکی نوحدا سودێکی تر وەردەگیرێت: رزگار بوون لە سزای دنیاییەکان بۆ باوەڕدارانە، ئەوانە رزگاریان دەبێت پێغەمبەران‌و شوێن کەوتوانن، وە سزا دنیاییەکان تایبەتە بە ستەمکاران‌و تاوانباران‌و شوێنکەوتوانیان لە منداڵ‌و ئاژەڵەکانیشیان، ئەگەر بێ تاوانیش بن، چونکە ئەو سزایانەی خوای گەورە بۆ چینی درۆزنانی دەنێرێت منداڵ‌و گیانلەبەرانیش دەگرێتەوە. بەڵام ئەوەی لە هەندێك وتەی، (اسرائیلیات) دا باسکراوە، کە قەومی نوح‌و قەومەکانی تریش کاتێك خوای گەورە ویستی لە ناویان بەرێت، رەحمی ئافرەتەکانی نەزۆك کردن، تا سزاکە شوێن منداڵەکانیان نەکەوێت، ئەمە راستی تیا نییە، چونکە نەفی فەرمانی زانراوەکا ن دەکەن،ئەوە راستە کە لە ئایەتەکەی خوا دا هاتووە، ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (الانفال ٢٥)

واتە: خۆتان لە بەڵایەك بپارێزن کە توشی ئەوانەتان نابێت بە تایبەت کە ستەمیان کردووە، بەڵکو هەمولایەك دەگرێتەوە.

٦. زانا (محمد رشيد رضا) دەڵێت: خوای گەورەلە دنیاو لە قیامەتدا بە ئیمانو کردەوەی چاك پاداشتی خەڵکی دەداتەوە نەك بە نەسەبو رەچەڵەك، بایەخ نادات بە کەس لەبەر خاتری باوکی یان وباپیری چاکەکاری ئەگەر لە پێغەمبەرانیش بن، ئەگەر کەسێك لە باوكو باپیرانی داوای شتێکی پێچەوانەی سونەتی شەرعو حیکمەت بیّ لە یاسای دروست کراوەکاندا، تاوان بار بووە شیاوی سزادانە هەتا ئەو کاتەی تەوبە دەکاو دەگەڕێتەوە.

٧. لەم ئایەتەدا: ﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ زانای تەفسیر (القرطبي) دەڵێت: دڵدانەوەیەکی بۆ دروست کراوەکان تیایە لە خراپی منداڵەکانیاندا ئەگەر خۆشیان چاکەکار بن، هەروەها بەڵگەشی تیایە لەسەر ئەوەی کەکوڕ بە پێی (اللغة) زمانو شەرع لە کەسو کارە هەرکەس وەسیەتی بۆ کەسو کار کرد کوڕەکەشی دەگرێتەوە. هەرکەس لە شوێنو ماڵی ئەودا بوو لە کەسو کاری ئەوە، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ (٧٥) وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ پێشتر مانامان کرد، هەمو ئەو کەسانەی کەلە شوێنو ماڵی ئەودان بە کەسو کار ناوی بردوون.

## ﴿چیرۆکی ئیبراهیم (علیه السلام)﴾

### فەزڵو رێزو گەورەیی ئیبراهیم (علیه السلام)

١. ستایشی خوا لەسەری:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٢٠) شَاكِرًا لِأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (١٢١) وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ (١٢٢) ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (النحل ١٢٠- ١٢٣)

واتە: بەراستی ئیبراهیم (علیه السلام) هەرخۆی ئومەتێك بوو، (هەر خۆی پێشەوایەك بوو) ملکەچی فەرمانداری خوا بوو، لە هەموو بیروباوڕێکی چەوت بە دوور بوو، لە هاوەڵ دانەرانو هەڵگەڕاوان نەبوو، هەروەها زۆر سوپاس گوزاری خوابوو لە بەرامبەر نازو نیعمەتی بێشوماری پەروەردگاریەوە.ئەویش

هەڵیبژاردو بۆ ڕێبازی راستو دروست ڕێنموویی کرد، ئێمە هەر لە دونیادا چاکەمان پێ بەخشیو پاداشتی چاکەمان دایەوە، (بە بەخشینی هاوسەری پاكو نەوەی خوا ناس) بەراستی ئەو لە جیهانی داهاتوودا لە ریزی چاکاندایە، (کە ڕێز دارو بەختەوەرو کامەرانن) دواتر (پاش چەند سەدەیەك) وەحیو نیگامان بۆ تۆ ئەی (محمد) (ﷺ) نارد کە شوێنی ئاینو بەرنامەی ئیبراهیم بکەوێت کە لە هەموو بیرو باوەڕێکی چەوت بە دوور بووە ئەو لە دەستەی هاوڵ دانەران نەبووە.

زانا (محمد متولی الشعراوی) دەڵێت: خوای گەورە ستایشی ئیبراهیمی کردووەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا﴾ (النحل ١٢٠)

لە واتای ﴿كَانَ أُمَّةً﴾ دا وتویانە: هیچ کاتێك هەموو سیفەتەکانی (کمال) بەهرەکانی رێزی تیا نابێت، چونکە لەوە گەورەترن لە کەسێکدا کۆ ببنەوە بەلاّم لە کۆمەڵێکدا کۆ دەبنەوە، ئەم ئازایەو بە هێزە، ئەم زیرەکەیەو تێڕوانینی بە هێزە ، ئەم گوێی تیژەو باش دەبیستێت، ئەم بیر کردنەوەی بە هێزە، ..هتد، ئەمانە ناتوانرێ لە تەنها کە سێکدا کۆ بکرێتەوە، دە گونجێت هەر تاکێك بەشێکی لەم بەهرانە تیا بێت، هەروەها هەموو سیفەتەکنی (کمال)یش بەسەر کۆمەڵێك کەسدا دابەش بووە، بێجگە لە ئیبراهیم (علیه السلام) کە بە تەنها نەتەوەیەك بووە. وەك ئەوەی بەهرەکانو (کمال)ی یەك نەتەوە لە خۆ بگرێت.خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (ال عمران ٦٧)

(ابن کثیر) دەڵێت: خوای گەورە روونی کردەوە کە ئیبراهیم لە سەر دینی پاكو دروست بوو، کە مەبەستی دڵسۆزییە، لە هەموو چەوتیو بێ مانابیەك لای دابوو، پێچەوانەی یەهودو نەساراو هاوەڵدنەران بوو.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وابراهیم الذی وفی﴾ (النجم ٣) لە هەموو ئەو فەرمانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکرد زۆر بەوەفا بوو بە هەموو رەوشتێکی ئیمانی بەرز بە لقەکانیشییەو هەڵدەسا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ (البقرة ١٢٤)

واتە: پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند فەرمانێك تاقی کردەوە ئەویش زۆر بە جوانی ئەنجامی دان، دوایی کە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا

سەرکەوت، خوا فەرموی: من بڕیارم داوە بتکەمە پیشەوای خەڵکی، ئیبراهیم وتی: حەز دەکەم نەوەکانیشم لەو کارە بێ بەهرەدارین، خوا فەرمووی: پەیام‌و پەیمانی من بۆ ستەم کاران نابێت (با نەوەی تۆش بن).

دەربارەی ئەم ئایەتە (القرطبي) دەفەرموێت: زانایان راو بۆچوونی جیاوازیان دەربارەی (کلمات) هەیە هەندێکیان دەڵێن: مەبەستی شەریعەتی ئیسلامە، هەندێکی تریان دەڵێن: مەبەستی بە فەرمان‌و نەهییە، هەندێکی تر دەڵێن: مەبەستی سەربڕینی کوڕەکەیەتی، هەندێکی تریان دەڵێن: مەبەستی بە جێگەیاندنی پەیامەکەیەتی، دەڵێت: ماناکان لە یەکەوە نزیکن.

٢. یەکێکە لە پێغەمبەرانی (اولی العزم) کە لە ناو هەموو پێغەمبەراندا بە تایبەت ناوی هاتووە، لە ئایەتەکانی هەردوو سورەتی (الاحزاب‌و الشوری) دا: (ابن کثیر)دەڵێت: ئیبراهیم (علیه السلام) دوای محمد (ﷺ) بەڕێز ترین پێغەمبەرانی (اولی العزم) کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاسمانی حەوتەم بینی پشتی دابووە بە (بیت المعمور)ەوە کە هەموو رۆژێك ٧٠ هەزار فریشتەی تێدەچێت. پاشان جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆی.

هەروەها فەرموودەکەی (ابی بن کعب) کە پێغەمبەر فەرمووی: (اللهم اغفر لامتي، اللهم اغفر لامتي، و اخرت الثالثة ليوم يرغب الي الخلق كلهم حت ابراهيم)[1]. واتە پێغەمبەر لە بەشێکی فەرمودەکەدا دوعای بۆ ئومەتەکەی کرد فەرووی: خوایە لە ئومەتەکەم خۆش بیت، خوایە لە ئومەتەکەم خۆش بیت، سێیەم دوعاو پاڕانەوەم دواخست بۆ رۆژێك کە دروست کراوەکان حەسودییان بە من دێت گشتیان تەنانەت ئیبراهیمیش.

کاتێك ئیراهیم (علیه السلام) لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) بە رێز ترینی پێغەمبەرانی (اولی العزم) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە لە تەحیاتی نوێژدا ناوی بهێنرێت، وەك لە فەرمووودە راستەکاندا، لە فەرمودەی (کعب بن

[1] (مسلم) لە (صلاه المسافرین)دا ریوایەتی کردووە)

عجرة) و کەسانی تردا هاتووە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانیمان سەلام لەسەر تۆ چۆنە. ئەی (الصلىاة) لەسەر تۆ چۆن دەبێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ولو اللهم صلى علي محمد وعل ال محمد كما صليت على ابراهيم و على ال ابراهيم انك حميد مجيد)[1]. واتا بلێێن: خوایە دروودو سەلات بنێرە بۆسەر محمدو ئال محمد وەك دروودو سەلامت نارد بۆسەر ئیبراهیمو ئالی ئیبراهیم، وە بەرەکەتو فەڕو پیرۆزی برژێت بەسەر محمدو ئالی محمد دا وەك بەرەکەتو فەڕو پیرۆزیت رژاندووە بەسەر ئالی ئیبراهیمدا. بەراستی تۆ خوایەکی سوپاس کراوو بەرزو بالآیت).ئیبراهیم (علیه السلام) لە هەموو پێغەمبەرانی تر زیاتر لە پێغەمبەر محمد (ﷺ) چووە، وەك لە (صحیحی بوخاریدا هاتووە، (اما ابراهيم فانظروا الى صاحبكم) واتە: بۆ ئیبراهیم تەماشای هاوەڵەکی خۆتان (واتە خۆی بکەن، واتە شێوەیان زۆر لە یەك چووە،

٣. هەروەها لە فەزڵو گەورەییەکانی زۆر خۆشەویستی خوا بووە، هەر لەمەدا پێغەمبەری خۆشمان بەشدار بووە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾ (النساء ١٢٥)

واتە: کێ هەیە ئاینی چاكو پەسەندترو جوانتر بێت لەو کەسەی رووی کردۆتە خواو خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردووە، لە کاتیکدا کە کارجوانو کار پەسەندەو، شوێنو ئاینی ئیبراهیمی مل کەچو فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمیشی کردۆتە خۆشەویستی خۆیو رێز داری کردووە.

وشەی (الخليل) ئەو پەڕی خۆشەویستی دەگەیەنێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ايها الناس لو كنت متخذاخليلا غير ربي لاتخذت ابى بكر خليلا ولكن اخوة الاسلام)[2]

[1] بخاری لە (الدعوات)و مسلم لە (الصلاة)دا ریوایەتیان کردووە.

[2] بخاری لە (فضائل الصحابة)وە مسلم لە(الفضائل)دا ریوایەتیان کردووە.





واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر من خۆشەویستێکم لە غەیری پەروەردگار بۆ خۆم بگرتایەو دیاری بکردایە، ئەوا ابو بکرم دەکرد بەڵام برای موسوڵمانە.

٤. هەروەها لە ڕێزو گەورەییەکانی خوای گەورە لە نەوەکانیدا پێغەمبەرانی ناردووەو کتێبی پێی داون.

خوای گەورە فەرمووی :﴿وجعلنا في ذريته النبوة و الكتاب﴾واتە : پێغەمبەرایەتیمان کردە کالای بالای نەوەکانی ئیبراهیمو کتێبە ئاسمانییەکانیشمان بۆ ناردن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاً هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٤) وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ (الانعم ٨٤- ٨٦)

واتە ئیسحاقو یەعقوبمان پێ بەخشی، هەر یەك لەوانمان ڕێنمویی کرد پێشتریش نوحمان ڕێنمویی کردبوو، لە نەوەکانی تری ئیبراهیم داودو سولەیمانو ئەیوبو یوسفو موساو هارون هاتنە دنیاوەو بوونە رابەرو چاو ساغی خەڵکی). بەو شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە، نەوەی چاكو پاك خوا ناسییان پێ دەبەخشین، هەروەها زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس هەرهەموویان لە پیاو چاکانن. ئسماعیلو یەسەعو یونسو لوطیش لە هیدایەت داوو پێغەمبەران بوون هەریەکە لەوانیشمان ڕێزدار کرد بەسەر هەموو خەڵکی جیهانی سەدەمی خۆیاندا.

(ابن كثير) دەڵێت: هەرکتێبێك لە ئاسمان بۆپێغەمبەرانی دوای ئیبراهیم دابەزیبێت بۆ نەوەکانی ئیبراهیم (عليه السلام) بوو، ئەوەش سونەتی خوا هاوشێوە بوو پلەیەکی بەرزیش بوو لە خۆ باییبوونو شانازی تیانەبوون، ئیبراهیم دوو کوڕی بوو، ئیبراهیم لە هاجەرو پاشان ئیسحاق لە سارە ئەوەیش یەعقوبی بوو، کە ئیسرائیلە کە هەموو نەوەکانی دەچنەوە سەر ئەو، پێغەمبەرایەتیان تیا بووە، ژمارەیان زۆر بوو، کەس ژمارەیان نازانێت تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بە پێغەمبەرایەتی ناردوونی تایبەت مەندی کردن بە پەیامی پێغەمبەرایەتی، تا بە عیسای کوڕی مەریەم کۆتاییان هات، کە لە (بني ئسرائيل) بوو.

بەڵام لە ئیسماعیل عەرەب پەیدا بوون لەگەڵ جیاوازی قەبیلەو تیرەکاندا، لەنەوەی ئەو تەنها پێغەمبەر (ﷺ) هات، کە لە دنیاو قیامەتدا بۆ نەوەی ئادەم جێگەی فەخرو شانازییە کە (محمدی کوڕی عەبدوڵایە)

٥. له ڕێزو گەورەیی فەزڵی ئیبراهیم، ئەوەیە ڕۆژی قیامەت یەکەم کەسە جل‌و بەرگ لەبەر دەکات.

له (ابن عەباس) (خوای لێ ڕازی بێت) ئەویش له پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (انکم محشورون حفاة عراة عزلا ثم قرأ ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾و اول من یکسی یوم القیامة ابراهیم) [1]

واتە: ئێوە له ڕۆژی قیامەتدا بە پێی پەتی‌و ڕوتی‌و خەتەنە نەکراوی کۆ دەکرێنەوە. پاشان ئایەتی ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ی خوێندەوە وەك چۆن کتێبی کراوە دادەخرێت وە دەپچرێتەوە هەروەك چۆن له سەرەتاوە دروستمان کرد وەك ئەوسای هۆی لێدەکەینەوە بۆ ئەوەی سەرلە نوێ بە شێوەیەکی تر دروستی بکەینەوە) جا ئەوە پەیمان‌و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین، یەکەم کەسیش کە ڕۆژی قیامەت بەرگ دپۆشێت ئیبراهیمە.

(الحافظ) دەڵێت: وتراوە: حیکمەت له تایبەتمەندی ئیبراهیم بەمە لەبەر ئەوە بووە بەڕووتی فڕێ درایە ناو ئاگرەوەو وتراوە لەبەر ئەوە یەکەم کەس بووە شەرواڵی لەبەر کردووە، بەوە پێویست نابێت فەزڵ بدرێت بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) چونکە خاوەن ڕێزو فەزڵ کراو بە شتێك جیا دەکرێتەوە کە تایبەت بێت بە خۆی، ئیتر بەوە ڕێزی ڕەها پێویست نابێت. پاشان وتی: ئیبرهیم (علیه السلام) چەند تایبەت مەندییەکی تری له پێشی هەبووە، یەکەم کەس بووە کە میوانی دەعوەت کردووە سمێڵی کورت کردۆتەوەو سونەتی خەتەنەکردنی جێبەجێ کردووە،پیری بینیوەو شتانی تریش.

٦. هەروەها له فەزڵ‌و ڕێزی بریتی بووە لەوەی کە درۆی نەکردووە تەنها سێ جار نەبێت، دوانیان تایبەت بوون بە زاتی خوا.

[1] بوخاری لة (الانبیاء)مسلم لة (فناء الدنیا وة بیان الحشر یوم القیامة ) ریوایەتیان کردووە.

(ابی هریرة)وە فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لن يكذب ابراهيم علية السلام الا ثلاث كذبات)[1].

واتە: ئیبراهیم علیه السلام تەنها سێ درۆی کردووە.

(الحافظ) دەڵێت: ئیمامی مسلم لە فەرموودەی (ابی زرعة) ئەویش لە ابی (هریرة)وە لە فەرموودەی (الشفاعة) کە فەرمودەیەکی درێژە ریوایەتی کردووە، باسی درۆکانی کردووە، پاشان لە رێگەیەکی ترەوە گێڕاویەتییەوە لە کۆتاییدا فەرمووی: لە قسەکەی ئیبراهیمدا زیادی کرد، دەربارەی (الكوكب) ئەستێرەکە وتی: (هذا ربي) بە بتەکانی وت: (بل فعلهم كبيرهم هذا) دەربارەی خۆیشی وتی: (اني سقيم) کۆتای هات.

پێشەوا (النووي) دەڵێت: زانایانی (فیقە) لەسەر ئەوە رێککەوتوون ئەگەر کابرایەکی ستەمکار بێت داوای کەسێکی شاراوە بکات بیگرێتو بیکوژێت، یان داوای بارمەتەیك بکات بۆ ئینسانێك تا لە تورەیدا بیگرێت، پرسیار دەربارەی بکات، ئەوا هەرکەسێك زانیاری لەسەر ئەوانە هەبێت کە شاراوەن پێویستە بیشارێتەوە ئینکاری بکات ئەگەر زانی، بەڵکو لەمەدا زۆر رێپێدراوەو بەڵکو واجبیشە بۆ ئەوەی ستەم کارەکە دووربخاتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەم جۆرە درۆیانە ئاگاداری داوە، کە ئەمانە لە درۆی رەهای ناپەسەندنین.

٧. یەکێکی تر لە فەزڵو رێزەکانی بریتی بووە لە:ئەوەی کە لە (ئەنەسی کوڕی مالیك) ریوایەتی کردووە: فەرموی: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی باشترین کەس، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ذاك ابراهيم).[2]. واتە: (ئەو باشترە ئیبراهیمە).

[1] بوخاری ریوایەی کردووە لە (الانبیا و)دا

[2] مسلم لە (الفضائیل)دا ریوایەتی کردووە

پێشەوا (النووي) دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بە لێبوردن و ڕێزەوە بۆ ئیبراهیم (علیه السلام) ووت: لەبەر خۆشەویستی و باپیرەکانی، گەر ناو پێغەمبەرمان (ﷺ) بەڕێزترو خاوەن فەزڵ ترە، وەك فەرموویەتی: (انا سید ولد ادم)، مەبەستی فەخرو شانازی نەبووە بەسەر کەسانی پێش خۆیدا بۆ ئەوە وتی کە فەرمانی پێکرابوو روونی بکاتەوەو رایبگەیەنێت، بۆ ئەمەش فەمووی: (ولا فخر) ئەمە فەخرو شانازی نییە، بۆ ئەوەی رەتی هەندێك تێگەیشتنی بێ کەڵك و ناڕاست بکاتەوە وتراوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) وتی ئیبراهیم باشترین کەسە، رەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە هێشتا نەیوانیوە خۆی گەورەی نەوەی ئادەمە.[1]

لە ڕێزو فەزڵی ئیبراهیم، خوای گەورە بەزانست و زانیاری و دڵنیایی و بەڵگەی بەهێز بەرزی کردەوە، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ﴾ واتە: بەو شێوەیە دەسەلاتی تۆکمەو بە هێزمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین، بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لە ریزی دڵنیاکاندا بێت.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاء إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ (الانعام ٨٣)

واتە: ئەو وتو وێژوو لێکۆڵینەوانە بەڵگەو نیشانەی ئێمە بوون، کاتێك بەخشیمانن بە ئیبراهیم لەسەر گەلەکەی زاڵ بوو بەسەریاندا، قسەو بیرو باوەڕی بەسەر قەومەکەیدا سەرکەوت، جا هەر کەسێك بمانەوێت و (خۆیشی شایستە بێت)پلەو پایەی چەندەها بەرز دەکەینەوە، بەراستی پەروەردگاری تۆ داناو کار بە جێیە، بە هەموو شتێك زانایە.

[1] (شرح النووي علی صحیح مسلم).

لە شەوق و زەوقی حەزکردنی بۆ گەیشتن بە ئامانجی زانست و کۆتاییەکەی داوای کرد لە پەروەردگاری و وتی: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِـي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقره ٢٦٠)

واتە: بە یاد بهێنە، کاتێك ئیبراهیم وتی: پەروەردگارا نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ خوا فەرمووی ئایا باوەڕت نەهێناوە؟ ئیبراهیم وتی: بەڵێ (باوەڕم هەیە) بەڵام حەز دەکەم (بەچاوی خۆم ببینم) تا دڵم ئارام بگرێت، خوا فەرمووی: کەواتە چوار باڵندە بهێنەو جوان سەرنجیان بدەو دوایی هەر چواریان سەر بڕەو گۆشت و پەڕو خوێنیان تێکەڵ بکە ئەوسا لەسەر لوتکەی هەر شاخێك هەندێك لەو تێکەڵەیە دابنێ، پاشان بانگیان بکە بە خێرایی و بە پەلە هەموویان دێنەو بۆ لات و چاك بزانەو دڵنیابە، بە ڕاستی خوا بالا دەست و کار بە جێیە.

٨. هەروەها لە ڕێزو فەزڵەکانی خوای گەورە لە سەرمانی واجب کردووە شوێن ئاین و دەستوری ئیبراهیم بکەوین و لە ڕێگاکەیەوە بڕۆین:

(زانا عبدالرحمن بن ناصر السعيدى) دەفەرموێت: بۆ ئەوەی بزانین هەموو ئەوەی کە خوای گەورە بۆی گێڕاوینەتەوە لە ژیان و بەسەرهاتی ئیبراهیم (عليه السلام) ئەوا ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە پابەندبین بە هەموویەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ﴾ واتە پابەند بن پێوەی. ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾ (النحل ١٢٣)

واتە: دوای چەندەها سەدە وەحیمان بۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ) نارد کە شوێن ئیان و بەرنامەی ئیبراهم بکەویت.

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ﴾ واتە: ئەی ئیمانداران بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو.

بەڵام ئەم قسەیەی بۆ باوکی بێ باوەڕی (لا تستغفرن) جیا کراوەتەوە. نا بێت پابەندبن پێوەی لەم حاڵەتەدا بە داوای لێخۆش بوون بۆ هاوەڵدانەران. داوای لێخۆش بوونی خۆی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێك بوو دابووی بە باوکی کاتیك بۆی دەرکەوت ئەوە دووژمنی خوایە ئیتر تەبەڕای لێکردو خۆی بەدوور گرت.

٩. لە فەزڵو ڕێزەکانی ئەوەبوو کە خوای گەورە خۆیو ئیسماعیلی کوڕی هەڵبژارد بۆ دروست کردنی (بیت العقیق) خوای گەورەش وەڵامەکەی دایەوەو لە ئوممەتی پێغەمەبەری خوایشدا داواکەی جێ بەجێ بوو:

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (البقره ١٢٧)

واتە: بە یاد بهێنن ئەوکاتەی ئیبراهیم پایەکانی لە کەعبە بەرز کردەوە لەگەڵ ئیسماعیلداو (دەیانوت): پەروەردگارا ئەم کارەمان لێ وەربگرەو لە ریزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەراستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەرو زانایت.لە پێغەمبەری خۆمانەوە هەواڵێکی راست نەهاتووە، کە (بیت) پیش ئیبراهیم (علیه السلام) دروست کرابێت، ئەوەی پەنا بۆ ئایەتی (مكان البيت) بەرێت، ئەوە بێ خەبەرو نادیارە چونکە مەبەستی شوێنەکە لە زانستی خودا بڕیار دراوە دیاری کراوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ (ال عمران٩٦).

واتە: بەڕاستی یەکەم خانەو ماڵو مەنزڵگایەك کە ۆ خەڵکی سەر زەوی دانرا (بۆ خوا پەرستی) ئەوەیە لە مەککەدایە، کە پیرۆزەو هیدایەتو ڕێنموونی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان، ووتراوە: شوێنی کەعبە (فيه ايات بينات) واتە: لەبەر ئەوەی دروست کراوی ئیبراهیمی باوکی پێغەمبەرانە لە دوای خۆی، پێشەوای چاکانو پاکانە لە نەوەکانی، ئەوانەی پەیڕەوی دەکەنو دەست بە سونەتەکانییەوە دەگرن، بۆ ئەمەش فەمووی: (مقام ابراهيم) واتە: ئەو بەردەی لە سەری دەوەستا بۆ ئەوەی بیناکە بەرز بکاتەوە، کوڕەکەی ئەو بەردە بەناوبانگەی بۆ دانا بۆ ئەوەی بچێتە سەری تا بیناکە بەرزی بکاتەوە، مەبەست لەوەی کە ئیبراهیم بەڕێزین مزگەوتی لە بەڕێزترین پارچە زەوی لە شیوێکی بێ سەوزاییو کشتوکاڵاو دروست کردن دووعای بەرەکەتی بۆ کەسو کارەکەی کرد کە خوای گەورە رزقو بەروبومیان بداتێ لەگەڵ کەمێك ئاوروەكو کشتوکاڵو بەرووبومدا، بیکاتە شوێنیکی گرنگو پیرۆزو موبارەكو بیکاتە شوێنێکی ئارامو پارێزراو، خوای گەورە وەڵامی دووعاکەی دایەوە سوپاس بۆ خوا، ئەوەی کە ویستی خوای گەورە پێی دا، خوای گەورە

فەرمووی: ﴿أَرْضِنَا أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِن لَّدُنَّا﴾ (القصص ٥٧).

واتە: مەگەر ئێمە شوێنێکی دوور لە ستەم‌و پڕلە ئاسایشمان بۆ فەراهەم نەهێناون کە جۆرەها بەروبومی بۆ دێت‌و لە هەمو نازو نیعمەتێك بەهرە وەرە). و داوای کرد لە خوای گەورە کە پێغەمبەرێکیان لە رەگەزی خۆی بۆ بنێرێت‌و بە زمانی خۆیان قسە بکات، بۆ ئەوەی هەردوو نازو نیعمەتی دین‌و دونیا بە بەختەوەری دنیاو قیامەت لەسەر تەواو بکات، بۆ ئەمەش خوای گەورە وەڵامی دایەوە ، وە پێغەمبەرێکی بۆ ناردن، بەڵام چ پێغەمبەرێك، کۆتای هەموو پێغەمبەرانی پێ هێناو دینی پێ تەواو کرد کە بە کەسانی پێش خۆی نەدابوو.

## ﴿ ئیبراهیم (علیه السلام) بانگەوازی باوکی دەکات﴾

ئیبراهیم (علیه السلام) سەرەتا بانگەوازەکەی لە باوکییەوە دەست پێکرد، چونکە نزیکترین کەسی بوو لێیەوە، پێشترین کەسیش بوو خەیری پێ بگەیەنێت، هەر ئەم کارە پێغەمبەری خۆشمان کردی (ﷺ)، ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ (الشعراء٢١٤).

واتە: خزمە نزیکەکانی خۆت ئاگاردار بکەرەوە، لە بانگەوازەکەیدا رەچاوی ئەدەبی جوانی کرد بۆ ئامۆژگاری کردنی ئەدەبی جوانی لەگەڵ گەورەکاندا بەکار هێنا، بەڵگەی بە هێزی بە کار هێنا، بە ئارام‌و خۆ ڕاگر بوو لەسەر هەموو ئازارێك کە توشی بهاتایە لە رێگای گەیاندنی بانگەوازەکەیدا، با بانگوازان بەوە دڵخۆش بن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا (٤١) إِذْ قَالَ لأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لا يَسْمَعُ وَلا يُبْصِرُ وَلا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا﴾ (مريم ٤١ –٤٢).

واتە: لە قورئاندا باسی (گۆشەیەك لە بەسەرهاتی) ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، بەڕاستی ئەو کەسایەتییەکی راستگۆبوو،لە پێغەمبەرانیش بوو، کا تێك بە باوکی وت: باوکی بەڕێزم ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستی نە گوێ بیستەو نەك کەس بەرچاو روون‌و رۆشنبیر دەکات نە هیچ سودێکت پێ دەگەیەنێت.

زانا (ابو السعود) دەڵێت: ئیراهیم علیه السلام له بانگەوازەکەیدا جوانترین بەرنامەو وبەهێز ترین رێگای بەکار هێنا جوانترین بەڵگەی به ئەدەبی جوانەوه بەکار هێنا.

کاتێك پەرستراو نه بیستێتوو نه بینێتو بەرچاو روون نەبێتو هیچ سودێکی نەبێت بۆ ئەو کەسەی دەیپەرستێت، ئیتر چ کەڵکێك له پەرستنیدا هەیە؟ ئەوە نا تەواو بێ دەستەلاتترە لەو کەسەی که دەیپەرستیت، ئەوەش بەهێزترین بەڵگەیه لەسەر بەتاڵ کردنەوەی ئەو پەرستنشه، ئینجا که پەرستنشو هەوڵەکەی به ژایه چوو، وەك ئەوەیه بڵێت: کەواته رێگاکه چۆن دەبێت؟

زانا (محمد متولي شعراوي) دەڵێت: ئیبراهیم (علیه السلام) کاتێك به باوکی فەرمووو: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا (٤٢) يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾ (مريم ٤٢ – ٤٣)

ئەم وتەیەی بۆ ئەوە نەوت که باسی خۆی بکات راستگۆیە، بەڵکو وەك پێغەمبەرێکی خاوەن پەیام فەرمووی، بۆ ئەوە هاتووە هەڵسوکەوتی خەڵکی راست بکاتەوە، بەو (وحی)یەی له لایەن خواوە بۆی هاتووە، ناڕاستەیان بکات.

وشەی (لابيه) که له قورئاندا هاتووە، خوای گەورە له قورئاندا (اسم علم) ناوێکی ناسراوی دیاریکراوی بۆ باوکی ئیبراهیم باس نەکردووە، لێرەدا (الاب) بۆ باسکردنە (وصف) بەڵام ناوەکەی نازانین، ئەگەر گەشتێك به ناو دەقەکانی قورئاندا بکەین که به دوو دەق (نەص) هاتووە، دقێکیان راستەوخۆ باوکەکان دەگرێتەوە بۆمان باس دەکات، (کوڕی باوکی باپیری باپیری باوکی) بەڵام ئایەتێکی تر جیاواز لەمە باس دەکات، (مام)ی هێناوەو ناوی باوکی داوە بەسەردا، وەك له سورەتی (یوسف)دا هاتووە: سوسف علیه السلام به دوو هاوڕێکەی ناو زیندان دەڵێت: ﴿رَبِّي إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُم بِالآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٣٧) وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَآئِـي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ﴾ (یوسف) ٤٢– ٤٣.

وشەی (ابائي) کۆی (اب)ە، (الاباء) بریتییه له: (ئیبراهیم پاشان ئیسحاقی کوڕی پاشان یەعقوبی کوڕی ئیسحاق) به دوای یەکیشدا راستەوخۆ هێناونی.

له ئایەتێکی تراد دەفەرموێت: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاء إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَـهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (البقره ١٣٣).

ئیبراهیم باپیری یەعقوب بوو، ئیسحاقیش باوکی یەعقوب بوو، ئەی ئیسماعیل لەم بەینەدا چی دەردەچێت؟ مامی یەعقوب بوو، کەواتە مامیش بە (اب) ناوی هاتووە. کەواتە قورئان مامی بە باوك لێك داوەتەوە، ئەگەر خوای گەورە لە هەموو ئایەتەکاندا بۆ ئیبراهیم وشەی (لابیە) بفەرموایە، ئەو کاتە کارە کە وادەبوو، کە دەبوونە باوکی راستەقینەی بەڵام تەنها یەکجار ناوی (ازر)ی هێناوە، دوای باوك کەس بە ناوی ناسراو نایەت، مەگەر تەنها مەبەستی مامی بوبێت.

ئینجا ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی: ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾ (مريم ٤٣).

واتە ئەی باوکە بەڕێزم، بەراستی ئەو زانستو زانیارییەی کە بۆ من هاتووە دەربارەی دەسەڵاتو توانای بە دیهێنەری ئەم جیهانە. بێگومان بۆ تۆ نەهاتووە، کەواتە پەیڕەوی من بکە ڕێنمونیت دەکەم بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی راستو دروست،

زانا (الزمخشري) دەڵێت: زۆر بە نەرمو نیانی بانگەوازی کرد، نەزانی نەدایە پاڵ باوکی ناوی بە نەزان نەهێنا، هەموو زانستێکیی نەدایە پاڵ خۆی، بەڵکو فەرمووی: من ئەندازەیەك زانستم لایە هەندێك لەوە لای تۆ نییە، ئەوەش زانستی بەڵگە دارە لەسەر ڕێگەی راست، خۆت بە گەورە مەگرە، منو تۆ بەرەو کاروانێك دەچین،بەڵام من لەسەر ڕێنمونیمو تۆ لەسەری نیت، کەواتە شوێنم کەوە رزگارت دەکەم لە گومرایی.

پاشان فەرمووی:﴿يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيًّا﴾ (مريم ٤٤).

واتە ئەی باوکی ئازیزم شەیتان مەپەرستە چونکە بەراستی شەیتان یاخییە لە خواو سەرکەشی کردووە.

پاشان فەرمووی:﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ الرَّحْمَن فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾.

زانا (االزمخشري) دەڵێت: لە چوارەم جاردا بە خراپی چارەنوسی ترساندی ئەوەی لەوڕوو دەدات لە شوێن کەوتنو چارەنوسی خراپە، سودی لە ئەدەبی جوان وەرنەگرت، بە جۆرێك کە دانی نەنا بەوەدا کە سزای پێ دەگات، بێگومان سزاکەی پێ دەگات، ئیبراهیم پێی فەرمووی: من دەترسم سزایەکی بەئازارت پێ بگات، ئیبراهیم لە هەموو ئامۆژگارییەکانیدا ووشەی (يَا أَبَتِ) بۆ باوکی بەکار هێناوە.

باوکی وتی: ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْراهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا

(٤٦) قَالَ سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾ (مريم ٦- ٤٧).

زانا (الشنقيطي) دەڵێت: خوای گەورە لەم دوو ئایەتەدا روونی کردەوە کاتێك ئیبراهیم ئامۆژگارییەکانی بە نەرمی بۆ باوکی راگەیاند هەق‌و راستی بۆ روون کردەوە لە پەرستنی شتی بێ کەڵك ئاگاداری کردەوە، لە سزای خوا ئاگاداری کردو پێی وت: پەرستنی شەیتان خراپە، بەڵام باوکی بە شێوەیەکی توندو رەق لەگەڵی دوواو بە ناوی خۆی بانگی کرد نەیوت (یا بنی) واتە کورشی خۆم، لە کاتێکدا ئیبراهیم ووتی (يَا أَبَتِ) ئینکاری پەرستنی بتەکانی کرد، ووتی: من نامەوێت، تەنها خوای بەرزو باڵا دەوێت، باوکی هەڕەشەی لێکرد ئەگەر واوز لەو قسانە نەهێنێت کە ئەیڵێت، ئەوا بەرد بارانی دەکات، یان جنێوو قسەی سوکی پێ دەڵێت، بەڵام بەرد باران کردنەکە راست‌و دیار ترە، پاشان پێی‌وت لای ئەو کۆچ بکات واتە بۆ ماوەیەکی درێژ دوور بکەوێتەوە، پاشان ئیبراهیم دوای ئەو توندو تیژییەی باوکی بە جوانترین‌و نەرم ترین وشە وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي﴾ .

(ابن كثير) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (سلام عليك) واتە ئیبراهیم وتی: باوکە لە منەوە نارەحەتی‌و ئازارت پێ ناگات، لە لایەنی منەوە سەلامەت‌و بێ وەییت، چاکەیەکیشی بۆ زیاد کردوو وتی: ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾

(ان عباس)و کەسانی تریش دەڵێن: زۆر نەرم‌و نیان‌و بە سۆز بوو، ئیبراهیم داوای لێخۆش بوونی بۆ باوکی کرد، وەك بەڵێنی پێ دابوو، کا تێك بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە تەبەڕای لێ کردوو خۆی لێ بە دوور گرت.

پێغەمبەر (ﷺ) دە فەرموێت: (يَلقى ابراهيم اباه يوم القيامة على وجه اذر غبرة و قترة، فيقول له ابراهيم: يا ابتِ الم اقل لك لا تعصني؟ فيقول له ابوه: اليومَ لا اعصاكَ يا ابراهيم، يقولُ ابراهيم: يا ربي وعدتني انكَ لا تخزني يومَ يبعثون، وهل الخي اشد من ان اخذي في ابي؟ فيقول الله تبارك و تعالى، يا ابراهيم اني حرمت الجنة على الكافرين)[1]

واتە: لە رۆژی قیامەتدا ئیبراهیم (علیه السلام) دەگات بە ئازەری باوکی‌و

[1] بخاري ریوایەتی کردووە

دەیبینێت دەموو چاوی رەش هەڵگەڕاوەو تەپ و تۆزی لێ نیشتووە، ئیبراهیم پێی دەڵێت، ئەی باوکە پێم نەوتیت سەرپێچیم مەکە؟ باوکی پێی دەڵێت:ئەمڕۆ سەرپێچیت ناکەم ئەی ئیبراهیم، ئیراهیم دەڵێت: ئەی پەروەردگار تۆ بەڵێنت پێ دام رۆژی زیندوو کردنەوە سەرشۆڕم نەکەیت، ئایا لەوە قورسترو ناڕەحەت تر هەیە کە لە باوکمدا سەرشۆڕم بکەیت؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئیبراهیم من بەهەشتم لەسەر بێ باوەڕان حەرام کردووە. لە فەرموودەیەکی تردا کە هەر بوخاری لە (الانبیاء)دا ریوایەتی کردووە لە بەشێکی فەرموودەکەدا هاتووە (هو بذيخ متلطخ فيؤخذ بقوائمه فيلقى في النار) واتە: باوکی ئیبراهیم شێوەی گۆڕاوە بۆ نێرەی کەمتیار لە ناو خوێن و خۆڵدا تلاوەتەوەو رەنگی گرتووە، دەربارەی ئەو وتراوە حیکمەت لەم شێوە گۆڕینەدا بۆ کەمتیار، چونکە کەمتیار لە بێ مێشك ترین ئاژەڵەکانە، ئازەریش لە بێمێشکترین مرۆڤەکان بوو، چونکە دوای ئەوەی کوڕەکەی بەڵگە روونەکانی بۆ دەرخست ئەو لەسەر بێ باوەڕی سور بوو هەتا مرد، ئیبراهیم باڵی سۆزو میهرەبانی و ملکەچی بۆ راخست، بەڵام ئەو خۆی بە گەورە زانی و لەسەر بێباوەڕەی سور بوو، لەبەر ئەوە لە رۆژی قیامەت بەزەلیلی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

ئیبراهیم (علیه السلام) نەیتوانی شەفاعەت بۆ باوکی بکات هەروەها پێغەمبەری خۆشمان نەیوانی شەفاعەت بۆ مامی بکات.

### سودو وانە ئیمانییەکانی چیرۆکەکە

١. سەرەتای بانگەواز لە کەسە نزیکەکانەوە دەست پێ دەکات:

٢. سۆزو نەرمی نواندن لە بانگەوازداو راخستنی باڵی رەحمەت، بە تایبەت لەگەڵ گەورەکاندا کە پلەو پایەیان هەیەو بە تەمەنن.

٣. هەڵگرتی ئازارو نارەحەتی کەسە نزیکەکان کە ناتوانرێت هی کەسانی تر بەو شێوەیە هەڵبگیرێت، چونکە هەقی زیاتر یان هەیەو سۆزو شەفەقەتی زیاتریان دەوێت، هەوڵی رزگار بونیان بدرێت لەو ناڕەحەتییەکەی کە تێی کەوتوون.

٤. بەرامبەر خراپە چاکە بکرێت کە هۆکارێکی چاکە بانگخواز خۆی پێ پڕ چەك بکات، تەنها وشەی جوان و رێك وپێك بەکار بهێنێت. وەك ئیبراهیم (علیه السلام) وتی: ( سلام علیك)و چاکەی کرد کە وتی (ساستغفر لك ربي).

٥. رۆژی قیامەت ئیبراهیم سود بە باوکی ناگەیەنێت و ناتوانێت رزگاری بکات لە ئاگر، پێویستە هەموو بەندەیەك نەفسی خۆی لە خوا بکڕێتەوەو لە کردەوە چاکەکان بکات کە دەبنە هۆکار بۆ چوونە بەهەشتی ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ (المؤمنون١٠١).

واتە: کاتێك فوکرا بە بوقداو قیامەت بەپابوو نەسەب و خزمایەتی لە نێوانیاندا نامێنێت و پرسیاریان لیٚ ناکرێت.

﴿ئیبراهیم (علیه السلام) بانگەوازی قەومەکەی دەکات، تا دەست لە ت پەرستی هەڵبگرن﴾

بێگومان بەڵگەکانی ئیبراهیم (علیه السلام) بە هێزترین بەڵگە بوون لە بەراورد کردن لەگەڵ پێغەمبەراندا،خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ﴾ (الانعام ٨٣)

واتە:ئەو وتو وێژوو لێکۆڵینەوانە کە لە ئایەتەکانی پێشتردا هات، بەڵگەو نیشانەی ئێمە بوون، کاتێك بەخشیمان بە ئیبراهیم لەسەر گەلەکەیی و زاڵ بوو بەسەریاندا، جا هەرکەسێك بمانەوێت (خۆیشی شایستە بێت) چەندەها جار پلەو پایەی بەرز دەکەینەوە.

هەروەها خاوەنی دڵێکی ساغ و تەندروست بوو، وەك خوا گەورە فەرمووی: ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ (٨٣) إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ (الصافات ٨٣- ٨٤)

واتە: بێگوامن ئیبراهیم لە شوێن کەوتەو پەیڕەوانی (نوح)ە، کاتێك رووی کردە پەروەردگاری بە پیر بانگەوازییەوە چوو بە دڵێکی پڕ لە ئیمان و یەك خوا ناسیەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ (٦٩) إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ (٧٠) قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ (٧١) قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ (٧٢) أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ (٧٣) قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ (٧٤) قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ (٧٥) أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ (٧٦) فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ (٧٧) الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ (٧٨) وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ (٨١) وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ (٨٢) رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ (الشعراء ٦٩- ٨٣)

(الزمخشري) دەڵێت: ئیبراهیم (علیه السلام) دەیزانی گەلەکەی بت پەرستن، بۆ ئەوە پیشانیان بدات ئەو شتەی دەیپەرستن شیاوی پەرستن نییە. کا تێك ئەوان وەڵامی ئیبراهیمیان دایەوە کە چاولێکەری باوك و باپیرانیان دەکەن،

ئیبراهم (علیه السلام) پێی ووتن: ئێوە ئەم فەرمانی چاو لێکەرییە بشکێنن چونکە ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر راستی چونکە بیّ ماناو بیّ نرخەکان مافی پێشخستنیان نابێت بەسەر هەق‌و راستیدا، پەرستنی ئەم بتانەش دوژمنایەتییە لەگەڵ خوا، مانای دوژمنایەتیش لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت: ﴿كَلاَّ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ (مریم ٨٢).

واتە نەخێر وانییە،، ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن (لە رۆژی قایامەتدا) باوەڕیان بە پەرستنی ئەوان نییە، نارەزایی دەردەبڕن بەڵکو بەسەختی دژایەتییان دەکەن، بەرپەرچیان دەدەنەوە، چونکە ئەو کەسەی لە پەرستشەکانیاندا سەری لێشیواندوون گەورەترین دووژمنە، بۆ ئینسان کە شەیتانە، بەڵکو ووتی: (عدوّلي) وێنەکێشانی مەسەلەکە بوولە نەفسی خۆیدا بەو مانایەی کە من بیرم کردەوە بینیم پەرستشم بۆ شەیتان ئەوە بۆ دووژمنە خۆم لیّ پاراست‌و پەرستشێکم هەڵبژارد کە لە هەموویان خەیرترو چاکترە، مەبەستیشم بەوە بۆ ئەوە بووە کە یەکەم جار ئامۆژگاری خۆمم کرد، بەوە ریّ‌و شوێنی کارەکەی دانا تا ئەوان تەماشا بکەن‌و بڵێن: ئیبراهیم بەوە ئامۆژگاری کردین کە نەفسی خۆی پیّ ئامۆژگاری کرد، ئەوەی بۆ ئێمە ویست بۆ رۆحی خۆی ویستی، تا لای ئەوان خوازراوبێت‌و گویّ لە قسەکانی بگرن، ئەگەر بیوتایە (فأنه عدوّ لكم) ئەو شوێنەی نەدەگرت کە مەبەست بوو لەبەر ئەوە دەچوویە بواری دەرخستنەوە، چونکە هەندیك جار ئەم دەرخستنە دەگات بە کەسی ئامۆژگاری کراو کە دانپیانان نایگەیەنێت چونکە بیری لێدەکاتەوەو را دەمێنێت کە رەنگە بتوانێت وەری بگرێت.

﴿سودو وانە ئیمانییەکانی چیرۆکەکە﴾

١. چاولێکەری گەورەترین بەربەست‌و گرفتەکانە کە رو بەڕوو بانگخوازانی خوا دەبێتەوە.

(الزمخشري) دەڵێت: بەراستی چاو لێکەری زۆر بێزارو نا پەسەندە، لەگەڵ قسەی وەرگێراو بە بیّ بەڵگە، فێڵی شەیتانیش بۆ چاولکەران زۆر گەورەیە کا تێك دەیانبات چاو لە باوك‌و باپیرانیان بکەن لە پەرستنی بت‌و داتاشراوەکاندا پەیکەریان بۆ دروست بکەن ئەوان باوەڕیان وایە لەسەر شتیك بن‌و زۆر جدین لەسەر خستی پەیرەو مەزهەبەکەی خۆیان، بە ناهەقی خۆیان

مناقەشەی حەقی خاوەن حەقەکان دەکەن، چاو لێکەران ئەو هەڕەشەیان بەسە کە بت پەرستی لە پیشەی ئەوان بێت.

٢. لە ئایەتی: (فأنهم عدوّ لي) تەبەڕا کردن‌و خۆ بە دوور گرتن لە بتەکان‌و ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژیان‌و ئیبراهیم لەم دژایەتی کردنەدا ڕۆ چوو لە بتەکان‌و هاوەڵدانەراندا ووتی: (وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَى أَلاَّ أَكُونَ بِدُعَاء رَبِّي شَقِيًّا) (مريم) ٤٨.

واتە: وا من دوور دەکەومەوەو کە نارگیر دەکەم لە ئێوەو لەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نا ئومێدو ڕەنجەڕۆم نەکات دووعاو نزاو پەرستنم لێ وەرگرێت.

## ﴿چاو پێکەوتن‌و گفتوگۆی ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ قەومەکەیدا لە کاتی پەرستنی ئەستێرەکاندا﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ (٧٥) فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَـذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ (٧٦) فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـذَا رَبِّي هَـذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (الانعام ٧٥- ٧٩).

(ابن كثير) دەڵێت: ئەمە مەقامی چاو پێکەوتنی بوو لەگەڵ قەومەکەیدا بۆی روون کردەوە کە ئەو کۆمەڵە ئەستێرە رووناکەی بینیویانە بە کەڵکی خوایەتی نایەت ناشێت لەگەڵ خواد بپەرسترێن، چونکە دروست کراوو ژێر بار خراون، جارێك هەڵدێن‌و جارێك ئاوا دەبن، لەم جیهانە خۆیان وون دەکەن پەروەردگاریش هیچی لێ ون نابێت‌و ناشاردرێتەوە، بەڵکو ئەو هەمیشە باقییەو ون نابێت، تەنها خۆی شیاوی پەرستنە تەنها خۆی پەروەردگارە.

ئاشکرایە ئامۆژگاری ئیبراهیم دەربارەی ئەم ئەستێرانە بۆ خەڵکی گران بوو، ئەوان ئەستێرەکانیان دەپەرست، وشەی (ملکوت) لە ئایەتەکەدا گەورەیی موڵك‌و دەسەڵاتی خوای گەورە نیشان دەدات، خوای گەورە سەرنجی ئیبراهیمی

راکێشا تا سەیری گەورەیی دەسەڵاتی بکات ئەستێرەو گەلە ئەستێرەکانی بینی فراوانی گەردوون کەوتە بەر چاوەکانی ئیبراهیم.

پرسیار: ئایا ئیبراهیم بێجگە لە خوا هیچی پەرست؟

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾ (الانعام ٧٦).

ئایا ئیبراهیم زۆر لە گوماندابوو؟ سەرەتا بە دۆخی (شك) گوماندا تێپەڕی تا گەیشت بە هیدایەتی خوای گەورە، سەرەتا وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە ئەستێرەی پەرست پاشان مانگ پاشان خۆر: وەك فەرمووی: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ﴾ کاتێك ئاوابوو وتی: ﴿قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾ من حەز ناکەم شتێك بپەرستم کە دیار نامێنێت.پاشان خوای گەورە فەرمووی:﴿ فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـٰذَا رَبِّي هَـٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾(الانعام ٧٧- ٧٩).

کا تێك ئیبراهیم کۆچی کرد بۆ شام شارێکی بینی ناوی (حران) بوو، خەڵکەکەی ئەستێرەیان دەپەرست ئیبراهیم قەت سوجدەی بۆ بت نە بردووە تەنها خوای گەورەی پەرستووە، کەواتە بۆچی ووتی: (هذا ربي)، ئیبرایم ویستی پلە بە پلە بانگیان بکات، ئیبراهیم رێگای ئینسانیکی پێ گەیشتووی ژیری خاوەن فیکری گرتە بەر، بە ئاستی تێگەیشتنی خۆیان قسەی لەگەڵدا دەکردن کە بتەکان دەشکێنن دەچێت تەورەکە دەخاتە سەر شانی بتە گەورەکەو پێیان دەڵێت: گەورەکەیان ئەم بتانەی شکاندووە ئادەی پرسیاری لێ بکەن بزانن وەڵام دەداتەوە، ئەم جارە قەومەکە کارێکی زۆر غەریب دەکەن، بە درێژایی رۆژ ناچن بەلای پەرستشدا بەڵکو بە شەو پەرستش دەکەن، هەریەکەیان ئەستێرەیەك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت و دەڵێت: ئیتر من ئەم ئەستێرەیە دەپەرستم ئیبراهیم لەو شارە خەڵکی بەم جۆرە بینی دوو کەسی دەبینی یەکێکان دەیوت ئەمە خوای منەو ئەوی تر دەیوت بێگومان ئەوە خوای منە، ئیبراهم (علیه السلام) بە درێژایی شەو لەگەڵیان دەمایەوە پێی دەوتن ئەی خەڵکینە ئەم

کارەی ئێوە بێ سودە دەبێت خوایەك هەبێت ئەم شتانە هەڵبهێنێتو ئاوا بکات، دەیویست ئاستی بیرکردنەوەیان بەرز بکاتەوە، بۆ سبەینێ کە رۆژ بوویەوە ﴿فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً﴾ پێی وتن بۆچی هەر شەو؟ بە رۆژیش دەگونجێت بۆچی ئێوە هەر بە تەنها لە شەودا پەرستش دەکەن دەگونجێت کە خوا لە رۆژیشدا هەبێت، دەیویست لەو تێگەیشتنو هەڵە خراپە دەربازیان بکات، وەرن با ئەمجارە خۆر بپەرستین: ﴿فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً﴾ روناکی خۆر ئاسمان پڕ دەکاتو زۆر گەرمە، ئەمەیان بە هێز ترە، دا بنیشن بیپەرستن ﴿هَـٰذَا رَبِّي هَـٰذَآ أَكْبَرُ﴾ بەو تیگەیشتنەی کە ئەوان دەیان ووت کەواتە ئێمە شتێکی گەورە دەپەرستین ﴿فَلَمَّا أَفَلَتْ﴾ کە بینیان ئەو خۆرە بە هێزو گەرمو رووناکە ئاوا دەبێتو دیار نامێنێتو لاواز دەبێت ئینجا ئیبراهیم (علیه السلام) ووتی: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ ئیبراهیم (علیه السلام) شێوازێکی جوانی هەڵبژارد شوێنی بکەوێت هەموو ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن بێ کەڵکن، بە هەموو هێزێك ئاراستەی کردن بۆ ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾(الانعام ٧٩)

واتە: من رووم کردە ئەو کەسەی کە زەویی و ئاسمانەکانی لە نەبوونەوە بە دیهێناوە کە کەسێکە دوورە لە هاوەڵو شەریكو ئیتر چۆن ئەستێرە بپەرسترێت؟

### ﴿ سودو وانە ئیمانییەکانی چیرۆکەکە ﴾

ئیبراهیم (علیه السلام) بە ئەستێرەکانی نەوت ﴿هَـٰذَا رَبِّي﴾ لە کاتێکدا کە لە گوماندا بێت یان هاوەڵدانەر بێت، چونکە خوای گەورە بە ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ بە تەواوی نەفی ئەو کارەی ئیبراهیمی کرد،

زانا (الشنقیطي) دەڵێت: نەفی کردنی بونەوەر رابردوو هەموو کاتی رابردو دەگرێتەوە، ئەوە جێگیر بوو کە ئیبراهیم (علیه السلام) هەنگاوی بۆ بت پەرستن نەناوە.

### ﴿ چاو پێکەوتنو گفتوگۆ لەگەڵ ئەو پاشایەی کە بانگەشەی خوایەتی دەکرد ﴾

 

خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِـي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِـي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (البقره ٢٨٥).

واتە: ئایا نەتبیستووەو نەت ڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمە قاڵەی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا (علیه السلام) لە بارەی پەروەردگارییەوە ، لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێ بەخشیبوو، (لە جیاتی وەرهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمەدەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)، ئەم لوت بەرزییەش کاتێك بو، بە هەواو فیزەوە پرسیویەتی لە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەرداری من ئەو زاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بە دەستە، (نەمرود لە وەڵامیدا) ووی: جا منیش ژین دەبەخشم و مردنم بە دەستە، ئینجا فەرمانی دا هەندێك لە نەیارانی بکوژن گوایە ئەو دەیانمرێنێت، هەندێکی نەکوشت گوایە ئەو ژیانی پێ بەخشین، ئینجا ئیبراهیم وتی: بەڕاستی خوا خۆر لە رۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا ئەگەر تۆ دەتوانیت لە رۆژ ئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێ باوەڕە رەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما بێگومان خوا هیدایەتی قەمی ستەمکاران نادا.

ئەو پاشایانەی حوکمی جیهانیان کردووە چوار بوون، دوانیان موسوڵمان بوون و دوانیان کافربوون، ئەمە قسەی پێش ئەم سەردەمەیە (نەمرود، بختنصر) کافربوون، کە ئیبراهیم (علیه السلام ) روو بەڕووی (نەمروود) بوویەوە، دوو موسوڵمانەکەش (سولەیمان و ذوالقرنین) بوون، ئەو سەردەمەی ئیبراهیمیش تیا پێگەیشت سەردەمێکی قورس و ناڕەحەت بوو، نەمروود حوکمی دەکرد، بەڵام خوای گەورە لە قورئاندا ناوی ئەو پاشایەی نەهێنا بەڵام ناوی ئیبراهیمی هێنا، چونکە ناوی ئەو شیاوی باسکردن نەبوو ئەم پاشایە بەو دەسەڵاتە کەمەی کە هەیبوو توشی لە خۆ بای بوون هاتبوو، دەبێت ئەو نهێنییە چی بێت وای لەم پیاوە دەکر بڵێت من خوام؟ بێگومان لە خۆ بایی بوو، کاتێك سەیری شێوازی گفتۆگۆکە دەکەین بۆمان دەردکەوێت کە کارەکە لە خۆ بایی بوون تێپەڕی کردووە بۆ بێ مێشکی، بەو جۆەی کە

دوو کەس لە زینداندا حوکمی لە سێدارەدانیان دەرچووبێت ئەو یەکێکی تریان ڕزگار بکات‌و یەکێکی تریان بکوژێت، بەڵام کاتێك ئیبراهیم داوای لێکرد خۆر لە خۆر ئاواوە بهێنێت کابرا دەمکوت بوو.

پرسیار: بۆچی دەمکوت بوو؟ ئایا نەدەبوو بیزانیایە کە خۆر هەموو ڕۆژێك لە خۆر هەڵاتەوە دێت، کەواتە چی وایلێکرد دەمکوت بوو؟ ئەمە بە نیسبەت ئێمەوە کارێکی ئاساییە،چونکە دەزانین هەمووکاتیك شەوو ڕۆژ بە داوی یەکدا دێن.

﴿ سودو وانە ئیمانیەوکانی چیرۆکەکە ﴾

١. لە سودو گرینگیەکانی تاقیکردنەوە (الابتلاء) لە خۆبایی بوون و خۆ بەگەورە زانین لا دەبات، ئەگەر ئەم پاشایەی لە گەڵ ئیبراهیمدا دەمە قاڵەی کرد کەسێکی فەقیرو هەژارو نەخۆش بوایە و گوێچکەو چاوی نەبوایە، دەمە قاڵەی لەگەڵ ئیبراهیمدا نەدەکرد دەربارەی پەروەردگاری. بەڵکو دەمەقاڵەی کرد دەربارەی پەروەردگاری چونکە خوای گەورە پاشایەتی و دەسەڵات و دەوڵەمەندی پێ بەخشی بوو. ﴿أنْ آتاهُ اللهُ المُلْكَ﴾.

٢. لە چیرۆکەکەدا سەرکەوتنی بۆ خۆشەویستانی خوا تیایە، بەڵگەی بە ئیلهام پێی بەخشی بۆ دەمکوت کردنی دوژمنەکانی.

﴿ لە هەڵوێستە ئیمانیەکان ﴾

١- چیرۆکی شکاندنی بتەکان و فڕێدانی ئیبراهیم بۆ ناو ئاگر:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ۝ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ۝ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ۝ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ۝ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ۝ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۝ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ۝ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ۝ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ

﴿قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠ قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ
يَشْهَدُونَ ۝٦١ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۝٦٢ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا
فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ۝٦٣ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٦٤
ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ۝٦٥ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ۝٦٦ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا
تَعْقِلُونَ ۝٦٧ قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ۝٦٨ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا
وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ۝٦٩ وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ۝٧٠﴾(الانبياء٥١- ٧٠).

مەسەلەیەك نیە بەقەد مەسەلەی (التوحید) یەكتاپەرستی دڵ و دەروون و ئەندامەكانی باوەڕدار سەرقاڵ بكات ئەوان هەوڵ دەدەن هەمیشە ووشەی خوا بەرز بێت، ئەگەر ڕێگاكانیان جیاوازیش بێت و ووشەی بێ باوەڕان نەوی و نزم بێت، ئەوان هەوڵ بۆ دنیاو ناوو شۆرەت و دەسەڵات و كۆكردنەوەی سامان نادەن، ئەوان دڵ‌و ئەندامەكانیان بۆ خوا ئامادە دەكەن، و حەزیش دەكەن خەڵكی وەك خۆیان بێت‌و هەموو خەڵكی ملكەچی فەرمانی خوا بن‌و بە شەرعی خوا حوكم بكەن، واتە هەموو بتێك بشكێنرێت كە لە غەیری خوا دەپەرترێت.و بەندەكان لە پەرستشی كوێرانە ڕزگار بكرێن، وەك (ربعی بن عامر) خوا لێی ڕازی بێت كاتێك چووە لای ڕۆستەم ووتی: (خوای گەورە ئێمەی نارد تا خەڵكی لە بەندایەتی كردنی بەندەكان دەربكەین بۆ بەندایەتی كردنی خوا. لە ناڕەحەتی دنیا دەریان بهێنین بۆ فراوانی لە ستەم و زۆرداری دینەكان ڕزگاریان بكەین بۆ دادپەروەری ئیسلام).

دوژمنانی خوا ئامانجی جیاوازو هەمە جۆریان هەیە، دەیانەوێت ناوو شۆرەت و دەسەڵاتیان بپارێزن و خەڵكی ملكەچی ئەوان بن، ئەمانەش بۆ سودی دنیایی و ئارەزوو ڕابواردنە، لێرەدا كێشەو ململانێ هەڵدەگیرسێت لە نێوانی حەق و ناحەقداو لە نێوان باوەڕدارو یاخی بواندا، چونكە دەركەوتنی خاوەن باوەڕ خەڵكی لە بێ ئاگایی بە ئاگا دێنێتەوەو داوایان لێ دەكەن بچنە ژێر فەرمانی خواوە، اە مەشەد ناوو شۆرەت و دەسەڵاتی دوژمنانی خوا ئاوا دەبێت و نامێنێت، لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن
يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٨﴾(البروج ٨)

چونکە نابێت و ناگونجێت ئەهلی حەق و ئەهلی بەتاڵ و ناحەق بەیەك بگەن چونکە ئامانجی هەریەکەیان لەناوبردنی ئەوی تریانە .

ئەمەش مەسەلەیەکە لە مەسەلە ئیمانیەکان، ئیمانی ئیماندارانی پێ زیاد دەبێت، ڕوخان و خەسارەت مەندیشی بۆ یاخی بوان و خراپەکاران تیایە، خواکانیان تێك دەشکێت و بتەکانیان لەت و پەت دەکرێن، دەبێت هەر ئاخ و داخی بۆ هەڵکێشن، هەڕەشەیان کردو وتیان: ﴿مَن فَعَلَ هذا بآلِهَتِنا إنَهُ لَمِنَ الظالِين﴾ دوا لە بتی نەزانەکان و تێکشکێنران کە وایان دانابوو ئەمان خوان. تکایان لێ دەکردن بە لای خوادا نەدەچون و قەومەکە نەدەگەڕان بە دوای ئەو کەسەدا کە کارەکەی کردووە تا تۆمەتەکان لەسەر کەسێکی گەنج کۆبکەنەوە کە ناوی ئیبراهیم بوو، بەڵگەی ئەم تۆمەتەش ئەوە بوو کە بیستبویان کە ئەو دوژمنایەتی خۆی بۆ هەموو ئەو بتانە ڕاگەیاندووە کە ئەوان لە غەیری خوا دەیان پەرست وەك فەرمووی: ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾﴾(الشعراء ٧٧-٨٢) .

واتە: (بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانیەکان، ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنمونیم دەکات، بۆ بەختەوەری هەردوو جیهان، هەر خۆی خۆراکم پێ دەبەخشێت و تینوێتیم دەشکێنێت، کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم هەر ئەوە چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت، هەر ئەویش دەممرێنێت و لەوەو دوایش زیندوم دوکاتەوە، هەر ئەوە ئومێدم پێیەتی کە لە گوناهم خۆش بێت لە ڕۆژی قیامەتدا).

هەروەها هەڕەشەی کردو ووتی: ﴿وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّواْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾﴾ (الأنبياء ٥٧)



واتە: سوێندی خوارد ووتی:(سوێند بەخوا نەخشەیەك دەکێشم بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە پشتتان هەڵکرد). مەسەلەیەك بوو تەنها یەك کەس تیایدا تۆمەتبار کرا لەگەڵ زیانێکی زۆرو ئاشکرا بۆ کافران، کە ئەو کەسەش ئیبراهیم "علیه السلام" بوو، خوای گەورە دەربارەی فەرمووی: ﴿إنَّ إبراهيمَ كانَ أُمَّةً﴾ واتە: ئیبراهیم خۆی بەتەنها ئومەتێکە. لە یاخی بوانی ئەو زەمانەوە فەرمانێك بۆ گرتنی ئیبراهیم "علیه السلام" دەرچوو، کە ئامادەی بکەن بۆ دادگایی کردن، تەنها تاوانی ئەو یەکتاپەرستی بوو، ئەو ماوەیەکی درێژ بانگەوازی یەکتاپەرستی بە ئاشکرا کرد، بەڵام ئەمجارەیان بە دەستی ئەنجامی داو هەموو بتەکانی شکاند، دادگایی کردنەکە بە شێوەیەکی ستەمکارانە بوو، بە پێی شەرعی خوا نەبوو، فەرمان لە پاشا یاخی بووەکەوە دەرچوو، کە بانگەشەی خوایەتی دەکرد، تۆمەتی ئاراستەی ئیبراهیم پێغەمبەر کرد، ئەگەر خاوەنی عەقڵێکی دادوەرانە بونایە شەرمیان دەکرد بڵێن: ﴿قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ۝﴾(الأنبياء ٦٢)

واتە: ئایا تۆ وات کرد بە خواکانمان و شکاندتن؟ پاك و بێگەردی بۆ خوا،! کام خوا کە نەتوانێت سود بە خۆی بگەیەنێت و زیان لە خۆی دوور بخاتەوە؟! لەوە لاوازترو بێ دەسەڵاتترە کە ڕێزێکی بۆ خۆی هەبێت تا ئەوەی سوودی بۆ غەیری خۆی هەبێت یان زیانیان پێ بگەیەنێت.

تۆمەتەکە ئاراستەی ئیبراهیم "علیه السلام" کرا، کە خوای گەورە بە ئایەتی: ﴿وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ۝﴾ (الأنعام٨٣)، مەدحی کردووە، (پێشتر مانا کرا) لەگەڵ ئەوەی کە تۆمەتەکە لە خۆیدا بەتاڵ و بێ مانایەو لە لایەن کەسی ژیرەوە ڕەت دەکرێتە، بێگومان ئیبراهیم شڵەژانی ئەوانی زیاد کردو سکاڵای ئەوەی کرد کە ئەوان لەسەر بەتاڵن و ووتی: ﴿بَل فَعَلَهُ كبيرَهُم فَسئلوهم إن كانوا ينطقون﴾

واتە: ئیبراهیم ووتی: (بۆچی لە من دەپرسن؟ خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە) نەخێر هەر کاری ئەو بتە زلەیە، دەلێیان بپرسن ، ئەگەر قسە دەکەن و تێ دەگەن!!.

ئیبراهیم "علیه السلام" ویستی دان بنێنن بە کەم و کوڕی و ناتەواوی و بتەکانیاندا، بەوەی کە قسە ناکەن و سودو زیان ناگەزیەنن.

﴿قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ۝﴾ (الأنبياء ٦٤)

واتە: (کەمێك داچڵەکان)و لە دڵی خۆیاندا لێکیان دایەوە، سەرئەنجام بە خۆیانیان ووت: بە ڕاستی ئێوە ستەمکارن (ئیبراهیم ڕاست دەکات، ئەمانە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، چۆن دەتوانن بەرگری لە ئێمە بکەن؟!)

خەڵکەکە لە بێئاگاییان بێدار بونەوە لە بەردەم ئەم بەڵگەیەدا کە ئیبراهیم "علیه السلام" هێنایەوە!! پاك و بێگەردی بۆ خوا! ووشەیەکی حەق ڕیزەکانی لەرزاندن لە دڵی خۆیاندا ووتیان: کە ئەمانە قسە ناکەن و سودو زیانیان نیە ئیتر بۆچی بیانپەرستین؟!

﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ۝﴾(الأنبياء ٦٥)

واتە: پاشان بەسەر شۆڕی پاشگەز کرانەوە بۆ بیرو باوەڕە کۆنەکەیان و ووتیان: بێگومان تۆ زانیوتە کە ئەوانە قسە ناکەن!!

﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ۝ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝﴾ (الأنبياء ٦٦-٦٧).

خوایەك کە دەپەرسترێت دەبێت بەتوانا بێت کە سود بە بەندەکانی بگەیەنێت و زیانیان لێ دوور بخاتەوە ئەگەر نا ئەوە بەتاڵ و بێ مانایەو شیاوی پەرستن نیە، یخوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝﴾(الانعام١٧).

واتە:(دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دوچاری زیان و گرفتێك بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە لە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت توشی خێرو خۆشیەکی بکات، ئەوە ئەو خوایە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ۝﴾(الأنبياء٦٨).

کاتێك ئیبراهیم بە بەڵگەو ڕون کردنەوەکانی سەرکەوت بەسەریاندا، ئینجا ئەوان چوون بۆ بەکارهێنانی هێزو بازو، بەو جۆرە هەموو کەسە دوور لە بەڵگەکان خۆیان لەبەردەم بەڵگەی ڕاستی دا ناگرن و پەنا دەبەن بۆ ململانێ بە زەبری هێزو پیاکێشان.

لە دادگای یاخی بوانەوە فەرمان دەرچوو بە قورسترین سزا بۆ ئیبراهیم "علیه السلام" کە بریتی بوو لە لەناوبردنی بە ئاگر.

زانا (إبن کثیر) دەڵێت: ئەوان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دارو کەرەستەی سوتەمەنی لە هەموو لایەکەوە کە دەستیان بگات، ماوەیەك مانەوەو کۆدەبنەوە بۆ ئیبراهیم تا ئەو کاتەی ئافرەتێك نەخۆش کەوت و، نەزری کرد ئەگەر چاك بومەوە دەبێت بە کۆڵم دار بێنم بۆ سوتاندنی ئیبراهیم.

لەم هەڵوێستە جوانەی ئیبراهیم دا "علیه السلام"، (إبن عباس) ڕیوایەت دەکات و فەرمویەتی: ئیبراهیم فەرمووی: ﴿حَسبنَا الله وَ نِعمَ الوَكيل﴾کاتێك فڕێدرایە نێو ئاگرەوە ئەمەی ووت،و محەمەدیش ﷺ هەمان شتی ووت کاتێك پێی ووترا: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾﴾ (آل عمران١٧٣-١٧٤).

واتە: ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بە ڕاستی خەڵکی بێ باوەڕو خوا نەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆ کردۆتەوە و مەڵاسداوە، لێیان بترسن (خۆتان توشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران) بەو پڕو پاگەندەیە باوەڕیان زیاتر دامەزراو، ووتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەرو یارمەتیدەرێکی چاکە، ئینجا مسوڵمانان گەڕانەوە، هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و نازو نیعمەتی خواییدا،و هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو) خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە.

ئیبراهیم "علیه السلام" نەفسی خۆی بەخشی بە خواو پشتی بە خوا بەست،و دڵی هەڵواسی بەوداو، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٦﴾﴾(الزمر ٣٦)

واتە: مەگەر خوا بەس نیە کە پشتیوان بێت بۆ بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە ﷺ کەچی ئەوان تۆ بە شتی تر بێجگە لە خوا دەترسێنن.لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾(الطلاق٣)

واتە: ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت بەسیەتی.لەم ناڕەحەتیە قورس و گرانە دەرگای ڕزگاربوون لە ئیبراهیم کرایەوە.﴿قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾(الأنبياء٦٩).

واتە: بە ئاگرەکەمان وت: بە هێواشی و سەلامەتی لەسەر ئیبراهیم ساردببەرەوە پاشان خوای گەورە یارمەتی داو دەستی گرت و نەیهێلاّ بسوتێت، ئیبراهیم بەندەیەك بوو نەفسی خۆی بەخشی بە خواو گەیشتن بە ئاواتەکانی خۆی.

ئیبراهیم "علیه السلام" ماڵی خۆی بەخشی بە میوانەکانی،و خوای گەورەش ئیسماعیلی لە قوربانی بۆ ڕزگار کرد خوای گەورەش ئیبراهیمی بە چەند وشەیەك تاقی کردەوە ئەویش لە خوای وەرگرت،و ئەو ڕۆژەی پێ فەرموو﴿نصُرهُنَّ﴾ قودرەتی خوایی بۆ دەرکەوت.

کاتێك ئاگرەکە کڵپەی سەند گەرمیەکەی ڕۆیشت و لە شوێنەکەیدا خوای گەورە درەختی ڕواندو کردی بە باخ، زانا (إبن کثیر) دەڵێت: ئەوان ویستیان سەرکەون بەسەر ئیبراهیم دا بەلاّم خوای گەورە سەر شۆڕی کردن، ویستیان بەرز بنەوە بەلاّم نزم بونەوە، ویستیان سەرکەون بەلاّم ژێرکەوتن، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾(الأنبياء٧٠).

ئەوان خەسارەتمەندی و دۆڕانیان لە دنیادا دەست کەوت، بەلاّم لە قیامەتدا ئاگرەکەی ئەوان ساردو هێ‌اش نابێت،و سەلامیشیان لێ ناکرێت، وەك ئەوە دەبێت کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾﴾ (الفرقان٦٦) واتە خراپترین و ناڕەحەتترین شوێنە.

﴿ وانەو سودە ئیمانیەکان ﴾

١. لایەنگرانی هەق ئەگەر کەمیش بن لە لایەنگرانی ناهەق بەهێزترن ئەگەر ژمارەیان زیاتریش بێت ، چونکە خوا پشتیوانیانە .

٢. هەرکەس پشت بە خوا ببەستێت ، خوای گەورە وونی ناکات و ڕێزی دەست دەکەوێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ (آل عمران ١٧٣).

٣. لایەنگرانی ناهەق دڵیان خراپەو ناحەقیدا ڕاهاتووەو خۆگری هاوەڵدانان بوون‌و دڵیان لە خراپە بێزار نابێت ، لەگەڵ ئەوەی کە دەیانزانی بەناو خواکانیان قسە ناکەن‌و سودو زیانیان نیە، کەچی سوربوون لەسەر پشتیوانی کردنیان .

٤. ڕەوڕەوەی کاروانی ئیمان یەکەو پێغەمبەران پێشەنگی دەکەن‌و بە خۆشەویستی خواو بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و پشتیوانی خواو پێغەمبەران‌و باوەڕداران بەستراوەتەوە، و دوژمنانی خوایش ، دوژمنی دۆستانی خوان ، لە هەموو کات‌و شوێنێکدا، لەبەر ئەوە پێغەمبەرمان "ﷺ" لە فەرمودەیەکدا فەرمانمان پێدەکات بە کوشتنی شەوگەرد چونکە فووی کرد بە ئاگرەکەی ئیبراهیم دا تا خۆش ببێت .

٥. لایەنگرانی ناحەق هەمیشە لە گومان‌و ناهاوسەنگیدان ، لایەنگرانی حەق کە باوەڕیان لە چیاکان دامەزراوترە، هەمیشە دڵیان خۆشە، چونکە خوای گەورە جێگیری پێ بەخشیون ، وەك خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾(إبراهيم ٢٧). واتە : خوای گەورە بە ووشەیەك باوەڕداران دامەزراوو جێگیر دەکات لە ژیانی دنیاو دواڕۆژدا کە ئەویش ووشەی ﴿لا إلهَ إلا الله﴾یە.

٦. هۆکارەکان جیاوازن، خوای گەورە فەرموی : سروشتی سوتاندن لە ئاگردا یەك مانایەو بۆ چەند مانایەك دابەش نابێت ، ئاگرەکە دار دەسوتێنێت‌و دەبێتە خۆڵەمێش هەر لەو کاتەدا کەلەسەر ئیبراهیم ساردو هێواش‌و سەلامەت کرا، بێگومان ئەمەش بە ویستی بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوی بوو ، هۆکارەکان بەویستی خوا کار لە شتەکان دەکەن نەك بە ویستی خۆیان

## ٢-چیرۆکی سەربڕینی ئیسماعیل "علیه السلام"

خوای گەورە دەربارەی ئیسماعیل دەفەرمویت : ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴿١٠٢﴾

فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾﴾ الصافات (٩٩-١١٠).

ئیبراهیم"علیه السلام " دڵی پەستبوو بەخوای گەورەوەو لەگەڵ (هاجر)ی خێزانیدا کۆچی کرد، ووتی : (من بەڕاستی ئێوە بەجێدەهێڵمو بەرەو ڕەزامەندی پەروەردگارم دەڕۆم لە ئایندەدا ڕێنمونیم دەکات).

ئیبراهیم"علیه السلام" لە خوا پاڕایەوە دەروی لێ بکاتەوەو لە ناڕەحەتی ڕزگاری بکات ، ووتی : (پەروەردگارا نەوەیەکی چاکو پاکم پێ ببەخشە)، خوای گەورەش مژدەی دا پێیو فەرموی : (ئێمەش مژدەی کوڕێکی بە ئارامو خۆگرو ژیرمان پێ بەخشی -ئیسماعیل-ە)، خوای گەورە بەخۆشەویستی خۆی هەڵیبژارد ، فەرموی : ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾(النساء ١٢٥).

ئیبراهیم "علیه السلام" لە شیوێکی چۆڵو ووشکدا کوڕە شیرە خۆرەکەیو دایکی جێهێشت ، هاوڕێو هاودەمێکیان نەبوو ، شوێنەکە بێ ڕووەكو کشتوکاڵ بوو ، تا نوێنەرایەتی فەرمانی خوا بکەن ، پاشان ڕوی کردە خواو پاڕایەوەو ووتی : ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾﴾(إبراهيم ٣٧).

واتە : (ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی من هەندێك لە وەچەو خێزانم لە دۆڵێکی ووشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە لە پاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا ، وە خوای گەورەش دەروی لێکردەوە ).

ئیبراهیم "علیه السلام" پیری ڕوی تێکردو چویە ساڵەوە ، و منداڵە خۆ ڕاگرەکەشی بۆی بویە باشترین پشتیوان کاتێك پێگەیشتو گەورە بوو،و پیاوێکی بەتەمەنی گەورە دەبینێت فەرمانی پێ دەکرێت کە کوڕەکەی خۆی سەربېڕێت لە کاتێکدا پێی ناخۆشەو تەنهایە، کوڕە خۆڕاگرەکەش ئەگەر باوکی نەیتوانیبێت بە سۆزی باوکایەتی خۆشەویستی بخاتە دڵی کوڕەکەی ، ئەوا خۆشەویستیەکە، خۆڕاگری‌و زیرەکی کوڕەکەی دادەمەزرێت، بەڵام ئەوەی فەرمانی کردووە خوای گەورەیە ، کاربەجێ‌و شارەزایە لە فەرمان‌و نەهی‌و بڕیارەکاندا،و ئەوەشی فەرمانی پێکراوە ئیبراهیمە، خوای گەورە لە گەنجیدا دەستی لێبەر نەدا تا لە پیریدا دەستبەرداری ببێت، ئیبراهیم دەست پێشخەری دەکات، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوا ، چونکە فەرمانی خوا لەگەڵ عەقڵدا پێچەوانە نابێت :﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ (الاحزاب ٣٦).

واتە : بۆ هیچ باوەڕدارێکی پیاوو ئافرەت نیە کە خوای گەورە فەرمانێکی دەرکرد ئەوان هەڵبژاردنێکی تریان بەسەر فەرمانەکەدا هەبێت،و هەر کەس لە فەرمانی خواو پێغەمبەر "ﷺ" سەرپێچی بکات‌و یاخی ببێت بە ڕاستی گومڕایەکەی ئاشکرایە . جێبەجێکردنی فەرمان لەسەر نەفسی خەڵك زۆر قورسە، بەندەیەك نەفسی خۆی دەبەخشێت بە خواو خۆی دەکات بە قوربانی‌و دەشزانێت ساتێکەو دەبڕێتەوە ، پاشان ڕۆحەکەی بۆ لای خوای گەورە بەرز دەبێتەوەو پاشتر لە بەهەشدا دەچێتە ناو نازو نیعمەتەوە ، شەهید ئازاری کوشتنی تۆش نایەت مەگەر بە هێندەی پێوەدانی مێشولەیەك.

بەڵام کەسێك هەستی‌و چەقۆیەك هەڵگرێت‌و کوڕێکی تاقانەی خۆی سەربڕێت‌و خوێنی کوڕەکەی بەسەر دەستی‌و جلەکانیدا بڕژێت، بەڕاستی ئەم نەفسانە بەشێوەی ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە تاقی دەکرێنەوە :﴿وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ ۘ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۗ

سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾ (الانعام ١٢٤).

واتە : (خوا زانایە بەو شوێن و دڵ و دەروونەی کە شایستەیە پەیامی خۆی تیا دابنێت). ئەو کوڕەشی خوای گەورە بەخشییە ئیبراهیم لە تەمەنی گەورەییدا، تەنها لە فەزڵی ڕەحمەتی خواوە بووە ، ئەگەر سەیر بێت کاری پیاوێکی بەتەمەن کە لە گوێڕایەڵی خوادا پیربووەو خۆشەویستی بۆ خوا زیادی کردووە ، ئەوە شیاوی خۆیەتی کە ببێتە خۆشەویستی تایبەتی خواو خوای گەورە بە خۆشەویستی خۆی باسی دەکات ، کە بەرزترین پلەی خۆشەویستییە،و لە ڕاستی سەری سوڕما لە کاری کوڕە خۆڕاگرو ژیرەکەی .

ئیبراهیم " علیه السلام" ئەوەی بۆ کوڕەکەی ڕون کردەوە کە لە خەونیدا بینی ، بۆ ئەوەی لای دڵی خوازراو بێت و قبوڵی بکات و لەسەری ئاسان و سوك بێت کاتێك بەزۆر دەیگرێت و سەری دەبڕێت ووتی : (ئەی کوڕی خۆشەویستی خۆم من لە خەونمدا بینیم کە من تۆ سەردەبڕم ، تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە ؟ ) ئایا کوڕەکە وتی : تاوانم چیە ؟ ئایا شتێکم کردووە شیاوی سەربڕین بم ؟ ئایا ووتی : ئایا نەفست فەرمانی داوە سەرم ببڕیت؟ ئایا ووتی : تۆ چۆن دوای کوشتنی من ژیانت خۆش دەبێت ؟ئایا ووتی : کاتێك من سەردەبڕیت وەڵامت بۆ دایکم چی دەبێت؟ ڕەنگە دەیان پرسیاری تر لەم جۆرە هەبن کە چاوەڕووان کرابێت لە دڵی منداڵێکی بچوکەوە دەرچێت ، بەڵام وەڵامەکە لەو پەڕی ژیری و بە ئاگاییەوە هات ، کوڕەکە یارمەتی باوکی دا لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانی خواو فەرمانەکە جێبەجێ بکات ،و ناڕەحەتیەکەی لەسەر سوك بوو چونکە لێی نەترسا، و (إن شاءالله) ئارامی لەسەر دەگرێت ، بەڵێنی ڕاستی بردە سەر ، وەك خوای گەورە فەرموی : ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ ﴾(مریم ٥٤).

واتە : (ئەی محمد "ﷺ" لە کتێبی قورئاندا ئیسماعیل باس بکە ، بە ڕاستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا ڕاستگۆ بوو).

خۆدانە دەست فەرمانی خوا شتێکە لە بەندەکان داوا کراوە ، دەبێت بەندەکان باوەڕیان وا بێت کە هەموو خەیرو چاکەیەك لە گوێڕایەڵی فەرمانی خوادایە ، شەڕو بەڵایشی لە ئەنجامی یاخی بوون لە فەرمانی خواوە پەیدا دەبن.

(الرازی) دەڵێت : حیکمەت لە ڕاوێژکردنی ئیبراهیم "علیه السلام" بە کوڕەکەی ، بۆ ئەوەیە کە کوڕەکەی بەسەر ئەو کارەدا بەرێت ، تا ئارامی خۆی

بۆ دەرخات لەبەردەم گوێڕایەڵی فەرمانی خواداو ببێتە بیلبیلەی چاوەکانی ئیبراهیم کاتێك کە دەبینێت گەیشتۆتە پلەی ئارام گرتن تا ئاستێکی گەورە لەسەر قورسترین تاقیکردنەوە، کوڕەکەش پاداشتی گەورەی لە قیامەتدا دەست دەکەوێت ،و لە ستایشکراوان و چاکەکاران دەبێت .ئایەتی : ﴿ستجدوني إنشاءالله من الصابرين﴾

واتە : دەم بینیت لەسەر سەربڕین یان لەسەر قەدەری خوا ئەگەر خوا بیەوێت لە ئارامگران دەبم .

لە پشت قسەو گفتوگۆکانەوە دیمەنەکە هەنگاو دەنێت و بەرەو جێبەجێکردن نزیك دەبێتەوە ﴿فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾﴾ (الصافات ١٠٣).

واتە : (کاتێك کوڕو باوك هەردوکیان تەسلیمی فەرمانی پەروەردگار بوون، ئیبراهیم ئیسماعیلی بە ڕوودا خستە سەر خاك بۆ ئەوەی سەری بېڕێت ).

(إبن كثير) دەڵێت : ﴿وتله للجبين﴾ واتە : لەسەر ڕووی دای بە زەویدا ، وتراوە : ویستی لە پشتی ملەوە سەری بېڕێت بۆ ئەوەی چاوی لە ڕووی نەبێت ﴿وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾﴾ (الصافات ١٠٤، ١٠٥ ). لەو کاتەدا بانگێك لە لایەن خواوە هات ، ئەی ئیبراهیم ، بەڕاستی خەوەکەت هێنایە دی ئێمە هەر بەوجۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (لە تاقیکردنەوەکاندا سەریان دەخەین چونکە لێبڕاون).

﴿إن هذا لهو البلاؤ المبين﴾ واتە : (بەڕاستی ئەمە خۆی تاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو ڕوونە). ﴿وندیناه بذبح عظیم﴾ واتە : ئێمەش بەرانێکی گەورەمان کردە قوربانی ئیسماعیل تا لەجیاتی ئەودا سەری بېڕێت ،و تا لای ئامادەبووانیش بینراو بێت کە بەرانێکی سپی چاو گەشی گەورەو شاخدار بوو

## ﴿ سودو بەرهەمە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) زانا (القاسمی) دەڵێت: زانایانی تەفسیر لە چیرۆکی سەربڕینی ئیسماعیلدا

زۆر شتیان ووتوە کە ڕاست نین نە زنجیرەی ئەو کەسانەی گێڕاویانەتەوە نە دەقی ووتەکانیشیان .

٢) زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر بڕاوەکەدا ئایا ئیسماعیل بووە یان ئیسحاق ؟ (إبن قییم ) خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت : بە پێی قسەی ڕاست سەربڕاوەکە ئیسماعیل بووە ، لە لایەن هاوەڵان‌و زانایانی شوێن کەوتوی ئەوان‌و دواتریش ، ئەو قسەیەی دەڵێت کە ئیسحاق بووە ئەوە بەتاڵە بە زیاتر لە بیست بۆچون.

لە (الصحیح قصص الانبیاء)ی (إبن کثیر) دا هاتووە : بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کە سەربڕاوەکە ئیسماعیلە چونکە ئەو لە مەککە نیشتەجێ بوو، بەڵام بۆ ئیسحاق نازانین ئایا لە تەمەنی بچوکیدا چووە(خوا زاناترە).

ئەوە لە قورئاندا ئاشکرا دیارە ، بەڵکو ئایەتی لەسەر هاتووە کە سەربڕاوەکە ئیسماعیلە، چونکە خوای گەورە باسی چیرۆکی ئیسماعیلی کرد، پاش ئەوە فەرموی :﴿وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (الصافات ١١٢).

واتە : (مژدەی هاتنە دنیای ئیسحاقیشمان پێ بەخشی کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان).

کاتێك خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو بچن مژدە بدەن بە ئیبراهیم کە خوای گەورە ئیسحاقی پێدەبەخشێت وەك لە ئایەتی (٧١) (هود)دا هاتووە ، مەحاڵە خوای گەورە مژدەی پێ بدات ، کە کوڕێکی دەبێت‌و پاشان فەرمانی پێ بکات سەری ببڕێت.

٣) زانا (السیوطي) لە(الإکلیل)دا دەڵێت: لە ئایەتەکەدا دەردەکەوێت کە خەوی پێغەمبەران وەحی یە، ڕێپێدراوە کارەکە نەکرێت پێش ئەوەی دامەزرابێت،و پێشخستنی ویست لەگەڵ ئیرادە لە هەموو ووتەیەکدا، هەندێك کەس بەم چیرۆکە بەڵگەیان هێناوەتەوە هەرکەس نەزری کرد کوڕەکەی سەر ببڕێت، پێویستە لە باتی مەڕێك سەر بڕێت.

٤) لە (الظلال)دا هاتووە دەڵێت: خوای گەورە تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوە دانی دەوێت، ئەگەر ئەو کوڕە جگەر گۆشەت بوبێت، ئەگەر نەفس و ژیانت بێت، ئەی ئیبراهیم تۆ فەرمانەکەت جێ بەجێ کرد، کە

بەڕێزترین و چاکترین شت بوو، ڕەزامەندی و ئارامیت پێ دەست کەوت و چوبیتە ناو دڵنیایی یەوە، تەنها خوێن و گۆشتت مایەوە، ئەمە لە جێ ی سەربڕاوێك دەبێت، چ سەربڕاوێك لە گۆشت و خوێن، بەڵام خوای گەورە ئەو نەفسە ڕزگار دەکات کە تۆ تەسلیمت کردوو بەجێت هێنا، خوای گەورە سەربڕاوێکی گەورە دەخاتە بری، کە بەرانێك بوو دەست ئیبراهیم کەوت کە پەروەردگاری ئامادەی کردبوو، ویستی وا بوو لە باتی ئیسماعیل سەری ببڕێت، بەو کارە سوننەتی سەربڕینی قوربانی مایەوە بۆ یادی ئەو ڕوداوە گەورەیە کە مەشخەڵێکی بۆ ڕاستی ئیمان و جوان گوێڕایەڵی و بە گەورەیی تەسلیم بوون بەرز کردەوە.

٥) خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾(النساء ١٢٥)

واتە کێ هەیە ئاینی چاکترو پەسەندترو جوانتربێت لەو کەسەی ڕوی کردۆتە خواو خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردووە لە کاتێکدا کاری جوان و کار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی و ڕێزداری کردووە.

٦) خوای گەورە لە پەرستش و گوێڕایەڵی بەندەکانی هیچ سودێکی دەست ناکەوێت و لەسەر پێچیشیان هیچ زیانێك ناکات، وەك لە فەرمودەیەکی قودسیدا فەرمویەتی: ﴿یا عبادي إنکم لم تبلغوا ضري فتضروني ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني﴾[1] .

واتە: (ئەی بەندەکانم ئێوە نەگەیشتونەتە ئەوەی زیانم پێ بگەیەنن تا زیانم لێ بدەن،و هەرگیز ناگەنە ئەوەی سودتان بۆ من بێت تا سودم پێ بگەیەنن). خوای گەورە هیچ سودێك لەسەر بڕینی کوڕی پیاوێکی بە تەمەن نابینێت، وەك

[1]- مسلم لە (البر)دا ڕیوایەتی کردووە

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾﴾ (الحج٣٧).

واتە: دڵنیابن هەرگیز گۆشتەکەی و خوێنەکەی بەخوا ناگات، بەڵکو تەقواو پارێزگاری ئێوە بەوە دەگات.

٧) زانا( الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە سودی چیرۆکی ئیبراهیمدا دەڵێت: لە سودەکانی: هەرکەس ویستی گوێڕایەڵی فەرمانێك بکات و توانای بەگەر خستن و هۆکاری بەکارهێنا، پاشان ڕێگرێك هات و نەهێڵێت تەواوی بکات، ئەوا پاداشتی لای خوای گەورە بۆ نوسراوە، وەك خوای گەورە دەربارەی کۆچکەرێك ئەوەی فەرموودە کاتێك دەمرێت پێش ئەوەی کۆچەکەی کردبێت، هەروەها وەك ئەوەی لە چیرۆکی سەربڕینەکەدا باسی کرد، بێگومان خوای گەورە پاداشتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی تەواو کرد کاتێك خۆیان دایە دەست خواو ملکەچی فەرمانی بوون و پاشان خوای گەورە ناڕەحەتی لەسەر لابردن و پاداشتی بۆ دانان.

## چیرۆکی موسایی ( علیه السلام )

## ڕێزو گەورەیی موسا ( علیه‌السلام )

١) ستایشی خوا لەسەر موسا :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيًّا (٥١) وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطورِ الأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا (٥٢) وَوَهَبْنَا لَهُ مِن رَّحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا ﴾ ((مريم / ٥١/ ٥٣ ))

واتە : ئەی موحەمەد (ﷺ) لە کتێبی قورئاندا باسی موسا بکە ، بەڕاستی ئەو بەندەیەکی دڵسۆز و هەڵبژێردراو و پێغەمبەری خوابوو ، ئێمە لەلای ڕاستی چیای (طور ) ەوە بانگمان لێ کرد ، کە چیایەکە دەکەوێتە نێوان ( مصر و مدین ) ەوە ، زانا ( ئالوسی ) دەڵێت : مەبەست لای ڕاستی موسا بووە چوونکە چیاکان ڕاست و چەپیان نی یە ، ( وقربناه نجیا ) واتە : نزیك خستنەوەو ڕێزگرتن ، وەك کەسێك لە پاشاوە نزیك بێت و هەڵبژێردرابێت بۆ هەوەڵی خۆی .

﴿ وَوَهَبْنَا لَهُ مِن رَّحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا ﴾ ( مريم ٥٣ ) .

( إبن كثير ) دەڵێت : خوای گەورە فەرمووی وەڵامی داواکەی موسامان دایەوە کە بۆ هارونی برای کردی و کردمان بە پێغەمبەر ، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿ وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾ (القصص٣٤ ).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى ﴾ ( طه ٣٦ ) .

واتە : بەڕاستی ئەی موسا داواکەت پێ بەخشرا .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قَالَ يَا مُوسَى إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاَتِي وَبِكَلاَمِي فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ ( الاعراف ١٤٤ ) .

زانای تەفسیر ( القرطبي ) دەڵێت : (الأصطفاء ) واتە : هەڵبژاردن و جیاکردنەوە ، واتە : ڕێزدارم کردیت بەڵام نەیفەرموو بەسەر دروستکراوەکاندا ، چونکە لەم هەڵبژاردنەدا قسەی لەگەڵ کرد ، چونکە قسەی لەگەڵ فریشتەکانیشدا کردوەو ناردونی ، مەبەستی ئەوە بووە بەسەر خەڵکی دا هەڵی بژاردووە و بۆ ئەوانی ناردوە .

لەفەرمودەیەکدا هاتوە لە ( أبي هريرة ) ەوە ( کە ئەم دەقە کوردیەکەیەتی ) دەفەرموێت : ( موسا پیاوێکی شەرمن بوو ، هیچ کات بەڕووتی نەدەبینرا ، ( بنوا إسرائيل ) ووتیان : هێلکەی گونی ئاوساوە ، لەناو تەنکاوێکدا خۆی شۆرد ، جلەکانی لەسەر بەردێك دانا ، بەردەکە کەوتە ڕێ و ڕۆیشت ، موسا بە عەساکەیەوە دوای کەوت و لێی دەدا و دەیفەرموو : ئەی بەرد جلەکانم ، هەتا گەیشتە لای کۆمەڵێك لە ( بنيي إسرائيل ) وەستا ، لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا ﴾ ( الاحزاب / ٦٩ ).

واتە : ( ئەی باوەڕداران وەك ئەوانە مەبن ئازاری حەزرەتی موسایان دەدا

هەتا خوا خاوێنی کرد لەو تۆمەتانەی ئەوان دەیان ووت چونکە موسا لای خوا خاوەن ڕێزو پلەو پایە یە ) .[1]

پێغەمبەران ( علیهم السلام ) لە شێوازی دروستکردن و ڕەوشتیاندا لەوپەڕی تەواوی دابوون ، هەرکەس کەموکوڕیەك پاڵ بداتە یەکێك لە پێغەمبەران ، بێگومان ئازاری داوە ، و ڕەنگە پێی کافر ببێت ، و موعجیزەیەکی ئاشکرای بۆ موساتیایە ، ئەوەشی تیایە کە پێغەمبەران ( علیهم السلام ) لەسەر ئازاری کەسە نەزانەکان ئارامیان گرتووە ، وخوای گەورە سزای ئەو کەسانەی داوە کە ئازاری پێغەمبەرانیان داوە .

( ئیمامی نووی ) دەفەرموێت : پێغەمبەران پاکن و دورن لە هەموو کەم و کوڕیەك لە دروست بوون و ڕەوشتیاندا هیچ پەڵەو عەیبێکیان پێوە نییە .

٢) لە ڕێزو گەورەیی موسا ( علیه السلام ) : خوای گەورە بەبێ هیچ هۆکارێکی یاریدەدەر (واسطة)

قسەی لەگەڵ کردو ، قسەکەی بیست :

وەکو خوای گەورە فەرمووی : ﴿ وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا ﴾ ( النساء / ١٦٤ ).

واتە : (( خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسادا کرد )).

خوای گەورە هەواڵی قسە کردنەکەی موسا دەدات و دەفەرموێت :

﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (١٠) قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلا يَتَّقُونَ﴾ ( الشعراء / ١٠-١١ )

واتە : (( ئەی موحەمەد (ﷺ) باسی ئەوە بکە کە پەروەردگارت بانگی لە موسا کرد بچێت بۆ لای قەومی ستەم کاران قەومی فیرعەون کە تەقوای خوا ناکەن .

لە (صحیح ) ی ( موسلیم و بوخاریدا ) هاتووە : ئادەم و موسا کەوتنە گفتوگۆ لەبەردەم پەروەردگاریاندا ئادم بە موسای ووت ( انتَ موسی اصطفاك

---

١/ ( موسلیم ڕیوایەتی کردوە ) لە ( بەشی پێغەمبەران و گەورەیی یان )

٢/ بوخاری لە(التوحید) و ( موسلیم لە ( القدر) ڕیوایەتیان کردوە .

الله بِرِسالاتِهِ وَ بِكَلامِهِ ) واته : (( تۆ ئەو موسایەیت کە خوا بەهۆی پەیام و ووشەکانی خۆیەوە هەڵیبژاردویت.)[1]

٣) لە ڕێزو گەورەیی موسا ( علیه السلام ) :خوای گەورە بە دەستی خۆی تەوراتی پێنوسی یەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ ﴾ ( الاعراف / ١٤٥ ).

واتە: (( لە تابلۆکانی تەوراتدا لە هەموو بابەتێکمان بۆ تۆمار کردبوو ئامۆژگاری تێرو تەواو ( بۆ هەموو چالاکی یەکانی ژیان ) هەروەها ڕوون کردنەوە بۆ هەموو شتێك و هەموو بابەتێك ، کەوابو ئەی موسا ، بە توندی بیانگرە و پەیڕەویان بکە و فەرمان بە قەومەکەشت بدە کەبە جوانترین شێوە وەریان بگرن و پەیڕەویان بکەن

٤) لە ڕێزو گەورەیی موسا ( علیه السلام ) : ( ابو هریره ) لە فەرمودەیەکدا لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، فەرمویەتی ( کە ئەوە دەقە کوردیەکەیەتی ) : ( لە نێوان پێغەمبەرانی خوادا کەسیان لەکەسیان بە چاکتر مەزانن ، بە ڕاستی کاتێك فوو دەکرێت بە ( صور ) دا ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندایە هەمووی لەناو دەچێت ، مەگەر کەسێك خوا بیەوێت ، دوای ئەوە جارێکی دی فوی پیادەکرێتەوە ,من یەکەم کەسم زیندودەکرێمەوە , یان لە ناو یەکەم تاقمدا زیندو دەکرێمەوە , دەبینم موسا دەستی گرتوە بە عەرشەوە , نازانم ئایا پاداشتی ئەوەی دراوەتەوە کە لەڕۆژی (طور)دا بێهۆشکەوت , یان پێش من زیندو کراوەتەوە , من ناڵێم هیچ کەس گەورەترە لە یونس کوڕی مەتتا) .[2]

---

١/ ( موسلیم لە (الفضائل ) و ( بوخاری لە (احادیث الأنبیاء ) دا ) ڕیوایەتیان کردوە.

٢/ ( بوخاری لە( الطب ) و موسلیم لە ( الایمان ) دا ڕیوایە تیان کردوە .

٥) هەروەها شەریعەتەکەی گەورەیەو ئومەتەکەی زۆرن :

(إبن كثير) دەڵێت :- بەشێوەیەکی گشتی شەریعەتی موسا (عليه سلام) گەورەیە , وئومەتەکەیشی زۆرن , پێغەمبەران و زانایان و بەندە و دنیا نەویستان و کەسانی ژیر و پاشا و دەسەڵات دار وکەسی گەورەی تیابوو , لەناو چون و گۆڕان وەك شەریعەتەکەیان گۆڕی خۆیشیان بوون بە مەیمون و بەراز . بەڵگەیش لەسەر گەورەی شەریعەتەکەی :-

﴿ ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِيَ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَاء رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ (الانعام /١٥٤)

واتە : پاشان کتێبی تەوراتمان بە موسا بەخشی بۆ ئەوەی نازو نعمەتی تەواو برێژین بەسەر ئەو کەسەدا کە بەچاکی پیادەی دەکات و ڕونکەرەوەی هەمو شتێك بێت و ڕێنمایی کەر و میهرەبانیش بیچێت , بۆ ئەوەی ئەوانە باوەڕی دامەزراو بهێنن بە گەیشتنەوەیان بە پەروەردگاریان (بۆ لێپرسینەوەو پاداشتی کردەوەکانیان) بەڵگەش لە سەر گەورەیی و زۆری ئومەتەکەی پاش پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) بریتیە لەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی :- (کەئەمە دەقە کوردیەکەیەتی) ئومەتەکان خرانە بەر چاوم دەبینم پێغەمبەر هەیە کەسی لەگەڵدانیە , ئینجا خەڵکێکی زۆرم پیشاندرا گومانم کرد کە ئومەتەکەی من بن , وپێم ووترا : ئەمە موسا و قەومەکەیەتی , بەڵام بڕوانە بۆ ئاسۆیەکی تر , (سەیرم کرد) دەبینم خەڵکێکی زۆرە, پێم وترا :( ئەوە ئومەتەکەی تۆیە , حەفتا هەزاریان لەگەڵتایە بێ لێپرسینەوە دەچنە بە هەشتەوە و سزایان نیە ).[١]

٢/ (موسليم) لە (الفضائل) دا ڕیوایەتی کردوە .

٦)هەروەها : لە فەرمودەی (الأسراء ) دا پێغەمبەر (ﷺ) بەلای موسادا تێپەڕی بینی هەستاوە لەناو گۆڕەکەیدا نوێژدەکات )[١]

٧) هەروەها لەفەزڵ وگەورەیی یەکانی : ئیمامی موسلیم لە (انس )ەوە (خوا لێی ڕازی بێت ) ڕیوایەتی کردوە , لە چیرۆکی ( الاسراء ) داهاتوە دەفەرموێت :

- پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاسمانی شەشەمدا بەلاماندا بەرزکرایەوە , جوبرەئیل داوای دەرگاکردنەوەی کرد , وترا : ئەوە کێیە ؟ ووتی : جوبرەئیل , ووترا : ئەی کێت لەگەڵدایە ؟ فەرمووی : موحەمەد , ووترا :ئایا بەدوایدا نێردراوە ؟ فەرموی بەدوایدا نێردراوە , فەرمووی : دەرگامان لێکرایەوە کە دەبینم موسا ( علیه السلام ) لەوێیە , پێشوازی لێکردم و دوعای بەخێری بۆ کردم) لە بەشێکی تری فەرمودەکەدا دەفەرموێت :- ( ئەوسا خوای گەورە ئەو ( وەحی ) یەی کەویستی پێی دام لە شەو و ڕۆژێکدا (٥٠) پەنجا نوێژی لەسەر فەرزکردم , ئینجا دابەزیم بۆ لای موسا (علیه السلام ) .

فەرموی : پەروەردگارت چی لەسەر ئومەتەکەت فەرز کرد ؟ ووتم : پەنجا نوێژ , فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای سوك کردنی لیّ بکە , بەڕاستی ئومەتت ئەوەیان پێناکرێت , چونکە من نەوەی ئیسرائیلم تاقی کردۆتەوە و هەڵم سەنگاندون , فەرمووی : گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم و ووتم : ئەی پە روەردگارم ئاسانکاری بکە لە سەر ئومەتەکەم , پێنج نوێژی لەسەر لابردم , و گەڕامەوە بۆ لای موسا ( علیه السلام ) و ووتم :- پێنجی لە سەر لابردوم , فەرمووی : ئومەتت ئەوەیان پێناکرێت , بگە ڕێرەوە لای پەروەردگارت داوای سوککردنی لیّ بکە , فەرمووی : بەردەوام دەهاتم و دەچوم لە نێوان پەروەردگاری بالاّ دەست و موسادا ( علیه السلام ) هەتا فەرمووی :-

ئەی موحەمەد : ( ئەوا کردمن بە پێنج نوێژ لە هە موو شەو رۆژێکدا ,هەر نوێژێك بە دە نوێژ ,ئەوە پەنجا نوێژ , هەر کەسێك نیازی چاکەیەکی هەبێت و نەیکات , ئەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت, ئەگەر کردی دە چاکەی بۆدەنوسرێت , هەرکەسیش نیازی خراپەیەکی هەبێت ونەیکات هیچ نانوسرێت ) خۆ ئەگەر کردی بەیەك گوناه بۆی دەنوسرێت . فەرموی :- پاشان دابەزیم تا گەیشتمەوە لای موسا (علیه السلام )هەواڵم دایە ,ئەویش فەرمووی :- ( بگە ڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت و داوای سوککردنی لێ بکە ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( ئەوەندە گەڕاومەتەوە بۆ خزمەتی ئیتر شەرمی لێ دەکەم ) [1]

سۆزو بەزەیی موسای بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئومەتەکەی تیابوو , وئامۆژگاری پێغەمبەری خۆمانی کرد ( سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران ) .

٨ )موسا ( علیه السلام ) گەشتێکی کرد بۆ دەسکەوتنی زانست و پلەی بەرزو بالآ ,کە ڕێزی زانست و ئەدەبی داواکردن و هەوڵ و تێکۆشانی بۆ دەستکەوتنی تیابوو . پێغەمبەر ( ﷺ )

فەرمویەتی (کەئەمە دەقە کوردیە کەیەتی ) :- جارێك موسا (علیه السلام ) لەناو کۆمەڵێك لەنەوەی ئیسرائیلیدا دەبێت , پیاوێك دێت پێی دەڵێت : کە سێك دەزانیت لەتۆ زیرەکتر بێت ؟ فەرمووی : نەخێر, خوای گەورە (وەحی) بۆ موسا کرد : بەڵکو بەندە یەکمان هەیە کە (خضر) ە, موساپرسی ڕێگاکەی لەکوێوەیە , خوای گەورەش ماسی یەکی بۆ کردە نیشانە , و پێی وترا : ئەگەر ماسی یەکەت ون کرد بگەڕێرەوە بەو بەندەیە دەگەیت , بەڵام ماسی یەکە ڕێگای لە دەریادا گرتە بەرو ڕۆیشت ,ئینجا موسا کوڕێکی گەنجی لەگەڵدا بوو پێی ووت :ئایا دەزانیت و بینیت کەلای بەردەکەدا لاماندابوو ,من لە وێدا ماسی یەکەم لەبیرچوو , تەنها شەیتانیش لەبیری بردمەوە بۆت باسبکەم , ئینجا موسا وتی :- هەر ئەوە بوو کەئێمە دەمانویست ( واتە : دەبوو لەو شوێنە دا چاوەڕێ بووینایە ) ئیتر بەناچاری

---

١/ (موسلیم ) لە ( الایمان)دا ڕیوایەتی کردوە .

گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە جێیان هێشتبوو ، لە وێدا (خضر) یان بینی ، خوای گەورە کارەکەیانی لە کتێبە کەی خۆیدا گێڕاوەتەوە.)[1]

**٨) یەکێکی تر لە فەزڵ و گەورەیی یەکانی:**

(ابو هريره) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە چیرۆکی وەفاتی موسادا فەرموویەتی (کە ئەمە مانا کوردی یە کەیەتی:- (فریشتەی گیان کێشان هات بۆلای موساو پێی ووت: وەلامی پەروەردگارت بدەرەوە، فەرمووی: موسا زللەیەکی دا لە چاوی، چاوی تەقاند، ئینجا فریشتەکە گەڕایەوە خزمەتی خوای گەورە، ووتی:- بەڕاستی تۆ منت نارد بۆلای بەندەیەکی خۆت کە مردنی ناوێت و چاوی تەقاندم،فەرمووی: خوا چاوی چاك کردەوەو فەرمووی: بچۆرەوە بۆلای بەندەکەم و پێی بڵێ: ژیانت دەوێت؟ ئەگەر ژیانت دەوێت ، دەست دانێ لەسەر پشتی گایەك، چەند تاڵ موو کەوتە ژێر دەستت،ئەوەندە ساڵ دەژیت، فەرموی:ئەی دوای ئەوە؟ فەرمووی: دوای ئەوە دەمریت، فەرموی:دەی ئێستا تا زووە،ئەی خوایە نزیکم خەیتەوە لە خاکی پیرۆز،بەئەندازەی بەرد هاوێژێك) پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:-(سوێند بەخوا، ئەگەر لە لای ئەو بوایەم گۆڕەکەیم پیشان ئەدان و لەکەناری ڕێگاکەدا لای کۆمەڵە لمە سوورەکەدا).[2]

**( لەدایك بوونی موسا ( علیه السلام )**

خوای گەورە لەسورەتی(القصص)دا باسی چیرۆکی لەدایك بوون وپاشان درێژەی چیرۆکی موسامان بۆ دەکات،بە پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێت:-
﴿ نَتْلُوا عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾(القصص/٣)

واتە: ئێمە لەهەواڵ و چیرۆك و بەسەرهاتی موساو فیرعەونت بۆ

---

١/ (بوخاری) لە (احاديث الأنبياء) دا ڕیوایەتی کردووە .

٢/ موسلیم) لە (الفضائل)دا ڕیوایەتی کردوە.

دەخوێنینەوەو دەنێرین بەڕاستی بۆ قەومێك کە باوەڕ دەهێنن.

سورەتەکە تایبەتکراوە بە موساو فیرعەون و باسی(قارون) یشی تیادا کراوە،لەگەڵ ئەوەشدا سورەتەکانی تر باسی کۆمەڵی پێغەمبەرانی تیادا هاتووە، بەڕاستی چیرۆکی موسا خۆی داوە لەچڵەپۆپە، چونکە فیرعەون بانگەشەی خوایەتی دەکات.

خوای گەورە لە ئایەتەکەدا بە(نبأ) هێناویەتی،چونکە فەرمانێکی گەورەو گرنگە،ئایالەوە گەورەترو گرنگ تر هەیە موسا(علیه السلام)بێت ڕەدی یەکێك بداتەوە کە بانگەشەی خوایەتی دەکات؟.

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلا فِي الأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴾ (القصص/٤).

خوای گەورە شتێکی لەغەیری ئەوەی فیرعەون دەوێت، نەخشەیەك لەغەیری نەخشەی خراپەکاران ویاخی بوان دەکێشێت،خراپەکاران بەهێزودەسەلاتی خۆیان هەڵدەخەڵەتێن وشەپرزە دەبن،وویست ودەسەلاتی خوایان لە بیر دەچێتەوە،وادەزانن ئەو شتە بۆخۆیان هەڵدەبژێرن کەپێیان خۆشە،بەلام شتێك هەڵدەبژێرن کە سودی بۆ دوژمنەکانیان تیایە.

فیرعەون لەسەر زەویدا خۆی بەگەورەزانی وگەلەکەی بەش بەش ولاوازکرد،نێرینەکانی سەردەبڕی وئافرەتەکانی دەهێشتەوە، بێگومان کەسێك بوو لە خراپەکاران.

ئەوهۆکارەی پالی نابەفیرعەونەوە ئەوکارە ناپەسەندە بکات،ئەوەبوو نەوەی ئیسرائیل لێکۆڵینەوەو بەدواگەڕانی ئەوەیان دەکرد کە لە ئیبراهیمەوە کاریان تێ دەکرا، کەبریتی بوو لەوەی کەلە نەوەی

ئیبراهیم ( علیه السلام ) کوڕێك پەیدا دەبێت لەناوچونی موڵکی میسر لەسەر دەستی ئەودا ئەبێت, ئەوەش -کەخوا زاناترە- کاتێك بەسەر (سارة) ی خێزانی ئیبراهیمدا هات لەدەسەلاتی میسردا کەویستی وابوو خراپەی بەسەردا بێنێت , و خوای گەورە پاراستی , ئەم مژدەیە لەناو نەوەی ئیسرائیلدا ناوبانگی دەرکرد , قبطی یەکان لەناو خۆیاندا باسیان دەکرد،وگەیشتەوە بەفیرعەون ،هەندێك لەپیاوەکان ودەسەلاتدارانی دەوروبەری کەقسەیان بۆ دەگێڕایەوە بۆیان باسکرد.ئەویش فەرمانی دابە کوشتنی کوڕەکانی نەوەی

ئیسرائیل،نەبادا ئەم منداڵە لەناو ئەواندا بێت،بەڵام حەزەرەکەی هیچ سودێک نادات لەقەدەری خوا بیپارێزێت.

(ونريدُ ان نَمُنَّ على الذينَ استضعيفوا في الأرضِ) خوای گەورە دەیەوێت منەت بکات بەسەر نەوەی ئیسرائیلداو دەروی خەیریان لێ بکاتەوە ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴾ (القصص/٥)

دەیانکەینە پێشەوا بۆ گرتنە دەستی موڵکی میسر ودەیانکەینە میراتگری.

گومانی تیانی یە کەخوای گەورە دەتوانێت بەندە لاوازەکانی سەقامگیرو جێگیر بکات ئیتر زووبێت یان درەنگ،لایەنگرانی حەق و ڕاستیش نابێت پەلە بکەن لەبەڵێنەکانی خوا.

﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ ﴾ (القصص/٦).

واتە:لاوازەکان بەهێزو دامەزراو دەکەین لەسەرزەویداو بێ دەسەڵاتەکان دەسەڵاتدارو کار ڕۆیشتو دەکەین و،زەلیل کراوەکان سەربەرز دەکەین، ئەمەش هەمووی بۆنەوەی ئیسرائیل دەبێت وەك خوای گەورە فەرمویەتی:-

﴿ سَاء مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُواْ يَظْلِمُونَ ﴾ (الاعراف/١٧٧).

فیرعەون هەموو ڕێگاو شوێنێکی گرتەبەر تا موسا پەیدا نەبێت،هەتا پیاوی دانا چاودێری ئافرەتە سکپڕەکان بکات و کاتی لەدایك بوونەکەی بزانن،هەر ئافرەتێك نێرینەی ببوایە دەبو ئەوکەسانە خێرا سەریان ببڕایە. تا نەوەی ئیسرائیل لاوازبن و تواناي بەرگرییان نەمێنێت.

کۆمەڵێك لەزانایانی تەفسیر دەڵێن:- قبطی یەکان چونەلای فیرعەون و سکالای کەم بونەوەی نەوەی ئیسرائیلیان کرد،وترسان گەورەکانیش لەگەڵ بچوکەکاندا کۆتاییان بێت، ویستیان چارەسەرێك بۆ نەوەی ئیسرائیل بدۆزنەوە،ئینجا فیرعەون فەرمانی دا ساڵێك سەریان ببڕن و ساڵێك وازیان لێ بهێنن.باسیان کردوە کە هارون لەوساڵەدا لەدایك بووە کەلێخۆشبونی تیابووە,وموسایش لەساڵی سەربڕیندا لەدایك بووە, دایکی دەستی داچوو ناڕەحەت بوو, لەکاتی لەدایك بوونەکەدا زۆر حەزەری کردو هەوڵی دا

ئاشکرانه‌بێت, کاتێك منداڵه که‌ی بوو, خوای گه‌وره ئیلهامی بۆنارد سندوقێکی بۆدروست بکات وبه‌په‌ت بیبه‌ستێت که ماڵه‌که‌ی نزیکی ڕووباری نیل بوو, وشیری پێ بدات, ئه‌گه‌ر ترسی له‌که‌سێك بوو بیخاته ناو سندوقه‌که‌و بیدات به‌ده‌م ده‌ریاکه‌وه‌و چمکی په‌ته‌که یش بگرێت کاتێك که‌سه‌کان ڕۆیشتن به په‌ته‌که ڕای کێشێته‌وه بۆلای خۆی.

﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلا تَخَافِي وَلا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ( ( ٩( ١٠(١٢) (١٣) (٢٢) وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ (٢٣) فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ (٢٤) فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢٥) قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ (٢٦) قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ (٢٧) قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ (٢٨) فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ (٢٩) فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِن شَاطِئِ الْوَادِي الأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٣٠) وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الآمِنِينَ (٣١) اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ (٣٢) قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ (٣٣) وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ (٣٤) قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ (٣٥) فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَى بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الأَوَّلِينَ (٣٦)﴾ (القصص / ٧)

ئەم (وەحی)یە بۆ ئیلهام و ڕێنیشاندان بوو, هەروەك چۆن وەحی بۆ هەنگ کردووە لەچیادا شوێن بۆخۆی دروست بکات, ئەمە وەحی پێغەمبەرایەتی نی یە.

خوای گەورە بەهۆی موسا پێغەمبەرەوە عیزەت وسەربەرزی بۆلاوازو ژێردەستەکان دەگێڕێتەوە و دروشمەکانی دینی پێ بەرزدەکاتەوە کەهێشتا هەرشیرە خۆرەیە.وفیرعەون کوڕەکانی نەوەی ئیسرائیلی سەربڕی کە ئەوەش لە بێ مێشکی یەوە بوو،چونکە ئەگەر ئەوە ڕاست بێت ووتراوە فەوتانی موڵکەکەی لەسەر دەستی کەسێکدا دەبێت لەوان ئەگەر ئەمە حەق بێت ئەوا کارەکانی بێ سوود دەبێت،ئەگەر ڕاستیش نەبوو،ئەوا حیکمەت لەسەربڕینی ئەو منداڵانەدا چی یە؟

خوای گەورە بەپێی توانای نەفسەکان تەکلیف دەکات،پێویستە لایەنگرانی حەق هەموو توانای خۆیان بەگەڕبخەن، ئەگەر کەمیشی بێت خوای گەورە بەرەکەتی تێ دەخات ، پاشان هۆکاری بۆ فەراهەم دەهێنێت،منداڵێکی بچووك دەکەوێتە دەست فیرعەون بەڵام لەژێر چاودێری خوادا دەپارێزرێت.

خوای گەورە بەدایکی موسای ڕاگەیاند کە مەترسەو دڵتەنگ مەبەو خەفەت مەخۆ بەڕاستی ئێمە کوڕەکەت بۆ دەگێڕینەوەو بۆت دەکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران.

﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ﴾ (القصص/٨).

پاشان ئالی فیرعەون دەیدۆزنەوە،خوای گەورە دەفەرموێت تاببێتە دوژمن بۆیان خەفەتیان پێ بدات

بەڕاستی فیرعەون و وەزیرە خراپەکەی کە هامانە وسەربازەکانیان و شوێن کەوتوانیان لەهەڵەیەکی گەورەدان، بەڕاستی ئەو سزاو حەسرەتە هەرشیاوی خۆیانە.

﴿وَقَالَتِ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ قُرَّةُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ (القصص/٩).

لەقسەکەی (ئاسیە)ی ژنی فیرعەوندا کە ووتی:بیلبیلەو بینایی چاوەکانی من و تۆیە ئەی فیرعەون،

گەشـــبینی یـــەکی زۆردەردەکەوێت،ئـــەم گەشـــبینی وسودەگەیشـــت بەدڵی،چـــونکەخوای گـــەورە لـــەدنیادا هیدایـــەتی دەدات ولەقیامەتیشـــدا بەجوانترین شێوە ستایشی دەکات،وەك خوای گەورە فەرمویەتی

﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (التحريم/١١).

واتە:-(خوای گەورە نمونەیەکی بۆ ئەوکەسانە هێنایەوە کە باوەڕیان هێناوە کەژنەکەی فیرعەون بوو کاتێك ووتی:ئەی پەروەردگارم لای خۆت لەبەهەشتدا مـــاڵێکم بـــۆ دروســـتکەو لەفیرعـــەون کردەوەکـــانی ڕزگـــارم بکـــەو لەقـــەومی ستەمکارانیش ڕزگارم بکە.

﴿وَقَالَتِ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ قُرَّةُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ (القصص/٩).

کاتێـك ئاسـیەی ژنـی فیرعـەون ووتـی:هیـوادارم ببێتـە مایـەی خۆشـحاڵی چـاوڕوونی بـۆمنیش وتـۆیش، فیرعـەون پێـی ووت:بـۆ تـۆ باشـە بـەلأم بـۆمن نا،واتـە:پێویسـتم نـی یـە. بەفیرعـەونی ووت: مـەیکوژن، بـەڵکو لەئاینـدەدا سـودمان پـێ بگەیـەنێت، یـان دەیکەینـە کـوڕی خۆمـان، لەکاتێکـدا کـە ئـەوان هەرپێی نازانن و هەستی پێ ناکەن.

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾. (القصص / ١٠)

ئینجا دایکی موسا هەستی بە بێتاقەتی و بە بۆشـایەکی زۆر دەکرد لـە دڵ و دەرونی خۆیدا ,بە ڕاستی خەریك بوو ڕازەکە ئاشکرا بکـات,ئەگـەر ئێمـە دڵیمـان دامەزراو نەکردایە تا لەو کەسانە بێت کە بڕوایان بە بەڵێنی خوا هەیە .

(الزمخشـري ) دەڵێت :- دەگونجێت دایکی موسـا لـە هـەم و بێتاقـەتی بـەتاڵ بوبێتـەوە کاتێك بیسـتی فیرعـەون نـەرمی بەرامبـەری نوانـدوەو دەیکاتـە کـوڕی خۆی , نزیك بو ئاشکرای بکات و بڵی کوڕی منە .

(إبن کثیر ) دەڵێت :- ( إبن عباس و مجاهد و عکرمة و سعید بن جبیر و أبو عبیدة و حسن و قتادة و ضحاك و کەسانی تر ) دەڵێن : دڵـی دایکـی مووسـا لە هەمووشتێك بە تاڵ بویەوە کە پەیوەندی بە کارو باری دنیاوە هەبێت , تـەنها خەمی مووسای تیامایەوە . ﴿ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لا

يَشْعُرُونَ ﴾( القصص / ١١) دايكی بە خوشكەكەی موسا – كە كچە گەورەكەی خۆی بوو – ووت شوێنی كەوەو چاوت لەسەری بێت و هەواڵم بۆ بێنەرەوە لە كەنارێكەوە ( موسای بە باوەشی ئافرەتێكەوە بینی ) , ئەوان هەستیان بەوە نەكرد ( كە خوشكەكەی چاودێری دەكات ) .

﴿ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴾ (القصص/ ١٢)

مامۆستا ( سيد قطب ) دەڵێت :– ئەو قودرەتەی چاودێری دەكات كارو باری بەرێوە دەبات و فێڵ لە فیرعەون و ئالی فیرعەون دەكات , وایان لێ دەكات بیدۆزنەوە , و خۆشیان بوێت و بەدوای كەسێك دابگەڕێن شیری بداتێ , بەڵام خوای گەورە قەدەغەی شیر خواردنی لە هەموویان لێ دەكات تا سەرسام بن , مەمكی هەموو ئافرەتە شیر دەرەكان ڕەت دەكاتەوە , دەترسن بمرێت , یان زۆر لاوازببێت , تالە دورەوە خوشكەكەی چاوی پێی دەكەوێت و دەیناسێتەوە , و مەجالێك وەردەگرێت و پێیان دەڵێت :– من كەسێكتان پێبڵێم چاودێری بكات و شیری بداتێ و ئامۆژگاری بكات و كەسێكی خەم خۆرو دڵسۆز بێت بۆی ؟ خێرا قسە كانی دەقۆزنەوەو مژدە بەیەكتری دەدەن , حەز دەكەن ئەگەر ڕاستی وتبێت ئەوا منداڵە خۆشەویستەكە ڕزگاری دەبێت . بێ گومان منداڵە وونبوەكە گەڕایەوە بۆ لای دایكی كە لەشی ساغ بوو و لە شوێنێكی خۆشیشدابوو . فیرعەون دەیپارێزێت و ژنەكەشی چاودێری دەكات .﴿ فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾( القصص / ١٣)

خوای گەورە گێڕایەوە بۆ لای دایكی بۆ ئەوەی دڵخۆشی بكات و چاوی بە بینینی ئاسودە ببێتەوە و ئیتر خەفەت نەخوات .

( زانا محمد متوالي الشعراوي ) دەڵێت :– ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ﴾ بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە هۆكارەكان لە دەستی خاوەن هۆكار دایە , خوای گەورە گێڕایەوە , چونكە خوای گەورە بەویست و دەسەڵاتی خۆی بە ڕێوەی دەبات هەر خوا دەتوانێت دەسەڵاتی خۆی بخاتە نێوان ئادەمیزاد و ئاواتە كانی ناو دڵی یەوە , بۆ ئەوەی بزانێت كە بە ڵێنی خوا ڕاست و حەقە .

﴿ سودو شوێنە وارە ئیمانیەكانی چیرۆكەكە ﴾

١) ئەگەر ستەم گشتی بوو پەرەی سەند خوای گەورە فەرمان دەدات بە لابردنی و لە ناوچونی ستەم کاران و دەسەلأتە کەیان ( شیخ الاسلام ) دەڵێت :- ( خوای گەورە دەوڵەتی داد پەروەر ڕا دەگرێت و دەهێڵێتەوە ئەگەر کافریش بن , و دەوڵە تی نادادو ستەمیش لە ناو دەبات ئەگەر مسوڵمانیش بن ) لەگەڵ ئەوەی فیرعەون کۆمە ڵێك تاوانی گەورەی کۆکردەوە و بانگەشەی خوایەتی دەکرد . خوای گەورە دەسەلأتەکەی لە ناو بردو لاوازو چەوساوەکانی سەرخست .

٢) لە ئایەتی :-﴿ نَتْلُوا عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾. ( القصص /٣ ) . خوای گەورە گرنگی پێدانی خۆی بۆ باوەڕداران دەرخست.

مامۆستا ( سید قطب ) دەڵێت :- خوای گەورە ئەم کتێبە ئاڕاستەی قەومی باوەڕداران دەکات , پەروەردەیان دەکات و گە شەو نەش و نومایان پێ دەکات و بەرنامە ڕێژیان بۆ دەکات , و ڕێگایان بۆ دەکاتەوە پیا بڕۆن , و ئەم چیرۆکەی کە لە سورەتەکەدا گێڕراوەتەوە بۆ ئەوەیە باوەڕداران سودی لێ وەرگرن .

٣) وەك خوای گەورە ڕونی کردەوە :- ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ . خوای گەورە سەرکەوتنی موسای بەسەر فیرعەوندا ڕوونکردەوە و لە ناوچونی فیرعەون و سەربازەکانی و شوێن کەوتوانی ڕاگەیاند . کارەکان بەپێی سونەتە کەونی و شەرعیەکان بەڕێوە دەچن , دەبێت باوەڕداران هەموو هۆکارێکی ڕێپێدراو بگرنە بەر .﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾

﴿ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ﴾. ئەمە ڕادەی هەوڵدانی دایکی موسا بوو لە پاراستنی موسای شیرە خۆرەدا . بەلأم لە ڕاستیدا خوای گەورە چاودێر و سەرپەرشتی بوو , دەگونجێت کە پاراستن و چاودێری بە بێ هۆکاریش بە دەست بێت .

٤. خوای گەورە ئیلهامی ڕێنیشان دان و مەبەست پێکان بۆ باوەڕداران دەنێرێت , خوای گەورە هەواڵی دا کە فەرمانی کرد بە دایکی موسا کە بە خوشکە کەی موسا بڵێت ( قُصّيهِ ) لەگەڵ ئەوەی کە هۆکاری ڕزگار بون و سەرکەوتن بەشێکی ئیمانە , فیرعەونیش لە ڕە حمەت بەدور بێت موسای لە

ماڵە کەی خۆیدا پەروەردەکرد و لە بەرژەوەندی موسا کاری کرد , وەك دەڵێت :- بە ( سمەکان) نی قەبری خۆی هەڵکەند , کافران و خراپەکاران کارێك دەکەن کەوا گومان دەبەن کە سودو چاکەی بۆ خۆیان تێدایە , بەڵام دەبێت بە گەورەترین هۆکار بۆ نائومێدی و خەسارەت مەندی خۆیان , وەك خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ ( الانفال / ٣٦). واتە : بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لە بەردەم ئاین و ڕێبازی خوادا , جا ماڵ و سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکەن ! پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت لە سەریان , لە دواییدا شکست دەهێنن , بێگومان ئەوانەش کە بێ باوەڕبوون بۆ دۆزەخ کۆدەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن.

٥- لەم چیرۆکەدا دامەزراوی و جێگیری بۆ باوەڕداران تیایە، ئەگەر هەیبەتیشیان لاواز بێت و توانای بەرەنگاربونەوەشیان نەبێت،وئەگەر خراپەکارانیش زیاتر لە ڕێ لابەن ویاخی بن و هۆکاری هێزو پیاکێشان و لەناوبردنی زیاتر بگرنە دەست،پێویستە باوەڕداران بەپشتیوانی خوا دڵخۆش بن و چاوەڕێی دەروی خوایی بکەن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی:- ﴿لولا ان ربَطنا على قلبها لِتَكونَ مِنَ المؤمنين﴾ واتە: بەپەیمان و پشتیوانی خواو سەرکەوتنی،وبێگومان خوای گەورە لە چەند ئایەتێکی تردا ڕوونی کردەوە کە خاوەن باوەڕانی پێ چەکدار دەکات، تا بیانکاتە پێشەوا، خوای گەورە دەفەرموێت:- ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة/٢٤).

واتە: پاشان کە نەوەی ئیسرائیل خۆگری و ئارامیان کردە پیشەیان ، کردمانن بە پێشەواو دەسەڵاتمان پێ بەخشین، ئەو کاتە دڵنیایی و بڕوایەکی تەواویان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە (شایستەی ئەو ڕێزە بوون).

٥. (شێخ عبدالرحمن بن ناصر السعدی) دەڵێت: لە سودە وەرگیراوەکان بریتی یە لە:- خوای گەورە سۆزونەرمی بەرامبەر دایکی موسا نواند بەو ئیلهامەی کە بەهۆیەوە کوڕەکەی سەلامەت کرد، پاشان بەو مژدەیەی کەبۆی

دەگێڕێتــەوە، ئەگــەروا نەبوایــە ئــەوا بــەردەوام خەفــەتی لەســەر منداڵەکــەی دەبوو،پاشان بەهۆی قەدەغەکردنی شیرخواردنەکەوە گێڕایەوە بۆلای دایکی، کەئەمەش بەخەیاڵی عەقڵەکاندا نایەت، ولێکیش نادرێتەوە ، بۆدایکی موسا ناڕەحــەت نابێــت کــە کوڕەکــەی کەوتــە دەســت ئــالی فیرعــەون، لەگــەڵ ئــەوەدا پاشەڕۆژو چارەنوسی بۆ دەرکەوت، لەگەڵ شوێنەوارە جوانەکاندا.

٦. لــە ســودەکانی: بێگومــان ئیمــان زیــاد دەکــات و کــەم دەکــات:- ﴿لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لێرەدا مەبەست لە ئیمان ، زیادبوونی ودڵ ئارامی یە.

٧. هــەروەها: لــە گــەورەترین نیعمەتــەکانی خــوا بــۆ بەنــدەکانی بریتــی یــە لەدامەزراوی لــەکاتی دودڵی و ترســدا، بێگومــان وەك ئــەوەی ئیمــانی پــێ زیــاد دەبێت پاداشتیشــی پــێ زیــاد دەبێــت، بێگومــان وتــەو کرداری ڕاستیشــی پــێ جێگیرو دامەزراو دەبێت،وبیرو بۆچونەکانیشی بەجێگیری دەمێنێتــەوە، وئــەو کەسەشی ئەم دامەزراوی یەی بۆ بەدەست نەهات ئەوە لە دودڵی و ترسەوەیە، ئــەوا بــیرو بۆچــونی لەدەســت دەچــێت و عەقڵیشــی لاواز دەبێــت، ئــیتر لــەم حاڵەتەدا ناتوانێت سوود بەخۆی بگەیەنێت.

## ﴿ تەمەنی گەنجی و کۆچی بۆ مەدیەن ﴾

خوای گەورە فەرمویەتی:- ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٤) وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ (١٥) قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (١٦) قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ (١٧) فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ (١٨) فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَا مُوسَى أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًا بِالْأَمْسِ إِن تُرِيدُ إِلَّا أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ (١٩) وَجَاءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ (٢٠) فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢١) وَلَمَّا

تَوَجَّهَ تِلْقَاء مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاء السَّبِيلِ﴾ (القصص/١٤-٢٢).

مامۆستا(سيد قطب)دەڵێت:- ناوەڕۆكی چیرۆكەكە پاش منداڵی موسا تائێره بۆ ماوەی چەند ساڵێكی درێژ بێ دەنگ دەبێت،ئەم بەشەی كەدێت گەنجێتی و تەواوكاری موسا دەگەیەنێت، نازانین دوای گەڕانەوەی بۆ لای دایكی كە شیری پێ دەدات چی ڕووی داو، نازانین چۆن لەناو كۆشكەكەی فیرعەوندا پەروەردە دەكرێت.

ئەمە بەشی دووەمی یەتی كاتێك كە موسا پێ دەگات وگەورە دەبێت،وخوای گەورە حیكمەت و زانستی پێ بەخشیوە،و پاداشتی چاكەكارانیشی پێ داوە.

(بلوغ الأشد) واتە: تەواو پێگەیشتن لەڕووی جەستەیی یەوە، و(الأستواء) واتە: تەواو پێگەیشتن لەڕووی ئەندامی و عەقلی یەوە، كەهەمیشە نزیكی سی ساڵی دەگەیەنێت،ئایا موسا تا گەیشتە ئەم تەمەنە لەناو كۆشكی فیرعەوندا بۆفیرعەون و ژنەكەی مایەوە كە كوڕو پەروەردەكراوی ئەوان بێت؟ یان لێیان جیابویەوە، ولەكۆشكەكەی چویەدەر،ودەر نەچوو بۆ ژیانێكی باشتر كە خۆی لەو وەزعە ڕزگار كات كە نەفسێكی پاكی وەك موسا(علیە السلام) كە هەڵبژێراوی خوایە ڕەنگە لەوێدا ئارام نەگرێت؟ بەڵگەمان لانی یە، بەڵام ناوەڕۆكی ڕووداوەكان شتێكمان دوای ئەمە پێ دەگەیەنێت وەك لەمەودوا دێت، بەدوا داهاتن لەسەر هاتنەكەی زانست و حیكمەتە﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ بەمژدە دان بەوەی كە چاكەی كردوە، وخوای گەورەش چاكەی لەگەڵ كرد بەپێدانی حیكمەت و زانست. ﴿ وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴾ (القصص/١٥).

(إبن كثير) دەڵێت:- (إبن عباس و سعيد بن جبير و عكرمَة قتادة و السدي) ووتويانە:لەنیوەی ڕۆژدا بووە كاتێك كە خۆی كردوە بەناو شارەكەدا كە خەڵكەكەی لە بێئاگایی دا بوون.

﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ﴾ واتە كاتێك چویە ناو شارەكە چاوی بەدوو پیاوكەوت كەشەڕیان دەكرد و بەیەكتریاندا دەكێشا.﴿ هَذَا مِن شِيعَتِهِ﴾ واتە:

یەکێکیان لە نەوەی ئیسرائیلی بوو کە لە دەستەو جەماعەتی خۆی بوو، ﴿ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ ﴾ واتە: ئەوی تریان لە قبطی یەکان بوو ﴿فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ﴾ ئەوکەسەی کەدەستەی خۆی بوو داوای یارمەتی لە موسا کرد بەسەر ئەوی تردا کە قبطی یەکە بوو تا موسا بەهانایەوە بچێت، لەبەرئەوەی موسا(عليه السلام) لەمیسر دەسەلاَت وهێزی هەبوو بەهۆی ئەوەی کە لە مالَی فیرعەونـدا بەخێوکرا بوو،ونەوەی ئیسرائیلیش هێزو دەسەلاَتیان هەبوو ناوبانگیان دەرکردبوو، وسەریان بەرزبوو بوویەوە بەهۆی ئەوەی کە شیریان دا بوو بە موسا ،و بووبوونە خالَوانی- بەهۆی شیرپێدانەوە-، کاتێك ئیسرائیلی یەکە داوای هاناو بەدەمەوە چونی لەموسا کرد بەسەر قبطی یەکەدا موسا بەدەمی یەوە چوو، و﴿فَوَكَزَهُ ﴾ بۆکسێکی پیاکێشا﴿فَقَضَى عَلَيْهِ﴾ هەر لەوێدا دەست بەجێ مرد، قبطی یەکە کافرو هاوەلَ دانەربوو، بەلاَم موسا نەیویست بیکوژێت، بەلَکو ویستی پیاکێشێت و دوری خاتەوە، لەگەلَ ئەوەدا موسا

ووتی:- ﴿ وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ (١٥) قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾(القصص/١٥/١٦)

واتە : ئەم کارەشەیتان پێی کردم (من نەم دەویست بیکوژم )بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە ،(ئینجا دەستەکانی بەرز کردەوە و ) ووتی: پەروەردگارا من بەڕاستی ستەمم لە نەفسی خۆم کردکاتێك لە دەستم دەرچوو ئەو کابرایەم کوشت ، لێم ببورە وبم بەخشە،خوای میهرەبانیش لێخۆشبو و میهرەبانە .

زانا (محمد متولي الشعراوي ) دەلَێت : ئەو شارەی موسای تێچوو ( منف ) بوو ، کاتی چێشتەنگاوی هەلَبژارد ، چونکە خەلَك کەمێك لە مالَەکانیاندا دەخەوتن.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە :- ( سالم ) ی کوڕی ( عبدالله ) دەلَێت :- (ابن عمر) ( خوالێیان ڕازیبێت) ووتی : ئەی عێراقی یەکان چەند پرسیار لەشتی بچوك و

سادە دەکەن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کەس زیاتر گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن ؟ گوێم لە( عبدالله )ی کوڕی ( عمر ) بوو دەیوت : لە پێغەمبەر (ﷺ) م بیست کە دەیفەرموو :- ( بێگومان فیتنە ئالێرەوە دێت بەدەستی ئاماژەی کرد بەرەو خۆرهەلآت لە وێوە هەردوو شاخی شەیتان هەڵدێت ) ئێوەش لەناو خۆتاندا هەندێکتان لەگەردنی هەندێکتان دەدەن ) ئەو زەلامەی کە کوشت لە دەست و پێوەندی فیرعەون بەهەڵە کوشتی , کەچی خوای بالآدەست پێی فەرموو ( کە ئەمە واتاکەیەتی ) :- ( زەلامێکت کوشت کەچی ئێمە تۆمان لە دەست خەمو خەفەت ڕزگار کرد و تۆمان توشی جۆرەها تاقی کردنەوەی سەخت کرد . ) ( طه ٤٠ )[1]

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾ (القصص ١٧)

واتە : ( موسا هەستی کرد پەروەردگاری نزای گیرا کردووە ) . بۆیە وتی :- پەروەردگارا مادام ئاوا نازو نیعمەتی لێخۆشبونت بەسەردا ڕژاندم , من ئیتر هەرگیز نابمە پشتیوان بۆ تاوانکاران .

زانای تفسیر ( الآلوسي ) :- دەڵێت : هاوەڵانی عیلم و زانست پێویستیان بەم ئایەتە هەیە لەوەی کە قەدەغەی یارمەتی دانی ستەم کاران بکەن لە سەر ستەم و خزمەتیان بکەن , ( عبد بن حمید و إبن منذر و إبن أبی حاتم ) لە ( عبدالله بن الولید الوصافي ) یەوە هێناویانە کەپرسیاریان کردوە لە ( عطاء بن أبی رباح ) لە برایەکی کە نوسەرێکی هەبوو , پێی ووت :- بێگومان براکەم شتێکی لە کاروباری دەسەلآتدا نیە . تەنها ئەوە نەبێت کە بە قەڵە مێك بۆی دەنوسێت, ئەوەی کە دێتە دەستی و ئەوەی کە لەو دەردەچێت , ئەگەر قەڵەمەکەی جێ بهێڵێت و وازی لێ بهێنێت قەرزار دەبێت و موحتاجی خەڵك دەبێت , ئەگەر دەستیشی پێوە بگرێت خێری لێی دەست دەکەوێت و دەوڵەمەند دەبێت ,

---

١. بوخاری لە (الفتن ) و(مسلم) لە (الفتن واشراط الساعة ) دا ڕیوایەتیان کردوە.

ووتی : بۆکێ دەنوسێت ؟ ووتی : بۆ ( خالد بن عبدالله القسري ) , ووتی ئایا گوێی لەوە نەبوە کە بەندە چاکەکە ووتی :- ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ . بابراکەت گرنگی و بایەخ بەشتێك نەدات و قەڵە مەکەی فڕێ بدات , بێ گومان خوای گەورە ڕزقی بۆ دەنێرێت . هەموو هێزو توانایەك لە لای خواوەیە , و داخ و حەسرەت بۆ کەسێك کە دینەکەی بە بەشێك لە دنیا فرۆشتووە , وتارێکیش بە توڕە بونی گەورەکەی دەکرێت , ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەمەش بەرستی لێشاوە کەلە ئاستی خۆی زیاتر بەرز بوو هەڵچوو تاگەیشتە ئاستێك وەك لافاوی شیو زۆر بوو و گوندەکانی دەورو بەری داپۆشی [١] پاش ڕوداوەکە ترس ڕوی تێکرد , هەرچاوی دەگێڕا بە ملاو بەولادا . خوای گەورە فەرمووی :-

﴿ فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ ﴾ ( القصص /١٨) .

[١]( محمد متولی الشعراوی ) دەڵێت :- چاوی دەگێڕا بۆ هەلس و کەوتی ئەو خەڵکانەی کەدەیبینین , چونکە دەترسا ئازاری بدەن و تۆڵە ی پیاوە ( قبطي ) یەکەی لێ بکەنەوە , لەوکاتەدا پیاوە ئیسرائیلی یەکەی بینیوە , هاواری کردو وتی : فریام کەوە , موساش پێی ووت : تۆ دەتەوێ سەرم لێبشێوێنیت , بۆ ئەوەی هەڵەکەی دوێنێ دووبارە بکەمەوە , لەگەڵ ئەوەدا بە پەرۆش بوو بۆ یارمەتیدانی , وازی لە بەرامبەرەکەی نەهێنا هێرش بکاتە سەری .

﴿ فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَا مُوسَى أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًا بِالْأَمْسِ إِن تُرِيدُ إِلَّا أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ ﴾ ( القصص/ ١٩)

کاتێك موسا ویستی هێرش بکاتە سەر ئەوەی کەدوژمنی هەردوکمانە ( واتە قبطی یەکان ) . کابرا ووتی :- ئەی موسا دەتەوێت منیش بکوژیت وەك ئەو کەسەی دوێنێ کوشتت , دیارە تۆ هەر دەتەوێت ببیتە زۆر دار لە زەویدا و ناتەوێت بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەی کە چاکەکارن . هەواڵ گەیشتە فیرعەون کە ئەو پیاوەی دوێنێ کوژراوە , ئەوە موسا کوشتویەتی , بۆیە ناردی بەدوای موسادا تادەستگیری بکات ،﴿ وَجَاءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا

موسَى إِنَّ المَلأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ ﴾ ( القصص / ٢٠ ).

واتە: ( پاش ماوەیەك ) لەو پەڕی شارەوە پیاوێکی ( ئیماندار کەلە خزمانی فیرعەون بوو ) بەپەلە هات و ووتی : ئەی موسا (فریای خۆت بکەوە ) بە ڕاستی دارو دەستەی فیرعەون دانیشتون و نەخشە دەکێشن تا بتکوژن ، تا زووە دەرچۆو ئێرە بەجێبهێڵە ، بێگومان من لە ڕاستگۆیانم بۆ تۆ .

﴿ فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢١) وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ ( القصص / ٢١-٢٢ ) .

واتە : موساله شار بەترس و بیمەوە دەرچوو، هەر سەیری ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد،لەبەر خۆیەوە دەیوت : پەروەردگارا لە دەست قەوم ی ستەمکار ڕزگارم بکە . کاتێك ڕووی کردە شاری مەدیەن

(دوو بارە ڕووی کردە پەروەردگاری و) ووتی : ئومێدەوارم کە پەروەردگارم ڕێنموییم بکات بۆ شوێن و جێگەیەکی ڕاست و دروست ( دوور لە کێشەو ناخۆشی ).

( الزمخشري ) دەڵێت ﴿تِلْقَاءَ مَدْيَنَ﴾ مەبەست ڕوو لە مەدیەن و بەرەو مەدیەن بوو ، کە شارەکەی شوعەیب

( علیه السلام ) بوو ، بە ( مەدیەنی کوڕی ئیبراهیم ) ناونرابوو ، لەژێر دەسەڵاتی فیرعەوندانە دابوو ) کە ماوەی نێوان میسر و مەدیەن هەشت ڕۆژ بە پێ ڕۆیشتن دەبوو ، موسا ڕێگاکەی شارەزا نەبوو ، ( إبن عباس ) فەرمویەتی : موسا دەرچوو هیچ زانیاریەکی دەربارەی ڕێگاکەی نەبوو ، تەنها گومانی باشی بە پەروەردگاری هەبوو )[1]

( إبن كثير ) دەڵێت : موسا ووتی : بەڵکو ئەم ڕێگایە بم گەیەنێتە شوێنی مەبەست ، هەروایش بوو، بێگومان گەیشتە شوێنی مەبەست ، بەلام چۆن مەبەستێك !

١. ( الكشا ف ) / (٣/ ٤٠٠)

## ﴿ سوودو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١. مامۆستا ( سید قطب ) دەڵێت : ( قالَ لَهُ موسی إنّكَ لغويٌّ مبين ) کابرایەکی شەڕەنگێز و خراپبوو کە بەمە کۆتای نایەت و تێك ئالآن و شپرزەبوون و چەواشەکردنەکانیشی بەرهەمی نابێت ، مەگەر کارلە کەسێکی شەڕبەرپاکەر بکات لە نەوەی ئیسرائیل ، کە ئەوان لە شەڕکردندا بیّ دەسەلآتن ، و لە چالاکی بەرهەمداریش لاوازن ، ئەم جۆرە تێهەڵچون و پیا هەڵپژانانە بایەخیان نابێت کە زیانی هەیە سود ناگەیەنێت .

٢. لە ئایەتی :- ﴿ فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢١) وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاء مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاء السَّبِيلِ﴾ ( القصص / ٢١- ٢٢ ).بەرەکەتی دوعاو گومانی باش و پشت بەستن بە خوا ، بیّ گومان موسا ( علیه السلام ) بەترسەوە بەتەنهایی دەرچوو ، و هیچی بۆ سەفەرەکەی ئامادەنەکرد بوو ، هیچ بەڵگەیەکیشی لەسەر ڕێگاکە پیّ نەبوو ، بەڵکو ڕووی کردە خوا سەرەتا بە دوعای ڕزگاربوون لە قەومی ستەمکاران ، پاشان داوایی ڕێنمونی کرد بۆ ڕێگای ڕاست و دروست ، بەو جۆرە هەمیشە باوەڕدار دڵی دەبەستێت بە خواوە ، وە چاوەڕێی خەیری لێدەکات ، لەکاتی ناڕەحەتیدا لە دوعا و پاڕەوانەکانیدا ڕۆدەچێت ، ئەمەش پشت بە خوا بەستن و گومانی باشە کە قەرەبووی کەمی هۆکار بۆ باوەڕداران دەکات و دەرگا داخراوەکانی لێدەکاتەوە .

٣.( قرطبي ) و کەسانی تریش بە ئایەتی : ﴿ وَجَاء رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ﴾. بەڵگەیەیان هێناوەتەوە کە قسە هێنان و بردن لە بەرژەوەندی دیندا ڕێی پێدراوە .

٤.زانا ( شیخ عبدالرحمان بن ناصر السعدي ) دەڵێت : ئەگەر ترسی لەناوچون لە کاری کوشتندا بەبیّ مافی ڕەوا هەبوو لە شوێنێکدا ، با ئەو کەسە بە دەستی خۆی ، خۆی لەناو نەبات ، بەڵکو لەو شوێنە ڕابکات لەگەڵ ئەوەی کە توانای هەبێت وەك ئەوەی موسا کردی .

٥.هەر ئەو دەڵێت : ئەگەر هەر چاری نەبوو دوو تاوانی خراپ هاتنەبەردەمی کە بیکات ، با ئەو کامیان سوکترە و زیانی کەمترە ئەوە یان دیاری بکات ، و واز لەوی تریان بهێنێت ، کاتێك موسا ئەوەی لێك دایەوە لە نێوان مانەوەی لە میسردا ، ڕەنگ بوو بکوژرایە ، یان ڕۆیشتنی بۆ هەندێك شوێنی دوور کە

ڕێگاکـەی نەئـەزانی ، و ڕێ نیشاندەریشـی نـەبوو بێجگـە لـە ڕێنمـونی پەروەردگاری – ئەوەش زانراوە کە ئەو سەلامەتی دەوێت – تاوانی تیا نیی یە موسا هەڵیبژێرێت .

٦.پاشان دەڵێت : ئاگادار کردنـەوەی جوانی تیایـە ، کە ئـەویش کەسێك بۆ زانست بڕوانێت و چاوەڕوانی بکات لە پێویستیدا بۆ کار یان قسەی پێ بکات کاتێك شتێکی باشتر و لەپێشتری لانەبوو لەو دوانە ، ئەوا بێ گومان پێویستە داوای ڕێنمونی لە پەروەردگاری بکات کە هیدایەتی بدات بۆ ڕاستترینی دوو قسەکە پاش ئەوەی کە بەدڵی مەبەستی حەقی دیاری کرد و بەدوایدا گەڕا ، بێ گومان خوای گەورە لەو حاڵەدا دەستی لێبەرنادا و نائومێدی ناکات ، وەك بەسەر موسا داهات کاتێك ویستی ڕوبکاتە مەدیەن ، ڕێگایەکی دیاریکراوی نەدەزانی بۆ ئەوێ ، ووتی :– ﴿عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاء السَّبِيلِ﴾ بێگومان خوای گەورە ڕێنمونی کردو ئەوەی پێدا کە خۆی ئاواتی پێ دەخواست و دەیویست .[1]

٧. (الشيخ ابوبكر الجزائري ) لە (هداية الأيات ) دا دەڵێت :–[2]

* سوپاسگوزاری نیعمەت:– کاتێك خوای گەورە لە موسا خۆشبوو، موسا سوپاسی کرد بەوەی کە پەیمانی پێدا کە ئیتر هەرگیز لای تاوان و خراپەدا ڕاناوەستێت .

* خراپی هاوەڵی بێمێشك و شەڕەنگێز: ئیسرائیلی یەکە لەبەر شەڕەنگێزی و گێچەڵکردنی و بێمێشکی هۆکاری هیلاك کردنی موسا بوو .

* ترسی ئاسایی لۆمەی لەسەر نی یە : بێگومان موسا بەشێوەیەك ترسا کە پەنای برد بۆ پەروەردگاری بە دووعا و خوای گەورەش وەڵامی دایەوە، سوپاس و ستایش بۆ خوا .

﴿ مانەوەی موسا ( عليه السلام ) لە مەدیەن و ژن هێنانی ﴾

---

١. ( خلاصته تفسير المنان ) ( ١٣١ – ١٣٢ )

٢. بەکورتی لە ( ايسر التفاسير لكلام العلى الكبير ( ٣/ ٣٨٩ )

خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاء مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاء وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ (٢٣) فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ (٢٤) فَجَاءتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاء قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢٥) قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ (٢٦) قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ (٢٧) قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ ( القصص/٢٣- ٢٨)

زانا ( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- کاتێك موسا گەیشتە مەدیەن ، شارەکەی شوعەیب لەسەر بیرەکەی ئەو شارە کە شوانەکان مەڕو ماڵاتیان لێ ئاودەدا کۆمەڵێك خەڵکی زۆری بینی چڕبوو بوونەوە ماڵاتەکانیان ئاودەدا .

( إبن كثير ) دەڵێت :- مەدیەن ئەو شارە بوو کە خوای گەورە ( اصحاب الأيكة ) ی تیا لەناو برد کە قەومی شوعەیب ( عليه السلام ) بوون . بە پێی قسەی یەکێك لە زانایان لەناو چونیان پێش سەردەمی موسا بوو .

﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأتَيْنِ تَذُودَانِ﴾ بێجگە لەو کۆمەڵەش دوو ئافرەتی بینی کە بەریان لە ماڵاتەکەیان دەگرت تا نەچنە سەر ئاوەکەو تێکەڵ بە خەڵکەکە نەبن .

﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاء مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاء وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾ ( القصص / ٢٣) .

موسا ( عليه السلام ) پێی وتن : کارتان چی یە ؟ وتیان ئێمە جارێ ماڵاتەکەمان ئاو نادەین هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن ، چونکە ئێمە ناتوانین بچینە ناو ئەو خەڵکە زۆرەو ناشمانەوێت تێکەڵاویان بین ، باوکیشمان پیاوێکی بە تەمەن وبە ساڵاچووە لەبەر لاوازی ناتوانێت سەرپەرشتی ئاودانی ماڵاتەکە بکات .

﴿فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە شوێنەکە گەرم و

ناڕەحەت بووە ، ئینجا موسا (علیه السلام ) ماڵاتەکەی بۆ ئاودان لەبەر ئەوەی بەزەیی پیایاندا هاتەوە .
( إبن كثير ) دەڵێت :- شوانەکان کاتێك لە ئاودانی ماڵاتەکانیان دەبوونەوە بەردێکی گەورەیان دەخستە سەر دەمی بیرەکە ، ئینجائەو دوو ئافرەتە دێن ، دەست دەکەن بە ئاودانی ماڵاتەکانیان ، ئینجا ئەو ڕۆژە موسا هات و بەتەنها ئەو بەردەی لابرد پاشان ماڵاتەکەی بۆ ئاودان ، پاشان خستی یەوە شوێنی خۆی وەك چۆن بوو ، وەك پێشەوای باوەڕداران عمر ( خوا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی :- ( ئاو دەرکێشەکە بە دەکەس ئینجا بەرز دەکرایەوە ) بەڵام موسا بەتەنها هەڵی کێشاو بەشی هەموو مەڕەکانی کرد پاشان چوو لایدایە ژێر سێبەری دارێك ، ووتویانە سێبەری داری ( السَّمر ) بووە )[1]
﴿فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾
( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- واتە :موسا ووتی ئەی پەروەردگارا من موحتاجی فەزڵ و چاکەی تۆم ، و پێویستیم بە خواردنە تالەبرسێتی ڕزگارم بکات ! داوای کرد لە خواشتێکی بۆ خواردن پێبدات چونکە زۆری برسی بوو .
( الضحاك ) دەڵێت :- حەوت ڕۆژ مایەوە هیچی نەخواردبوو تەنها لە دانەوێڵەو و گیای زەوی نەبێت ،
( إبن عباس ) دەڵێت : موسا لە میسر دەرچوو بۆ مەدیەن تەنها خۆراکی بریتی بوو لە دانەوێڵەی زەوی و گەڵای ڕوەك ، و پێی پەتی بوو نەگەیشتە مەدیەن پێستی بن پێی لێبوویەوە ، و لەسێبەرێکدا دانیشت - کەئەو هەڵبژێردراوی خوا بوو لەناو دروستکراوەکانیدا - و لەبرساندا سکی نووسا بوو بە پشتیا ، و سەوزی دانەوێڵەکان لەناو سکیدا دەبینرا ، بێ گومان ئەو زۆر پێویستی بە لەتە خورمایەك هەبوو )[2]

﴿ فَجَاءتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاء قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا

---

١. ( إبن أ ي شبة لة ( المصنف ) دا ڕ یوایەتی کردوە . و (المصنف ) لە ( تفسیر القرا ن العضیم )دا بە ( صحیح ) دایناوە .
٢. ( صفوة التفاسير ) ( ٢ / ٤١٢ )

سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ ( القصص /٢٥ )

لـە ئایەتەکـەدا کـورت کردنەوەیـەك هەیـە : هـەردوو کچـکە گەڕانـەوە بـۆلای باوکیان بە خێرایی کە عادەتیان وابوو هێواش دەڕۆیشتن کاری پیاوەکەیان بۆ گێڕایەوە ، ئینجا باوکی فەرمانی کرد بە یەکێکیان کە بچێت موسا بانگ بکات بۆ ماڵەوە ، ئینجا ئەویش بەحەیاو شەرمەوە دەڕۆیشت و

هات بۆلای موسا پێی ووت :- بەڕاستی باوکم بانگت دەکات بۆ ئەوەی کریٚ و پاداشتی ئاودانەکـەت بـداتیٚ کـە مالأتەکـەت بـۆ ئێمـە ئـاودا ، کاتێك موسـا ئـەوەی بیسـت بەقسـەی کـردو لەگـەڵی هـات و چیرۆکی و بـاس و بەسـەرهاتی خـۆی بـۆ گێڕایـەوە کـە چـۆن لـە میسـر دەرچـووەو هـەڵهاتوە لەدەسـت فیرعـەون, باوکی کچەکانیش پێـی ووت:- ئیتر مەترسە تۆ لەقەومی ستەمکاران ڕزگارت بووەولە ژێر دەسەلأت و دەوڵە تی ئەواندا نە ماویت .

( سید قطب ) دەڵێت : پێشتر وتم ئەم پیاوە ( شعیب )ە و جارێکی تـر وتم : ڕەنگـە شـوعەیب بێـت و ڕەنگـە ئـەویش نەبێت،بـەلأم ئێسـتامن زیاترمـەیلم بەولایەدایە کە ئەونەبێت،بەڵکو پیاوێکی بەتەمەنی ترە لەمەدیەندا،ئەوەشی ئەم قسـەیە لەپێشـتر دادەنێـت کـە ئـەم پیـاوە بەتەمـەن و گەورەیە،وشـوعەیب لەناوچونی قەومەکەی خۆی بینیوە کە باوەڕیـان پێـی نەکرد،تـەنها باوەڕدارانی لەگەڵ مایەوە،ئەگەر ئەوە شوعەیبی-پێغەمبەر-بێت،لەناو قەومەکەیدا باوەڕدار مابونـەوە کەماڵەتەکـەی لـەپێش ئـەم دوو کچـەوە بـۆ ئـاو بدەن،ئەمـە هـەڵس و کـەوتی قـەومی بـاوەڕداران نـی یـە کـە دووکچ بچێت مـالأت ئاوبدات ومامەڵـەی ئەوانیش نی یە لەیەکەم نەوەدا کە بەم جۆرە بن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا،لەگەڵ ئەمانەشدا قورئان شتێکی باسنەکرد ئەوە دەربارەی ئەوەی کە موسا فێربکـات بمێنێتەوە، ئەگەر شوعەیبی پێغەمبەر بوایە بێگومـان دەنگـی پێغەمبەرایەتیمان لەشتێك لەمەدا لەگەڵ موسادا دەبیست، کە بێگومان موسا(علیە السلام) دەسال لەگەڵیدا مایەوە.[1]

---

١ / ( في ظلال القران) / (٥/٢٦٨٧)

﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ﴾ (القصص/٢٦)

واتە: یەکێك لە کچەکان ووتی ئەی باوکی بەڕێزمان ئەم پیاوە بەکریٚ بگرە بۆ ئیش کردن، چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بەکریٚ، ئەم پیاوەبە هێزوئەمین و دەست پاك و دەرون پاکەیە .

(الزمخشري) دەڵێت:- ئایەتی﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ﴾ قسەیەکی جوان وگشتگیرەو هیچی لەسەر زیاد ناکرێت، چونکە ئەگەردوو سیفەتی(هێزودەستپاکی) لەکەسێکدا کۆبونەوە کە کار بۆتۆ بکات،ئەوە بێگومان بۆکاری تۆ خۆی دەست بەتاڵ کردوەو مەبەستت بەجیٚ گەیشتووە، بێگومان پێویستی بە ناردنی ئەم قسەیە نەبوو کە لەناو نمونەو قسەی حیکمەتدا بوو کە بڵێت:- لەبەر لێهاتویی و دەستپاکی بەکرێی بگرە.

زانا(محمد متولي الشعراوي) دەڵێت: ئەم ئایەتە حوکمێکمان دەداتیٚ، لەگەڵ ئەوەی کە پێویستی دووکچەکەی ناچارکرد بەدەرچوون،ئەوانیش بەقەدەر ئاستی پێویست پێویستی یەکەیان وەرگرت تێکەڵی پیاوەکان نەبوون، لەمەدا کۆمەڵگای موسڵمان یارمەتیان دەدات، کچ کاتێك کەسێکی دەستپاك دەبینێت داوا دەکات لە باوکی کەکاری پیٚ بکات و کرێی بداتیٚ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چونە دەرەوەکەی بۆ خۆدەرخستن نەبوو، دەیویست کەسێکی دەست کەوێت کە لەگەڵی پاك بێت لەم کارەدا ، بە پێچەوانەی حاڵی زۆرێك لە ئافرەتانی ئەمڕۆ ، کە یەکێك لەوان هەرچی لە توانایدایە بە خەرجی دەدات لە پێناوی دەرچوون و چونە ناو پیاوانەوە .

﴿ قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ ( القصص / ٢٧ ) .

واتە : باوکی کچەکان ووتی : من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم ، بەزاوای خۆم یەکێك لەم دوو کچەت لیٚ ماربکەم بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کاربکەیت ، خۆ ئەگەر دەساڵیشت بردە سەر ئەوە چاکەی خۆتە ، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم ، دەمبینیت ئەگەر خوا بیەوێت لە چاکان دەبم ؟.

( القرطبي ) دەڵێت :- لەم ئایەتەدا گەورەو سەرپەرشتیاری کچەکان پێشنیاری کچەکەی خۆی کرد بۆ موسا ، هەروەها عمری کوڕی خطاب پێشنیاری حەفصەی کچی بۆ ( ابوبکر ) و(عثمان ) کرد ، و ( الموهوبة ) ش پێشنیاری کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ﴿ قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ ( القصص /٢٨).

واتە : موسا پێشنیارەکەی لاپەسەند بوو ، بۆیە ووتی : ئەم پەیمانە لە نێوان من و تۆدایە ، من پێی ڕازیم ، بەڵام هەرکام لەم ماوانەم بۆتەواوکرا با ستەمم لیٚ نەکرێت و ئازادبم ، خوای گەورەش شایەت و ئاگایە بەوەی کە دەیڵێن و بڕیاری لەسەر دەدەن .

ئیمامی بوخاری لە ( سعید بن جبیر ) ەوە ڕیوایتی کردوە ، ووتی یەهود دەربارەی ئەهلی ( حیرة ) پرسیاریان لیٚ کردم : موسا کەم ماوەیانی تەواوکردو بردەسەر ؟

ووتم :- نازانم تا ئو کاتەی ئەم پرسیارە لە ( إبن عباس ) کرا ، منیش پرسیاری لیٚ ئەکەم ، چومە لای و پرسیارم لە ( إبن عباس ) کرد ، ئەویش ووتی :- زۆرەکەیانی بردە سەر کە جوانترو باشتر بوو ، بێگومان پێغەمبەری خوا ئەگەر بڕیارێکی دا دەیباتە سەر [1]

---

١/ ( بوخاری ) دەری هێناوە ، ( الكشاف ) ( قصص الأنبيا ) بەدەستکاریەوە .





**﴿سوودو شوێنەوارە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾**

١) ( القرطبي ) دەڵێت :- مارە بڕینی لەبەرامبەر بەکرێ گرتندا بە ئاشکرا لە ئایەتەکەدا دیارە ، کە فەرمانێکە شەرعمان ڕێی پێدراوە و دانی پیا ناوە ، لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە پیاوێك هیچی نەبوو تەنها ئەندازەیەك قورئانی لەبەربوو ( الأئمة ) ڕیوایەتیان کردووە ، لەبەشێکیشدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ما تحفظ من القران ؟ ) چەندی قورئان لەبەرە ، ووتی :- سورەتی ( البقرة )و ئەوەش لەدوای ئەودێت ، فەرمووی :- ﴿فعلمها عشرين اية وهي امراتك ﴾ واتە : بیست ئایەتی فێرکەو خێزانی خۆت بێت .[١]

٢) ( شيخ عبدالرحمان بن ناصر )دەڵێت :- ئەگەر بەندە کارێکی بە دڵسۆزانە بۆ خوا کرد پاشان شتێکی وەك دیاری لەسەر دەستکەوت بەبێ مەبەستی خۆی ، ئەوە لەسەری لۆمە ناکرێت ، وەك ئەوەی موسا دیاریەکەی قبوڵ کرد لە کاتێکدا کە خۆی داوای نەکردبوو لێی .

٣) هەر ئەوەی فەرمووی : لەگەورەترین و بەڕێزترینی ڕەوشتەکان بریتییە لە هەڵس وکەوتی جوان لەگەڵ هەموو ئەوانەی پەیوەندیان پێتەوە هەیە لە خزمەتکارو کرێکارو خێزان و منداڵ و کەسانی تریش ، لەوەش سوك کردنی کار لەسەر کرێکار وەك ئایەتی : ﴿وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾خراپەی تیا نییە کرێکار حەز بەوەرگرتنی حەق دەست و کرێ بکات بەوەی کە بەکەسێکی خۆش مامەڵە باسی خۆی بکات ، بەمەرجێك لەوەدا ڕاستگۆبێت .[٢]

٤) مامۆستا ( سيد قطب ) دەڵێت : بەو جۆرە سادە و خاوێنی یە کۆمەڵگای ئیسلامی بەڕێوە دەچێت وماڵی خۆی پێك دێنێت و بوونی خۆی ڕادەگرێت بەبێ زمان تێکەڵ بوون و هەڵبزڕکان و خۆنیشاندان و پێچ و پەنا .

---

٢/ تفسير القرطبي ( ٦/ ٤٩٨٨) بەکورتی ، و ( بوخاري ) ڕیوایەتی کردوە .

١/ خلاصته تفسير اللطيف المنان ( ١٣٢، ١٣٣ ).





ئه‌مه‌ش پیاوه به‌ته‌مه‌نه‌که‌ی – هاوه‌ڵی موسا – کردی ، ئه‌و پێشنیاره‌ی خستنه به‌رده‌می و به‌ڵێنی پێدا که ناڕه‌حه‌تی نه‌کات و زۆری لێ نه‌کات و له کاردا ماندووی نه‌کات ، تکای لای خوا وابوو که موسا له چاکه‌کاران بێت له کاره‌که‌ی و وه‌فا نواندنه‌که‌یدا ، ئه‌وه‌ش ئه‌ده‌بێکی جوانه له گفتوگۆدا ده‌رباره‌ی نه‌فس ، له‌لایه‌نی خوایشه‌وه ئه‌و خۆی به‌پاك ڕاناگرێت و پێ له‌سه‌ر ئه‌وه داناگرێت که له‌چاکه‌کارانه ، به‌ڵکو تکاده‌کات وابێت و کاره‌کانی ده‌داته ده‌ست خوا ، موسایش پێشنیاره‌که‌ی قبوڵ کرد و په‌یمانه‌که‌ی به ڕوونی و به ووردی جێ به جێ کرد [1] .

﴿ چیرۆکی گه‌ڕانه‌وه‌ی موسا به خێزانه‌که‌یه‌وه‌و قسه‌کردنی خوا له گه‌ڵی و ڕاسپاردنی به په‌یامی ئاسمانی﴾

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت ﴿ فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ (٢٩) فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِن شَاطِئِ الْوَادِي الأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٣٠) وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الآمِنِينَ (٣١) اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ (٣٢) قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ (٣٣) وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ (٣٤) قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾ ( القصص / ٢٩-٣٥ ) .

---

١/ في ظلال القرآن ( ٥/ ٢٦٨٨)





ئایه‌تی ﴿ فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ ( القصص / ٢٩ ).

واته: کاتێك موسا ئه‌و ماوه‌یه‌ی ته‌واو کرد که له‌سه‌ری ڕێك که‌وتبوون که بریتی بوو له (١٠) ساڵ شوانی و کارکردن له‌گه‌ڵ خێزان و منداڵه‌کانی به‌ره‌و میسر ڕۆیشتن ،. ئینجا موسا ( علیه السلام) له دووره‌وه ئاگرێك ده‌بینێت له ته‌نیشتی چیای ( طور ) ه‌وه کلپه‌و بڵێسه‌ی ده‌دا که چیایه‌کی ڕۆژئاوابوو که‌وتبوه لای ڕاستی ئه‌و ، ﴿قَالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا﴾ وه‌ك ئه‌وه‌ی – خوا زاناتره – به‌بێ ئه‌وان بینیبێتی ، چونکه ئه‌و ئاگره له ڕاستیدا ڕووناکی بوو ، که‌چاك نه‌بوو هه‌موو که‌سێك بیبینێت ﴿لَعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾ واته: به‌ڵکو بچم هه‌واڵی ڕێگاکه بپرسم و بۆتان بهێنمه‌وه، تا به‌ڵکو که‌سێکی لێ بێت ڕێگامان پیشانبدات ،﴿أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ یان لقه دارێکی ئاگراویتان بۆ بهێنم تا ئاگری پێ بکه‌نه‌وه و خۆتانی پێ گه‌رم بکه‌نه‌وه ، که به‌ڵگه‌بوو له‌سه‌رئه‌وه‌ی ڕێگایان وون کردوو له شه‌وێکی تاریکدا .[1]

﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِن شَاطِئِ الْوَادِي الأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ ( القصص / ٣٠ ).

واته : کاتێك موسا له ئاگره‌که نزیك بویه‌وه له که‌ناری لای ڕاستی دۆڵه‌که‌وه له شوێنێکی پیرۆزه‌وه له‌پاڵ دره‌خته‌که‌وه بانگی لێکرا : ئه‌ی موسا ، ( ئه‌وه‌ی گفتوگۆت له‌گه‌ڵدا ده‌کات ) به‌ڕاستی منم (الله ) که په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانیانم .

﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ واته ئه‌و گۆچانه‌ی که به ده‌سته‌وه‌یه فڕێی بده ، وه‌ك موسا خۆی دانی پیا نابوو :﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى(١٧) قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى﴾ ( طه / ١٨/١٧ ).

---

١ / قصص الأنبياء ( إبن كثير )

واتە: ئەو دار گۆچانەی کە بەدەستەوەیە خۆت دەیزانیت فڕێی بدە
﴿ فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى ﴾ (طه /٢٠)
جاکە هەر فڕێی دا ، یەکسەر بوویە مارێکی زیندوو ، بە خێرای دەجولاًیەوە ﴿فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ﴾بینی بە خێرایی دەجولێتەوە وەك تۆ لەمار هەڵهات و ئاوڕی نەدایەوە ، چونکە سروشتی بەشەر وایە لەو شتانە ڕادەکات و هەڵدێت ، کاتێك خوای گەورە بە موسای ووت :﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الآمِنِينَ﴾ ( القصص /٣١ ) .
ئەی موسا وەرە مەترسە بەڕاستی تۆ لەو کەسانەیت کە ئەمین دەبیت و لەترس بەدوریت . ئینجا موسا گەڕایەوە و ڕاوەستا لەیەکەم مەقامیدا ، ( دەستی کردبە ناو دەمی مارەکەداو بوویەوە بە دار گۆچان )[١] .
﴿ اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ واتە : ئەگەر دەستت کرد بەژێر چمکی کراسەکەتدا بۆ بن باڵت پاشان دەرت هێنا دەیبینیت ڕووناکی دەدات و دەدرەوشێتەوە وەك بەشێکی مانگ ، بۆ ئەمەش خوای گەورە فەرمووی ﴿مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾کە ئەمە خراپ و تێك چوون نی یە .
﴿وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ﴾هەروەها بازوەکانت بهێنەرەوەیەك ز لەسەر سنگ و دڵت داینیٚ ، ترس و بیمت نامێنێت . ﴿فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ﴾ واتە : فڕێدانی گۆچانەکەو بوون بە ماری کەدە جولاًو دەرهێنانی دەستت بە سپیێتی لە ژێر باڵتەوە بەبێ عەیب و ئازارو نەخۆشی دوو بەڵگەو نیشانەی ڕوون بوون کە خوای گەورە بە موعجیزە دای بەتۆ ، کە دەبنە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی تۆ ، ﴿إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ﴾ کە دوو نیشانەن بۆ فیرعەون و قەومەکەی لە دەسەلاًتداران و کەسە گەورەکان ی دەوروبەری و شوێنکەوتوانی ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ واتە : بەڕاستی ئەوان لە فەرمان و گوێڕایەڵی خوا چونەتە دەرەوە[٢] .

٢/ . صفوة التفاسير ( محمد علي الصابونى)
٢. ( تفسير القرآن العظيم ) بە کورتی .

لەگەڵ ئەو نیشانانەدا حەوت نیشانەی ترت دەبێت کە دەکەنە نۆ ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لأَظُنُّكَ يَا مُوسَى مَسْحُورًا﴾ ( الإسراء / ١٠١ ) .

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ (٣٣) وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ (القصص / ٣٣-٣٤ ).

خوای گەورە هەواڵ لە بەندەو پێغەمبەری خۆی موسا ( عليه السلام ) دەدات کە چۆن وەڵامی پەروەردگار دەداتەوە ، کاتێك فەرمانی پیٚ کرد بچێت بۆ لای دوژمنی سەرسەخت ، فیرعەون ، کە موسا لە خاکی میسر هەڵهات لەناو ستەم و نادادی دەسەلاٚتیان ، کاتێك قبطی یەکی کوشت ، بۆ ئەمانە ووتی :- پەروەردگارا ، خۆت دەزانیت کە بێگومان من کەسێکم لێکوشتوون ، و دەترسم بمکوژنەوە ، هارونی برام لە من زمان پاراوترە ، ئەویش لەگەڵ من رەوانە بکە بۆ ئەوەی پشتیوانیم لیٚ بکات و پشتگیرم بێت و بەڕاستدا نەرم بێت ، چونکە بە ڕاستی من دەترسم بڕوام پیٚ نەکەن .

﴿قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾ ( القصص / ٣٥ ) .

خوای گەورە فەرمووی :- ئێمە پشت وبازووی تۆ بەهۆی براکەتەوە بەهێز دەکەین و دەسەلاٚتێکتان پێدەبەخشین کە نەتوانن بێنە سەرتان , جا بە هۆی موعجیزەکانمانەوە هەردوکتان و هەموو شوێنکەوتوانتان سەرکەوتوو زاڵن.

﴿ سوودو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) لەو نیشانای کە خوای گەورە بە خشینی بە موسا ڕێزو گەورەی تیابوو بۆ موسا , کە چۆن خوای گەورە تایبەت مەندی کرد بە پەیامی ئاسمانی و قسە لەگەڵ کردن , بەبیٚ هۆکار گفتو گۆی لەگەڵ کرد .

( الالوسي ) : دەڵێت: ( الحسن ) ووتی خوای گەورە بانگی لە موسا کرد بە وەحی نەك بە قسەکردنی ئاسایی , زانایان دانیان نەناوە بەوەدا چونکە لەگەڵ

( دیار) دا پێچەوانە دەبێت , و بێگومان ئەو ڕووی تایبەتمەندی بەناوی ( کلیم ) لە نێوان پێغەمبەراندا تیادەرناکەوێت .[1]

٢) ( القرطبی) دەڵێت :- ( وسارُ بأهْلِهِ) وتراوە :- بەڵگەی تیایە کە پیاو دەتوانێت لەگەڵ خێزانەکەی بڕوات خۆی چۆنی بوێت , چونکە فەزلی قەوامەی بەسەر خێزانەکەیدا هەیە و پلەی زیاترە , باوەڕداران لەگەڵ مەرجی یەکتردان , وباشترینی مەرجەکانیش ئەوەیە کەوەفا بکات لەوەدا کە داوێنی بۆی حەلاڵ کراوە.[2]

٣) ( شیخ عبد الرحمن بن باصر السعدي ) دەڵێت : نیشانەی پێغەمبەران و ڕێزی پیاو چاکان و ئەوەشی خوای گەورە لە عادەت دەری دەکات لە نیشانەکان و گۆڕینی هۆکارەکان یان قەدەغەکردنی بەهۆکار بونیان یان پێویست بونیان بە هۆکاری تر , یان بونی ڕێگرێك بۆ پەك خستنیان , ئەوە لەنیشانە گەورەکانن لەسەر تاك و تەنیایی خوای گەورە و بێگومان ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە , هیچ ڕووداوێکی بەبایەخ و کەم نرخ لە قەدەری خوا ناچێتە دەرەوە , ئەو موعجیزە ڕێز گرتن و گۆڕان کاریانە ئەوەی ئەوە ناکات کە خوای گەورە بەسەر دروستکراوەکان کردوویەتی لە هۆکارە هەستپێکراوەکان و یاسا جێگیرەکان , تۆ لە سونەتی خوا دا گۆڕانکاری نابینێت .[3]

٤) ( شیخ أبوبکر الجزائري ) لة ( هداية الآيات ) دا دەڵێت : ڕوونکراوەتەوە کە تۆڵە کردنەوە زانراوەو کاری پێ کراوە لە لای نەتەوە پێشکەوتوەکان , بەڵام

١/ روح المعاني ( ٢٠/ ٧٤)
٢/( .الجامع الأحكام القرآن ) ( ٦/ ٤٩٩٧)
٣/ خلاصة تيسير اللطيف المنان ( ١٣٣) .
٤/ ايسر التفا سير (٣/ ٣٩٩) .

شارستانیەتی ڕۆژئاوا هات ئینکاری کرد , ئیتر ئینسان زاتی خوێن ڕشتنی ناحەقیان کرد, بەشێوەیەك کە پێشتر لە مێژوی بەشەریدا وێنەی نەبووە لەبەر ئەوە ڕاست دەبێت کەلە باتی شارستانیەتی بەشەری ناوی بنێیت خەسارەتی مرۆیی.[1]

٥) لە شوێنە وارە ئیمانیەکان , ( دڵنیایی ) ە , بەوەی کە ڕەحمەتی خوا بۆ بەندەکانی گەورەترە لە ڕەحم و بەزەیی خۆیان بە خۆیان , موسا ( علیه السلام ) ووتی : ﴿لعلّي ءاتيكم منها بِخَبرٍ او جَذوَةٍ مِن النارِ لعلّكم تصطلونَ﴾ ئەمە بەزەیی خۆی بوو, ئینجا تەماشایی ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە بکە بەموسا کە چۆن بەپەیام ڕێزی قسەکردن لەگەڵ خوای گەورەدا گەڕایەوە, خوای گەورە لەخۆیان زیاتر بە بەندەکان بەزەیی ترە, و لەخۆشیان زیاتر زانایە پێیان , ئەو بەبەزەیی ترینی خاوەن بەزەیی یەکانە, داوا کارین لە خوای گەورە کە گەنجینەی ڕحمەتی خۆیمان لێ بکاتەوە .

﴿ بە یەکگەیشتی موسا ( علیه السلام ) لەگەڵ فیرعەون و باوەڕهێنانی ساحیرەکان﴾

خوای گەورە لەسورەتی (الاعراف ) دا دەفەرمویەتی :-﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَظَلَمُواْ بِهَا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ (١٠٣) وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (١٠٤) حَقِيقٌ عَلَى أَن لاَّ أَقُولَ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ (١٠٥) قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (١٠٦) فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ (١٠٧) وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاء لِلنَّاظِرِينَ (١٠٨)

قَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَـذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ (١٠٩) يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ (١١٠) قَالُواْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِي الْمَدَآئِنِ حَاشِرِينَ (١١١) يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ (١١٢) وَجَاء السَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالْواْ إِنَّ لَنَا لأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ (١١٣) قَالَ نَعَمْ وَإَنَّكُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ (١١٤) قَالُواْ يَا مُوسَى إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ (١١٥) قَالَ أَلْقُوْاْ فَلَمَّا أَلْقَوْاْ سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ (١١٦) وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (١١٧) فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ (١١٨) فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَانقَلَبُواْ صَاغِرِينَ (١١٩) (١٢٤) (١٢٦) وَقَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَونَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءهُمْ وَنَسْتَحْيِـي نِسَاءهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ (١٢٧) قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللّهِ وَاصْبِرُواْ إِنَّ الأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ (الاعراف / ١٠٣ - ١٢٦ )

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَظَلَمُواْ بِهَا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ ( الاعراف / ١٠٣ ) .

واته :- دوای ئەو پێغەمبەرانەی کە لەئایەتەکانی پێشوی (سورەتی الاعراف) ناویان هاتووە , موسا مان هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی جۆراو جۆر دا بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەکەی نارد, کەچی ستەمیان لەخۆیان کردو پێی بێباوەڕبوون , جا تەماشابکەو ببینە بزانە چۆن بوو سەرئەنجامی ئەوانەی کە چێنەری تۆی خراپە بوون .

( زانا محمد رشید رضا ) دەڵێت :- ئەوان بەبێ باوەڕی ستەمیان لە خۆیان و قەومەکەیان کرد، خۆیان بە گەورە نیشان داو سەرکەشیان کرد ، تاوانی ئەوانەیان لەسەر بووو تاوانی قەومەکەشیان لەسەر بوو کە بێ بەش کران لە ئیمان بە شوێنکەوتنی فیرعەون و دەستەکەی , بێگومان پاداشتی ئەوانیان دەبوو ئەگەر باوەڕیان بهێنایە , ئەوەی دەگەیاند کە موسا ( علیە السلام ) بۆ

قەومی نەوەی ئیسرائیل و فیرعەون و دار ودەستەکەی نێراوە .[1]

( الآلوسي ) : دەڵێت :- ﴿إِلَى فِرْعَوْنَ﴾ ناوێکی دیار و ناسراوە بۆ کەسێك پاشان بوو بەناز ناو بۆ هەموو پاشایەکی میسر لە عەمالیقەکان , وەك ئەوەی کە ( کیسرا ) ناوبوو بۆ پاشای فارسەکان , و ( قیصر ) بۆ پاشای ڕۆمەکان , و ( نجاشی ) بۆ حەبەشیەکان , و ( تُبع ) بۆ پاشای یەمەن .[2]

﴿وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (١٠٤) حَقِيقٌ عَلَى أَن لاَّ أَقُولَ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ( الأعراف /١٠٤-١٠٥) واتە : موسا وتی : ئەی فیرعەون من پێغەمبەرێکم بۆ لای تۆ نێراوم لە لایەن خوای بەدیهێنەر کە پەروەردگار و بەدیهێنەرو پاشای هەموو شتێکە , هەمیشە سورم و بە شیاو حەقی دەزانم کە تەنها هەواڵی حەق و ڕاستی دەربارەی خوا بڵێم لەوەی کە دەیزانم دەربارەی خوا , بە ڕاستی من بەبەڵگەی یەکلاکەرەوە و ئاشکراوە بۆ لای ئێوە هاتووم لە لایەن خواوە , تۆش شایەتی لە ڕاستگۆیی من بدە , واز لە نەوەی ئیسرائیل بهێنەو ئازادیان بکە تا لەگەڵ من بێن بۆ زەوی خاکی پیرۆز کە نیشتمانی باوك و باپیرانیانە .[3]

( إبن الجوزي ) دەڵێت :-فیرعەون نەوەی ئیسرائیلی لە کاری قورس و گراندا بەکار دەهێنا .[4]

﴿ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (١٠٦) فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ (١٠٧) وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاء لِلنَّاظِرِينَ (١٠٨) قَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَـذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ (١٠٩) يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ ( الأعراف / ١٠٦ – ١١٠ ) .

واتە : فیرعەون بڕوای نەکردو وتی : ئەی موسا ئەگەر بەڵگەیەکت هێناوە دەبیخەرە ڕوو ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت , ئینجا موسا ( علیه السلام )

---

١/ تفسير المنار ( ٩/ ٣٩-٤٠)

١. روح المعاني ( ٩/ ٣٩- ٤٠)

٢. صفوة التفاسير ( محمد علي الصابوني ) (٤٥١/١ )

٣. زاد الميسر ( ٣/ ٢٣٧ )

گۆچانەکەی فڕێداو بوو بە مارێکی گەورە و درێژ , ( إبن عباس ) دەڵێت : گۆڕا بۆ مارێکی گەورە و دەمی کرد بویەوە و بەخێرایی بەرەو فیرعەون دەچوو , وئاشکراو دیار بوو خەیاڵی نەبوو, پاشان موسا دەستی دەرهێنا و بو بە کافوری سپی و بریقەی دەدایەوە بۆ تەماشاکەران , ئینجا هەندێك لە دەسەلأت داران و کەسە گەورەو دیارەکانی دەوری فیرعەون ووتیان : بەڕاستی ئەمە ساحیرێکی زانا و شارەزایە , دەیەوێت بەم شتانە ئێوە لە خاك و ئاوی خۆتان دەرکات و دەربە دەرتان بکات جا ئێوە چ فەرمانێك دەدەن ؟

( الزمخشري ) دەڵێت :-﴿ إِنَّ هَـٰذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ﴾ . واتە : شارەزا بەسیحرو جادوو ئەو کەسەیە کەچاوی خەڵکی بەفێڵ دەگرێت تا گۆچانی لیٚ بکات بە مارو ڕەنگی پێستی لێبکات بە سپی , ئەگەر بڵێیت : ئەم قسەیە دڵدانەوە بوو بۆ فیرعەون, ئەویش بۆ کەسە گەورەکانی دەوری خۆیی ووت, ولێرە دڵدانەوە بوو بۆ ئەوان,فیرعەون و ئەوانیش وتیان, قسەکەی فیرعەون وقسەکەی ئەوانیش گێڕدرایەوە, یان لەپێشدا فیرعەون ووتی و لێی قۆزرایەوە و کەسە دەسەلأتدارەکانی دەوریشی بە دوای خۆیانیان ووت .

﴿قَالُواْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِي الْمَدَآئِنِ حَاشِرِينَ (١١١) يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ (الأعراف/ ١١١-١١٢ ).

واتە : ووتیان : جاریٚ وازی لیٚ بهێنە لەگەڵ براکەیداو چەند پیاوێك بنێرە لەشارەکاندا تا هەموو جادو گەرەکان کۆ بکەنەوە, تا هەموو جادوگەرێکی شارەزاو زانات بۆ بهێنن کە وەك ئەوبێت .

( ابو منصور ) دەڵێت :- فەرمان دان بەدواخستن ی کارەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەو فەرمانێکی تری بەسەردا پێش خستووە کەئەویش برتیی بوو لە ویستی کوشتنی ,ئینجا ووتیان : وازی لیٚ بهێنە و دوایخە یان حاڵی خۆی بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە .[١]

١. محاسن التأويل ( ٧/ ٢٢٨ )

﴿وَجَاء السَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالْواْ إِنَّ لَنَا لأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ (١١٣) قَالَ نَعَمْ وَإَنَّكُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ (الاعراف /١١٣-١١٤)

واتە: لەناو قسەکاندا (لابراوێك ) هەیە ، کە ئەویش بریتیە لەوەی کە فیرعەون داوای ناردوە بۆ جادوگەرەکان کە کۆببنەوە بۆ موسا کە هاتنە لای فیرعەون ووتیان : ئایا ئێمە شاباشێکمان هەیە ئەگەر لەم ململانێ یەدا سەرکەوتوو بوین و بردمانەوە ؟ فیرعەون ووتی : بەڵێ بێگومان ئێوە لەکەسی نزیکان و ڕێزلێگیراوان دەبن . کاتێك ئەم بەڵێنە یان لە فیرعەون وەرگرت ، ووتیان :

﴿قَالُواْ يَا مُوسَى إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ﴾ ( الأعراف / ١١٥ ).

واتە : ساحیرەکان بە موسایان ووت ئەی موسا یان ئەوەتا لە پێشدا تۆ شتەکەی خۆت فڕێ بدە یان ئێمە فڕێی دەدەین .

ووتراوە : ئەوان موسایان ئیختیار کرد بۆ ئەوەی دەسپێکردنی پاڵەوانیەتیەکە دیاری بکات ، ئیتر گرنگ نەبو بەلایانەوە کامیان لە پێشدا دەست پێ بکات .[1]

( الزمخشري ) دەڵێت :- دیاریکردنی موسا لە پێشدا بۆ ئەوان ئەدەبێکی جوان بوو ، چاودێری بارودۆخی ئەو کەسانەی کرد لەگەڵیاندایە .[2]

( القرطبي ) دەڵێت : ئەدەبیان لەگەڵ موسادا جوان بوو کە ئەوەش هۆکاری ئیمان هێنانیانە .

﴿ قَالَ أَلْقُوْاْ فَلَمَّا أَلْقَوْاْ سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ ( الأعراف / ١١٦ ).

واتە : موسا : ووتی : دەی ئێوە دەستبەکاربن و دایبەزێنن ، جا کاتێك دایانبەزاند جادویان لە چاوی خەڵکی کرد ، ئەوان حەبل و گوریس و پەتەکانی

٢. محاسن التأويل ( ٧/ ٢٣٠ )

٣. الكشاف ( ٢ / ١٤٠ )

خۆیانیان هەڵدا لەبەرچاوی خەڵکەکە دەجولآیەوە کە فێڵ بوو لە چاویان کرابوو ، و هیچ ڕاستیەکی تیانەبوو ، خەڵکەکە ڕاچڵەکین و زۆر ترسان کاتێك لەبەرچاویان وەك ماری لێهاتوەو دەجوڵێت ، ئەوان جادویەکی گەورەیان هێنابوو هةركةس بيبينايه دةترسا .

﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (١١٧) فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ (١١٨) فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَانقَلَبُواْ صَاغِرِينَ﴾ ( الأعراف / ١١٧ – ١١٩ ).

واتە : خوای گەورە دەفەرموێت : وەحیمان کرد بۆ موسا ووتمان : ئەی موسا دار گۆچانەکەی دەستت هەڵبدە ، ئینجا ئەویش هەڵی دا ، ئینجا لەو کاتەدا دەبێتە مارێکی گەورە و بەخێرایی دەجوڵێت ، هەرچی شتێك ئەوان لە فێڵ و درۆ و تەزویر دایان بەزاندبوو هەمووی بەخێرایی هەڵدەلوشێت و قوتدەدات ( إبن عباس ) دەڵێت :بەلای هەرشتێك لە حەبل و تەختە فڕێدراوەکانی ئەواندا بڕۆیشتایە قوتی دەدا ، ئینجا حەق و ڕاستی جێگیر بوو دەرکەوت بۆ هەر کەسێك کە بینی و ئامادەبوو ، و فێڵی جادوگەرو درۆزنانیش مایە پوچ دەرچوو ، ئینجا فیرعەون و قەومەکەی لەو کۆبونەوە گەورەیەدا ژێر کەوتن و بچووك بوونەوە و سەرشۆڕ بوون . بەڵام ئەم کارە لە کتو پڕە هێشتا کۆتای نەهاتووە ، بەردەوام دیمەنەکە بەرەو کارەساتی لە پڕ و گەورەتر دەچێت:

﴿وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ (١٢٠) قَالُواْ آمَنَّا بِرِبِّ الْعَالَمِينَ (١٢١) رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ (١٢٢)﴾ (الأعراف / ١٢٠ – ١٢٢ ) .

واتە :جادوگەرەکان کە هەق و ڕاستیان بۆ دەرکەوت سوجدەیان بردوو ئیمانی خۆیانیان ڕاگەیاند بە پەروەردگاری جیهانیان ، چونکە هەق ڕایکێشان ، (قتادة ) دەڵێت : ئەوان سەرەتای ئەو ڕۆژە کافربوون و ساحیر بوون ، بەڵام لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا شەهادەتیان هێناو چاکەکار دەرچوون .

﴿قَالَ فِرْعَوْنُ آمَنتُم بِهِ قَبْلَ أَن آذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَـذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَا أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (١٢٣) لأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلاَفٍ ثُمَّ لأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (الأعراف / ١٢٣– ١٢٤) .

واتە : فیرعەونی زۆردار بە جادوگەرەکانی ووت : ئایا ئێوە هەروا بە ئاسانی

باوەڕتان بە موسا هێنا ، پێش ئەوەی داوای ڕێپێدان لەمن بکەن ؟ کەمەبەستی لە سەرزەنشت کردنیان بوو ، بەڕاستی ئەم کارە ئێوە کردتان فێڵێك بوو ئێوەو موسا لە میسر ڕێکتان خستبوو پێش ئەوەی دەرچن بۆ گەڕانەوە ، بۆ ئەوەی قبطي یەکانی پێ دەربەدەر بکەن و نەوەی ئیسرائیلی تیا نیشتە جێ بکەن ، بەڕاستی ئەمە چاو بەست بوو لە خەڵکی تا شوێن جادوگەرەکان نەکەون لە ئیماندا ، ئینجا پاشتر دەزانن و تێدەگەن کە چیتان بەسەر دێنم ، ئەمە هەڕەشە بوو فیرعەون ئاڕاستەی کردن ، پاشتر ووتی : بەڕاستی من دەستێك و قاچێکی هەریەکە لە ئێوە بە پێچەوانەوە دەبڕم ، واتە دەستی ڕاست لەگەڵ قاچی چەپ ، یان دەستی چەپ لەگەڵ قاچی ڕاست ، پاشان هەموتان هەڵدەواسم و لەدار دەدەم .

کە ئەمەش سوکایەتی و سەرشۆڕیە بۆ ئێوە و نمونەی ئێوە ، بێگومان سزادان و ناشرینکردن هۆکاری دەستی خراپەکارانە لە ڕووبەڕوبونەوەی هەق و ڕاستیدا ، کە ناتوانن بەبەڵگە و نیشانەی جوان وەلای بنێن ، بەلأم کاتێك نەفسی ئادەمیزاد کاتێك ڕاستی ئیمانی تیا ئاشکرا دەبێت بەسەر هەموو هێزەکانی سەر زەویدا زاڵ دەبێت و گاڵتەی بە خراپەی خراپەکاران دێت ، و عەقیدەو باوەڕ لەناخیدا سەردەکەوێت ،و لەناوچون وبڕاوەی لا سوك دەبێت تا دەگاتە ژیانی هەتا هەتایی و نەبڕاوە ، ئەو ناوەستێت بپرسێت بۆچی دەگرین ؟ و بۆچی بانگ دەکەن ؟ بۆچی لادەبەن ؟ بۆچی زیان دەدەن ؟ و چیت دەست دەکەوێت ؟ بۆچی لەسەر ڕێگای ناڕەحەتی و دڕك و داڵ و قوربانیدانت تووش دەبێت ؟ چونکە ئاسۆی ڕوونی لەبەردەمەوە دیارە، ئەو چاوەڕێی شتێك لەسەر ڕێگەکە ناکات .

﴿قَالُواْ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ (١٢٥) وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلاَّ أَنْ آمَنَّا بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءتْنَا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ (الاعراف/١٢٥-١٢٦).

واتە:جادووگەرەکان کاتێك باوەڕیان هێنا ووتیان: بەڕاستی ئێمە بەمردنمان دەگەڕێینەوە بۆ لای خوا چارمان نی یە،ناترسین لەوەی کە تۆ هەڕەشەت لێ کردین و گوێ نادەین بەمردن، ئای چەند خۆشە مردن لەڕێگەی خوادا، ئینجا ئێمە هیچ تاوان وعەیبەیەکمان نەبوو تەنها ئەوەمان هەبوو کە باوەڕمان بە خواو نیشانەکانی هێنابوو!!، ئەی پەروەردگارا سەبرو ئارامی بڕێژە بە

سەرماندا لەسەر سزدانی فیرعەون بۆمان و لەسەر ڕێبازو دەستوری ئیسلام بمان مرێنەو توشی فیتنەمان نەکەیت.

زانا(محمد متولي الشعراوي) دەڵێت:جادووگەرەکان کە باوەڕیان هێنابوو بە فیرعەونیان ووت:- بەڕاستی تۆ پەلەت کرد لەخەیردا بۆ ئێمە چونکە ئێمە لەپەروەردگارمان نزیك دەبینەوە، تۆ بەبێ مێشکی خۆت چاکەو خەیرت بۆ ئێمە دەستەبەرکرد، بەجۆرێك کە خۆشت نەتدەزانی.

هەروەها دەڵێت: ووشەی (الإفراغ) واتەکردنی شتێك بەسەرشتێکی تردا تادای پۆشێت، وەك ئەوەی بڵێن:- ئەی پەروەردگارا هەموو ئارامی یەکمان پێ ببەخشە، چونکە ئەوان زۆر پێویستیان بەئارامگرتن بوو چونکە فیرعەون هەڕەشەی لێ کردبوون دەست و قاچیان ببڕێت.[1]

## ﴿سوودو وانە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە﴾

١- (الجشمي) دەڵێت:- دەگونجێت موعجیزەکان لە جنس و ڕەگەزی ئەو شتەبن کە لە ناو قەومەکەدا بلاوە،ونەتوانن نموونەی بهێنن، زانستی پزیشکی لەسەردەمی عیسا(علیه السلام) بلاو بوو، بەلام عیسا هات بەفەرمانی خوا مردووی زیندودەکردەوەو کەڕولاڵ و بەڵەکی چاك دەکردەوە، ئەمە لەتوانای پزیشکەکاندانەبوو. لەسەردەمی پێغەمبەری خۆیشماندا(ﷺ) ڕەوانبێژی وزمانپاراوی و خوتبەو شیعر بلاو بوو، قورئان هات و تەحەددای هەمووی کرد. ئایەتەکان بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی کە ئەوان بەفێڵ حەبل و گۆچانەکانیان خستە جوڵە تاوا دەرکەوت لەبەر چاوی تەماشاکەران کەزیندون،بەلام کەلەسەر بنەڕەتەکەی خۆی وەستێنرا وانەبوو، زانرا کە نمونەی ئەوە شتێکی ڕاهێنراوەو دروستکراوە کە سیحرو لەبەرچاو تێکدانە، لەبەرئەوە موعجیزە لەو شتانە جیا دەبێتەوە. پاشان ووتی:- بەڵگەی تیایە لەسەردان نانی فیرعەون بەزەلیلی و

---

١. تفسير الشعراوي.

لاوازی خۆیدا کاتێك هاواری برد بۆ جادوگەرەکان کە بەکارەکەی خۆیان نارەحەتی لێ دووربخەنەوە[1]

٢- زانا(محمد رشید رضا)دەڵێت:- ئەوەی خوای گەورە لەم چەند ئایەتەدا گێڕایەوە بەدوعای جادووگەرە باوەڕ هاردوەکان کۆتایی پێ هێنا: ﴿جَاءتْنَا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾

واتە:- ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان پێ ببەخشە بەفراوانی بەوەی کەجێ پێمان قایم ودامەزراو بکەیت لەسەر ئیمان و پشتگیریمان بکەیت هەروەك چۆن ئاوی ناو دەفرێك بەتاڵ بکرێت بەوجۆرە دڵمان لەترسی غەیری خۆت بەتاڵ بکەیت، تەنها مەبەست بەفەزڵ و گەیشتن بەخۆتی تیابێت،و وەك موسڵمانی خۆت بمانمرێنە، ملکەچی فەرمان ونەهی خۆتمان بکەیت، بەهەڕەشەی فیرعەون توشی فیتنەو سەر لێشێواوی نەبین،نە لەقسەو نە لە کردارماندا لەفەرمانی تۆ دەرنەچین.ئەوان بە دوعاکانیان ئەمانەیان لەنێوان تەواوی ئیسلام و ئیماندا کۆکردەوە[2]

٣- (الشیخ أبوبکر الجزائري) لە(هدایة الآیات)دا دەڵێت:-

*سوونەتی خوا ڕوونە لەوەی کە حەق و ناحەق کاتێك لەهەرشوێنێکدا بەیەك گەیشتن هەمیشە سەرکەوتن بۆ حەقە.

* بەتاڵ بوون ومایە پوچ بوونی جادوو و دۆڕانی خاوەنەکەیەتی، وەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾ (طه/٦٩) [3]

---

٢. محاسن التأویل (٢٣١/٧) بە دە ست کارییە وە

٣. تفسیر المنار (٧٧/٩) بە کورتی.

١. أیسر التفاسیر(٦٤/٢- ٦٥ ).

## ﴿لەناوچوونی فیرعەون ورزگاربوونی موسا و باوەڕداران﴾

خوای گەورە لەسورەتی( الشعراء) دا دەفەرمویێت:- ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ (٥٢) فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ (٥٣) إِنَّ هَؤُلَاء لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ (٥٤) وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ (٥٥) وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ (٥٦) فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (٥٧) وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ (٥٨) كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ (٥٩) فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ (٦٠) فَلَمَّا تَرَاءى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٦٢) فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ (٦٣) وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ (٦٤) وَأَنجَيْنَا مُوسَى وَمَن مَّعَهُ أَجْمَعِينَ (٦٥) ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ (٦٦) إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (٦٧) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (الشعرا /٥٢-٦٨).

(القرطبي) دەڵێت:- خوای گەورە فەرمووی:- ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾(الشعراء/٥٢)

سوونەتی خوایە بۆ بەندەکانی کە باوەڕدارانی ڕاستگۆ لە دۆستان و خۆشەویستانی خۆی ڕزگار دەکات، کە دانیان ناوە بە پەیامی گشت پێغەمبەراندا، وکافرانیش لەناودەبات لەدوژمنەکانیان، ئینجا موسا فەرمانی کرد کە نەوەی ئیسرائیل لەشەودا دەرچن، وبە بەندەش ناوی بردن چونکە باوەڕیان بە موسا هێنابوو، وپێی ووتن:کە فیرعەون وقەومەکەی شوێنتان دەکەون تا بتان گێڕنەوە و لەباوەڕەکەتان پەشیمانتان بکەنەوە، هەر لەناو مانای ئەم ئایەتەدا بۆی باس کردن کە بێگومان خوای گەورە لەدەست ئەوان ڕزگاریان دەکات، ئینجا موسا لەگەڵ نەوی ئیسرائیلدا لەبەرەبەیاندا دەرچوون [١]

(محمد علي الصابوني) دەڵێت:- خوای گەورە فەرمووی: بە ڕێگای وەحی

٢.جامع لاحكام القران (٦ / ٤٨١٦) بە كورتی

فەرمانمان کرد بەموسا کە لەشەودا لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلدا بەرەو ئاڕاستەی دەریا بڕۆن.

﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ﴾ (الشعراء/٥٣) .

واتە: فیرعەون (کەهەواڵی زانی) ناردی بۆ شارەکان کە هێز کۆبکەنەوە و(نەیەڵن نەوەی ئیسرائیل کۆچ بکەن) وپێی ووتن ﴿إِنَّ هَؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ (الشعراء /٥٤).

واتە: نەوەی ئیسرائیل دەستەیەکی کەم ولاوازن و زوو دەیانگرین و باڵبەستیان دەکەین،

(الطبري) دەڵێت: نەوەی ئیسرائیل شەش سەدو حەفتا هەزار کەس بوون،بەڵام فیرعەون بەبەراورد لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەکەمی دانان.[١]

﴿وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ﴾ (الشعراء/٥٥).

واتە:بەڕاستی ئەوان سەرکەشیان کردووە و کارێکیان کردووە ئێمەیان تووڕەکردووەو دەرونیان ناڕەحەت کردوین.

﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ﴾ (الشعراء /٥٦).

واتە: خەمتان نەبێت، ئێمە لەهەموو کاتێکدا لەنەخشەو پلانی ئەوان ئاگادارین،

﴿فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (٥٧) وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ (الشعراء٥٧-٥٨).

واتە:خوای گەورە فەرمووی ئێمە فیرعەون و قەومەکەیمان لەناو باخ و سەرچاوەئاویەکانی خۆیان و لەناو گەنجینەی جۆراو جۆرو جێگەوڕێگەی ڕازاوە دەرهێنا، واتە لەناو ئەم هەموو نازونیعمەتانە بۆناو دۆزەخ، وهەموو ئەو شوێنە بەرز وبێستان وئاوو ڕووبارو سەروەت و سامان و ڕزق و دەسەڵاتەیان لەدنیادا بەجێ هێشت.

---

٣ . الطبري ( ١٩ / ٤٦).

﴿كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ (الشعراء/٥٩).

واتە بەو شێوەیەی کە بۆمان ڕوون کردنەوە کە دەرمان کردن ئینجا نەوەکانی ئیسرائیلمان کردە خاوەنی شوێن و سامانەکانی ئەوان پاش لەناو بردن و خنکاندنی فیرعەون و قەومەکەی.

﴿فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ (٦٠) فَلَمَّا تَرَاءى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ (الشعراء/٦٠-٦٢).

واتە: ئەوسا(فیرعەون و دارو دەستەکەی) شوێنیان کەوتن، لەگەڵ خۆرهەڵاتندا پێیان گەیشتن، کاتێك هەردوو کۆمەڵەکە چاویان بەیەك کەوت و بەیەك گەیشتن،واتە کۆمەڵی موسا و کۆمەڵی فیرعەون، ئینجا هاوەڵانی موسا ووتیان:ئەوا بە ڕاستی پێمان گەیشتن فیرعەون وسەربازەکانی دەمان کوژن، کاتێك کە بینیان فیرعەون ودەستەکەی لەپشتیانەوەن و دەریایش لەبەردەمیانەوەیە،ووتیان :- تازە ئێمە تیا چووین.

(إبن كثير) دەڵێت:- کاتێك هەردوولا کۆمەڵی یەکتریان دیاری کردو بینی، ئیتر هیچ نەمایەوە تەنها کوشتن و قسەکردن و خۆپاراستن نەبێت، ئینجا شوێن کەوتوانی موسا سکالأیان لای موسا کرد لەو حاڵەی کە تیای بوون وبینیان، بەلأم موسا(عليه السلام) پێی ووتن: (كَلاً إنَّ معيَ ربِّي سيهدين) (إبن كثير) دەڵێت:لەو کاتەدا موسا لەدوای سوپاکەوە بوو، ئینجا هات بۆ پێشەوە، وسەیری دەریاکەی کرد بینی بەیەکدا دەچێت و شەپۆلی گەورە دەدات.

ئینجا موسا ووتی: نەخێر پێتان ناگەن، بێگومان من پەروەردگارم لەگەڵە، دەم پارێزێت و سەرم دەخات،ڕێنمونیم دەکات بۆ ڕزگار بوون.

زانای تەفسیر (الرازي) دەڵێت:- بەهۆی دووفەرمانەوە نەفسیان بەهێز بوو:یەکەمیان: کە موسا پەروەردگاری لەگەڵ بوو کە ئەمەش بەڵگەی سەرکەوتن ودەستەبەرکردنی یارمەتی بوو، دووەم:- ووشەی(سيهدين) واتە:

ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێگای ڕزگاربوون، کاتێک ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای ڕزگاربوون و دوژمنەکانی لەناوبرد،ئەوا کارەکە گەیشتۆتە کۆتایی سەرکەوتن [1]

ئینجا پاش ئەمانە خوای گەورە وەحی بۆ موسا(علیه السلام) نارد:-

﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ (الشعراء/٦٣).

واتە:ئەی موسا بەدار گۆچانەکەت بماڵە بە دەریاکەدا، (هەر کە ئەو کارەی کرد) دەریا شەق بوو کەهەر بەشێکیان شەپۆلەکانی هێندەی چیایەکی بەرز بەرز بویەوەو ناوەندەکەی بویە ڕێگای پەڕینەوەی پیادە.( کەدوانزە بەش بوو بۆ هەر دوانزە تایەفەکەی نەوەی ئیسرائیل ) ئینجا خوای گەورە لە سورەتی(طه)دا دەفەرموێت:- ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لاَّ تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَى (٧٧) فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ فَغَشِيَهُم مِّنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ (٧٨) وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَى﴾ (طه/٧٧- ٧٩). واتە:سوێند بەخوا بەڕاستی نیگامان بۆ موسا کرد کە شەوڕەوی بە بەندەکانم بکە و ڕێگەیەکی ووشکانیان لەدەریادا بۆ دابین بکە،لەکاتێکدا ترسی ئەوەت نی یە کە پێت بگەن و خەمی نقوم بوون و تیا چونیشت نی یە، ئینجا فیرعەون بە سەربازەوە شوێنیان کەوتن لەپڕ لەناو ئاوەکەدا شەپۆلی دەریا دای بەسەریانداو هەموویانی داپۆشی بەچ داپۆشینێك! فیرعەون قەوم وگەلەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێنمونی نەکردن.

﴿وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ﴾ (الشعراء/٦٤)

(إبن كثير)دەڵێت: خوای گەورە فەرموی : فیرعەون وسەربازەکانیمان لەدەریاکە نزیکخستەوە ،ئەوەندە نزیك بوونەوە تا چونە ناو دەریاکەوە بەشوێن نەوەی ئیسرائیلدا.

﴿وَأَنجَيْنَا مُوسَى وَمَن مَّعَهُ أَجْمَعِينَ (٦٥) ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ﴾(الشعراء ٦٥- ٦٦).

١.التفسير الكبير (١٣٨/٢٤)

واتە: موسا و نەوەی ئیسرائیلمان ڕزگار کرد و ئەوکەسانەیش کە شوێنیان کەوتن و چونە سەردینی ئەوان،کەسمان لەوان لەناو نەبرد. فیرعەون و سەربازەکانیشی تیاچوون و کەسیان لێ ڕزگار نەبوو.(إنَّ في ذلِكَ لَآيةً)واتە: بەڕاستی لەم چیرۆك و بەسەرهاتەدا نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەبوو کە سەرکەوتن و پشتیوانی بۆ بەندە باوەڕدارەکانی خوا بوو،و لەناوچون و نوقم بونیش بۆ دوژمنانی خواو باوەڕداران بوو، ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (٦٧) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (الشعراء/٦٧-٦٨) .

واتە:لەگەڵ بینینی ئەم نیشانەو دیمەنە گەورەیەدا زۆرینەی خەڵك باوەڕیان نەهێنا، ودڵ دانەوەیەکیشی بۆ پێغەمبەر(عليه السلام) و هەڕەشەیەکیشی بۆ دوژمنان تیایە.بەڕاستی خوای گەورە تۆڵەسێنەرە لەدوژمنانی و بەڕەحم و بەزەییشە بۆ دۆستانی باوەڕداری.

## ﴿پەندو وانە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە﴾

١) پێغەمبەران(عليهم السلام) لە هەمووکەس زیاتر دڵنیان بە سەرکەوتنی خوایی و بەڵێنەکانی،ئەگەر کارەکانیش تەسك بوو بنەوەو ناڕەحەت بووبن،وخەڵکیش گومانیان لە پشتیوانی و دەروکردنەوەی خوایی هەبێت.

٢) دوعاکەی موسا(عليه السلام) لەسەرفیرعەون وەڵام درایەوە کە خوای گەورە سەروەت وسامانیان لەناو بەرێت و دڵ و دەرونیان ببەستێت، ئەوان باوەڕ ناهێنن هەتا سزای بەئازار نەبینن. واتە: کاتێك ئەوە سودیان پێ نادات ئەواداخ وحەسرەتی لەسەر دەبێت، خوای گەورە بەموسا و هارونی برای فەرموو،کاتێك ئەو دوعایەیان کرد: ﴿ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلاَ تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ (٨٩) (يونس/٨٩).

واتە دوعاکەتان وەڵام درایەوە.[١]

---

١.( قصص الأنبياء ) ی إبن كثير، بەدەستکاری یەوە.

٣) بەردەوامی لەسەر کردەوە چاکەکان لەکاتە خۆش و بێ گرفتەکاندا هۆکاری ڕزگاربوونە لەناڕەحەتی یەکان،وەك هەندێك لە پێشین ووتویانە: لە کاتە خۆشەکاندا زۆر یادی خوا بکەن، کاتێك یونس (علیه السلام) نەهەنگەکە قوتی دا و چویە ناوسکی، خوای گەورە فەرمووی:-
﴿فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ (١٤٣) لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ (الصافات/١٤٣-١٤٤).

واتە: ئەگەر تەسبیحات ویادی خوای نەکردایە،تا ڕۆژی قیامەت لە ناوسکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە.و فیرعەون کە کافرو سەرکەش بوو ویادی خوای نەدەکرد، کاتێك کەوتە ناو دەریا کەوە ووتی:- ﴿ وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (یونس/٩٠).
واتە: فیرعەون خەریك بوو دەخنکا لەو کاتەدا ووتی:- وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کە هیچ خوایەك نی یە جگە لەو خوایەی کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوەو من ئیتر لە موسڵمان و ملکەچانم.
خوای گەورەش پێی فەرموو:-﴿آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (یونس/٩١).
واتە:- پێی وترا:- ئا ئێستا(باوەڕ دەهێنیت) لەکاتێکدا بەڕاستی پێشتر یاخی بوویت و لەڕیزی ئەوانەدا بویت کە تۆوی خراپەیان دەچاند.؟
٥) کەسانی موسڵمان باشترو لەپێشترین کەسن بە پێغەمبەرانی خوا،لە(إبن عباس)ەوە فەرمووی: کە پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو مەدینە بینی جوولەکە لەڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو دەبن, فەرمووی:- (ما هذا اليوم الذي تصومونهُ) واتە: ئەم ڕۆژە چی یە وا ئێوە ڕۆژوی تیا دەگرن؟ ووتیان:ئەو ڕۆژەیە کە موسا تیایدا بەسەر فیرعەوندا سەرکەوت، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو:- (ئێوە شیاوترن بە موسا لەوان دەی ئێوەش ڕۆژوو بگرن)[١]

٦ /رجب/١٤٣٠ هیجری بەرامبەر ٢٩/ ٦/٢٠٠٩ زاینی دووشەممە

٢. بوخاری وموسلیم و ترمذي ڕیوایەتیان کردووە.

## ﴿چیرۆکی عیسای کوڕی مەریەم ( علیه السلام )بەندە و پێغەمبەری خوا﴾

### فەزڵ و گەورەیی عیسای کوڕی مەریەم ( علیه السلام )

١. خوای گەورە مژدە دەدات بە مەریەمی کچ کە عیسا ( علیه السلام )، ی پێ دەبەخشێت ، وەك دەفەرموێت : ﴿ إِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ (٤٥) وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ (ال عمران / ٤٥-٤٦ ).

زانا ( إبن كثير ) دەڵێت : ئەمە مژدەیەك بوو لە فریشتەکانەوە بۆ مەریەم ( عليهاالسلام ) کە کوڕێکی گەورەی دەبێت ، بونیشی بەوشەیەك لەلایەن خواوە دەبێت ، واتە دەفەرموێت : ( كُنْ فيكونُ ) واتە : ببە ، دەبێت ، ﴿وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ واتە : ناوبانگ و پلەو پایەی بەرزی لای خوای گەورە دەبێت ، لە دونیادا بەوەی کە خوای گەورە شەریعەت و بەرنامەی لە کتێبدا بۆ دەنێرێت و شتانی تریشی کە خوای گەورە پێی دەبەخشێت ، و لە ڕۆژی قیامەتیشدا لای خوای گەورە تکای ڕزگاربوون بۆ کەسانێك دەکات کە خوای گەورە مۆڵەتی دەدات ، وەك پێشەنگێك لەگەڵ برایانی پێغەمبەری ( اولی العزم ) دا قبوڵ دەکرێن ﴿وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً﴾ واتە : بانگەوازی یەکتا پەرستی دەکات کە خوایەکی بێ هاوەڵە لە کاتی بچوکی و منداڵیدا کە نیشانەو موعجیزەیەکی گەورەیە ، و لەحاڵەتی گەورەیشدا کاتێك خوای گەورە وەحی بۆ دەکات﴿وَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ واتە : لە گوفتار و کرداریدا لە چاکەکارانە ، زانستی ڕاست و کردەوەی چاکی دەبێت .

٢.خوای گەورە پاکی کردۆتەوەو بۆ لای خۆی بەرزی کردۆتەوە خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾( ال عمران / ٥٥ )

( محمد علي الصابوني ) دەڵێت : واتە : من بەرزت دەکەمەوە بۆ ئاسمان پاشان دەت مرێنم پاش پاککردنەوەی تەواوت مەبەستیشی لە مژدە پێدانەکە کە لە دەست جولەکە ڕزگاری دەکات بەبێ ئازار بۆ ئاسمان بەرزی دەکاتەوە ،

ئینجا لەشەڕی خراپەکاران دەتپارێزم و جیات دەکەمەوە کە ویستیان تۆ بکوژن ، ( الحسن ) دەڵێت : لە جولەکەیی و مەسیحی و مەجوسی کافرانی قەومەکەی پاکی کردۆتەوە ، و شوێنکەوتوانت دەکەین بە باوەڕداران ، بەرزی دەکەینەوە بەسەر ئەو کەسانەدا کە ئینکاری نیشانەکانی خواو پێغەمبەرایەتی تۆ دەکەن تا ڕۆژی قیامەت .[1]

( ابن کثیر ) دەڵێت : زۆرینە دەڵێت : مەبەست لە ووشەی ( الوفاة ) لەم ئایەتەکەدا واتە : ( النوم ) خەوتن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام /٦٠ )

واتە : بەڕاستی ئەو خوایە کە بەشەو دەتان خەوێنێت[2]

٣. هەروەها لە کۆتایی دنیادا وەك بڕیاردەرێکی دادپەروەر دادەبەزێت و خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و جزیەو سەرانە لادەبات :-

خوای گەورە فەرمویەتی :- ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ ( النساء / ١٥٩ ).

واتە : هیچ کەسێك نی یە لە خاوەن کتێبەکان ، کە باوەڕ نەهێنێت بە عیسا پێش ئەوەی گیانی دەربچێت ، بەڵکو سوێند بە خوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لە پێش مردنیدا ، و لە ڕۆژی قیامەتیشدا شایەتە بەسەریانەوە ، ( ابوهریرة) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت :

( ئەمە دەقە کوردیەکەیەتی ) ( سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، بێگومان نزیکبوەتەوە کە عیسا ی کوڕی مەریەم دادەبەزێت بۆ ناوتان وەك بڕیاردەرێکی دادپەروەر ، و خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و باج و سەرانە لادەبات ، ئینجا ماڵ و سەروەت و سامان دەڕژێت و زۆر دەبێت بەجۆرێك کەس

---

١.صفوتت التفاسیر ( بەدەست کاریەوە ).

١. تفسیر القرآن العظیم ( بەکورتی ) .

وەری نەگرێت ، تاوای لێ دێت کە یەك سوجدەبردن خەیری لە هەموو دنیا و ئەوەش تیایەتی زیاتر دەبێت ) . پاشان ( أبو هريرة ) دەڵێت : ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێننەوە : ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ ( النساء / ١٥٩ ) .[١]

عیسا ( علیه السلام ) کاتێك دادەبەزێت بە دەستورو شەریعەتی ئیسلام حوکم دەکات ، پێشەوایەتی موسڵمانان دەکات و داد پەروەری بڵاودەکاتەوە و دەچەسپێنێت ، دینی(یەهود) جولەکە و مەسیحییەکان بەتاڵ دەکاتەوە ودادپەروەری دەچەسپێنێت هەرچی شتێك خوای گەورە بەحەرام و قەدەغەکراو دایناوە ئەویش حەرامی دەکات .

زانایان دەڵێن :- حیکمەت لە دابەزینی عیسا ( علیه السلام ) بەبێ پێغەمبەرانی تر (علیهم السلام) ڕەتدانەوەیە بۆ جولەکە کەوایان لێك داوەتەوە کوشتویانە ، خوای گەورە درۆکەیان ڕوون دەکاتەوە، کە بێ گومان عیسا ئەوان دەکوژێت ، یان دابەزینی لە کاتی نزیك بوونی ئەجەلیەتی تا لەسەر زەویدا بنێژرێت .[٢]

( إبن كثير ) دەڵێت : بێگومان عیسا لای منارە سپی یەکەی شاری ( دمشق ) دادەبەزێت ، نوێژی بەیانی دابەستراوە ، پێشەوای موسڵمانان پێی دەڵێت : ئەی ڕۆحی خوا فەرموو بچۆرە پێشەوە و پێشنوێژی بکە ، دەفەرموێت : نا، نەخێر ،ئێوە هەندێکتان بۆ هەندێکتان فەرمان ڕەوای بەڕێزی خوان بۆ ئەم ئومەتە ، لە گێڕانەوەیەکی تردا : عیسا ( علیه السلام ) پێی دەڵێت : ئەوەتا نوێژ کە بۆتۆ دابەستراوە تا پێشنوێژی بکەیت ، ئینجا نوێژ لە پشتیەوە دەکات ، پاشان بەڕێ دەکەوێت و موسڵمانانی لەگەڵدایە کە داوای ( دەجال ) دەکەن ، ئینجا عیسا پێی دەگات لای دەرگای ( لُدّ )دا ، بەدەستی پیرۆزی خۆی دەیکوژێت .[٢]

---

٢. بوخاري لە ( أحاديث الأنبياء ) و موسليم لە ( الأيمان ) دا ڕیوایەتی کردووە .

١/ بەکورتی لە ( فتح الباري ) ( ١/ ٤٩١- ٤٩٢ )

٢ / (قصص الأنبياء ) ی إبن كثير.

٤. خوای گەورە باسی کردووە کە بەوشەو فەرمانی ئەو بـوە و عیسـا ڕۆح و گیـانێکی تایبەتە لەلایەن خواوە : خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ وَلاَ تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقِّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلاَ تَقُولُواْ ثَلاَثَةٌ انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا اللّهُ إِلَـهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَن يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَات وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً﴾ ( النساء / ١٧١ ).

واتـە : بەڕاسـتی مەسـیح ، عیسـای کـوڕی مەریـەم جگـە لـەوەی پێغەمبـەری خوایە ، لەدایك بوونەکەی بەفەرمانی خوا بووە ، کە لە مەریەمدا (بەجەستە بوو) عیسا ڕوح و گیانێکی ( تایبەتە ) لەلایەن خواوە لـە(عبادة )ەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت)پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی (کەئەمـە دەقـە کوردیەکەیـەتی) (هەرکـەس شـایەتی بـدات کەیـەك خـوا هەیـە و هـاوەڵی نـی یـە ، و موحەمـەد بەنـدەو پێغەمبـەری خوایە ، و عیسـا بەنـدەی خـواو پێغەمبەرە ، و بەوشـەیەك بۆ سەر مەریـەم بەرجەسـتە بـوەو ، ڕۆح و گیـانێکی ( تایبەتـە ) لەلایـەن خـواوە ، وبەهەشـت حەقەو ئاگر حەقە ، ئـەوا خـوای گـەورە دەیخاتـە بەهەشتەوە لەسـەر هەر هۆکارێك بووبێت ) [١].

(القرطبي) دەڵێت : مەبەستی ئەم فەرمودەیە ئاگـادار کردنەوەیەکە لـەوەی کە مەسیحیەکان ڕوویداوە

لـە گومڕاییـان دەربـارەی عیسـا و دایکـی ، ئەوەشـی لێوەردەگیرێـت کـە بگەیەنرێت بە مەسیحیەکان کاتێك موسڵمان بوون .

(الحافظ) دەڵێت : ووشەی ﴿ وَكَلِمَتُهُ ﴾ (النسـاء / ١٧١ ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە عیسا بەڵگـەو نیشـانەی خوایـە بـۆ بەنـدەکانی ، خـوای گـەورە بـەبێ بـاوك بەدیهێنا ، و پێش گەیشتن بەکاتی خۆی قسـەی پـێ کـرد ، مـردوی پـێ زینـدو کردەوە ، ووتراوە : ناوبراوە بە ووشەی خوا ، چونکە بە ووشـە و فـەرمانی خـوا بەدیهاتووە .

---

١/ بوخاری لە ( أحاديث الأنبياء ) و موسلیم لە ( الأيمان ) دا ڕیوایەتیان کردووە .

وناونانیشی بە ( ڕۆح ) گیان و ڕۆح ئەوەبوو کە خوای گەورە بڕیاری دا لەسەر دەستی ئەودا مردوو زیندوبکاتەوە ، ووتراوە : چونکە خاوەنی ڕۆحە ، بەدیهات بەبێ بوونی بەشێك لە خاوەن ڕۆح .[1]

٥. هەروەها لە فەزڵ و ڕێزەکانی :-

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی :- (( انا اولى الناس بِعيسى إبن مريم في الدنيا و الأخرةِ و الأنبياء إخوةٌ لَعلاّت امهاتهم شتى و دينهم واحد ) [2] .

واتە : من نزیکترین و لەپێشترین کەسم بە عیسای کوڕی مەریەم لەدونیاو قیامەتدا ، و پێغەمبەران هەموویان بران باوکیان یەکەو دایکیان جیاوازە ، دینیان یەکە ).

( الحافظ ) دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) تایبەت و نزیکترین بوو ، چونکە عیسا ( عليه السلام ) مژدەی بەهاتنی دابوو لەدوای خۆی .

( إبن الأثير ) دەڵێت : ( إخوة العلاّت ) واتە : ( اولاد العلاّت ) ئەو کەسانە دایکیان جیاوازەو باوکیان یەکە ، مەبەستی ئەوە بوو ، ئیمانیان یەکەو شەریعەتیان جیاوازە .[3]

٦.[4] لە فەزڵ و ڕێزەکانی :

( أبو هريرة ) دەگێڕێتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : - ( مامِن مولودٍ يولد إلاّ نخَسَهُ الشيطان فيستهِلُّ صارخاً ، إلا اين مريَم و امّهُ ) واتە : ( هیچ لەدایك بوویەك لە دایك نابێت مەگەر شەیتان سیخورمەیەکی لێ دەدات ، ئینجا لەدایك بووە دەست دەکات بە گریان تەنها عیسای کوڕی مەریەم و دایکی نەبێت ) پاشان ( ابو هريره ) ووتی : ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێننەوە:

---

٢/ فتح الباري ( ٦ / ٤٧٤ ) بە کورتی .

٣/ بوخاری لە ( أحاديث الانبياء ) دا ، ڕیوایەتی کردووە .

٤/ بوخاری لە ( التنسير ) و موسلیم لە ( الفضائك ) دا ڕیوایەتی کردووە .

﴿ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ ( ال عمران / ٣٦ ).

واتە : مریەم و وەچەکەی دەپارێزم بە تۆ ئەی خوایە کەلەشەیتانی ڕەجم کراو بیان پارێزیت ).[١]

٧. لەفەزڵ و ڕێزەکانی :

( ابو هریره ) گێڕاویەتیەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:-( رای عیسی إبن مَريمَ رَجُلاً يَسْرِقُ فقالَ لَه : اسَرَقْتَ ؟ قالَ : كَلاّ و اللّه الذي لا إله إلا هُوَ ، فقال عيسى : امنت باللّه و كذبتُ عَيْني )[٢]

واتە : (عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزی دەکرد ، پێی ووت :- ئایا دزیت کرد ؟ ووتی : نا سوێند بەو خوایەی کە تاك وتەنهایەو هەرخۆی شیاوی پەرستنە، ئینجا عیسا ووتی:- باوەڕم هێنا بە خواو چاوی خۆمم بەدرۆ خستەوە).

(النووي) دەڵێت:- (القاضي) ووتوویەتی:- ئاشکرای قسەکە: باوەڕم پێ کرد بەوەی کە سوێندی خواردبە خوای گەورە و ئەوەشم بەدرۆ دانا کە بۆم دەرکەوت لە ڕواڵەتی ئاشکرای دزی یەکەیدا، ڕەنگە لە شتێکی بردبێت کە مافی خۆی بووبێت یان بەڕازی بوونی خاوەنەکەی، یان مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی نەبوبێت،یان بۆی دەرکەوتبێت کە دەستی بۆ درێژ کردوە شتێکی بردبێت، کاتێك سوێندی بۆ خوارد گومانەکە بەتاڵ بویەوەو لێی گەڕایەوە.[٣]

١/ شرح النووي على صحيح المسلم .

٢/ بوخاری لە ( أحاديث الانبياء ) و موسلیم لە ( الفضائل ) دا ڕیوایەتیان کردووە .

٣ /شرح النووي على صحيح مسلم.

﴿چیرۆکی لەدایك بوونی عیسای بەندەو پێغەمبەر لە مەریەمی کچی پاك داوێن﴾

خوای گەورە فەرمویەتی:-﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا (١٦) فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا (١٧) قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا (١٨) قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لأَهَبَ لَكِ غُلامًا زَكِيًّا (١٩) قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا (٢٠) قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا (٢١) فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا (٢٢) فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا (٢٣) فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلاَّ تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا (٢٤) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا (٢٦) فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا (٢٨) فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا (٢٩) قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا (٣٣) ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ (مريم/١٦- ٣٥).

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا﴾ (مريم/١٦) واتە: مەریەم لە خەڵکی دوورکەوتەوەو کەسوکارەکەی جێهێڵا بە تەنها بەرەو ڕۆژهەڵاتی (بيت المقدس) ڕۆیشت، بۆ ئەوەی بەکاری پەرستشەوە سەرقاڵ بێت.(محمد متولي الشعراوي) دەڵێت: شوێنێکی شاراوەی بۆ خۆی هەڵبژارد بەلام قەدەغەی ئەوە ناکات کەسێك بەو شوێنەدا بڕوات ،پەردەیەکی دانا تا بیشارێتەوەو لەو کەسانەی کە بەو شوێنەدا تێدەپەڕین، چونکە ئەو دەیویست پەیوەندی بە خواوە هەبێت.

﴿فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ (مـريم/١٧). واتــه مەریــەم لــە نێـوان خـۆی وخەڵکیـدا پەردەیـەکی دانـا تـا نەیبینن،پاشـان خـوای گـەورە(جبریـل)(علیـه السـلام)ی لەشـێوەی مرۆڤـدا بۆدابەزاند، (إبن عباس) دەڵێت:- جبریل لە شێوەی گەنجێکی دەم وچاو سپی قژ لول لەش ڕێکدا هاتە لای. زانایانی تەفسیر دەڵێن، خوای گەورە بۆیە خستی یەشێوەی ئادەمیزاد تا مەریەم بتوانێت قسەی لەگەڵدا بکات و لێی ڕانەکات. ئەگەر هەر لەشێوەی فریشتەدا بوایە ئەوا دەترساو هەڵدەهات و نەیدەتوانی گوێی لێ بگرێت، خوای گەورەش بەڵگەی لەسەر پاکی وخواپەرستی مەریەم هێنا بەوەی کە پەنای گرت بەخوا لەو شێوە جوانەی کە جبریل هەیبو، کە لەوپەڕی جوانیدا بووە.[1]

﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا﴾ (مريم/١٨)

مامۆستا(عمرو خالد) دەڵێت:- مەریەم پەنای نەگرت لەوەی کە پیاوێك بێتەلایەوە، بەڵکو ووتی:- (اعوذ بالرحمن) پاشان لەگەڵی دوا: ئەگەر تۆ لە خوا دەترسیت بۆچی هاتویتە ئێرە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لأَهَبَ لَكِ غُلامًا زَكِيًّا﴾ (مريم/١٩).

واتە: جبریل پێی ووت:من تەنها نوێنەرێکم لەلایەن خواوە هاتوم تا منداڵێکی خاوێن وپاکت پێ ببەخشم کە لە گوناهو تاوان پاك کرابێتەوە.

﴿قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ (مريم/٢٠)

مەریەم ووتی:من چۆن منداڵم دەبێت؟ وبەچ ڕێگە و شێوەیەك ئەم منداڵە لەمن پەیدا ئەبێت؟کە من هاوسەرم نی یە تابێتە لام و داوێن پیسیشم نەکردوە؟

﴿قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا﴾ (مريم/٢١).

---

١/ صفوة التفاسير (محمد علي الصابوني).

(إبن کثیر) دەڵێت:- جبریل بە مەریەمی ووت: پەروەردگارت بەڵێنی داوەکەمناڵێك لەتۆدا دروست دەکات کەمێردت نی یە, لەوکەسانەیش نیت کەداوێن پیسی دەکەن ،ئەو کارەش لەسەرخوا ئاسانە ، و بێ گومان خوا هەرچی بوێت بەتوانایە بیکات . تا دروست کردنی ئەو منداڵە بکاتە نیشانەو موعجیزەیەك بۆ خەڵك تا ببێتە بەڵگە لە سەرتوانای تەواوی خوا لەسەر هەموو شێوازەکانی دروستکردن ، بێگومان خوای گەورە ئادەمی بەبێ دایك و بەبێ باوك دروست کرد ، و (حواء )یشی لە ئادەم دروستکرد بەبێ ڕەگەزەکەی تر ، پاشان دروستکراوەکانی تری لە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ دروستکردووە . ، و تاببێتە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ خەڵکی لەلایەن ئێمەوە ، ئەوەش کارێکە تازە بڕیارمان داوەو بڕاوەتەوە .

﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا﴾ ( مريم / ٢٢ ) .

مامۆستا ( عمرو خالد )[٢] دەڵێت : بیر لە هەستی مەریەم بکەرەوە لەم کاتەدا ، مەریەمی داوێن پاك کە خەڵکی پێی دەڵێت : بەڕاستی ڕەمزی داوێن پاکیە ، و خواپەرستێکی چاکە ،و کچی عمرانە ، بەبێ ئەوەی کەس نزیکی بکەوێت سکی بە منداڵ پڕدەبێت، وەك هەر ئافرەتێکی ئاسایی کە نۆ مانگی پێدەچێت ، ناتوانێت ڕووبەڕووی خەڵك ببێتەوە ، و ناشزانێت چی بکات ، و لەترس و دوو دڵیدایە ، ئافرەتان زیاتر دەتوانن هەست بە هەست و سۆزی مەریەم بکەن ، ئینجا لە ( بيت المقدس )ەوە دەرچوو کە کەسی لەگەڵدا نییە ، تەنها خوای لەگەڵە بۆ شوێنێکی دوور .

﴿فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾( مريم / ٢٣ )

( محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت :- دوای ئەوەی مەریەم چوو بۆ شوێنێکی دووری کە کەس بەنهێنی سك پڕبوونەکەی نەزانێت ، ئینجا ژانی

---

٢/ ( قصص القرآن ) ی ( عمروخالد ).

منداڵبوونی بۆ هات وای لێ کرد کە بیبات بۆ لای کۆتەرە دار خورمایەك ، ( المخاض ) ئەو ئازارەیە کە تووشی ئافرەت دێت لەکاتی منداڵ بووندا ، تا پاڵ بدات بە کۆتەرە دار خورماکەوە ، کە دار خورمایەکی ناسراوو دیار بوە .

( إبن کثیر ) دەڵێت :- مەریەم ووتی : خۆزگا بمردمایە پێش ئەم حاڵەتە و لە بیرچومایەتەوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئاوات خواستن بە مردن لەکاتی فیتنەو بەلاْو ناڕەحەتیدا ، چونکە خەڵکی دەیزانن و تۆمەتباری دەکەن و باوەڕی پێ ناکەن بەڵکو بەدرۆشی دەخەنەوە ، هەتا بەمنداڵێکەوە دێتەوە بۆ لایان : ﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلاَّ تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾( مريم / ٢٤ ) .

واتە : ( ئەو منداڵەی لە داوێنی مەریەم بەربویەوە ) لە ژێری یەوە بانگی کردو ، ووتی : دایەگیان ، خەفەت مەخۆ ئەوە تا پەروەردگارت بەبەردەمتدا جۆگەلەیەکی ئاوی جاری کردووە .[1]

﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾ ( مريم / ٢٥ ) .

ئینجا بە مەریەمی ووت کۆتەرەی دار خورماکە ڕاوەشێنە خورمای تەڕوو تازەت بۆ دەکەوێتە خوارەوە , کەتەنها کۆتەرەیەکی وشك بوو لەشوێنێکی ووشك و بیابان و چوڵ و بێ ئاودا , (مامۆستا عمرو خالد ) دەڵێت :- پێی ووت : ئەی مەریەم سەیری سەرووی خۆت بکە , خورما لەدارەکە پەیدا بوو , ڕەحمە تێك بوو لەسەرەوە و لەخوارەوە . )[2] (الشنقيطي) دەڵێت : ئەوە کارێکی لە عادەت دەرچوو بوو خوا کردی . ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾(مريم / ٢٦)

ئینجا لەو خورمایە بخۆ لەو ئاوەش بخۆرەوە و ئەم منداڵەت لێ پیرۆز بێت و خەمت نەبێت , لەو کاتەدا مەریەم چاوی دەگێڕا بۆ شتە لە عادەت دەرچووە کان , چونکە تەنها خواردن و ئاو بۆ ئەو لەگەڵ بوونی تۆمەت لەسەری

---

١.تفسیری ئاسان ( بورهان محمد ئەمین ) .

٢. (القصص القران ) ی (عمرو خالد ) .





بەڕاستی ئەمە خۆش نییە بۆ ئەو , چونکە خوای گەورە ئایەتی لەسەر هێناوە وەك لەسورەتی (آل عمران ) دا فەرمووی : - ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَـذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (آل عمران /٣٧) . واتە:- هەر کاتێك زەکەریا بچوایە بۆ لای مەریەم لەناو میحرابەکەیدا خواردنی هەمەجۆری لادەبینی کەهی ئەو وەرزە نەبوو خوا بۆی ناردبوو , دەیوت : ئەی مەریەم ئەمەت لەکوێ بوو ؟ دەیوت : لەلایەن خواوەیە , بێ گومان خوای گەورە بەویستی خۆی ڕزق دەدات بەهەر کەسێك خۆی بیەوێت.

﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾ (مريم / ٢٦ ) .

(إبن کثیر) دەڵێت : ئەمەش لەتەواوکەری قسەی ئەو کەسە بوو , کەلەژێرەوە بانگی لەمەریەم کرد ,

ئەگەر کەسێك بینیتی , پێیی بڵێ , واتە : بەزمانی حاڵ و ئاماژە کردن : بەڕاستی من بڕیارم داوە بەڕۆژوو بم لەقسەکردن , کەلەشەریعەتی ئەوان دا ڕۆژوو بریتی بووە لەبێدەنگی و نەخواردن بە دەستی ئاماژەی کرد بۆدەمی کەبڕیارم داوە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ کەسدا نەکەم .

﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ (مريم / ٢٧-٢٨ )

مەریەم دوایی لەخوێنی منداڵ بوونەکەی پاك بویەوە منداڵەکەی هەڵگرت و هاتەوە بۆناو قەومەکەی ,کاتێك خۆی و منداڵەکەی باوەشیان بینی , هەموو بەسەرسامی یەوە وتیان : بەڕاستی کارێکی زۆر گەورەو ناشیرین و ئابڕوو بەرت کردووە , ئەی خوشکی هاروون ( لەبەر لێکچوونیان لەخوا پەرستی و تەقواو خواناسیدا ئەو نازناوەیان پێدابوو ) بەڕاستی باوکی تۆ پیاوێکی خراپ نەبوو , و دایکیشت کەسێکی داوێن پیس نەبوو . چۆن دەبێت ئەم کارە لەتۆ بوەشێتەوە , کەتۆ لەماڵێکی پاك و ناسراو بەچاکە کاری و خوا پەرستی هاتوویت . (قتادە ) دەڵێت :(هاروون پیاو چاکێك بوو لەنەوەی ئیسرائیل

بەچاکە ناسرابوو بۆیە شوبهاندیان بەو ) ١، کە هارونی برای موسا نی یە چونکە نێوانیان لە هەزار ساڵ تێپەڕ دەکات .

(إبن كثير ) دەڵێت :- کاتێك مەریەم حاڵی نارەحەت بوو شوێن وجێی لێ تەسك بویەوە و قسەی لێ قەدەغەکرا ، ئینجا پشت بەستن بە خوا گەورەترین کارە ، تەنها دڵسۆزی و پشت بەخوا بەستن مانەوە:(فأشارتْ ) ئاماژەی کردبۆعیسای منداڵ و بچووك کە قسەی لەگەڵ بکەن ، کەئەو وەلاّمتان دەداتەوە ، کە چاوەڕێی قسەیان لێ نەدەکرد، لەو کاتەدا (قالوا ) کەکەسی خراپەکارو سەرکەشیان تیابوو ، ووتیان ( كيفَ نُكَلِمُ من كانَ في المَهْدِ صبياً) واتە : چۆن قسە بکەین وچاوەڕێی وەلاّم لە منداڵێکی بچووکی ناو بێشکە بکەین کە ناتوانێت قسە بکات ؟ لەگەڵ ئەوەدا عیسا لەناو بێشکەدا شیرە خۆرەیە .

﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾ (مريم / ٣٠-٣٣ ).

(إبن كثير ) دەڵێت :- ئەمە یەکەم قسە بوو کە عیسای کوڕی مەریەم کردی ، یەکەم شت کە ووتی بریتی بوو لە ( إني عبدالله ) دانی نا بەوەی کە بەندایەتی بۆ پەروەردگاری دەکات ، و خوا بە پەروەردگاری خۆی دەزانێت،خوای بەپاك ڕاگرت لە قسەی ستەم کاران کە دەیان ووت ئەو کوڕی خوایە ، بەڵکو بەندەو پێغەمبەری خوایە و کوڕی نەتەوەکەی خۆیەتی پاشان دایکی بە پاك ڕاگرت لەو تۆمەتانەی کە نەفامان دەیاندایە پاڵیان وەك ووتی :-( ءاتاني الكتابَ وجعلني نبياً ).

١. (صفوة التفاسير ) ی (محمد علي الصابوني ) .

دەربارەی ئەم ئایەتە (محمد علي الصابوني ) دەڵێت : عیسا (علیە السلام ) فەرمووی : خوای گەورە بڕیاری داووە ئینجیلم بداتێ و بمکاتە پێغەمبەر ، بەلاّم خوای گەورە بە (صیغة )ی (فعل)ی (ماضي)هێنای چونکەهەر شتێك خوا بڕیاری بدات جیٚ بەجیٚ بووە(وجعلني مباركاً أين ماكنت ) خوای گەورە خەیرو بەرەکەتی تیا بەدیهێناوم کە سوودم بۆ بەندەکانی هەبێت لەهەرکویٚ بم و هەرچۆن بم ،(واوصياني بالصلاه و الزكاه مادمت حيّاً ) پەروەردگار ئامۆژگاری کردووم کە پارێزگاری لە نوێژو ڕوکنەکانم بکەم بەدرێژایی تەمەنی خۆم،کەئەم کارانەش بۆپاك کردنەوەی دەرونەوخۆڕازاندنەوەیەبە ئەخلاقە جوانەکان دوورکەوتنەوە لە ناپەسەندیەکان ،و پاك کردنەوەی مالٚ وسامان بەبەخشین بۆ کەسانی هەژار ( وبَرّاً بِوَالِدتِي ولَم يَجعَلْني جَبَّاراً شَقياً ) خوای گەورە کردومی بە چاکەکار بۆ دایکم تا چاکەی لەگەڵدا بکەم ، بێگومان عیسا دڵنیای کردەوە کە مافی دایکی بەسەروەیە ، ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ ( مریم /٣٢). خوای گەورە نەیکردوم بە خۆبەگەورە زان و بەد ڕەفتار بەسەر هیچ کەسێکدا ، قسەو کردارێك لەمن دەرناچێت پێچەوانەی فەرمانی خوا بێت .

﴿ وَالسَّلامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾ ( مریم /٣٣ ) .

(القرطبي) دەڵێت : واتە : سەلام و سلاّوی پەروەردگارم لەسەرە لە دنیاو لەناو گۆڕدا لە قیامەتدا.

(عمروخالد ) دەڵێت :واتە: ئەی دایکە من ناکوژرێم و سەلامەت دەبم و خوای گەورە بەرزم دەکاتەوە بۆ لای خۆی ﴿ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾( مریم /٣٤-٣٥ ).

پاش ئەوەی خوای گەورە بە ڕوونی وجوانی چیرۆکی عیسای گێڕایەوە ، ئینجا فەرمووی: ئەوانەی کە باسمان کرد دەربارەی عیسا هەمووی وتەی حەق و ڕاست بوو،وەك ئەوەنییە کەمەسیحی باسی عیسا دەکات کە کوڕی خوا بێت ، یان جولەکە دەڵێن : بەداوێن پیسی لە دایك بووە ، بەڕاستی ئەوان گومان و قسەی ناڕەوا بەدەوریدا ڕێك دەخەن ، بێگومان ناگونجێت بۆ خوای گەورە کەس بکاتە ڕۆڵەی خۆی ، خوایەکی پاك و بیٚ هاوەڵە ، پاك و بێگەردی بۆ زاتی پیرۆزی ، ئەگەر خوای گەورە بڕیاری هەر کارو فەرمانێك بدات ، هەر ئەوەندەی

بفەرمویت ببە دەبیت .

زانا ( محمد متولی الشعراوی ) دەڵێت:(الذي فيه يمترونَ ) واتە :گومانیان تیادا هەیە ، وەك ئەوەی

هەواڵمان بداتیّ کە ئەوان لەمەودوا لەو ووتەیەدا گومان دروست دەکەن و قسەی هەڵبەستراوی تێکەڵ دەکەن .[1]

﴿ سوودو پەندە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) ( الشنقیطي ) دەڵێت :- هەندێك لە زانایان لە ئایەتی :- ( وهُزي إليكَ بِجذع النَّخْلَةِ )ئەوەیان وەرگرتووە کە هەوڵ دان و هۆکار هەیە بۆ دەستکەوتنی ڕزق و ڕۆزی ، کارێکە شەرع فەرمانی پێکردووە .

٢) هەرخۆی دەفەرموێت :- بزانە کە ئەو قسەیەی ( إبن کثیر ) هەڵی بژاردو جیای کردەوە کەمەبەست لە ( فقولی ) واتە : بە ئاماژە کردن ئەوە دەربڕە ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاماژە کردن جێگەی قسە دەگرێتەوە ، چونکە لەم ئایەتەدا بە ( قول ) ناوبراوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئاماژە جێگەی قسە دەگرێتەوە ، چیرۆکی ( الأمة السوداء ) ە ، کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (این اللّە ) خوا لە کوێیە ؟ ئەویش ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان ،ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( ئازادی کەن بێگومان باوەڕدارە ).[2]

ئاماژەکەی خستە بریتی قسەکردن لە ئیماندا کەبنەمای هەموو ئاینەکانە.

٣) زانا(محمد متولی الشعراوی) دەڵێت:- (مکاناً شرقیاً) بۆچی ئاڕاستەی ڕۆژهەڵاتی لە (بیت المقدس) هەڵبژارد بەسەر ئاڕاستەکانی تردا؟

---

١. ( قصص الأنبیاء و معه سیرة الرسول ) ی ( محمد متولي الشعراوي ).

٢. (موسلیم) و(مالك) و(أبوداود) و(النسا ئي) ڕیوایەتیان کردوە.

ووتویانە:-چونکە ئەوان بەهەڵهاتنی خۆر گەشبین دەبوون، کە نیشانەی ڕوناکی بوو کە ڕێگای پیشانی خەڵکی دەدا تا وون نەبن،ئینسان دوو ڕوناکی هەیە:ڕوناکی یەکی ماددی لە خۆرومانگ و ئەستێرەکان وگڵۆپ..... هتد کە ئەمانە دەوروبەری بۆ ڕون دەکەنەوە. وڕووناکی بەرنامەی خوا کە ڕێنمایی دەکات بۆ مەسەلەی بەهاکان، تا توشی وون بوون و گومڕایی نەیەن.

٤) (القرطبي) دەڵێت:-(الربیع بن خثیم)ووتی:- من لە خورمای تەڕوتازە باشترم لانیە بۆ ئافرەتانی تازە مندالبو ئەگەر خوای گەورە شتێکی لە خورما بە باشتر دابنایە دەیدا بە مەریەم بیخوات.و بۆ نەخۆشیش لە هەنگوین چاکتر نی یە بیخوات.

٥) (القاسمي) دەڵێت :- (الرازی ) لە (القاضي ) یە وەهێناویەتی دەربارەی (والسلام عليَّ ...) سەلام دەستەواژەیەکە ئەمان و ئارامی پیٚ دەست دەکەوێت لەوانە سەلامەتی لەنازو نیعمەت و لاچونی دەردوبەلاّدا, وەك ئەوەی پرسیاری کردبێت لەپەروەردگاری و داوای لیٚ کردبێت, خوای گەورە هەواڵی چی دا بەیەحیا کردبێتی, کەدەبێت لە پێغەمبەراندا ئەوە هەبێت کەدوعایان وەلاّم درابێتەوە, وگرنگ ترین حالٚ و بارو دۆخیش بۆ ئینسان کە پێویستێتی تیایدا سەلامەت بێت , بریتی یە لەم سیٚحاڵەتە :ڕۆژی لەدایك بوون و ڕۆژی مردن وڕۆژی زیندوبوونەوە, ئەوسیٚ حاڵەتە کەئینسان پێویستی بەسەلامەتی یە تیایداو کۆبونەوەی بەختەوەریش لەگەڵیاندا لەلایەن خواوەیە [1]

٦) مامۆستا (سید قطب) دەڵێت :- بێگومان ئەرسوننەتەی خوای گەورە دایناوە بۆ بەردەوای ژیان بریتی یەلە خستنەوەی وەچە لە ( نێرومیٚ ) لە

١. محاسن التأويل ( ١١ / ١٢٣ )

٢. في ظلال القرآن ( ٤/ ٢٣٥ ).

هەموو جۆرەکاندا ، ئەم سوننەتە چەندەها ساڵ و سەدەی درێژ ڕۆیشتوەو بەردەوام بووە ، تا ئەوە لە تێڕوانینی مرۆڤدا چەسپا کە تەنها ڕێگایە و یەکەم ڕووداوی دروستکردنی پێشوویان بیرچویەوە ، چونکە لە دەرەوەی پێوانەکردندا بوو،خوای گەورە ویستی نمونەی عیسای کوڕی مەریەم (علیە السلام)یان بۆ بهێنێتەوە تا توانای لە ڕادەبەدەر ی خوایان بیربخاتەوە ، لە شێوەی دروستبوونی عیسا دوبارە نەبویەوە چونکە ئەسڵ ئەوەیە کە سوونەتەکەی خوا دایناوە وەك خۆی بڕوات ، و ئەو کارە لە عادەت دەرچووە جێ بە جێ ببێت ، ئەوەش تەنها ڕووداو بوو کەبەس بوو بمێنێتەوە لە بەردەم تێڕوانینی مرۆڤدا بە ئاشکرا لەسەر ئازادی دەسەلآت و وویستی خواو و شێوازەکە لەناو بازنەی کارە لە عادەت دەرچوەکەدا نەهێڵێتەوە .[1]

## ﴿ موعجیزەکانی عیسا ( علیە السلام ) و هەواڵی دابەزینی سفرەوخوانەکە و پاکی عیسا لە درۆ هەڵبەستنی مەسیحی یەکان ﴾

خوای گەورە لە سورەتی ( المائدە )دا فەرمویەتی :﴿ إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ (١١٠) وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ

أَنْ آمِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوَاْ آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ (١١١) إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء قَالَ اتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (١١٢) قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ (١١٣) قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء تَكُونُ لَنَا عِيداً لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ (١١٤) قَالَ اللّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لاَّ أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ (١١٥) وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ (١١٦) مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (١١٧) إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾( المائدة / ١١٠ -١١٨ ) .

( القاسمي ) دەڵێت :- ( اذكر نعمتي عليك ) واتە : ئەی عیسا باسی نیعمەت و منەتەکانی من بکە بەسەر خۆتەوە ( وعلى والدتك ) و بەسەر دایکیشتەوە بەوەی کە خوای گەورە پاك ڕایگرت وبەسەر ئافرەتانی جیهاندا هەڵیبژارد ( إذا أَيَّدتُّكَ ) واتە : بەڕاستی من تۆم بەهێز کرد ( بِروح القدُس ) بە جبریل ( علیە السلام ) بۆ چەسپاندنی بەڵگەو نیشانەکان یان ڕۆحی تۆ پاك ڕابگرین لە هەموو پەیوەندیەکی ستەمکارانە ، بەجۆرێك کە بزانێت ئەوە بەهۆی بەشەرەوە نی یە کە شایەتی بدات لەسەر پاکی تۆو دایکت ، لەوانەش بۆ هەتا هەتا نەفستم بەهێزکرد کە نەفسێکی قسەکەر بێت : (تُكَلِّمُ الناسَ في المهدِ و كهلاً ) واتە : لەناو بێشکەدا قسە لەگەڵ خەڵکی بکەیت و لەگەورەیشدا ، کە لاوازترین و بەهێزترینی کاتی تەمەنت دەگرێتەوە ، کە یەك قسە دەربڕیت .

(إبن كثير ) دەڵێت :- واتە: ئەی عیسا بە منداڵی و بەگەورەیی تۆم کردۆتە پێغەمبەرێکی بانگ خواز بۆ لای خواو لەناو بێشکەدا قسەم پێکردیت بە بچوکی ، و شایەتیت دا بە پاکی دایکت لە هەموو عەیبێك دانت نا بەبەندایەتی کردندا بۆ من ، و هەواڵت دا لە پەیامەکەی من بە خەڵکی و بانگەوازت کرد بۆ پەرستنی من ، بۆ ئەمەش فەرمووی ( تُكَلِّمُ الناس في المهد و كهلاً ) .

واتە : تۆ لە منداڵی و گەورەیتدا بانگەوازی خەڵکی دەکەیت بۆ لای خوا وشەی (تُكَلِّمُ) دەستەبەری بانگکردنەکە دەکات ، چونکە قسەی ئەو بۆ خەڵکی لەتەمەنی گەورەبوونیدا کارێکە سەیر نییە.[1]

(الألوسي) دەڵێت :- ( وإذ علَّمْتُكَ الكِتابَ و الحكمة ) ئەی عیسا باسی ئەو کاتە بکە کە من فێری کیتاب و حیکمەتم کردیت، ووتراوە ( الكتاب)واتە :خەتی نوسینی جوان و (الحكمة )، قسەی جوان و ڕێك و ئامانج دار( و التوراة و الآينجيل ) و تەورات و ئینجیل ، خوای گەورە تایبەتی کردن بەباس کردن بۆ نیشاندانی ڕێزی هەردوکیان (وإذ تخلقُ من الطين كهيئةِ الطيرِ) واتە : ئەی عیسا باسی ئەو کاتە بکەو دیاری بکە کە تۆ لە قوڕ شێوەی باڵندەیەك دروست دەکەیت کەلە باڵندە دەچێت ( بأذني فتنفخُ فيها ) واتە : بەفەرمانی من فو ئەکەیت بەو شێوەیەدا ( فتكون )پاش فوکردنەکە دەبێتە ( طيراً بإذني )باڵندە یەکی زیندوو وەك هەموو باڵندەکانی ترە ئەمەش بەفەرمانی من .

( وتُبريَ الآكمه والآبرصَ بأذني ) هەروەها بە فەرمانی من کوێری زکماك و بەڵەکت چاك دەکردەوە ، (وإذ تُخرِجُ الموتى بأذني)جارێکی تر لێرەدا (إذ)دووبارە بویەوە،بۆ هاتنەدەرەوەی مردووەکان لەگۆڕەکانیان پاش ئەوەی کە بووبوون بە خۆڵ ، ئەمەش موعجیزەیەکی ڕوونە بەیاد خستنەوەو دان پیانان بە کاتەکەیدا .

( وإذ كففتُ بني إسرائيل عنْكَ إذ جئْتَهُمْ بالبيّناتِ) واتە :- هەروەها باس و یادی ئەوەش بکە کاتێك تۆم پاراست و نەم هێڵا بکەویتە ناو شەرو دەست درێژی یەهودی نەوەی ئیسرائیلەوە کە بت کوژن کاتێك ویستیان بت کوژن ، کاتێك تۆ بەبەڵگەو موعجیزەکانەوە هاتیت بۆ لایان .

﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ

١. تفسير القرأن العظيم ( ٢/ ١١٥ ) .

وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ ( المائدة / ١١٠ ) .

پاش ئەوەی بێ باوەڕان ئەم هەموو موعجیزەو نیشانانەیان بینی وتیان : بەڕاستی ئەمانە سیحر و جادویەکی ئاشکران ، ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوَاْ آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ﴾(المائدة /١١١).

(محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت : ووشەی ( الحواري) لە هەستپێکراوەکانەوە وەرگیراوە ، ووشەکەلە (ئارد) یێکی بێژراوەی پاك دەنرێت ، لە هەموو شتێکی پاڵێوراوو ساغ دەنرێت ، (الحواري) لێرەدا واتە:- دڵسۆز و خۆشویستن بۆ بەرنامەی چاکەو خەیر ، خوای گەورە دەفەرموێت ( و إذ اوْ حَيْتُ)

وشەی( الوصي) بەمانای گشتی یەکەی بریتی یەلە گەیاندێك بەنهێنی و شاراوە ، واتە خوای گەورە ئیلهامی بۆ ناردن کە باوەڕبهێنن بە پەیامەکەی عیسی (علیه السلام ) کەلە خواوە دەیگەیەنێت.واتە بەڕازی دڵی تێی گەیاندن .خوای گەورە وەحی کرد بۆ حەواریەکان کە باوەڕ بە خوا و پەیامەکەی عیسا بهێنن ، تەنها بە هاتنی عیسا (علیە السلام)و بیستیان کە پێغەمبەری خوایە،ئیمانی خۆیانیان ڕاگەیاندو بوون بەکەسی دڵسۆز و تایبەتی عیسا، و حەواری یەکان وتیان : ئێمە باوەڕمان هێنا بە عیسا کە پێغەمبەرە لەلایەن خواوە و شایەتیان دا کە موسڵمانن .

﴿ إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء قَالَ اتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ( المائده / ١١٢ ) .

واتە : حەواری یەکان بە عیسای کوڕی مەریەمیان ووت:ئایا پەروەردگارت دەتوانێت لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێکمان بۆ دابەزێنێت ئینجا عیسا(علیە السلام ) پێی ووتن :- ئامۆژگاریتان دەکەم کە تەقوای خوا بکەن داوای ئەم نیشانەیە مەکەن ، لەبەرئەوەی ئیمانتان هێناوە پێشنیار مەکەن بۆ خوا کە نیشانە یەکتان بۆ دابەزێنن تا ببێتە بەڵگەی ڕاستی پێغەمبەرەکەی ئەوەتان بەسە خوا پێی داون بۆ ڕاستی پەیامەکەی من ، بەڕاستی زانایان لەسەر ئایەتی

( هل يستطيعُ ربُّك ) هەڵوێستەيان كردوەو دەپرسن :- ئەم قسەيە چۆن بووە ،بە تايبەتى كە مانا ديارەكەى بريتى يەلە (ايقدِرُ ربُّكَ )؟
( ئايا پەروەردگارت دەتوانێت ؟)و چۆن بۆ حەواريـە كان دەگونجێت ئەمە بڵێت ؟ لە كاتێكدا ئەوان شايەتيان داوە بۆ عيسا (عليه السلام)كە ئەوان موسڵمانن ؟ زانايان دەڵێن :- هەر كەسێك دەربارەى ( اللغة) زمان قسه بكات ، دەبێت شارەزاو بەرچاو ڕوون بێت بەرامبەر بەكارهێنانى داڕێژراوى ووشەكان و تايبەتمەندى يەكانيان ، ووشەى (يستطعُ ) واتە : (يطيعُ) گوێڕايەڵى دەكات ، وەك وتراوە ( استجابَ ) واتە (أجاب ) وەڵامى دايەوە . وەك ئەوەى مانای پرسيارەكەيان بەم جۆرە بێت ئايا خواى گەورە وەڵام دەداتەوە بۆ ناردنى سفرەو خوانێك لە ئاسمانەوە ؟ (استطاعَ) بەرامبەر (استجاب )يە . بێگومان خواى گەورە بە توانايە بەسەر هەموو شتێكدا ، هەموو شتێك گوێڕايەڵى فەرمانى ئەو دەكات .
( القرطبي ) دەڵێت:ئەم پرسيارەيان لە سەرەتاى كاركەيانەوە كرد پێش ئەوەى بە تەواوى خوايان ناسيبێت ، وەرەنگە لە لايەن چەند كەسێكى نەزانيانەوە كرابێت،وەك هەندێك لەقەومەكەى موسا بە موسايان ووت :- ( إجعلْ لنا إلهاً كما لهم إلهةِ ) واتە : ووتيان : ئەى موسا تۆيش بۆ دروست بكە وەك چۆن بت پەرستان چەند خوايەكمان هەيە (أبو حيان ) دەڵێت :- ئەم ووشەيە ديوە ئاشكراكەى گومان دەگەيەنێت لە تواناى خواى گەورەدا كە سفرەوخوانێكيان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێت .
دواى داواكەيان عيسا ( عليه السلام ) پێى فەرموون :- لە نموونەى ئەم جۆرە داواكارييانەدا لە خوا بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا هەيە .
﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (المائده / ١١٣ ).
زانا ( محمد رشيد رضا )دەڵێت :حەوارييەكان ووتيان ئێمە بۆ چوار سودو مەبەست داواى ئەم سفرەو خوانەدەكەين :-
يەكەم :- بێگومان ئێمە لێى بخۆين چونكە پێويستمان بە خواردن هەيە , شتێك نيە پێويستى خۆمانى پێى جێبە جىٚ بكەين , ووتراوە:- مەبەست خواردنێكى بەرەكەت داربووە,

**دووەم :-** دەمانەوێت دڵنیاو دڵ ئارام بین بەوەی کە ئیمان بهێنین بە قودرەت و توانای خوای گەورە بە بینینی شتێکی لە عادەت دەرچوو , واتە :- بە جۆرێك ببینین و دەستی لێبدەین و بۆنی بکەین بەوەی کە لە تۆی دەبیستین و توانای تێڕوانین و بەڵگە هێنانەوەمان لەسەرهەبێت .

**سێ یەم :-** ئەم جۆرە لە عیلم و زانست بزانین _ واتە :زانستی بینین و شایەتیدان لەسەری – واتە حاڵمان لەگەڵ تۆدابێت کە بریتیە لەوەی کە ڕاستت لە گەڵ و کردووین لەو بەڵێنەی پێتداوین لە بەرهەمی ئیمان وەك وەڵامدنەوەی دوعا ئەگەر بەدەرچون لە عادەتەکانیش بێت .

**چوارەم :-** ئیمە لەو کەسانە بین کە شایەتی لە سەر ئەم نیشانەیە دەدەن لە لای ئەوەی ئیسرائیل و ئامادەین بۆ ئیمان هێنان و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ئیمانیان زیادبکات , ئەمەی دەیبینین لە قسەکانیان ئاڕاستەی دەکەن بەڵگەیە لەسەر ساغی ئیمانیان . ﴿قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيداً لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾(المائده/ ١١٤) .

زانا ( محمد متولی الشعراوی ) دەڵێت :- عیسای کوڕی مریەم ( علیه سلام ) وەڵامی داواکەیانی دایەوەو دوعای بۆ کردن و ووتی :- ئەی پاشای هەموو فەرمانێك لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێکمان بۆ دابەزێنە تا بێتە جەژن و خۆشی بۆ باوەڕداران کە باوەڕیان بە پێغەمبەرانی پێشین و دواین هێناوە , موعجیزەیەك بێت پاڵپشتی بکات لە بەرنامەکەی تۆ , خوای گەورە وەڵامی دایەوە و سفرەو خوانێکی بۆ دابەزاندن و هەڕەشەی سزاشی لێکردن بۆ کەسێ سەرپێچی و ئینکاری ئەم نعمەتە بکات , هەرکەسێك دوای قورئان داوای نیشانە و مو عجیزەیەك بکات بۆ ئیمان هێنان ئەوە بەڵگەیە لە سەر دانەمەزاوی ئیمان لەدڵیدا .

﴿قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لاَّ أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ﴾ ( المائدة/ ١١٥)

( القرطبی ) دەڵێت :- ئەمە بەڵێنێك بوو لە لایەن خواوە وەڵامی داواکەی عیسا ( علیه لسلام) ی پێدایەوە , وەك ئەوەی کە داواکەی عیسا بریتی بوو لە وەڵامێك بۆ حەواریەکان , ئەمەش پێویستی دەکات کە بێگومان خوای گەورە

دابەزاند و بەڵێنەکانی خوا حەقن ، پاش دابەزینی قەومەکە ئینکاریان کردو باوەڕیان نەهێنا و خوای گەورەش شێوەیانی گۆڕی بۆ سەر مەیمون و بەراز .

( إبن عمر ) ووتویەتی :- (( بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا سەختترین سزای بۆ دووڕووەکانە ، وئەو کەسانەی بێ باوەڕبون لەوەی کە سفرە و خوانەکەیان بۆ دابەزی و ئالی فیرعەون )) . زانایان ڕای جیاوازیان بوو لە سەر دابەزینی سفرەو خوانەکە : - ئایا دابەزی یان نا ؟ ئەوەی زۆرینە لەسەرین – کە ڕاستره – دابەزیوە بەپێی ئەم ئایەتە :-( إنّي مُنَزِّلُها عليكم ) .[1]

( محمد علی الصابونی ) :- دەڵێت :- خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی دایەوەو فەرمووی : بەڕاستی من ئەوسفرەیەتان لەمەو دوا بۆ دائەبەزێنم ( فَمَن يَكْفُرْ بَعْدَ منكم فإنّي اعَذّبَهُ عذاباً لا ا عَذّبهَ احداً من العالمين) . واتە :- هەرکەس دوای ئەو نیشانە ڕوون و ئاشکرایە بێ باوەڕبێت دواتر سزایەکی سەختی دەدەم کە هیچ کەسێك لەبەشەر لەوشێوەیە سزانەدەم . لە فەرموو دەیەکدا هاتووە :- ( سفرە کەلە ئاسمانەوە دابەزی کە نان و گۆشتی لە سەربوو فەرمانیانیان پێکرا کە پاشەکەوتی نەکەن بۆ ڕۆژی داهاتوو ، خیانەتیشی لێنەکەن ، ئینجا خیانەتیان کردوو لێیان پاشەکەوت کرد ، پاشان بۆ ڕۆژی داهاتوو بەرز کرایەوە و شێوەیان گۆڕا بۆ مەیمون و بەراز )[2]

﴿ وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ ( المائدة/ ١١٦) .

( إبن كثير ) :دەڵێت :خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ڕۆژی قیامەت لە عیسای کوڕی مەریەم ( عليه سلام ) دەپرسێت لە سەر شێوەی ڕێز گرتن لە عیسا ، و هەڕەشەو سەر زەنشت یش بۆ ئەو کەسانەی کە درۆیان دەربارەی هەڵبەست و

---

١. جامع لأحكام القرآن .

٢. (ترمذی ) لە (بان التفسير ) دەریهێناوە .

وایان دانا کە کوڕی خوایە یان خوایە یان هاوبەشی خوایە , خوا بەرزو بالآیـە و دورە لە وانەی کە دەیڵێن . ئینجا خوای گەورە پرسیاری لێدەکات و دەزانێت کە ئەوە لە عیسا ڕوی نەداوە , بەلأم بۆ سەرزەنشی درۆ هەڵبەستان , دەڵێت :-
( ئەی عیسا ئایە تۆ بە خەڵکت ووت : من و دایکم بە دوو خوا دابنێن لـە خوار خواوە , ئـەویش وتـی : پـاکی و بێگـەردی و بـیّ هـاوەڵی شایستـەی خۆتـە ) ( مایکونُ لي انْ اقولَ ماليسَ لي بِحَقٍ ) واتە : بۆم نیە من شتێك بۆ خۆم بڵێم کە مافی من نەبێت , ( ئـەی خوایـە ئەگـەر شـتێکی وا لـەمن دەر چوبێت و وتبێتم بێگومان تۆ هیچ شتێکت لیّ ناشاردرێتەوە , بەڕاستی تۆ زاناو شارەزای بە وەی کـە مـن نـەم وتـووە . بەڕاسـتی ئەمـە پـاکی و بـیّ تـاوانی بـوو لـە عیسـادا و ئـەدەبێکی جـوانیش بـوو ودەر خسـتنی ملکەچـیش بـوو لـە ئامـادەبونی لای پەروەردگاری. )

﴿وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾( المائدة /١١٦).

واتە : تۆحەقیقەتی من دەزانیت و دەزانیت چی لـەدلّ و دەرونـی مندایـە,بەلأم من حەقیقەتی تۆ
نـازانم و نـازانم چـی لـەدەریای عیلم وزانسـتی بێپایـانی تۆداهەیـە لەسیفاتە تەواوەکانت, بەڕاستی تۆ
زانایـت بەشـاراوەکان و نیەتـەکان و زانسـتی تـۆ دەوری هـەموو شـتێك دەدات کەبووەو دەبێت [1]

(ماقلتُ لَهُم إلاّ ما امَرْ تـني بـه ) واتـە : شتانێکم نـەووتوە غـەیری ئەوانـەی تـۆ فـەرمانت پـیّ داون کاتێـك تـۆ منـت بەپێغەمبـە رایـەتی نـارد بەکیتابـەوە کەبەسـەریاندا بخوێندرێتـەوە, پاشان ئـەوەی ڕوونکـردەوە کە بـەوانی ووتبوو,

---

١. صفوة التفاسير .

ووتی ( انِ اعبدوا اللّه ربِّی وربّکم ) واته : پێم وتن :- خوا بپەرستن که پەروەردگار و بەدیهێنەری من و ئێوەشه و ڕزق دەری من وئێوەشه, منیش بەندەیەکم وەك ئێوه. ( وکنتُ علیهم شهیداً مادمْتُ فیهم فلمّا تَوَ فَّیْتني ) واته : ( من شایەت بووم بەسەر کردەوەکانیانەوەهەتا لە ناویاندا بووم ,کاتێك منت بەرزکردەوه بۆلای خۆت لەوکاتەدا کەویستیان بمکوژن و لە خاچم بدەن تۆ ڕەحمت پێکردم و لە دەست ئەوان ڕزگارت کردم و شێوەی منت خستە سەر یەکێك له خۆیان تا تۆڵە لەو بکەنەوە و سزای بدەن , کاتێك ئەمە ڕویدا :-

﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (١١٧)﴾( المائدة / ١١٧) .

بەڕاستی خۆت چاودێربووی بەسەریانەوه , وهەرخۆت شایەتیت لەسەر هەموو شتێك . پاشان لەسەر شێوازی فەرمان دانە دەست پەروەردگار و خۆبەدوور گرتن له بە ناو شوێن کەوتوەکان ووتی :( إنْ تُعَذِبْهُمْ فإنَّهُم عِبادُكَ) واته : ئەگەر تۆ لە قیامەتدا سزایان بدەیت خۆ بەندەی خۆتن , لە کاتێکدا کە شیاوی ئەو سزایەشن .

﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾( المائدة/ ١١٨)

بەڕاستی ئەمەش دانەدەست خواو خستنە پاڵ ویستی خوایه , ئەگەر لێیان خۆشبیت خۆت خوایەکی بالأدەست و دانایت ( دەزانیت کێ شایستەی لێخۆشبوونە ) .

﴿ سوودو پەندو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١. مامۆستا( سید قطب ) دەڵێت : - ئەم گفتوگۆیە- گفتو گۆی داواکردنی سفرە و خوانەکە - سروشت و هەڵسوکەوتی قەومەکەی عیسامان بۆ دەردەخات کە دڵسۆزەکانیان بوون - حەواریەکان بوون - کە لە نێوان ئەوان و هاوەڵانی پێغەمبەری خۆماندا ( ﷺ) جیاوازیەکی دوور هەبوو. ئەوان حەواریەکان بوون کە خوای گەورە ئیمانی خستبووە دڵیانەوە بە خۆی و

پێغەمبەرەکەی کە عیسا بوو , باوەڕیان هێناو شایەتیان لەسەر ئیسلامەتی خۆیان بۆ عیسا دا , لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوان دوای ئەوەی چەند موعجیزەیەکیان بینی لە عیسادا کە بینیان , پاشان داوای شتێکی تری لەوشێوەیەیان کرد کە لە عادەت دەرچوبوو تالێی دڵنیابن , لەوەدا بزانن کە ئەوە لەسەر بەڕاست زانیینی ئەوانە و شایەتی لەسەر بدەن بۆ کەسانی دوای خۆیان . بەلاّم هاوەڵانی موحەمەد (ﷺ) داوای شتێکی لەوجۆرەیان نەکرد لە موحەمەد( ﷺ) دوای موسڵمان بوونیان. بێگومان ئەوان باوەڕیان هێناو دڵنیا بوون هەرئەوکاتەی کە بە ڕوگەشی و ڕووخۆشی یەوە ئیمانیان وەرگرت . بەدڵنیایی پێغەمبەرەکەیان بەڕاست زانی ، جارێکی تر نەگەڕانەوە لەسەر ڕاستگۆیی ئەو داوای بەڵگە و نیشانەبکەن ، شایەتیان لەسەر ڕاستی ئەودا تەنها بە موعجیزەی قورئان .[1]

٢. زانا ( محمد رشید رضا ) دەڵێت :- ئەو عیبادەت وپەرستشانەی کە مەسیحی یەکان ئاراستەی مەریەمیان کردووە ، بریتی بوون لە نوێژ کە دوعاو سوپاس و ستایش و پاڕانەوەو داوای شەفاعەتی تیابووە ، و هەروەها ڕۆژوی دراوەتە پاڵ و بەناوی خۆیشیەوە ناو دەبرا ئەمانەش ملکەچی و خشوع ی تیابووە ، و باوەڕیشیان وابووە کە لە دونیاو قیامەتدا سوودو زیانی بۆی دەبێت کە ڕەنگە بەهۆی کوڕەکەیەوە بێت ، و دانیان ناوە بەوەدا کە دەبێت عیبادەت و پەرستش بۆ مەریەم بکرێت ، بەلاّم نازانین کام دەستە لە مەسیحیەکان ووشەی ( إله ) یان ناوە لە مەریەم و پێشی دەڵێن :( والِدة الآلـه ) دایکی خوا ، هەندێکیان دانی پیادەنێن کە ئەمە ( حقیقه ) ڕاستە و (مجاز) بی یە ، بەلاّم قورئان لێرەدا دەفەرموێت : ئەوان مەریەم و عیسایان بە دوو خوا وەر گرتووە و بڕیاریان داوە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە ووتویانە : -

١. ( في ظلال القرآن ) ( ٢/ ٩٩٨ ) بە دەستکارییەوە .

﴿إنَّ الله هُوَ المسيحُ إبن مريم ﴾ ( المائده /٧٢ ). واته : بەڕاستی خوا بریتیە لە عیسا ی کوڕی مەریەم – پەنابەخوا – و پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی ڕوون کردەوە کە دەربارەی ئەهلی کیتاب دەفەرموێت : ﴿ إتخِذوا أحبارهم و رهبانهم أرباباً مِن دونِ الله ﴾( التوبه / ٣١ ).

واتە : گاورو جولەکەکان حاخام و قەشەکانی خۆیانیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا و شوێنیان کەوتوون لەوەی کە حەلاڵی دەکەن و حەرامی دەکەن نەك لەبەرئەوەی کە ناویان ناون ( ارباب ).[1]

٣. ڕۆچوون لە دروستکراوەکاندا هۆکارێکە بۆ هاوەڵ دانان :– گاورەکان – لە ڕەحمەتی خوا بە دوور بوون – ڕۆچوون لە عیسادا ( علیه السلام ) هەتا بە کوڕی خوایان دانا یان سێیەمی سیٚ خواکە ،و خوای گەورە بە دڵنیاییەوە وەلامی دانەوە و ڕەتی کردەوە ، فەرمووی :

﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَـهٍ إِلاَّ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٣) أَفَلاَ يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٧٤) مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلاَنِ الطَّعَامَ انظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الآيَاتِ ثُمَّ انظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ ( المائده / ٧٣ – ٧٥ ).

( إبن كثير ) دەڵێت:–خوای گەورە حاڵی مەسیح و دایکی ڕوون کردەوە کە عیسا بەندەو پێغەمبەری خوایە ، و دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە ، خراپەکار نی یە، وەك جوولەکە ووتویانە، بەڵگەشی لەسەرەکە پێغەمبەر نی یە ، وەك هەندێك لە زانایانمان وای بۆچووبوون ئایەتی :–

( كانايأكلانِ الطعام ) هەردوکیان خواردنیان دەخوارد ، واتە : ئەگەر یەکێك ئەمە حاڵی بێت چۆن دەبێتە خوا ؟ بەڕاستی خوا بەرزو بالآیە دوورە لەم قسەو نەزانی یەی ئەوان .

---

١. ( تفسير المنار ) بەکورتی .

کاتێك پیا هەڵدان و ڕۆچوون لە دروستکراوەکاندا گەورەترین هۆکار بێت بۆ هاوەڵ دانان ، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لە پیاهەڵدان ،و فەرمویەتی :- ( لاتُطروني كما أطرت النصارى ابنَ مَريَمَ إنّما انا عبدٌ ، فقولوا : عبدُ اللّهِ و رسوله).[1] واتە :- ( بەسە مندا هەڵمەدەن زیاد لە پێویست وەك ئەوەی کە گاورەکان زیاد لە پێویست بەسەر عیسای کوڕی مەریەمدا هەڵیاندا ، بێگومان تەنها من بەندەیەکم ، جا ئێوەش بڵێن :- بەندەی خواو پێغەمبەرە ).

﴿ بەرزکردنەوی عیسا ( علیه السلام ) و درۆی گاورو جوو لەمەسەلەی لە خاچداندا ﴾

خوای گەورە لە سورەتی (آل عمران ) دا فەرمویەتی :-
﴿إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ( آل عمران /٥٥ ).

پێشتر لە فەزڵ و ڕێزەکانی عیسادا ( علیه السلام ) ڕوون کرایەوە .

لەسورەتی ( النساء )دا دەفەرموێت :- ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِم بَآيَاتِ اللّهِ وَقَتْلِهِمُ الأَنْبِيَاء بِغَيْرِ حَقًّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَلْ طَبَعَ اللّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُونَ إِلاَّ قَلِيلاً (١٥٥) وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا (١٥٦) وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا (١٥٧) بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٥٨) وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾( النسا /١٥٥-١٥٩ ).

(إبن كثير ) دەڵێت :- جوولەکە دەگێڕنەوە دەڵێن :- کاتێك خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم ی بە بەڵگەو نیشانەو هیدایەتەوە نارد ، حەسودیان پێ

[1] ٢. بوخاری لە ( الأنبياء ) دا ڕیوایەتی کردووە .

برد لەسەر ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و موعجیزە ئاشکراکانی پێدابوو ، کە کوێرو بەڵەکی بەفەرمانی خوا چاك دەکردەوە و مردوی زیندوو دەکردەوە بە فەرمانی خوا ، ولە قوڕ شێوەی باڵندەیەکی دروست دەکردو پاشان فووی پیادەکرد ، دەبویە باڵندە ، دەیانبینی کە چۆن دەفڕی ، ئەمەش بە فەرمانی خوا ، لەگەڵ چەندین موعجیزەی تر کە خوای گەورە ڕێزی لە عیسا پێ گرتبوون ، ولەسەر دەستی ئەو دا ڕوویان دەدا ، لەگەڵ ئەوانەشدا باوەڕیان پێی نەدەکرد و سەرپێچیان دەکرد ، و هەوڵیان دەدا ئازاری بدەن بەو شێوەیەی کە دەیان توانی لەشارەکەی خۆی نیشتەجێ ببێت ، بەڵکو زۆر لە گەڕاندابوو لەگەڵ دایکیدا ، پاشان بە مەش قەناعەتیان نەکرد هەتا گەیشتنە لای پاشای ( دمشق )ی ئەو زەمانە ، ئەویش پیاوێکی هاوەڵدانەر بوو لە ئەستێرە پەرستەکان ، بەخەڵکەکەی ژێر دەستی دەوترا : (الیونان ) ، پێیان ڕاگەیاند کە لە ( بیت المقدس ) پیاوێك هەیە خەڵکی تووشی فیتنە دەکات و سەریان لێ تێك دەدات خراپەی بەرامبەر پاشاو بەردەستەکانی دەکرد ، پاشا توڕ بوو لەمە ، نامەیەکی بۆ جێگرەکەی نووسی کەلە ( قودس )بوو کە ( احتیاط ) لەسەر باس و خواسەبکات و لەخاچی بدات و دڕك و داڵ لەسەری دابنێت و دەستی پێ هەڵبگرێت لە خراپەو ئازاردانی خەڵکی ، کاتێك نوسراوەکە گەیشت ، والی ( بیت المقدس ) گوێڕایەڵی کرد و نوێنەرایەتی کرد ، لەگەڵ کۆمەڵێك لە ( یهود ) جوولەکە چوون بۆ ئەو شوێنەی کە عیسا ( علیه السلام ) ی لێ بوو ، لەناو کۆمەڵێك لەناو هاوەڵە کانیاندا بوو دوانزە یان سیانزە کەس دەبوون ، ووتراوە :- حەڤدە کەس بوون ، ڕۆژی جومعە بوو دوای عەسرەکەی هەرلەوێدا لەشەوی لەسەر ( شەممە ) دا گەمارۆیاندا،کاتێك عیسا ( علیه السلام ) هەستی پێکردن کە ئەوان ناتوانن بێنە ژوورەوە بۆلای یان ئەم بچێتە دەرەوە بۆ ناویان ، بە هاوەڵەکانی خۆیی ووت : کامتان دەیەوێت شێوەی منی بەسەردا بدرێت و لەبەهەشتدا هاوڕێی من بێت ؟ بۆ ئەوە گەنجێك نوێنەرایەتی کرد وەك ئەوەی بە بچوك تەماشای کردبێت بۆ دووەم جارو سێیەم جار دووبارەی کردەوە کەسیان نوێنەرایەتیان نەدەکرد تەنها ئەو گەنجە نەبێت . ئینجا ووتی تۆ ئەو کەسە دەبیت ، خوای گەورە شێوەی عیسای (علیه السلام)دا بەسەردا هەتا وەکوخۆی لێهات ، پاشان لەسەقفەکەوە کونێکی بۆ کرایەوە ، ئینجا عیسا ( علیه السلام ) تووشی خەوەنچکێ هات و بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان ، وەك خوای گەورە فەرمووی :( إذ قالَ اللّهُ يا عيسى إني مُتوَفيك و رافِعُكَ إلَيَّ ... ) واتە : ( یادی

ئەو کاتە بکە کە خوای گەورە فەرمووی ئەی عیسا بەڕاستی من وەفات بە تۆ دەکەم و بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم ...) کاتێك بەرزکرایەوە ، کۆمەڵەکە چوونە دەرەوە کاتێك ئەو کەسەیان بینی واگومانیان برد کە ئەوە عیسایە هەرلەو شەوەدا گرتیان و لە خاچیان دا ، پاشان درك و داڵیان لەسەر سەری دانا ، یەهود وایان دەرخست کە هەوڵیاندا و تێکۆشان بۆلە خاچدانی و شانازیشیان بەوە وە کرد ، کۆمەڵێك لە گاورەکان لەوە ڕزگاریان بوو بەهۆی نەزانی و کەم عەقڵیانەوە ، و خوای گەورە فەرمووی : ( وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ ) واتە : ( لە ڕاستیدا نە عیسایان کوشتووەو نەلە خاچیان داوە بەڵکو لێیان تێك چووەو ( کەسێکی تریان لە جیاتی ئەو کوشتوە ) . ولە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ( وما قتلوه يقيناً ) .

واتە : بەدڵنایی نەیان کوشتوە و بۆیان نەکوژراوە بەڵکو لە گوماندان و وەهمیان بۆ دروست بووە .

( بل رفَعَهُ اللّهُ اليه وكان اللّهُ عزيزاً حَكيماً ) واتە : ( نەخێر بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆ لانی خۆی ، خوا هەمیشەو بەردەوام بالادەست و دانایە )[1].

٩/ ٧ / ٢٠٠٩ بەرامبەر ١٦ / رجب / ١٤٣٠ پێنج شەممە .

## ﴿ چیرۆکی ئادەم ( عليه السلام ) ﴾

خوای گەورە فەرمویەتی :-﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ (٣٠) وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ

١.( تفسير القرآن العظيم ) بە کورتی .

إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٣٤) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (٣٦) فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧) قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩)﴾ (البقرة / ٣٠ -٣٩ )

پـێش ئـەوەی ببێینـە سـەر ڕوون کردنـەوەی مانـای ئایەتەکـە, بۆمـان ڕوون دەکەنـەوە کـە خـوای گـەورە (ئـادەم ) ی چـۆن دروسـتکرد , بێگومـان ئـەوەش بەشـێکە لـە (غیـب ) شـاراوەکان , کەتـەنها خـوای گـەورە خـۆی دەیزانێـت , کـە (غیـب ) شـاراوەکان , ڕابردوو داهـاتوش دەگرێتـەوە :- ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا (٢٧)﴾ ( الجن / ٢٦ / ٢٧ ) .

واتـە :- خـوای گـەورە زانـای نهێنـی و شـاراوەکانە ) کەسـیش لـەنهێنی و شاراوەکان ئاگادار ناکات ) مەگەر بۆ پێغەمبـەرێك خوا خـۆی ڕازیبێـت ( بـەوەی هەندێك نهێنی بزانێت ) ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لەبەرو پشتەوە ( تا پـەری و شـەیتانەکان نـەتوانن زەفـەری پـێ بـەرن ).سـەرەتا بەناسـاندنی ئـادەم ( علیـه السـلام ) و پێناسـەی (غیـب ) شـاراوەکان دەسـت پـێ ئەکـەین , تـەنها ڕێگەیش بۆ زانین و ناساندنی (غیب ) بریتی یە لە قورئان و سوو ننەتی ڕاست.

- ئادەم (علیه السلام ) چۆن دروستکرا ؟

ئـادەم (علیـه السـلام ) بـاوکی مرۆڤەکانـە , و یەکـەم پێغەمبەریشـە , پێچـەوانەی ڕای فەیلەسـوفەکانە , لـەوەدا کـەوای لێـك دەدەنـەوە مرۆڤـەکان لەسـەر (شـرك ) هاوەڵـدانان بـوون ) لەسـەرەتای کاریانـدا , خـۆر و مـانگ و ئەسـتێرەوە دار و درەخت و مانگا و گیانلەبـەریان دەپەرسـت , ئەمانـەش بەهـەوڵی خـۆیان بـوون , بەڵگەش لەسـەر بـەتاڵ کردنـەوەی ئـەم قسـەیە هـاتووە , کەفەرموودەیەکی ( ابن عبـاس ) بـووە ,کـە دەفـەرمووێت: (کـان بـین أدم و نـوح عشـرة قـرون کلـها

علیالأسـلام )١ واتـه : ( لـەنێوان ئـادەم و نوحـدا دە (جیـل ) نـەوە هـەبوون هەموویان لەسەر ئیسلام بون)

هەروەها پێچەوانەی ئەوەشە کە (داروون ) ی یەهودی , لەبیردۆزەکەیدا لێکی دەداتەوە , کەخرایە ناو زبڵدانی مێژووەوە , بەجۆرێك کەشەرع و عەقڵ شایەتیان دا لەسـەربەتاڵ کردنـەوەی ) کـەدەڵێت : ئینسـان بریتـی یـە لـە ئـاژەڵێکی گەشەکردوو لە مەیموونەوە دروستبووە , بێگومان لەم بۆچونەیاندا گومڕایی یەکی ئاشکراو درۆهەڵبەستێکی ئابڕوبەریان لێکەوتەوە , چونکە چاوەکانیان کوێربووبـوو لـەوەحی ئاسمـانی , ودڵـەکانیان داپۆشـرابووبێ هـۆش و بـێ ئاگابوون لەوەی کە پێغەمبەران هێنا بوویان :﴿ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ (٤٠)﴾ ( النور )

واتە : ( بێگومان ئەوەی خوا نوری پـێ نەبەخشێت , هـەرگیز نووری دەست ناکەوێت .

ئەمەش وەحـی ڕاست ودروستە کە بریتی یە لەقورئان و سوننەتی ڕاست , ڕوونی دەکاتەوە کە ئادەم (علیه السلام ) چۆن دروست کراوە , و سیفەتەکانی چۆنن , و چۆن خێزانەکەی لەو درووستبوو .

خوای گـەورە فەرموویـەتی :-﴿ إنَّ مثـلَ عيسـى عِنـدالله ِ كَمَثـلِ آدم خَلقَـهُ مِـن تُرابٍ ثم قالَ لَهُ كُن فيكون ﴾ (ال عمران /٥٩ )

واتە : بەڕاستی نموونەی دروستبوونی عیسا لەلایەن خواوە : وەك نموونەی ئادەم وایە , کەلەخاك دروستی کـردوو , لـەوەو دوا فەرمانیـدا و پێـی ووت :- ببـە (بەئینسـان ) ئـەویش بـوو . ( عیسـا دایکـی هـەبوو , بـەڵام ئـادەم دایـك و باوکیشـی نـەبوو ) . ئـادەم (علیـە السـلام ) یەکـەم کەسـە کـە خـوای گـەورە

---

١ / (الحاکم ) بەژمارەی (٢/ ٤٤٢ ) لە (إبن عباس ) ەوە بە (موقوفا ) ی ڕیوایـەتی کـردووە ) لەسەر مەرجی ( البخاری ) بەڕاستی داناوە , .

چیرۆکەکەی لە قورئاندا بۆ باس کردووین لەپێغەمبەران و ئادەم باوکی بەشەر بووە , لەقورئاندا (٢٥) بیست و پێنج جار ناوی هاتووە , لە (٢٥) ئایەتدا .
ئادەم (علیه السلام ) بەپێی ئەوەی کەلەتەوراتدا هاتووە (٩٣٠ ) ساڵ ژیاوە .[١]
و دەربارەی داڕشتەی ناوی (ادم ) دوو بۆ چوون هاتووە :- یەکەمیان لە (أديم الأرض ) ەوە وەرگیراوە واتە : ڕووی زەوی , دووەمیان لە (الأدمـةً ) ەوە وەرگیراوە , کەمانای ڕەنگ و سیفەت دەگەیەنێت , ڕەنگ خاکی و گەنم ڕەنگی و ڕەشباوە کەماناکان لەیەکەوە نزیکن [٢] لە ( أبی موسی ) ەوە , ئەویش لەپێغەمبەر( ﷺ ) فەرموویەتی :-( إن الله خلقَ آدم مِن قبضَةٍ قبضها مِن جميع الأرض , فجاء بنو آدم على قَدرِ الأرضِ , فجاء منهم الأبيض والأحْمَرُ والأسوَدُ ,وبين ذلك , والخبيث والطيب والسّهلُ والحزن وبين ذلك [٣] )
واتە : خوای گەورە ئادەمی دروستکرد لەمشتێك خۆڵ ی کۆکراوە لە هەموو بەشە جیاوازەکانی سەرزەوی , ئینجا نەوەی ئادەم لەسەر شێوەو ڕەنگی سروشتی ئەو خاکەهاتن , لەوانە , پێست سپی و پێست سوورو پێست ڕەش

---

١/ (الأعلام والمواقع في القرآن الكريم ) ل (٢٣ _ ٢٤ )
٢/ ( الأعلام و المواقع في القرآن الكريم ) ل / (٢٤ ) .
٣/ ( الترمذي) و( ابوداود ) ڕیوایەتیان کردووە . الترمذي ووتویەتی :- ئەمە فەرمودەیەکی جوان و ڕاستە . هەروەها ( الألباني ) لە (صحيح) ە کەیدا بەژمارەی ( ١٦٣٠ ) بەڕاستی داناوە , ئەم بەشەی فەرمودەکە : - ( فجاء بنو أدم على قدر الأرض ) :- ( شمس الحق أبادي ) لە ( النهاية ) دا ووتویەتی:- واتە : ئینسانەکان بەپێی دابەشبوونی ڕەنگەکان و سروشتیان لەڕەنگ و سروشتی خاکی سەرزەویدا هاتوون , لەو ڕەنگانە ڕەنگی سورو سپی و ڕەش بەپێی جۆری خۆڵە کانیان لەو سێ جۆرە بنەڕەتیە هاتوون , ئەوەی لەوان جیاوازە لەوانە پێکهاتووە , کە مەبەستی لە : - ( بين ذلك ) واتە : - لەنێوان ڕەنگەکانی سوورو سپی و ڕەشدا, بەو پێیی یەی کە بەشەکانی سەر زەوی دەگرێتەوە , ئەمە ( القاري ) ووتوویەتی. ووشەی ( السهل ) واتە :- نەرم و نیان و لەسەرخۆ . و ( الحزن) واتە :- توونددوتیژو ڕەق , و( الخبيث) : واتە :- ڕەوشت ناپەسەند . (( عون المعبود )) ) (١٢/ ٤٥٦- ٤٥٧ )

و ڕەنگەکانی تر لە نێوانیاندا هاتن , کەسانی ڕەوشت ناپەسەند لە خاکی ناپەسەند و کەسانی پاك و پەسەند لەخاکی پاك و پەسەندو , کەسانی نەرم و نیان لەخاکی نەرم و , کەسانی توندوتیژ لەخاکی زبرو ڕەق لەنێوانیاندا پەیدابوون .

لە ( انس )ە وە ( خوا لێی ڕازی بێت ) , پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : - (( لَماصَوَّرَ الله أدم في الجَنَةِ تركَهُ ما شاء اللهُ أَنْ يُتْرِكَهُ , فجَعَلَ إبليسَ يطيفُ بهِ , ينظرُ ما هُوَ , فلمّا راهُ اجوفَ أنَّهُ خُلِقَ خلقاً لا يتمالك )) [1]

واتە : (( کاتێك خوای گەورە دیمەنی ئادەمی کێشا لەبەهەشتدا , وازیلێهێنا ئەوەندەی کە خوا ویستی وازی لێ بێنێت , ئیبلیس بەدەوریدا دەگەڕاو سەیری دەکرد هەتا بزانێت چی یە ؟ کاتێك بینی کە ناوسکی بۆشە , زانی کە بەشێوەیەك دروستکراوە کە خۆی ناگرێت )) .

- دەربارەی سیفەتی ئادەم و پێکهاتەی ( علیه السلام ) : -

لە ( ابی هریرە ) ەوە ( خوا لێی ڕازی بێت ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:- (خلقَ الله عزوجل أدم على صورتِهِ طوله ستونَ ذراعاً , فلما خلقهُ قال : اذهب فسلّم على أُولئك النفر , وهم نفرُ مِن الملائكةِ جلوسُ , فأسْتَمِعْ ما يُجيبونكَ , فإنّهَا تحيّتُكَ وتحيّةُ ذُرّيتِكَ . قالَ : فذهبَ فقال :- السلامُ عليكم , فقالوا :السلامُ عليكَ ورحْمَةُ الله , قال : فزادوهُ وَرَحْمَةُ الله , قالَ : فكُلُّ مَنْ يدخُلُ الجنَّةَ على صورة أدم (عليه السلام ) وطولهُ ستونَ ذِراعاً , فلم يزل الخلقُ ينقصُ بَعْدَهُ حتى الأن ) [2]

---

٢/( مسلم ) ( البرو الأداب والصلة ) دا ڕیوایەتی کردووە .

٣/ ( بوخاری ) لة ( الأستئذان ) و ( موسلیم ) لة ( الجنّة ) دا , ڕیوایەتیان کردووە .

واتە :- ( خوای بالاّ دەست ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردووەو , درێژیەکەی شەست باڵ بووە , کاتێك دروستی کرد فەرمووی :- برۆ سەلام بکە لەسەر ئەو چەند کەسە ,کەچەند کەسێك بوون لە فریشتە دانیشتبوون گوێ بگرە بزانە چۆن سلاّوت دەسێننەوە , چونکە ئەوە دەبێت بەسلاّوی خۆت و سلاّوی نەوەکانت , ئینجا ڕۆیشت و ووتی:- سەلامتان لەسەربێت , ئەوانیش ووتیان : سەلام و ڕەحمەتی خوا لەسەر تۆیش ,دەفەرمووێت:

( ڕەحمەتی خوا ) یان لێ زیادکرد , هەرکەسێك دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە ( سەلامی خوای لەسەربێت ) کە بالاّی شەست باڵ بەرزبووە , ئیتر دوای ئەو خەڵك بەرەو کورت بوون هاتوون هەتا ئێستا )).

بەلاّم دەربارەی ناوی خێزانەکەی قورئان هیچی بۆ باس نەکردووین , هیچیشی دەربارەی چۆنیەتی دروستبوونەکەی بۆباس نەکردوین بەلاّم لەئایەتێکدا ئاماژەی پێداوە : - ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء ﴾ ( النساء / ١ )

واتە : ( ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆتان بپارێزن کەئێوەی لەتاکە نەفسێك درووست کردووە , هەر لەو نەفسەیش هاوسەرەکەی بەدیهێناوە, لەو دوانە پیاوان و ژنانی زۆری خستەوە و بلاّو کردەوە .

زۆربەی زانایانی تەفسیر بۆچوونیان وایە کەخوای گەورە (حواء ) ی لەپەراسوی ئادەم دروستکرد , بەڵگەشیان بەم فەرموودەیە هێناوەتەوە :- (إستو صوا بالنساءِ خيراً , فإ نُهنَ خلقن من ضلعِ وإن أعوجَ مافي الضلعِ اعلاه)[١]

واتە : _(( ئامۆژگاری وەرگرن و لەگەڵ ئافرەتان چاك بن , چونکە لەپەراسوو دروستکراون , لارترین بەشی پەراسویش لا سەرووبەتی )).

١/ (بوخاري ) لە (الأنبياء ) دا ڕیوایەتی کردووە .

هەندێك لەزانایان بۆچونیان وایە مانای ( خُلِقَ منها زوجها ) (النساء / ١ ) واتە : - خوای گەورە لەڕەگەزی ئادەم دروستی کردووە , هەتا بوونی جیاوازی لەنێوانیاندا نەبێت .

لێرەوە دەست ئەکەین بەڕونکردنەوەی مانای ئایەتەکان :- خوای گەورە فەرموویەتی : -

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ (البقرة / ٣٠)

(القاسمي) دەربارەی ئەم ئەم ئایەتە دەڵێت : واتە : ئەی محمد( ﷺ )باسی ئەوە بکە پەروەردگارت بەفریشتەکانی ووت :- بەڕاستی من لەسەر زەویدا قەومێك دروست دەکەم , کەهەندێکیان شوێنی هەندێکیان بگرنەوە جیل لە دوای جیل , وەك خۆی فەرموویەتی : - ﴿ وهو الذي جَعَلَكُم خَلَئِفَ الأرضِ ﴾ (الآنعام /١٦٥ ) واتە : ( ئەو خوایەی کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لەسەر زەویدا ) ,لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت : -﴿ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاء الأَرْضِ ﴾ ( النمل /٦٢ ) واتە :( ئێوە دەکات بەجێنشین لەسەر زەویدا ).

(الشنقيطي ) دەڵێت : - ووشەی (خليفة ) لە تەفسیری زانایاندا دوو لێکدانەوەی هەیە :-

یەکەمیان : - مەبەست پێی ئادەمی باوکمانە (عليه السلام ) چونکە جێنشینی خوایە لەسەر زەویدا لەجێبە جێ کردنی فەرمانەکانیدا , وتراوە : - لەبەر ئەوەی بۆتە جێگرەوەی پەری یەکان ئەوانەی لەپێش ئادەمەوە لە سەر زەویدا نیشتە جێ بوون .

دووەمیان :- ووشەی (خليفه ) ووشەیەکی (مفرد) تاکە وەمەبەست پێی ( جمع ) کۆیە , واتە (خلائف ) , ئەمە هەڵبژێردراوی (إبن كثير ) ە , ئەگەر ( مفرد ) ناوێکی تاك بۆ (إسم جنس ) ناوی ڕەگەز بوو , ئەوا لای عەرەب زۆر بەکاردەهێنرێت و مەبەست پێی (جمع ) کۆیە . وەك ئەم ئایەتە :- ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ (٥٤)﴾

(القمر/٥٤) واتە : (انهار ) , بەبەڵگەی ئایەتی:﴿ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ ﴾ (محمد / ١٥)

ئەگەر هاتوو ئایەتە کە ئەو لێکدانەوەی گرتەوە کە باسکران , ئەوە بزانە کەئایەتی تر بەڵگە لەسەر لێکدانەوەی دوەمیان دەدات , کەمەبەست لە (خليفه )

: (الخلائف ) ە , لە ئادەم و کورەکانی و نەوەکانی , نەك خۆی بەتەنها , وەك خوای گەورە فەرموویەتی : - ﴿ قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ (٣٠) ﴾ (البقرة / ٣٠)

ئەوە زانراوە کە ئادەم (علیه السلام ) بێگومان لەو کەسانە نەبوە کەفەساد و خراپە لە سەر زەویدا بەرپا بکات و خوێن برێژێت . وەك خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا (٣٩)﴾ (فاطر / ٣٩)

( الشیخ محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت :- چیرۆکی ئادەم لە چەند ئایەتێکدا هاتووە , کەبەهەموویان چیرۆکێکی تەواومان دەداتێ , هەر ئایەتێك حیکمەتی خۆی تیایە کەپێویستی بەو کاتە هەبووە کەتیایدا دابەزیوە , خوای گەورە سەرەتای دروست بونمان بۆ دەگێڕێتەوە , و پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : - (ئێوە هەمووتان نەوەی ئادەمن و, ئادەمیش لە خۆڵ دروست بووە ) .

ئینجا فریشتە کان ووتیان : ﴿ قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ﴾ (البقرة / ٣٠ )

واتە : - فریشتەکان ووتیان :- ئایا تۆ دروستکراوێك دروست دەکەیت لە سەر زەویدا کە فەساد و خراپەی تیا بەر پابکات و خوێنی تیابڕژێت , لەکاتێکدا ئێمە تۆبە پاك ڕادەگرین و تەسبیحات و سوپاسگوزاری تۆدەکەین و هەموو کەموو کوڕی یەك لەتۆ بەدوور دەگرین .

فریشتەکان ئەمەیان چۆن زانی ؟ کەواتە دەبێت پێشتر حالەتێکی لەو جۆرە بوو بێت کە خراپە لەسەرزەویدا کرابێت ,یان وا گومانیان بردووە کە ئادەم لەسەر زەویدا خراپە دەکات و یاخی دەبێت , باشە فریشتەکان چۆن هەردوو ووشەی ( سفك ) و ( دم ) یان زانیبێت , کەهێشتا هیچ لەو جۆرە لەسەر زەویدا ڕوینەدابوو ؟ کەواتە دەبێت لەژیانی پێش ئەماندا زانیبێتیان , خوای گەورە دەفەرمووێت : -

﴿ وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ ( ٢٧ )﴾ ( الحجر /٢٧ )

واتە :وەك ئەوەیە کەپەریەکان پێش ئینسان دروستکراون .

﴿ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ (٣٠) ﴾ ( البقرة / ٣٠ ) واتە : ئەی دروستکراو زانستەکەی تۆ بەقەدەر دروستبوو نەکەی خۆت لەگەڵت گونجاوە . بەلاّم زانستی خوا , ئەوە هەر بووەو کۆتایی نایەت و بێ ئەندازەیە .

پاشان خوای گەورە شتێکی لەحیکمەتی ڕێزگرتن ی لەئادەم و نەوەکانی بۆ فریشتەکان ڕونکردەوە کەدەیان کات بە جێنشین لەسەر زەویدا , فەرمووی :-

﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ(٣١) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) ﴾ (البقرة/٣١ -٣٢ )

( ابن كثير ) دەڵێت : خوای گەورە ڕێزی ئادەمی لەزانستدا بۆ ڕوونکردنەوە , کەناوی هەموو شتەکانی لەگەڵ کارەکانیان لەگەورەو بچوکیانی فێر کرد , هەروەك ( إبن عباس ) (خوا لێیان ڕازی بێت ) ئاماژەی پێ دابوو.[1]

لە (انس ی کوڕی مالك ) ەوە , پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :- (( يجتمعُ المؤ منونَ يومَ القيامَةِ فيقولونَ :- لو إستشفَعنا إلى ربِّنا , فيا تونَ آدم فيقولون : انت أبو البشر , خلقك اللهُ بيده , واسجدَ لك ملا ئكتُهُ , وعلمكَ اسماء كل شيئ .....))[2]

واتە : باوەڕداران لەڕۆژی قیامەتدا کۆدەبنەوە , دەڵێن خۆزگا لای پەروەردگارمان تکامان بۆ دەکرا ڕزگار بین , ئینجا دێن بۆ لای ئادەم (علیه السلام ) دەڵێن : - تۆ باوکی هەموو بەشەریەتی , خوا بەدەستی خۆی دروستی کردویت , و فریشتەکانیش سوجدەی ڕێز گرتنیان بۆ بردویت , و ناوی هەموو شتێکی فێر کردوویت ...) .

١/ (قصص الأنبياء ) ی (إبن كثير ) ل (١٤)
٢/ (بوخاری ) و ( مسلم ) دەریان هێناوە .

﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (البقرة / ٣١ ) .

( حسن ی بصري ) ( خوا لێی ڕازیبێت ) ووتویەتی : - کاتێك خوای گەورە ویستی ئادەم دروست بکات , فریشتەکان ووتیان :- پەروەردگارمان دروستکراوێك دروست ناکات , بێجگە لەوەی کە ئێمە لەو زاناترین ! بەمەتاقی کرانەوە .[١] فریشتەکان ووتیان ﴿ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾(٣٢) (البقرة / ٣٢ )

واتە : پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە , ئێمە هیچ زانست و عیلمێکمان نی یە بێجگە لەوەی کەخۆت فێرت کردوین بەڕستی تۆ خوایەکی زاناو کار بەجێیت.

(القاسمي ) دەڵێت : - پاك وبێگەردی لەلایەن فریشتەکانەوە دەربڕا : کەیەکێك بتوانێت هەست بەشتێك لەزانستی خوا بکات , مەگەر خۆی بیەوێت و حەز بکات . ئەوان شتێك نازانن تەنها ئەوە نەبێت کەخوافێری کردون و دانیان نا بەوەدا کەئەوان بێ دەسەڵاتن و کەم توانان لەوەدا کەتەکلیفی لێکردون . بێگومان خوا زانایە بەهەموو زانراوە کان کەلە ناو ئەواندا ئامادەکردنی ( ئادەم ) ( علیە السلام ) ی تیایە , کەئێمە دوورو گۆشەگیرین لەو ئامادەبوونە لەزانستە شاراوەکان کەپەیوەندی دارن بەو شتانەی لەناو زەویدان لەجۆری هەموو دروستکراوەکان کەفەزای جێنشینی خوای کاربەجێ لەسەر ئەو شتانە سوڕدە خوات . کەتەنها بەپێی حیکمەت کارەکانی بەڕێوە دەبات , هەروەها فێر کردنی ئادەم ( علیە السلام ) کەپێویست بوو لەزانستی گشتی و بەشەکانی کەپەیوەندی داربوون بەو حوکمانەی هەبوون لەسەر زەویدا و دروست کردنی

---

٣/ ( قصص الأنبياء ) ی (إبن كثير ) . (الطبري ) به (سسند) ێکی (جيد ) له (جامع البيان ) ( ١ / ١٧٣ ) دەرهێناوە .

جێنشینی لەسەر زەویدا .[1] ﴿ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣) ﴾ (البقرة / ٣٣ )

( ابو جعفر إبن جرير الطبري ) دەڵێت : - خوای گەورە بەو فریشتانەی ووت کەپرسیاریان لێ کردبوو : - کەئادەم و نەوەکانی دەکات بەجێنشین لەسەر زەویدا , فریشتەکانیش واباسی خۆیانیان کرد کەگوێڕایەڵ وملکەچی فەرمانی خوان و لەو کەسانە نین کەفەساد و خراپە لەسەر زەویدا دەکەن و خوێن دەڕێژن , بێ گومان ئەوان بێ ئاگا بوون لەوەی کەخوای گەورە نەخشەی چی کێشاوە , و لەکوێدا جێ بەجێ ی دەکات پێش ئەوەی ئەوانی لێ ئاگادار بکات لەسەر شێوەی ئەو نەزانی یەی کەناوی فریشتەکانیان نەدەزانی , ئینجا ئادەم ناوی شتەکانی فێر کردن , ئەگەر زانایەك هەبووایە فێری بکردنایە بێگومان دەیان زانی , ئەوان و غەیری ئەوانیش لەو بەندانەن کەهیچ نازانن تەنها ئەوە نەبێت کەخوای گەورە فێری کردوون , و خوای گەورەش هەرکەسی بوێت تایبەتمەندی دەکات بەعیلم و زانست و هەرکەسیشی بوێت قەدەغەی دەکات لێی , وەك ئەوەی ئادەم ی فێری ناوەکان کردوو ئەویش بۆ فریشتەکانی خستە ڕوو .[2]

پاش ئەوەی خوای گەورە تایبەتمەندی ئادەمی دەرخست و مافی لەجێنشینی دا ڕوون کردەوە , ئینجا ڕێزێکی زۆری ڕشت بەسەریدا , خوای گەورە فەرمووی :-

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ (البقرة / ٣٤ ) .

---

٤/ (محاسن التأويل ) (٢ / ٩٩ - ١٠٠ ) .

١/ ( جامع البيان في تفسير القرآن ) ( ١/ ١٧٥ ) ( دار المعريفة ).

(إبن كثير ) دەڵێت : - ئەمەڕێز گرتنێکی گەورەبوو لەلایەن خواوە بۆ ئادەم و ڕشتی بەسەر نەوەکانیشیدا , بە جۆرێك هەواڵی دا کەخوای گەورە فەرمانی کرد بەفریشتەکان سوجدەی ڕێز گرتن بەرن بۆ ئادەم , لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ ﴾ (الحجر /٢٩ ) .

چوار ڕێز گرتنی بۆ ئادەم تیایە : - بەدەستی پیرۆزی خۆی دروستی کردووە , لەڕوحی خۆی کردوە بەجەستەیدا , و فەرمانی کردوە بەفریشتەکان سوجدەی ڕێز گرتنی بۆ بەرن , و ناوی شتەکانی فێر کردووە .

بۆ ئەمەش مووسا کاتێك لەگەڵ ئادەم لەناو فریشتە بەرزوو بەڕێزە کاندا کۆبوونەوە و چاویان بەیەك کەوت , ووتی : - ( تۆ ئادەمی باوکی بەشەریت , کەخوای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردوویت , و لەڕوحی خۆی کردووە بەبەرتدا , و فریشتەکانی سوجدەیان بۆ بردوویت و و ناوی هەموو شتێکی فێر کردویت . )[1]

(القاسمي ) دەڵێت : خەڵکی دەربارەی ئەم سوجدەیە قسەی جیایان هەیە , :- هەندێکیان دەڵێن ڕێز گرتن بووە لەئادەم (علیه السلام ) و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بووە , پەرستنی ئادەم نەبووە , ووتراوە : - سوجدە بردن بۆ خوایە , و ئادەم (علیه السلام ) لەوێدا وەك (قیبلە ) واتە (ڕەوگە ) وابووە , یان سوجدە بۆ ئادەم وەك سلاوێك بووە , یان سوجدە بووە بۆ ئادەم پەرستشێك بووە بە فەرمانی خوا و فەرزی کردووە بەسەریاندا ,و(إبن الأنباري ) لە (الفراء ) و کۆمەڵێك لەپێشەوایانەوە باسیان کردووە کە سوجدە ی فریشتەکان سلاوێك بووە نەك پەرستش , سوجدەی بەگەورەو بەڕێز دانان و سلاو کردن بووە نەك سوجدەی نوێژو پەرستش .

---

٢ / فەرموودەیەکی (صحیح ) ە (أبو داود ) بەژمارەی (٤٧٠٢ ) و (أبو یعلی ) لە (المسند ) دا بەژمارە (٢٤٣ ) بەسەنەدێکی (جید ) دەریان هێناوە .

(شیخ الاسلام إبن تیمیە ) ووتویەتی : ئەهلی زانست ووتوویانە :- سوجدە بۆ ئادەم بە فەرمانی خوا بووە و خۆی فەرزی کردووە , خوای گەورە فەرموویەتی : - (آسجدوا لآدم ) نەیفەرمووە :- (إلی آدم ) هەریەکەیان مانای خۆی هەیە جیاوازیش هەیە لەنێوان (سَجدتُ لَهُ ) و (سجدتُ إلیهِ ) خوای گەورە فەرموویەتی : -﴿ لا تسجدوا للشمسِ ولا للقمرِ و آ سجدوا الله ﴾ (فصلت / ٣٧) هەروەها فەرموویەتی :﴿ ولِله یسجدُ مَن فِي السموات والأرض ﴾ ( الرعد / ١٥ ) موسڵمانان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە سوجدە بۆیەردو دارو گیانلەبەران حەرامە, بەلاَم دەربارەی (کەعبە ) دەوترێت : - پێغەمبەر( ﷺ )بەرەو ئاڕاستەی ( بیت المقدس) نوێژی دەکرد, پاشان بەرەو ئاڕاستەی( کەعبە ) نوێژی کرد , ناوترێت نوێژی بۆ ( بیت المقدس ) یان بۆ ( کەعبە) کرد , ڕاستیەکەی بریتیە لە: ملکەچی بە دڵ و دان نان بەبەندایەتیدا, تەنها بۆ خوای گەورە دەگونجێت .[1]

ئایەتی :- ﴿ إلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ ( البقرة/٣٤).

واتە:- (کاتێك خوای گەورە فەرمانی کرد بەفریشتەکان سوجدە بۆ ئادەم بەرن کۆمەڵێکیان سوجدەیان بۆ برد , تەنها ئیبلیس سوجدەی نەبرد , فەرمانەکەی ڕەتکردەوەو خۆی بەگەورە نیشاندا, و ئەو یەکێك بوو لەکافران )

زانا ( الشنقیطي ) دەڵێت :- لێرەدا ڕوونی نەکردۆتەوە هۆکاری خۆ بەگەورە زانینەکەی چی بوو لەوەدا کەلێکی دایەوە , بەڵکو لەشوێنێکی تردا ڕوونیکردەوە , وەك فەرمووی:﴿ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ ( الأعراف/ ١٢)

واتە :- ( من لەئادەم چاکترمو خەیرم زیاترە چونکە تۆ منت لە ئاگر دروستکردوەو ئەوت لە قوڕدروستکردووە) ڕوونکردنەوە :- ئیبلیس پێوانەی لەسەر ئەوەکرد کە ئەو ڕەگەزی ئەوی لێدروستکراوە ئاگرە , ئەو ڕەگەزەی ئادەمی لێدروستکراوە قوڕە , ئەوەی بەرهەمی هێنا بریتی بوو لەوەی کەئەو چاکترو خەیری زیاترە لە ئادەم , ناگونجێت فەرمانی پێ بکرێت سوجدە

---

١/ ( محاسن التأويل ) ( ٢/ ١٠١ – ١٠٢ ) .

بۆکەسێك بەرێت کەئەم خۆی لەو چاکتربێت , لەگەڵ ئەوەی کەخوای گەورە فەرمووبووی :( اسجدوا لآدَمَ ) .

پاشان خوای گەورە فەرموویەی :- ﴿ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ ﴾ ( البقره/ ٣٥) .

واتە :- ووتمان : ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەکەت لەباخ و بەهەشتدا ژیان بەرنەسەرو نیشتە جێبن , لەهەر کوێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێروتەسەلی , بەڵام نزیکی ئەم درەختەمەکەون ( درەختێکی دیاری کراوبووبۆ تاقیکردنەوە لێیان قەدەغەکرا ئەگینا دەچنەڕیزی ستەم کارانەوە ) .

زنایان ڕای جیاوازیان هەیەدەربارەی ئەو (جنة ) بەهەشتەی کەئادەمی تێ چووە ,ئایا لەئاسماندابووە یان لەزەویدا بووە ؟

( إبن کثیر ) ووتویەتی:- زۆرینە لەسەر ئەوەن کەئەو بەهەشتە لەئاسماندابووە , کە (جنة المأوی ) بووە, بەپێی ڕواڵەتی ئایەت و فەرموودەکان , وە ك خوای گەورە فەرمووی :-

﴿ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ ﴾ ( البقره / ٣٥ ) لێرەدا ( ال ) لەسەر ووشەی ( الجنة ) بۆ گشتی نەبوو,

(محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت : - چۆن دەگونجێت ئیبلیس بچێتە ناو بەهەشتی گوێڕایەڵانەوە لەکاتێکدا ئەو خۆی لەخوا یاخی بووە ؟ و چۆن دەگونجێت بچێتە ناو بەهەشتی ( خلد ) هەتا هەتایی و پاشان لێ ی دەربچێت, لەگەڵ ئەوەی کەخوای گەورە بڕیاری داوە هەرکەس بچێتە ئەو بەهەشتە لێ ی دەرناچێت ؟ ئێمەیش بە هەموویان دەڵێین :- ئێوە بەئاگانین لە مەبەستی ووشەی ( جنة ) , ئەمەشتێکە پێی دەڵێن : ( غلبة الآستعمال ) واتە : (زۆر بەکارهاتوو) , لێرەدا ووشەکە چەند مانایەك دەگەیەنێت ,بەڵام عادەت وایە زۆرجار بەیەك ماناوەردەگیرێت,

بەجۆرێك کەووشەکە دەبیسترێت یەکسەر بیری مێشك ئەچێت بۆلای هەتا هەتایی کەبەهەشتی قیامەت و ڕاستیە . کاتێك ووشەیەك لەقورئاندا دێت , دەبێت بەکارهێنانی ووشە کەبزانین , چونکە خوای گەورە دەریبڕیوە

ووشەی ( الجنة ) لەماناادا واتە ( الستر ) داپۆشەر , لەو شوێنە دەنێرێت کەدارستانی چڕو پڕو هەمەجۆری تیابێت. ئەگەر بێینە لای قورئان دەبینین

ووشـەی (الجنـة ) ی لـەدووماناادا بـەکارهێناوە . مانـای زمانـەوانی و مانـایی بەهەشتی کۆتای خوای گەورە دەفەرموویێت :-

﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ﴾ (البقرة /٢٦٦)

واتـە :( ئایـە هـیچ کـەس لـەئێوە حـەزدەکات بـاخێکی هـەبێت لـەدارخورماو چەندەها جۆر باخە ترێ پێك هاتبێت ),

هەروەها ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ ﴾ ( البقرة /٢٦٥ )

واتە : ( وەك باخچەیەك لەبەرزاییەك دابێت , بارانێکی دلۆپ گەورە بیگرێتەوە و ببێتە هۆی ئەوەی دووبەرامبەر بەرهـەمی هـەبێت ). ئەم دووئایەتەو چەندین ئایەتی تریش مەبەستی لەباخچەی دنیایە کەرِازاوەن نەك بەهەشتی کۆتـایی . کەواتـە ... دەبێـت بـزانین ئـەو بەهەشتەی کـەئادەمی بۆماوەیـەك تیاژیـا , ئـەوە بەهەشتی هەتاهـەتایی نـەبوو, .چونکە ژیـان لەبەهەشتی نـەبڕاوەدا دوای جێ بـەجێ کردنـی تـەکلیفی خـوایی دێـت , کەپاداشـتی شـوێن کـەوتنی بەرنامـەی خواییە . هەرکەس چووە نـاو بەهەشتی هەتاهـەتایی هـەرگیز لێ ی دەرناچێت , ئادەم بۆسەر زەوی دروستکراوە , کەواتە ..... ئەوبەهەشتەی ئادەمی تیـا ژیـا , شوێنێك بوو خوای گەورە ئامادەی کردبوو, بۆئەوەی ڕاهێنانی تیابکات لەسـەر بەرنامەکەی خوا , فەرمانی بەهەردووکیان کرد بەووشەی ( فكلا ) لێی بخۆن, و نەهیشی لێ کردن بەووشەی ( ولاتقربا ) واتە نزیکی مەکەون [1]

ئیبلیس وەسوەسە بۆئادەم و حەوا دروستدەکات .

خوای گەورە فەرموویەتی :-﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ ﴾ ( الأعراف / ٢٠ )

واتــە : شــەیتان وەسوەســەی خســتە دڵیانــەوە تاعــەورەتی شــاراوەیانی دەرخســت وتــی :- پـەروەردگارتان نـەهی لێ نـەکردون لـەخواردنی بـەری ئـەم

١/ ( قصص الأنبياء ومعه سيرة الرسول ) ( محمد متولي الشعراوي )

درەختە , مەگەر ئەوەی کەنەیویست ئێوە ببنە دووفریشتە یان بۆ هەمیشەی لە بەهەشتدا بمێنەوە . ) ( وقاسَمَهَا ) ئینجا لەسەر ئەوە سوێندی بۆ خواردن ,﴿إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ﴾ ( الاعراف /٢١ )

واتە : بەڕاستی من ئامۆژگاری کارو کەسێکی دڵسۆزم بۆتان .

لەئایەتێکی تردا هاتوە :- ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَّ يَبْلَى ﴾ (طه / ١٢٠ )

واتە : ( ئایاڕێنمایت بکەم و پێت بڵێم کە درەختێك هەیە لێ یبخۆیت , ئەوە بەهەمیشە یی لەناو نازو نیعمەتی نەبڕاوەدا دەمێنیتەوە , ئەمەش بەڕاستی سەرلێ شێواندن و فروفێڵ و پێچەوانەی ڕاستی بوو. مەبەست لە ( شجرە الخلد) واتە : ئەگەر لێ ی بخوات ئەوا نەمر دەبێت , ڕنگە ئەو درەختە بێت کەپێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی : - ( انّ في الجنة شجرة يسير الراكبُ في ظلمها مائة عامٍ لايقطعها ) [1]

واتە :( بەڕاستی لەناو بەهەشتدا دارێك هەیە , سوارێك لەژێر سێبەرەکەیدا بۆ ماوەی سەد ساڵ دەڕوات هێشتا تەواو نابێت ) .

﴿ فَأَكَلا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ﴾ ( طه / ١٢١ )

واتە :( هەردووکیان لەبەری درەختەکەی بەهەشتیان خوارد , بەرگی بەهەشتەکەیان لەبەر کەوتە خوارەوەو عەرەت و جەستەیان دەرکەوت , ئینجا دەستیان پێ کرد کەبەگەڵای داری بەهەشت خۆیان پۆشتە بکەنەوە , )

حواء , پێش ئادەم لەبەری درەختەکەی خوارد هەر ئەویش هانی ئادەمی دا کەبیخوات ( خوا زاناترە ) .

---

١/ ( بوخاری ) بەژمارەی ( ٣٢٥٢ ) و(مسلم )بەژمارەی ( ٢٨٢٦ ) دەریان هێناوە .

لە( ئەبی هورەیرە )ەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( لولا بنو إسرائيل لم يخنزاللحم , ولولا حواء لم تخن انثى زوجها ) [1] واتە : ( ئەگەر نەوەی ئیسرائیل نەبوونایە ئەوا گۆشت خراپ نەدەبووبۆگەنی نەدەکرد , و ئەگەر حەواء یش نەبوایە هیچ ژنێك خیانەتی لەمێردەکەی نەدەکرد ) .

لە ( أبی هريرة ) و ( خذيفة ) ( خوالێیان ڕازی بێت ) ووتیان :- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :- ( خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا خەڵکی کۆدەکاتەوە , ئینجا باوەڕداران کاتێك بەهەشتیان لێ نزیك دەخرێتەوە , دێن بۆلای ئادەم ( عليه السلام ) و دەڵێن :- ئەی ئادەمی باوکمان .... داوابکە دەرگای بەهەشتمان بۆ بکرێتەوە ,ئەویش دەڵێت :- ئایا تەنها بەهۆی گوناهێکی باوکتانەوە لە بەهەشت دەرنەکران ؟ ....) [2]

خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿ فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ ( البقرة / ٣٦ )

( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- شەیتان بەهۆی ئەو درەختەی ناو بەهەشتەکەوە ئەوانی خستە هەڵەو لەخشتە بردنەوەو سەری لێ تێك دان کەڵ ی بخۆن , پاشان لەناو نازو نیعمەتەکەی بەدەرکردنی دان , خوای گەورەش فەرمووی : پێمان ووتن لەو بەهەشتە دابەزن و دەرچن بۆسەر زەوی , بەهەر سێکیانی ووت کە ( ئادەم و حەواء ) و ( ئیبلیس ) بوون , کەشەیتان دووژمنە بۆ ئادەم و حەواو ئێوەش ببنە دوژمنی شەیتان , ئینجا بۆ ئێوە لەسەر زەوی دنیا شوێنی نیشتە جێ بوون و مانەوە هەیە و لەناو نیعمەتی بخۆن و سوودی لێ وەربگرن تا ئەو کاتەی لەسەر زەویدا دەژین . [3]

---

٢/ ( بوخاری ) بەژمارەی ( ٣٣٣٠ و ٣٣٩٩ ) و (مسلم ) بەژمارەی ( ١٤٧٠ ) دەریان هێناوە .
٣/ ( مسلم ) لە ( الشفاعة ) دا ڕیوایەتی کردووە .
٤/ ( صفوة التفاسير ) . ( محمد علي الصابوني ) .

(الشیخ ابو بکر الجزائري ) دەڵێت : – خوای گەورە هەواڵی دا کەشەیتان ئادەم و هاوسەرەکەی خستە هەڵەوە , کاتێك کەخواردنی بەری درەختەکەی لەبەر چاو جوان کردن و ڕازاندیەوە ئینجا ئەوانیش لێیان خوارد , پاشان جل و بەرگەکانیان کەوتە خوارو گیانیان دەرکەوت , نەبوونە کەسێك لەو بەهەشتە دا بمێننەوە , دابەزینە سەر زەوی لەگەڵ ئیبلیسی دوژمنیاندا , تاڵەوێ بەدوژمنایەتی یەوە بژین تاژیانیان کۆتایی دێت [1] .

﴿ فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ (البقرة / ٣٧ ) .

واتە : ( ئادەم (علیه السلام ) لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند ووشەو نزایەکی وەرگرت ( بەدڵ و بە کوڵ پاڕایەوە و خوای میهرەبانیش ) نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو , چونکە بەڕاستی ئەو میهرەبان و تەوبە وەرگرە ). نزاکەی بریتی بوو لە : ﴿ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ ( الأعراف / ٢٣ ).

واتە : ( ئەی پەروەرگارمان ئێمە ستەممان لەنەفسی خۆمان کرد ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبیت و ڕەحممان پێ نەکەیت بەڕاستی لەخەسارەتمەندان دەبین )

﴿ قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾(البقرة/ ٣٨)

(إبن کثیر ) ووتویەتی :– خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەی ئەوەی کەئادەم و هاوسەرەکەی ئاگادارکردۆتەوە , کاتێك لەبەهەشتەکەی دایبەزاندن – کەمەبەستی نەوەکانیشیەتی – کەلەمەو دوا کتێبیان بۆ دادەبەزێت و پێغەمبەرانیان لێ دەنێرێت و بەڵگەو نیشانەیان پێ دەدات .

(مقاتل ) ووتویەتی :– (الهدی ) مەبەستی (محمد) ە( ﷺ) و (الحسن ) ووتویەتی : (الهدی ) مەبەستی قورئانە , هەردوو ووتەکەش ڕاستن , قسەی

---

١/ (ایسر التفاسیر لکلام لعلي الکبیر ) ( ١ / ٣٩ ) .

(إبي العالية ) گشتگیرترە : ( فمن تَبِعَ هُدَايَ ) واتە :- هەرکەس ڕوو بکاتە ئەو کتێبانەی دابەزیون و ئەو پێغەمبەرانەی نێردراون ( فلا خوفَ عليهم ) . ترسیان لەسەر نابێت لەوەدا کەلەڕۆژی قیامەتدا ڕوو بەڕوو دەبنەوە , ( ولاهُم يحزنونَ ) خەفەتبار و دڵ تەنگ نابن لەوەی کەلەدنیادا لە دەستیان چووە , وەك لەسورەتی (طه ) دادەفەرمووێت : - ﴿ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى ﴾( طه / ١٢٣ )

واتە : خوای گەورە فەرمانیداو فەرمووی :- ئیتر هەردوکتان دابەزن لەبەهەشت بەگشتی , هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان , جا ئەگەر هیدایەت و ڕێنمونی من بۆ ئێوە هات , ئەوەی شوێن بەرنامەکەم بکەوێت , نەگومڕا دەبێت نەناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێگەکەی)

(إبن عباس ) فەرموویەتی :- لەدنیادا گومڕا نابێت و لەقیامەتیشدا ناڕەحەتی و ناخۆشی توش نابێت .[١]

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ ( البقرة / ٣٩ ) .

واتە : (ئەوانەش بێباوەڕ بوون و باوەڕیان بەئایەت و نیشانەکانی ئێمە نەکرد , ئەوانە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ دەبن و بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە ) .

## ﴿ سوودو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) زانا ( السعدی ) دەڵێت : - بەڕاستی خوای گەورە ئەم چیرۆکەی کردە شوێنی پەند وەرگرتن بۆ ئێمە , حەسودی و خۆ بەکەورە زانین و سووربوون لەسەر شتێك لەمەترسیدارترین ئەخلاق و ڕەوشتن لەسەر بەندەکان , خۆ بەکەورە زانینی ئیبلیس و حەسودی بردنی بە ئادەم ( علیه السلام ) بەرەو ئەوەی برد کەبینیتان , سووربوونی ئادەم و هاوسەرەکەی بەرەو ئەوەی بردن کەلەبەری درەختەکەیان خوارد , ئەگەر ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە

١/ ( تفسير القرآن العظيم ) (١ / ٨٢ ) .

نەبووایە بۆیان ئەوا بەرەو لەناوچوون دەچوون , بەلاّم ڕەحمەتی خوا کەم و کورییەکانی پڕکردەوە و, شکاوەکان پێکەوە دەبەستێتەوە , و ئەوەی خەریکە لەناو بچێت ڕزگاری دەکات و ئەو کەسەی کەوتووە هەلّ دەستێنێتەوە .

٢) هەروەها دەفەرموێت :- بۆ بەندەکان دەگونجێت ئەگەر کەوتنە هەلّە و تاوانەوە , خێرا پەنابەرن و دەستپێشخەری بکەن لەتەوبەکردن و دان نان بە هەلّەکانیان دا , ئەوەی کەهەردووکیان ئادەم و حەواء لەدلّێکی پاك و بەمەبەستی گەڕانەوەیان بۆ لای خوا ووتیان , خوای گەورە سیفەتی ئەو تەوبەکردنەی بۆ نەگێڕاینەوە , بۆ ئەوەی کە تەنها ئێمە پەیڕەویان بکەین , ئێمە بەبەختەوە ری دەیبەینەوە و لەتیا چوون ڕزگارمان دەبێت , هەروەها هەوالّی ئەوەشی پێداین کەشەیتان لە هەڕەشەی خۆی پێی ووتین و , پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە بەهەموو شێوەیەك سەرمان لێ بشێوێنێت , مەگەر ئێمە خۆمان بەباشی بۆ ئەو دووژمنە ئامادەبکەین . ئەوەی کەدەرکەوت بەم دووژمنایەتی کردنە , خوای گەورە حەز دەکات ئێمە بەهەرچی توانامان هەیە بەرگری لێ بکەین و خۆمان لەڕێگاو نەخشەکانی شەیتان بپارێزین , هەروەها چەکی لەناو بەری شەیتان بریتی یە لە ڕاستی ئیمان و هێزی پشت بەستن بە خوای گەورە , و لوت شکاندنی بەئەنجامدانی کاری خەیر , و بەرگری لە وەسوەسەکانی و بۆچونە پیسەکانی , کەهەمیشە دلّەکان هەلّدەنێت بۆ ئەو کارەی دژێتی و دووری دەخاتەوە لەزانستی بەسود و ڕاستی یەکان .[١]

٣) (القاسمی ) دەلّێت :- ئایەتی :- ﴿ وإذ قالَ ربُكَ للملائِكة ﴾ بەلّگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ڕازی دەبێت بەندەکانی پرسیار لەحیکمەتی خوا لەکارەکانی و ئەوەی لەنهێنی دروستکراوەکانی دەشارێتەوە بکات , بەتایبەتی لەکاتی سەرسوڕماندا – پرسیارو داواکردنیش بە ووتن یان بەبوار

١/ ( خلاصة تیسیر اللطف (لمنان ) (١٠٦ , ١٠٧ ) بەدەستکاری یەوە .

ڕەخساندن و ڕووکردنە خوا دەبێت لەڕشتنی زانست و زانیاری بەسەر بەندەکاندا بەداواکردنیان لەسەر چاوەکەی کەسوننەی خوا هەمیشە لەکاردایە و, زانست بەسەر بەندەکانیدا دەڕێژێت – وەك لێکۆڵینەوەی زانستی و بەڵگە هێنانەوەی عەقڵی و ئیلهامی خوایی.

دووەم :– ئەگەر لەنهێنی و حیکمەتەکانی خوای گەورە لای فریشتەکان شاراوە بێت , ئەوا ئێمە لەپێشترین لامان شاراوەبێت , شوێنی چاوتێبڕین و تەماع نابێت بۆ ئینسان کەهەموو نهێنی و حیکمەتی دروستکراوەکان بزانێت , چونکە ئەندازەیەکی کەمی لەزانست پێ دراوە !

سێ یەم :– خوای گەورە فریشتەکانی ڕێنمونی کرد لەسەر سوڕمانەکەیان , و وەڵامی پرسیارەکەشیانی دایەوە بەهێنانەوەی بەڵگە – پاش ڕێنموێنی کردن – بۆ ملکەچ بوون و خۆ بەدەستەوە دان , پاش ئەوەی کە خوای گەورە هەواڵی پێدان کەخۆی شتانێك دەزانێت و ئەوان نایزانن , ئادەمی فێری ناوی هەموو شتەکان کرد پاشان ئەویش بۆ فریشتەکانی خستە ڕوو .[1]

٤) هەروەها زانا( القاسمي) دەڵێت :–زۆرینەی خەڵکی وتویانە :– ئیبلیس کافربوو , لەبەر ئەوەی فەرمانی سوجدەبردنی ڕەت کردەوە , و خۆی بەگەورە زانی و سەرکەشی کرد , و لایدا , و باوەڕی وابووکە لەسە ر حەقە لەو کاری لادانەیدا, بەوەش بە ڵگەی هێنایەوە کەوتی : ( انا خيرٌ منهُ ) وەك ئەوەی کە سوجدە نەبردنەکەی بێ عەقلی بوو بێت بەرامبەر فەرمانی خواو حیکمەتەکانی کەووشەی خۆ بەگورە زانین بوو , کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی : – ( ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی هێندەی گەردێك خۆ بەگەورە زانین لەدڵی دابێت ).[2]

١ / ( محاسن التاويل ) ( ٢ / ٩٧ ) .

٢/ (محاسن التاويل ) (٢ / ١٠٤ – ١٠٥ ) .

٥) ( الحافظ إبن كثير ) دەڵێت:-بزانە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ فأزلهما الشيطانُ عنها فاخرَ جَهُما مما كانَ فيه...﴾ هەرەشەیەکی گەورە هەیە بۆ هەموو سەرپێچی یەك لەچەند ڕوویەکەوە : هەرکەس تێڕوانینی وابێت ئەوەی بەسەر ئادەمدا هات بەهۆی هەنگاو نانی خۆی بووە بۆ ئەو هەڵەو سەرپێچی یە بچووکە , ئەوە لەترسێکی زۆر دایە بەرامبەر سەرپێچی .

( الرازي ) لە ( فتح الموصلي ) یەوە دەڵێت :- ئێمە قەومێك بووین لە ئەهلی بەهەشت , ئینجا ئیبلیس دیل و دەست بەستی کردین و هێنایینی بۆ دنیا , ئێمەش تەنها ئەوەمان لەسەر بوو غەم و پەژارەو خەفەت بخۆین هەتابگەڕێینەوە بۆ ئەوماڵەی کە لێی دەرکرابووین .[1]

٦) مامۆستا (سید قطب ) دەڵێت : - لەڕووداوەکانی جەنگدا کە چیرۆکەکە وێنەی کێشاوە لە نێوان ئینسان و شەیتاندا , هەمیشە یاد خەرەوەیە بەسروشتی جەنگەکە کە لەنێوان پەیمانی خواو , سەرلێشێواندنی شەیتان دایە , لەنێوان ئیمان و کوفردایە , لەنێوان حەق و ناحەق دایە , لەنێوان هیدایەت و گومڕایی دایە , .... ئینسان خۆی گۆڕەپانی جەنگەکەیە , هەر خۆی سوودمەند یان زیان مەند دەبێت تیایدا , لەمەشدا هەمیشە پێی دەگەیەنرێت کە ئاگاداربێت , و هەمیشە ئاڕاستە دەکرێت بەوەی کە ئەو سەربازێکە لەمەیدانی جەنگدا , و ئەو یان ئەوەتا خاوەنی دەستکەوتە یان دۆڕان لەو مەیدانە دا .

٧) هەروەها (سیدقطب ) دەفەرمووێت :- لەکۆتایی دا بۆچوونی ئیسلام دەربارەی هەڵەو تاوان تەوبەکردن دێت ...کەهەڵەی تاکە کەس و تەوبەی تاکە کەسی هەیە , لەتێڕوانینی سادەو ڕوون دا , کە ئاڵۆز نی یە , هەڵەیەکی بڕیار دراو لە سەر ئینسان نی یە لەپێش لەدایکبونیدا وەك ئەوەی تێڕوانینی کەنیسە دەیڵێت و بەکافرکردنیش نی یە وەك (لاهوتی ) , وەك ئەوەی کەنیسە دەیڵێت :- عیسا (علیه السلام ) , - بەلێکدانەوەی ئەوان عیسا کوڕی

---

[1] / (تفسير القرآن العظيم ) ( ١/ ٨١ )

خوابێت – هەر لەئەستۆیدا بووبێت , ڕزگاربوونی نەوەکانی ئادەم بێت لە هەڵەکەی ئادەم , !! هەڵەکەی ئادەم هەڵەیەکی شەخسی بوو , ڕزگاربونیشی لێی بەتەوبەی ڕاستەوخۆ دەبێت بەشێوەیەکی ئاسان و لەبار و سادە , و هەڵەی هەر کوڕێکی , ئەویش هەڵەیەکی شەخسی دەبێت , و ڕێگاش بۆ تەوبەکردن کراوەیە , هەرئینسانێك تاوانی خۆی هەڵدەگرێت .[1]

٨)زانا (الشنقيطي ) دەڵێت :– خوای گەورە مامەڵەی لەگەڵ ئیبلیس کردبە پێچەوانەی ئەو مەبەستانەی کە هەیبوو , کەمەبەستی خۆ بەگەورە زانین و گەورە نیشاندان بوو , بەڵام خوای گەورە بەبچوکی و کەم نرخی و سەرشۆڕی و زەلیلی دەریکرد , ئەمەش لەئایەتی ﴿إنَّك مِن الصاغرين ﴾ (الأعراف /١٣ ) دا , دەرکەوت ,( الصغار) ئەو پەڕی سەرشۆڕی و بێنرخی یە , و ئایەتی ﴿.....أخرُج منها مذءُوماً مدحوراً ﴾ ( الأعراف / ١٨ ) و چەندین ئایەتی تریش , لەم ئایەتەوە تێ دەگات کە کەسی خۆ بەگەورە زان ناگات بە و گەورەیی و بەرزی یەی کەمەبەستی بووە و ویستوویەتی , بەڵکو پێچەوانەی ئەوەی دەست دەکەوێت , خوای گەورە دانی پیاناوە و فەرموویەتی :– ﴿ إن فِي صُدُورِهِمْ إلاَّ كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيه ﴾( غافر / ٥٦)

واتە ( ئەو کەسانەی لەناو سنگیاندا خۆ بەگەورە زانین هەیە بەهیچ جۆرێك ناگەنە ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە هەیانە ).[2]

٩)ئایەتی :– ﴿ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ﴾ ( الأعراف / ٢٢)

دەرکوتنی جەستەو ئاشکرابوونی عەورەت , بێگومان ئەوە سزای تاوان و سەرپێچی یە , نیشانەیەك نی یە بۆمەدەنیەت و شارستانیەت , بەڵکوپاشەکشە و دورکەوتنەوەیە لە فیترەت , بێگومان خوای گەورە چاکەی کردووە لەگەڵ نەوەی ئادەم دا بەوەی کەجل و بەرگی خۆ داپۆشینی پێداون ,

---

١/ (في ظلال القرآن ) (١/ ٥٥ ) بەدەستکاری یەوە .

٢ / (اضواء البيان ) (٢/ ٢٦٣ )

کەجەستەو عەورەتیان بشارێتەوە , کەجوانی و ڕازاوەیی یە بۆ یان , وەك فەرموویەتی :-

﴿ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ ﴾ (الأعراف / ٢٦)

واتە : (ئەی ئەوەی ئادەم بەڕاستی ئێمە پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون , عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دایئەپۆشێت , هەروەها جل و بەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ بڕازێننەوە , ( بەڵام بیرتان نەچێت ) کە پۆشاکی تەقواو خوا ناسی چاکتر و خێردارتر و بەفەڕترە ) .

١٠) وتەی خوای گەورە بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی دوای سەرپێچی بریتی بوو لە (اهبطوا ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسەرپێچی دەبێتە هۆکار بۆ بێبەش بوون لە بەختەوەری , هەر بەو جۆرەی ئەگەر کەسێك حاڵی لەگەڵ خوا دابوو , ئەوا شیرینی ئیمان و کردەوەیچاکی پێی دەست دەکەوێت , ئەگەر لە خوا یاخی بوو , ئەوا لە و بەختەوەری یە بێبەش دەبێت , و لەو پلەیە دێتە خوار وەك ئەوەی بەهەندێك لە پیاو چاکان وترواوە:ئایا کەسێك سەرپێچی بکات لەزەتی گوێڕایەڵی دەست دەکەوێت ؟ وتیان : نەخێرو نەخێر, هەرکە س حەزی پێ بکات .

## ﴿ چیرۆکی هود ( علیه السلام ) ﴾

هۆزی عادی قەومی هود( علیەالسلام) لەکۆنترین نەتەوەکانن , خوای گەورە دەربارەی هود بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت :- ﴿ واذكروا إذجعلكم خلفاء من بَعْدِ قومِ نوحٍ﴾ ( لأعراف /١٩) .

واتە :-( یادبکەنەوە و بیهێننە بیری خۆتان کەخوای گەورە ئێوەی پاش نوح کردە جێنشینی خۆی . لە ( الاحقاف) گردو تەپۆڵکە لماویەکان دابوون لە یەمەن کەلەنێوان ( عمان ) و ( حضرموت ) دا بوو , ئەوان گەورەو جەستەیەکی زلیان هەبوو . وەك خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ (٦) إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ (٧) الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ (٨) ﴾ ( الفجر /٦-٨)

واتە :( ئایە نەت دیو نەت زانی کە پەروەردگارت چی بەهۆزی عادکرد ؟ لەگەڵ هۆزی ئیرەم ( ئیرەم باپیری عادە) کەباڵابەرزوو خاوەنی کۆشکێکی

سنورداربوون ) کەوێنەو هاوشێوەی ئەوانە لەهیچ شارێك دا سازنەدرابوو) .
ئەمانە عادی یەکەم بوون.

( إبن کثیر) دەڵێت :- ئەوان یەکەم کەس بوون دوای ( طوفان ) لافاوەکەی نوح ( علیه السلام ) بتیان پەرست, خوای گەورە ( هود) پێغەمبەر ( علیه السلام ) ی بۆ ناردن . ( إنشاء الله ) دواتر باسی بانگەوازەکەی دەکەین کە کەلە سورەتی( الاعراف )داهاتووە , بەجۆرێك کەسورەتەکە باسی بانگەوازی هودی بەدرێـژی کـردووە و چیرۆکی سزای قەومەکەیان و لەناو چونیانی پێکەوە کۆکردۆتەوە, پاشان ئەوەی لە سورەتی ( فصلت ) دا هاتووە کەکۆتای و لەناو چونیان چۆن بووە باس دەکەین , کەخوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە .

## ﴿ بانگەوازی هود ( علیه السلام ) ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ (٦٥) قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وِإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٦٦) قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (٦٧) أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي وَأَنَاْ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ (٦٨) أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَاذكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٦٩) قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٧٠) قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ اللّهُ بِهَا مِن س إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ (٧١) فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ (٧٢) ﴾ ( الاعراف /٦٥ – ٧٢)

ئایەتی :- ﴿ وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ (٦٥ ) ﴾ ( الاعراف /٦٥) .

( القاسمیی) دەڵێت :- واتە: برایان بووە لە نەسەبدا , چونکەبەپێی قسەی نەسەب ناسان لەخۆیان بووە . ووتراوە : خەڵکی هەموویان لەنەسەبدا برای یەکن , چونکە هەموویان نەوەی (ئادەم و حواء) ن .[1]

( محمد متولی الشعراویی ) دەڵێت :- لەبەر ئەوەی برایانە تەنها خێرو خۆشی بۆیان دەوێت , لەبەر ئەوەی برایانە ڕاستگۆ دەبێت لەوەدا کە پێیان دەڵێت .[2]

خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ (٦٥) قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وِإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٦٦) ﴾ ( الآعراف / ٦٥-٦٦)

( إبن كثير ) دەڵێت :- مەبەست ئەوەیە کە عاد قەومێکی دڵڕەق و بێبڕوا بوون , قەومێکی لوت بەرزو لە خۆبایی و یاخی بوون لەبت پەرستی دا , خوای گەورە پیاوێکی لەناو خۆیان دا بۆناردن بانگەوازیان بکات بۆ لای خواو تەنها پەرستش بکەن دڵسۆز و ئیخلاسیان بۆ خوا بێت , باوەڕیان پێنەکرد و سەرپێچیان کرد , خوای گەورە بەتوندترین شێواز گرتنی .

کاتێك فەرمانی پێ کردن بە خوا پەرستی و دڵخۆش کردن بە گوێ ڕایەڵی و لێخۆشبونی خوایی , ولەسەر ئەوەش بەڵێنی خەیری دنیا و قیامەتی پێدان :-

﴿ قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ﴾

واتە :- ( پیاوە گەورە و دیارەکانی قەومەکە کە کافر بوون وتیان : ئێمە تۆ لە بێمێشکی دا ئەبینین , وئێمە وا گومان دەبەین کە تۆ لە درۆزنان بیت ) .

﴿قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ( الآعراف ٦٧)

واتە : کارەکە وەك ئەوە نەبوو کە ئێوە گومانتان پێ کرد , بەڵکو من پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە .

---

١. ( محاسن التأويل ) ( ٧/ ١٦٤)

٢.( قصص الأنبيا ومعه سيرة الرسول ) ل ( ٥٣)

زانای بانگ خواز مامۆستا ( عمرو خالد ) دەڵێت :- بۆچی ئەم پێغەمبەرە ناو نراوە ( هود )؟ خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا﴾ , وشەی هود لە ( الهوْ د) ەوە هاتووە , واتە هێواشی و لەسەر خۆیی , بانگەوازی قەومەکەی بەلەسەر خۆیی و هێواشی و بەزەیی دەکرد , ناوەکەی پێت دەڵێت کە ئەو چۆن بانگەواز دەکات .[1]

﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسالاتِ رَبّي وانالكم ناصِحٌ امين ﴾ ( ٦٨)

واتە :- ( من پەیام و نامەکانی پەروەردگارم دەگەیەنم بەئێوە و من بۆ ئێوە دڵسۆزو ئامۆژگارێکی ئەمینم ) .

گەیاندنی پەیام پێویستی بە ڕاستگۆیی هەیە لە کەسەکەدا کەدەیگەیەنێت , وپێویستە دەستەواژەی جوان و گشتگیرو پڕماناو مەبەستی چاك بەكار بهێنێت , ئاڵۆزی تیانەبێت و شوێنی جیاوازی و ناکۆکی نەبێت , ئەو لەگەڵ ئەمانە دا لەسەر شێوەی ئەم گەیاندنە لەوپەڕی دڵسۆزی و بەکوڵبوندا بووە و سور بووە لەسەر هیدایەت دانیان, بەتەمای هیچ کرێو پاداشتێك نابێت لێیان و داوایان لێناکات بەڵکو ئەو بەدڵسۆزی و بانگەواز بۆ خوادەکات , تەنها داوای پاداشت لەو کەسەدەکات کە ناردویەتی , چونکە خێری دنیا و قیامەت گشتی لە دەستی ئەو دایە ) وفەرمانیش بۆ خۆیەتی , دەفەرموێت :﴿ يَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي أَفَلاَ تَعْقِلُونَ ﴾ ( هود/٥١)

واتە :- ( ئەی قەومەکەم من داوای کرێتان لێناکەم لەسەر بانگەواز , کرێ و پاداشتی من تەنها لای ئەو کەسەیە کەمنی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە , ئایا ئێوە بیرناکەنەوە ؟) .

﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ ( الأعراف ٦٩)

( محمد علی الصابونی ) دەڵێت :- واتە : سەرتان نەسوڕمێت کە خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆتان بۆ خۆتان ناردووە ، تا ئاگادارتان کاتەوە لە گەیشتنەوەتان بە خواو ، لە سزای خوا بتانترسێنێت .[2]

---

٣. ( قراءة جديدة ورؤية في قصص الأنبياء ) ل ( ١٨٤)

١/ صفوة التاسفير ( ١/ ٤٤٢ ).

﴿وَاذكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ( (الأعراف / ٦٩ ) .

زانا ( محمد رشيد رضا ) دەڵێت : واتە :- یادبکەن و فەزڵ و نیعمەتی خوا بەسەر خۆتانەوە بێننەوە یادتان کاتێك ئێوەی کردووە بە جێنشین لەسەر زەویدا لە دوای قەومی نوح ( علیە السلام ) ، و زیادی پێدا ون لە دروستکراوەکان و بۆی فراوان کردون ، و هەروەها فراوانی لە موڵك و دەسەڵات و شارستانیەتدا پیێ داون ، یان لە دروستکردنی جەستەی خۆتاندا ، کاتێك باڵاتان بەرزو لاشەتان بەهێزە ، یادی نیعمەتەکانی خوا بکەن و سوپاس گوزاربن لەسەری ، تا بەڵکو ئەوەی خوای گەورە بۆ سوپاس گوزارانی ئامادەکردووە ئێوەش دەستان بکەوێت .[1]

﴿قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (الأعراف / ٧٠ )

واتە : ( ووتیان : ئایا تۆ هاتووی بۆ لای ئێمە کە بەتەنها خوا بپەرستین و واز لەوانە بهێنین کە باوك و باپیرانمان دەیپەرستن ، جا ئەو سزایەمان بۆ بێنە کە بەڵێنت پێداوین ، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت ) .

﴿ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا نَزَّلَ اللّهُ بِهَا مِن س إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ ﴾ ( الاعراف / ٧١ ) .

( إبن كثير ) دەڵێت :- ئێوە بەوەی ووتتان بە ڕاستی سزاو توڕەبونی خوا بەسەرتان دا هات ، ئایا ئێوە پشت لەوە دەکەن کە تەنها خوا بپەرستن کە هاوەڵی نی یە ، بۆ بت پەرستنی کە خۆتان داتان تاشیون و ناوی خواتان لیێ ناون لەلایەن خۆتانەوە کە خۆتان و باوك و باپیرانتان ئەو ناوانەتان بڕیارداوە ، بەڵگە لەسەر ئەوە دانەبەزیوە کە ئێوەو باوك و باپیرانتان بۆی چوون ، ئەگەر

---

٢/ بە کورتی و دەستکاریەوە لە ( تفسیر المنار ) ( ٨/ ٤٩٨ ) .

ئێوە حەق ڕەت بکەنەوەو لەناو ناحەقی و بێ مانایی دا بمێننەوە ئەوا ، وەك یەك وایە بۆتان ، ئەگەر نەمیشیان لێ بکەین یان نا ، جا چاوەڕوانی سزای خوا بکەن پێتان دەگات ، و سزاکەی ناگەڕێتەوەو ڕێی لێناگیرێت .[1]

زانا ( الشنقیطي ) دەڵێت :- لێرەدا خوای گەورە هیچی دەربارەی ئەو موجادەلەی نێوان هود ( علیه السلام ) و قەومەکەی بۆ ڕوون نەکردینەوە بەڵام لەشوێنێکی تردا ئاماژەی پێداوە : -

﴿قَالُواْ يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ (٥٣) إِن نَّقُولُ إِلاَّ اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوَءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللّهَ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٥٤) مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ (٥٥) إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ( هود / ٥٣ – ٥٦ ) .

واتە : – ( ووتیان: ئەی هود تۆبەڵگەیەکت بۆ ئێمە نەهێناوە و , ئێمە لەبەر قسەی تۆ دەست لە خواکانی خۆمان بەرنادەین , وئێمە بڕوات پێناهێنین , ئێمە تەنها ئەمە بەتۆ دەڵێین : – کەهەندێك لە خواکانمان زیانیان بەتۆ گەیاندووە ( دەستیان لێوەشاندویت و تێکیان داویت ) , هود ووتی :– خوابەشایەت دەگرم ئێوەیش شایەت بن , کەبەڕاستی من لەوەی کەئێوە ئەیکەنە هاوبەش بۆخوا بەریم , لەغەیری خوا , جاهەمووتان پیلانم بۆ بگێڕن لەپاشان مۆڵەتیشم نەدەنێ ( بەڵام هیچیشتان پێناکرێت) , بەڕاستی من پشتم بەخوابەستووە کەپەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە , هیچ گیانلەبەرێك نیە کەبجوڵێت لەسەر زەویدا مەگەر ئەوەی کەناوچەوانیان بەدەستی خواوەیەو دەیان گرێت , بێگومان پەروەدگارم لەسەر ڕێگای ڕاستە )

﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ ( الأعراف / ٧٢) . واتە :– ( هود ( علیه السلام ) و ئەو کەسانەی

---

١/ ( قصص الانبیاء ) ل ( ٨٢ ) .

لەباوەڕداران لەگەڵیدابوون , بەڕەحمەت لەلایەن خۆمانەوە ڕزگارمان کردن , و درۆزنـــان و کافرانیشـــمان لـــە ڕەگ و ڕیشـــە دەرکێشـــا و هـــەموویانمان بەسەریەکداداو ماڵیانمان وێران و ڕوخاوکرد , ئەوان باوەڕیان نەهێنا , بۆیە شیاوی ئەو سزایە بوون )

﴿ تیاچوونی ( عاد ) ی قەومی ( هود ) ﴾

خوای گەورە فەرمووی : - ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ (١٥) فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لا يُنصَرُونَ﴾ ( فصلت / ١٥-١٦) .

ئایەتی:﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾ زانا ( الخازن ) دەڵێت : هود پێغەمبەر (علیه السلام ) بەسزای خوا هەڕەشەی لێ کردن ئەوانیش وتیان :- ئێمە بەفەزڵ و هێزو قوەتی خۆمان دەتوانین ئەو سزایە لەخۆمان دووربخەینەوە , ئەوان قەومێکی جەستەو لاشە گەورەبوون خوای گەورەش وەڵامی دانەوەو فەرمووی :- ئایا ئەوان نەیان بینیوەو نەیان زانیوە کەخوای گەورە ئەوانی دروستکردووە لەوان بەهێزترو بەدەسەڵاتترە , ئەوان هەرئینکاری ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان دەکرد, ئینجائێمەیش بایەکی بەهێزی توندمان بۆناردن کەدەنگی گەورە بوو , ووتراوە بایەکی ساردبووە , وتراوە ( با) هەشت بەشە , چواریان بۆ سزایە , کەبریتین لە ( الصرصر , العاصف , القاصف , العقيم ) , چواریشیان بۆڕەحمەتن ئەوانیش :( الناشرات , المنشرات , المرسلات , الزاريات ) ن , وتراوە خوای گەورە لەسنورێکی دیاری کراودا بای ساردی بۆ ناردن , هەموویان لەناوچون لەچەند ڕۆژێکی شومدا ( وتراوە : ڕۆژانێکی تەپوتۆزاوی بوو خۆڵ و غوباربووە , بەجۆرێك بووە چاو هیچی نەدەبینی , و خوای گەورە بارانی لێ گرتنەوە بۆماوەی سێ ساڵ , تەنها خۆڵ بەسەریاندا دەباری بەبێ باران , بۆ ئەوە لەدنیادا سزای سەرشۆڕیان پێ بچێژێن , ئەوان بەبێ مافێکی ڕەوا لەسەر

زەویدا خۆیان بەگەورە نیشاندا لەژیانی دنیادا , وبەڕاستی سزای قیامەت سەرشۆڕکەرترو بە ئازارترە , بەڕاستی ئەوان لە وسزایە پارێزاونابن و پەنا نادرێن .١

پاش ئەو باتوندو بەهێزە خوای گەورە باسی حاڵیانی کردوو فەرمووی :-
﴿فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ (٧) فَهَلْ تَرَى لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ ﴾ ( الحاقة /٧-٨ ) .

زانای تەفسیر ( القرطبي ) دەڵێت : دەتبینی ئەو خەڵکەی کەلەماوەی ئەوچەند شەو ڕۆژەدا تیاچووبوون , هەمووڵاڵ و پاڵ بەمردوویی کەوتبون , دەتوورت قەدی دارخورمای هەڵکێشراون و ناوەکەی بەتاڵە , ( أبو الطفيل ) فەرموویەتی:- وەك کۆتەرەی دار خورمای ناوبۆش , ( ابن شجرة ) وتویەتی : - ( با) توندو بەهێزەکە دەیدا لە دەمیان و لە وێوە دەچویە ناوسکیان و , هەرچی لەناو سکیان دابوایە ڕایدەماڵی و بەبەتاڵی دەیهێشتەوە , وەك کۆتەرەی دارخورمای کلۆریان لێ هاتبوو , ﴿فَهَلْ تَرَى لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ ﴾ واتە : ئایەکەسێك یان کۆمەڵێکیان لێ مابوویەوە , ( إبن جريج ) دەڵێت :- ئەوان بۆ ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژ لەناوسزای خوادا کەبای بەهێز بوو هەربە زیندووی مانەوە , کاتێك لە ڕۆژی هەشتەمدا ڕۆژیان کردەوە مردن , ئینجا با هەڵیگرتن و فڕێیدانەناو دەریاوە ﴿ فأصبَحوا لا يُرى إلا مساكِنهم ﴾ واتە :- تەنها ماڵە چۆڵەکانیان دەبینرا .[٢]

---

١. ( تفسير الخازن )
٢. ( تفسير القرطبيى ) ( ٨/ ٦٧٤٠) بەکورتی و بەدەستکاریەوە .

﴿ پەندو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) زانا( محمد متولیی الشعراویی ) دەڵێت :- کاتێك ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودا ﴾ دەبیستین , ووشەی ( اخاهم ) کۆمەڵێك مانامان دەداتیٚ , یەکەم : لەڕەگەزی خۆیان بووە و بەهەمان زمانی خۆیان قسەی کردووە , ولەگەڵیاندا ژیاوەو بەباشی ناسیویانە , ئەوەش نزیکی و خۆگری و تێکەڵاوی بووە لەگەڵ پێغەمبەرەکەدا , چونکە ئەگەر کەسێکی بێگانە و بیانی بوایە دەیانووت :- کەسێکی بیانی هاتووە دەیەوێت دەسەڵاتمان لیٚ وەرگرێت و ببێت بەگەورە بەسەرمانەوە , وئەگەر بەغەیری زمانەکەی خۆیان لەگەڵیان بدوایە , ڕەنگ بوو نەیان توانیایە گفتوگۆی لەگەڵ بکەن [١]

٢) زانای تەفسیر ( القاسمیی ) دەڵێت :- پشت بەوە نابەسترێت کەهەندێك لەمێژوو ناسان تیایدا ڕۆچوون و باسی دەکەن لەقەومی (عاد) زۆر بالاّ بەرزوو گەورەو بەخۆوەبوون , کەدرێژ ترینیان (١٠٠) باڵ بووە و کورترینیشیان (٦٠) شەست باڵ بووە , بیٚ گومان ئەمە بەڵگەیەکی لەسەر نی یە نە( عەقڵی ) و نە ( نەقڵی ) تەنها وەهمە , ئایەتی ( وزادكم في الخلقِ بصطة ) نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەوان وویستویانە , بەڵکو بەڵگەیە لەسەر گەورەیی لاشەیان و بەهێزیان , بیٚ گومان نەتەوەکان یەکسان نەبوون لە گەورەیی لاشەیان و درێژی و هێزیاندا , بەڵکو لەیەك جیاواز بوون . [٢]

٣) (إبن كثير ) دەڵێت :- هەرکەسێك بڵێت :- ڕۆژی شووم بەردەوام بووە لەڕۆژی چوارشەمەدا , لەم تێگەیشتنەوە ڕەشبین بێت پێی , بێگومان هەڵەی کردووە و پێچەوانەی قورئانیشە , چونکە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی :- ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لا يُنصَرُونَ﴾ ( فصلت / ١٥-١٦) .

---

١/ (قصص الأنبياء وقعةُ سيرة الرسول ) ل (٥٧ – ٥٨ ) .

٢ / (محاسن التأويل ) . (٧ / ١٦٧ – ١٦٨ ) .

زانـراوەکـە هەشـت ڕۆژی بـە دوای یەکداهاتووبووە, ئەگـەرخۆیان لەخۆیانـدا شـوم بـووین , ئـەوا بێگومـان هـەر حـەوت ڕۆژەکـەی هەفتـەی بـەدوای یەکـدا تێکەوتووە , هەموویان دەگرێتەوە کە شووم بن , بۆئەمەش کەس شتی وای نەوتووە, بەڵکو مەبەست لە ( أيّامٍ نَحِساتٍ واتە : لەسەر ئەوان شووم بووە . [1]

٤) ( الـدکتور فضل حسن عبـاس ) دەڵێت :- بەڕاسـتی هـود ( علیـه السـلام ) ویستی دژایەتی هەستی قەومەکەی نەکات , هەرلەسەرە تاوە خۆی بگەیەنێتە هەست و سۆزیان بەڵکو نزیکیـان کـەوت و سـۆزی بۆ نوانـدن , بـەڵام قـەومێك دەبیـنین , بەهۆی خۆشەویستیان بۆ مـاڵی دنیـا , سـۆزی ئـەو خۆشەویستیە داپۆشیوون , ئەگەر بچن ئـەو سۆزو عاتیفەیەلـە دەرونیـان دەرکێشـین , ئـەوا کاردانەوەیـەك ڕودەدات , پێچـەوانەی ئـەوە ڕوو دەدات کـە دەمانـەوێت , بـەڵام باشـترین ڕێگـا بـۆ لـەڕەگ دەرکێشـانی ئـەو سـۆزە , بریتـی یـە لـەوە کەئێمـە سـۆزێکی تـر لەدەرونیانـدا بـەهێز کـەین وەك بەخشـین لەڕێگـەی خـوداداو بـە خەرج دانی لە بواری خێردا , ئەگـەر خوای گەورە خـەیری بۆ ئـەوان ویسـت , ئەوەی کە ڕوودەدات بریتی دەبێـت لـە ململانێـی هـەردوو جۆرە سۆزو عاتیفـە کە , یەکێکیان بەسەر ئـەوی تریانـدا بەهێزو زاڵتر دەبێت , ئـەوەش بەرنامـەی هـود ( علیـه السـلام ) بـوو , بەڕاسـتی ئـەو ویسـتی ئـەوەی لـە دەرونیاندایـە دەربهێنێت و ئەو جۆرە سۆزوعاتیفەی تربخاتە شوێنیان . پێیان دەفەرمووێت :- ( ئـەی خزمـەکانم داوای لێخۆشـبوون لـە پـەروەردگارتان بکـەن , پاشـان بگەڕێنـەوە بـۆلای ئـەو , هەرئـەوە لەئاسمانـەوە بـارانی زۆری پڕبەرەکـەتتان بۆدەبارێنێت , هێزو دەسەڵاتتان بۆزیاددەکات زیادلەهێزو دەسـەڵاتی ئاسایی خۆتـان , ڕووەرمـەگێڕن لـەم باس و ئامۆژگاریانـە لەکاتێکدا کەهەمیشە تـاوان بارن ) . ( هود /٥٢ )

---

٣- ( صحيح قصص الأنبياً ) ل ( ٨٦ )

٥) پاداشت لەجۆرو ڕەگەزی کردەوەکان دەبێت , لەکاتێکدا خوای گەورە هێزی جەستەی و هۆکاری مادی دابوو بەقەومی ( عاد) , ئەوان خۆبەگەورە زانین و لادان لە خوایان پەیڕەو کرد , هەتا وتیان :- ( مَن اشَدّ مِن قَوةً) کیٚ لە ئێمە بەهێزترە , سزاکەیان ئەوە بوو خوای گەورە بایەکی لەخۆیان بەهێزتری بەسەردا زاڵکردن , هەریەکە لەوان بەوگەورەیەی خۆیان بۆئاسمان بەرزدەکردەوە , پاشان دەیکێشایەوە بەزەویدا و سەری دەشکاند و جەستەی وەك کۆتەرەی دار خورمای هەڵکێشراوی لێدەهات , ئەوە سزای خۆبەگەورە زانینەکەیان و هێز و دەسەلاٚت و زۆرداریەکەیەیان بوو , پەروەردگار ستەم لە بەندەکانی ناکات ئەو لەناوچوونەش وەنەبێت زۆر دووربێت لەستەم کارانەوە .

## ﴿ چیرۆکی( صالح ) پێغەمبەر ( علیه السلام ) ﴾

هۆزی (ثمود) قەومی ( صاڵح ) پێغەمبەر بوون ( علیه السلام ) لە ( الحجر) نیشتەجیٚ دەبوون , لەنێوان (حجاز) و (تبوك ) دا , پێغەمبەر (ﷺ) بەو شوێنە دا تێپەڕی کە بۆ ( تبوك ) دەچوو , ئیمامی ( أحمد ) لە( إبن عمر ) ەوەبۆمان دەگێڕێتەوە , فەرموویەتی :- کاتێك پێغەمبەر (ﷺ ) لای خەڵکەکە لە تەبوك لایدا , لای ماڵەکانی( ثمود) لە ( حجر) یش لایدا لایان , بینی خەڵکەکە لەو ڕوبارە ئاویان دەرەهێنا کە ( ثمود ) لێی دەخواردەوە , پاشان هەویریان لێشێلاو مەنجەڵ و ساجی گەورەیان دانا , پێغەمبەر ( ﷺ) فەرمانی پێکردن منجەڵەکان بڕێژن و هەویرەکەش بکەن بە عەلەفی وشتر و ولاٚخەکانیان , پاشان جێی هێشتن تاگەیشتە سەر ئەو بیرەی , کەوشترەکەی ( صالح ) ئاوی لیٚ دەخواردەوە , و نەهی لێکردن کە بچنە شوێنەواری ئەو قەومەی کەسزا درابوون , فەرمووی:- ( من لەوە دەترسم کەئەوەش توشی ئێو ببێت کەتوشی

ئەوان هاتووە , لەبەر ئەوە مەچنە سەر شوێنەکەیان ) .[1]

هەر لە ( إبن عمر ) ەوە ووتی:- پێغەمبەر ( ﷺ ) کەلە ( الحجر) دا بوو , فەرمووی:- ( مەچنە سەر ئەو قەومەی کەسزادراون مەگەر لەکاتێك دا بچن کەبگرین , ئەگەر گریانتان نەبوو نەگریان مەچنە سەریان , بائەو سزایەتان پێ نەگات کەبەئەوان گەیشتووە ) .[2]

لەهەندێك گێڕانەوەدا هاتووە , پێغەمبەر ( ﷺ ) کاتێك بەشوێنەوارەکەییان دا تێپەڕی سەری پێچابوو , ولاخی سواریەکەشی بەخێرایی تاودابوو, و نەهی کردووە بۆ شوێنەکەیان مەگەر ئەوکەسانە بەگریانەوە بچن . سەردەمەکەشیان , قورئان ئاماژەی پێداوە کە دوای قەومی ( عاد ) لە ( هود ) ( علیه السلام ) بوون , وەك لەپێغەمبەر ( صالح ) ەوە دەگێڕێتەوە , فەرموویەتی : ﴿ وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ ﴾ ( الأعراف / ٧٤ ) .

ئەوان ئەهلی پیشەی ئاژەڵداری بوون , ئاژەڵی زۆر و ڕەزو باخ و کشتووکاڵیان هەبوو , نازو نعمەتێکی زۆریان پێگەیشتبوو , بەڵام ناشکوری ئەو نیعمەتانەیان کرد , خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردن لەخۆیان کەدەیان ناسی ڕاستگۆیەو دەست پاکە , کەئەویش ( صالح ) ە ( علیه السلام )

مامۆستای بانگ خواز ( عمرو خالد ) دەڵێت :- ( ثمود ) ووشەیەکە لە ( ثمد ) ە وە هاتووە, واتە : ئاوێکی کەم , چونکە لەشوێنێکدا نیشتە جێ دەبوون خاکەکەی ئاوی کەم بوو , هۆزەکە بەو ناوەوە ناونرا لە بەر کەمی ئاوەکەی . هەروەها ( ثمود ) باپیرە گەورە یان بووە , مەرج نیە ( ثمود ) ئەوانە بوون کە لەگەڵ گەورەمان ( صالح)دا ژیابن , دەگونجێت نازناوی هۆزەکە بێت .[3] خوای گەورە لە سورەتی ( الأعراف ) دا دەفەرموێت :-

---

١- ( البخاری ) بەژمارەی ( ٦/ ٣٧٨) لە ( الأنبیا ) دا ڕیوایەتی کردووە .

٢- ( البخاری ) بەژمارەی ( ٦/ ٣٧٩ ) لە ( الأنبیا ) دا ڕیوایەتی کردووە .

١ / (قراءة جديدة ورؤيه في قصص الأنبياء ) ل (١٩٥)

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَـذِهِ نَاقَةُ اللّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللّهِ وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوَءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٣) وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ (٧٤) قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ (٧٥) قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ (٧٦) فَعَقَرُواْ النَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ (٧٧) فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ (٧٨) فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَكِن لاَّ تُحِبُّونَ النَّاصِحِينَ﴾
( الأعراف / ٧٣-٧٩ )

﴿ وإلى ثمود اخاهُم صالحاً ....﴾ . واتە بۆ قەومی (ثمود ) (صالح ) ی برایانمان نارد کە لە نەسەبی خۆیان و نیشتیمان ی خۆیان بوو, بەهەمان شێوازی بانگەوازی پێغەمبەرانی پێش خۆی و دوای خۆی بانگەوازی کردن . کە بریتی بوو لە :- ( اعبدوا الله مالكم مِن إلهٍ غيرهُ ) خوا بەتاك بزانن و هاوەڵ بۆبڕیارمەدەن . پاشان ئەو ئینسانەو موعجیزەی بیرخستەوە کە خوای گەورە لەسەر دەستی ( صالح ) دا بەدیهێنان کە بریتی بوو لە ( هذه ناقة اللهِ لَكُم ءايَة فذروها تأكُلْ في ارضِ اللهِ ولا تمسوها بسوءٍ فيأخذ كُم عذابَ اليمَ ) .

(إبن كثير ) دەڵێت :- زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە (ثمود ) ڕۆژێك لە ( نادی ) شوێنی کۆبونەوەی خۆیان کۆبونەوە پێغەمبەر صالح (عليه السلام ) هات بۆ لایان , بانگی کردن بۆ لای خوا یادی خستنەوەو ئاگاداری کردنەوەو ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێدان , ئەوانیش ووتیان :- ئەگەر تۆ لەوبەردە - کەبەردێکی گەورەی دیاری کراو بوو - ووشترێکی مێیەمان بۆ بێنیتە دەرەوە , کەسیفەتی واو وا بێت , چەند سیفەتێکیان باس کردوو خستیانە پاڵی , کەگەورەبێت و ملی درێژ ..... ئینجا پێغەمبەر صالح (عليه السلام ) پێی ووتن :- ئایا ئەگەر دیتان کەمن داواکەتان بۆ جێبەجێ بکەم لەسەر ئەو شێوەی خۆتان , ئایا باوەڕدەهێنن بەوەی کەمن هێناومەو بەڕاستم دەزانن لەوەدا کەپێی هاتوم ؟ ووتیان :- بەڵێ , ئەویش بەڵێن و پەیمانی لەسەر ئەوە

لـێ وەرگـرتن , پاشـان هەسـتا چـوو بـۆ شـوێنی نوێـژ کردنەکـەی , ئەوەنـدەی پێویست بوو نوێژی بۆ خوا کرد , پاشان لەگەروەرداری پاڕایەوە کە داواکەیان وەڵام بداتەوە , خوای گەورە فەرمانی کرد بەو بەردە کەلەت بێت و ووشترێکی گەورەی لێ بێتە دەرەوە , لەسەر ئەوشێوەیەی کەئەوان داوایان کردبوو . یان لەسەر ئەو سیفەتانەی کەلێیان نابوو . کاتێك بەو شێوەیە بینییان کارێکی گەورەو مەزن هاتە بەر چاویان , دیمەنێکی سەیرو , توانایەکی لەڕادەبەدەر , و بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوە , و نیشانەیەکی ڕوون , زۆرێکیان باوەڕیان هێناو , و زۆرێکیشیان لەسەر کفری خۆیان و گومڕایی مانەوەو بەردەوام بوون , لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمووی : ئینکاری ئەو بەڵگە گەورەیان کردوو , بەهۆیەوە زۆرینەیان شوێن حەق نەکەوتن .[1]

(محمد رشید رضا ) دەڵێت : - ( هذه ناقةُ اللهِ ) , ئەمەدەرخستنێکی سەرلەنوێ یە بۆ بەڵگەو نیشانەکان , واتە : ئەمەووشتری خوای گەورەیە , ناوەکەی ( إضافة ) کراوە بۆ لای ناوی (الله ) . ( ناقةُ اللهِ ) لەبەر گەورەیی و گرنگی کارەکەی . وتراوە :-لەبەر ئەوەیە بەپێچەوانەی سوننەتی کاری خۆی درووستی کردووە , لە چاو درووستکردنی ووشترەکانی تر و سیفاتەکانیاندا , وتراوە :- لەبەر ئەوەیە کە خاوەنی نی یە . بەموڵکی کەسیان نەبوو,

﴿ فذروها تأكُل في أرضِ اللهِ ولاتمسوها بسوءٍ فيأخُذكُم عذابَ أليم ﴾ ووتی :- کۆی ئایەتەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەنیشانەی خوا لەووشترەکەدا ئەوەیە , کەکەس نابێت دەستکاری بکات و خراپەو ئازاری تووش بکات , نە لە خواردنیدا و نەلە خواردنەوەیدا , و ئاوی (ثمود ) لەنێوان قەومەکەو ووشترەکەدا , دابەشکرابوو , کەئاوێکی کەم بوو , دەبوو ئەوان ڕۆژێك بیخۆنەوە و , ووشترەکەیش ڕۆژێك , ڕیوایەت هاتووە , کەئەوان لەباتی ئاو شیریان لەووشترەکە بەشی هەموویان دەست دەکەوت , ئەمە لە (إبن عباس ) و (قتادە ) ەوە, ڕیوایەت کراوە.

---

١ / (قصص القرآن ) (١١٧) .

پاشان بەو نیعمەتەتان یادی خستنەوە کە لەسەریان بوو .

﴿ وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ ( الأعراف / ٧٤ ) .

واتە : یادبکەنەوە کاتێك خوای گەورە ئێوەی کرد بەجێنشین لەسەر زەویدا , (الشهاب ) دەڵێت : – نەیفەرموو : (خلفاء عاد ) جێنشینی عاد , ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەلەنێوانیاندا ماوەیەکی دوورو درێژ هەبووە , و ئێوەی لە خاکی (الحجْر) دانیشتە جیّ کرد , کەلەدەشت و تەختانی یەکانیدا بیناو باڵە خانەی بەرزوو تەلاری هەمەجۆر دروستبکەن , و چیاکان ببڕن و دای تاشن لە شێوەی ماڵدا بۆشوێنی نیشتە جیّ بوونتان .

( القرطبي ) دەڵێت :– ماڵ و خانویان لە شاخەکان دەبڕی و دروستدەکرد لەبەر تەمەن درێژی خۆیان , چونکە خانوەکانیان پێش کۆتایی هاتنی تەمەنی خۆیان لەناو دەچون . یادی نازوو نیعمەتی خوا بکەن بەسەر خۆتانەوە سوپاسگوزاری خوابن لەسەری و فەسادو خراپە لەسەر زەویدا بەرپامەکەن .[١]

﴿ قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ(٧٥) قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ (٧٦ )﴾ ( الأعراف / ٧٥-٧٦ )

( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :– پیاوە گەورەو ناودارو خۆبەگەورە زانەکان لە قەومی صالح بەباوەڕدارە لاوازەکانیانی شوێن کەوتووی صالحیان ووت :– بەڕاستی خوای گەورە صالحی بۆ ئێمە و ئێوەش ناردووە , ئەمەیان لەسەر شێوازی گاڵتە جاری ووت , بەلاّم ئەوان ( باوەڕداران ) بەشێوازێکی حەکیمانە , بەئیمان بەپەیامەکەی وەلاّمیان دانەوە , .

---

٢ / (صفوة التفاسير ) ( ١ / ٤٤٤ ) .

( أبو حيان ) ووتویەتی : لادانیان لە ووتنی ( هُوَ مُرسل ) بۆ ووتنی ( إنا بما أُرسِلَ بِهِ مؤمِنون ) لەو پەڕی جوانیدا بووە , کاتێك فەرمانی پەیامەکەی زانراو و ڕوون و دیارە , و پارێزراوە و گومانی تێناچێت لەوەدا کەبەو شێوە ناوازەو دەستەو سانەوە هێناویەتی پێویستی بەوە نابێت کەپرسیاری پەیامەکەی لێ بکرێت , ئینجا ئەو کەسانە کەخۆیان بەگەورە زانیوە ووتیان :- ئێمە باوەڕ بەوە ناکەین کە ئێوە بەڕاستان زانیوە , لەپێغەمبەرایەتی صالح , بەڵکو ئەوان نەیان ووت :- ( أنا بما أُرسِل بە کافرون ) , بۆ دەرخستنی سەرپێچی خۆیان بوو بۆ ئەوان و ڕەت کردنەوەی قسەکانیان بوو .[1]

﴿ فَعَقَرُواْ النَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ ( الأعراف /٧٧)

( ابن کثیر ) دەڵێت :- کاتێك ئەو حاڵەتەیان لەسەر درێژبوویەوە , کەسە گەورەو خۆ بەزل زانەکانیان کۆبوونەوەو , لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کەئەو ووشترە بکوژن , تالەدەستی ئیسراحەت بکەن , و ئاوەکەیان بۆ بگەڕێتەوە , شەیتان کردەوەکەی بۆ جوان کردن . ئەوەی کاری کوشتنەکەی گرتە ئەستۆی خۆی , گەورەکەیان بوو, بەڕێکەوتنی هەموویان کردی , لەبەرئەوە کارەکە دەدرێتە پاڵ هەموویان .[2]

﴿وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ ( الأعراف /٧٧ )

زانا ( عبدالرحمن بن ناصر السعدی ) دەڵێت :- لەشارەکەدا نۆ پیاوی گەورەو بەهێز هەبوولەشەیتانەکانیان , بەرگری ئەوانەیان دەکرد کەصالح ( علیە السلام ) بۆی هێنابوون ,بەربەستیا لەبەردەم ڕێگەی خواو بانگەوازەکەیدا دەگرت و خراپەیان لەسەرزەویدا دەنایەوە و چاکەیان نەدەکرد , و صالح ئاگاداری کردن کە ووشترەکە نەکوژن , بەڵام ئەوان لەخۆ بەگەورە زانین و ڕەتکردنەوەی حەقدا , یەکەم شت کەکردیان کۆڕێکیان بەست تالەسەر

---

١/ ( صفوة التفاسير ) ( ١/ ٤٤٤ – ٤٤٥ ) .

٢/ ( صحيح قصص الأ نبياء ) ل ( ٩٥–٩٦ ) .

ئەوە ڕێك کەوتن ووشترەکە بکوژن ...... هەر لەوماوەیەدا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کارەکانیان توندو چڕیکەنەوە لەسەرکوشتنی ووشترەکە تێپەڕن بۆ کوشتنی صالح ی پێغەمبەریان , پەیمانیان دا ڕێك کەوتن , و سوێندیان خوارد , و فەرمانەکەیان شاردەوە لەترسی ئەوەی کەس و کارەکەی قەدەغەیان نەکەن , چونکە لەماڵێکی بەڕێزو سەربەرزدابوون , ووتیان ( لَنُبَيتَنَّهُ واهلَه ) سوێندبێت , بۆی دەمێنینەوە بەشەو , پاشان ئەگەر کەس و کارەکەی پێیان زانین و گومانیان برد ئێمە کوشتومانە , ئەوا سوێند بۆ دۆست و نزیکەکانی دەخۆین کەئێمە لەناو بەری کەس و کارەکەیمان نەبینیوە , بەدڵنیایی ئێمە لەڕاستگۆیانین . ئەم نەخشە گەورەیان ڕێك خست و , بەڵام ئەوان نەخشەی فێلاوی دەکێشن و خوای گەورە یش , نەخشەی بەتاڵکردنەوە بۆکارەکانیان دەکێشێت و فێری صالحی پێغەمبەری دەکات ,کاتێك خۆیان کەمین کرد لەبناری چیایەکدا تا بۆفرسەتێك چاوەڕێ بن بۆصالح , بەڵام خوای گەورە دەستی کرد بەسزادانی ئەوان , ئەوان بوونە پێشڕەو بۆ قەومەکەیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ , و خوای گەورە لە سەر چیاکەوە بەردێکی گەورەی بۆ ناردن دای بەهەموویان داو بەخراپترین شێوە هەموویانی لەناوبرد , دواتر کەسێ ڕۆژتەواو بوو , لەسەرویانەوە دەنگێکی زۆرگەورە هات و لەسەرو بن ڕای تەکاندن و سەرو ژێری کردن بەخاکەوە , ئینجا خوای گەورە صالح وباوەڕدارانی ڕزگارکرد وفەرمووی :-

﴿يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَكِن لاَّ تُحِبُّونَ النَّاصِحِينَ﴾[1] الأعراف / ٧٩ ) .

١/ بةكورتى لة ( تيسير اللطيف المنان ) ل ( ١١٥ ) .

( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- دواتر ( صاڵح ) ( عليه السلام ) پشتی لێ هەڵکردن پاش ئەوەی لەناوچوون و بینینی کە چییان بەسەرداهاتووە , لەسەر شێوازی حەسرەت و داخ هەڵکێشان پێی ووتن :بەڕاستی من پەیامی پەروەردگارم پێ گەیاندن , وئاگادارم کردن لە سزای خوا , وتوانای خۆمم بە خەرج دا لەئامۆژگاری کردنتان , بەڵام کاری ئێوە بەردەوامی بوو لەسەر ڕقبوونتان لەکەسانی دڵسۆزو ئامۆژگاری کار , و دوژمنایەتیتان کردن .[1]

( ابن کثیر ) دەڵێت :- واتە :- صاڵح فەرمووی من زۆرم هەوڵدا لەپێناو هیدایەت دانی ئێوەدا بەهەمووتوانام کەهەمبوو و بەقسەو کردارم سووربووم لەسەری , بەڵام ئێوە حەقتان قبوڵ نەکرد , لەبەرئەوە لەسەر ئەوکارە مانەوە کەئازارو سزا بوو بۆتان و بەردەوامیش دەبێت لەسەرتان بۆ هەتا هەتایە , من توانایەکم نی یە تازەدورتان بخەمەوە , ئەوەی واجب و پێویست بوو لەگەیاندنی پەیام و ئامۆژگاری بۆ ئێوە گەیاندم و کردم , هەموو هەوڵ خۆم بەخەرج دا , بەڵام خوای گەورە ئەوەی خۆی بیەوێت دەیکات .[2]

## ﴿ وانە و پەندە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) (القاسمي) دەڵێت :- ( الرازی ) ووتویەتی :- هەندێك لەبێباوەڕان وای لێك دەدەنەوە ئەو ووشانەی لەگێڕانەوەی ئەم ڕوداوەدا دابەزیون جیاوازیان لەنێوان دایە , ووشەکانیش : ( الرجفة , الطاغیة , الصیحه ) ن ؟ وەڵام , ئەوەی ( أبو مسلم ) ووتویەتی بریتی یەلە :- ( الطاغیة ) ناوێکە بۆ هەموو ئەوانەی لەسنوری خۆیان تێپەڕیان کردوە , وەك یەکە ئەگەر ئاژەڵ بن یان شتی تر , و ( هاء) ی پێوە نوسێنراوە بۆ ( مبالغة ) . موسڵمانان پاشای

٢/ ( صفوة التفاسير ) ( ١/ ٤٤٥ )

٣/ ( قصص الأ نبياء ) بةدةسكاريةوة ل ( ١٢٤ )

لاەریان ناوناوە : ( الطاغية ) و ( الطاغوت ) .
بەلأم ( الرجفة ) بریتی یە لەو جوڵەو بوومەلەرزە لەزەویدا , بریتی یە لەجوڵیەکی دەرەکی کەدورنیە ناوی ( الطاغية ) ی بەسەر دا ببڕدرێت .
بەلأم ( الصحة ) زۆرجار بوومەلەرزە دەنگی گەورەی لەگەڵ دا دەبێت کەپێی دەوترێت ( الصيحة ) , هەروەها ( الصاعقه ) زۆرجار بوومەلەرزەیە . هەروەها ( الزجرة ) یش . خوای گەورە فەرموویەتی :-
﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ (١٣) فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ ﴾ [١] ( النازعات/ ١٣ -١٤ )

واتە : (( باخوا نەناسان چاك بزانن ) بەڕاستی تەنها گەڕانەوەیە یەك تێخوڕینە , جا دەست بەجێ هەر هەموو ئەو خەڵکە بێدار دەبنەوە و زیندوو دەبنەوە و لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەدا ئامادەدەبن ).
٢) زانا ( محمد رشيد رضا ) دەفەرمووێت :- سوننەتی خوای گەورە تێپەڕی لەوەدا کەهەژارە لاوازەکان لەخەڵکی پێش بکەون بۆ وەلأم دانەوەی بانگەوازی پێغەمبەران و شوێنیان بکەون و بچنە ناو هەموو بانگەوازێکی چاکە خوازیی یەوە , چونکە لەسەریان قورس و گران نابێت کەببنە شوێنکەوتووی غەیری خۆیان و کەسە خۆ بەگەورە زان و دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانەکان پێیان بێ باوەڕ بن , چونکە شەق دەکەنە نێوانیان کەببنە سەر گەورە , و ملیش کەچ ناکەن بۆ فەرمان و نەهی یەکانیان .ئەوان زیادە ڕەوی لە زیان بەخشەکاندا ناکەن و هەواو ئارەزووەکانیان لەسنوری حەق و دادپەروەریدا سنوردار کراوە , هەر لەسەر ئەم سوننەتە کەسە گەورەو بەدەسەلأتەکان لەقەومی صالح لەسەر قسەی خۆیان بەرامبەر باوەڕداران بەردەوام بوون : ئایا ئێوە وادەزانن کە صالح لەلایەن پەروەردگاری یەوە نێردراوە ؟ ووترا : ئەم پرسیارە بۆ ڕابواردن و گاڵتە جاری بووە . ڕێگرێك نی یە لەوەدا کەبوبێتە پرسیارێکی حەقیقی ئەگەر پرسیاریان کردبێت لە (علم ) زانینی ئەوەی کەنێردراوێکە

---

٤ / (محاسن التأويل ) ( ٧ / ١٩٣ ) بەکورتی .

گومـان بـۆ ئـەوان دروسـت بكـات لەشـوێنكەوتنی دا دەربـارەی زانسـتێكی بورهانی , و لادانیان كەبەشێوەیەكی جوان بێت و ڕێزو فـەزڵ بدات بە صالح بەسەر ئەواندا و هەڵی بژێرێت بۆ سەرۆكیان لەباتی خۆیان .[1]

٣) لایەنگرانی ناحەق ڕقیان لەوانە دەبێت كەبانگەوازیان بكات بۆ حەق و ڕاستی و هـەوڵیان لەگەڵـدا بـدات و هانیـان بـدات لەسـەری , صـالح ( علیـه السـلام ) خۆشەویسـت بـوو لایـان پـێش ئـەوەی بانگیـان بكـات بـۆ یەكخواناسـی و دەركێشـانی هـاوەڵ پەرسـتی تیانـدا , وەك خـوای گـەورە دەربارەیـان فەرموویـەتی :- ﴿ يصـلِحُ قـد كُنْـتَ فينـا مَـرْ جـواً قَبْـلَ هـذا ﴾ واتـە :- ( قەومەكەی ووتیـان :- ئەی صالح , بەڕاستی پێش ئەم یاسایانەت تۆ لەناو ئێمە دا شوێنی هیوامان بوویت ) بەڵام پاش بانگەوازەكەی حاڵ گۆڕا تا بوو بەكەسێك زۆر ڕقیـان لێـی بـوو , لەگـەڵ ئەوەی ئـەو نـەرمی لەگـەڵ دەنوانـدن و بەسۆز بوو لە بانگەوازەكەیدا و بە ئارام بوو لە سەریان , و وەڵامی داواكەیانی دایەوە , كەداوای كرد لەپەروەردگاری ئەو ووشترەیان بۆ بنێرێت كەداوایان كردبوو , بەڵام ئەو حەقەی كەئەوی لەسەر بوو , ئەوان ڕقیـان لێـی بـوو , وەك خوای گەورە دەربارەی ( أصحاب ( لأخدود ) فەرموویەتی :-

﴿ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾ ( البروج /٨ )

كەسانی خاوەن حـەق ئامـانجی دنیـایی یـان نـی یـە , و منافەسـەی كەسانی دنیایی ناكەن لەسەر ئەو پلەو پایەو ڕۆچوونەی هەیانە , و پاشە ڕۆژیش بۆ لە خواترسانە .

٤) ئەهلی ئیمان بە ئیمانەكەیانـەوە ڕێزیان هەیـە , وەك ئـەوەی كەئـەهلی سوننەو جەماعەت قەناعەتیان پێی هەیە, ئیمانی ئەبو بەكری ڕاستگۆ ( خوا لێـی ڕازی بێت ) وەكو ئیمانی ئومەت نی یە . هەروەها ئـەهلی شـەڕو خراپـەیش لەشەڕو خراپـەدا زیادیـان هەیـە , و هەنـدێك لەشـەڕ لەهەنـدێكی تریـان سـوك تـرو هێواشترە , لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی قەومی صـالح كـافرو خراپـە كـاربوون بـەڵام

---

١ / (تفسير المنار ) ( ٨ / ٥٠٤ ) .

نۆ کەسیان لە هەموویان زیاتر , شەڕو خراپەیان هەبوو . خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ وَلا يُصْلِحُونَ﴾( النمل ٤٨ )

خوای گەورە بەپەلە سزای بۆ ناردن و لەناوی بردن لەپێش باقی قەومەکەوە , بۆ ئەوەش بەم ئایەتە ئاماژەی پێدان : - ﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيًّا(٦٩) ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيًّا﴾( مريم ٧٠،٦٩) واتە :- ( لەوەو دوا لەهەر گرۆو دەستەیەك ئەوانە دەردەکێشین کەزۆر یاخی بوون لەخوای میهرەبان ( دژایەتی دین و بەرنامەکەیان دەکرد ) , پاشان زۆر چاك ئاگادارین بەوەی کەکێ لەوانە لەپێش و شایستە ترە بەوەی کەزوو بخرێتە ناو ئاگری دۆ زەخەوە )

٥) پێویستە و دەگونجێت کە ئەو مشتە باوەڕدارە , متمانەیان بەسەرکەوتنی خوایی هەبێت , و فێڵی فێڵبازان لەخراپە کاران و ئەو کەسانەی بەربەست دروستدەکەن لەڕێگەی خوادا چۆك یان پێ دانەدات , بێگومان خوای گەورە لەپشتیانەوە لەهەموو شتێك بە ئاگایە , ئەگەر ئەوان فێڵ لە ئەهلی ئیمان بکەن , ئەوا خوای گەورەش فێڵیان لێ دەکات لە سەروی حەوت ئاسمانەوە , وەك فەرموویەتی کە ئەمە ماناکەیەتی : ( ئەو تاوانبارانە ) پیلان و تەڵە کەیان گێڕا ( بۆ لەناوبردنی صالح شوێنکەوتوانی ) ئێمەیش نەخشەیەکی ترمان کێشا ( بۆ ڕزگار کردنی ئیمانداران و لەناوبردنی خوا نەناسان ) , ئەوان ئاگایان لێ نە بوو , هەستیان پێ نەدەکرد , جا ئیتر سەرنج بدەو تەماشاکە سەرئەنجامی پلانەکەیان چیان بەسەر هات , بەڕاستی ئێمە ئەوانیش و قەومەکەیانمان لەناو برد ( بەهۆی بومەلەرزەوە ). ئەوەتا ماڵە کانیان کاول و چۆڵە بەهۆی ئەو ستەمەی کەکردیان , بەڕاستی لەو بەسەر هاتەدا بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێك کەلەشت تێبگەن و بزانن . ئینجا ئێمە ئەو کەسانەمان ڕزگار کرد کەباوەڕیان هێنابوو , ئەوانەپارێزگار بوون و لەخوا دەترسان ) (النمل / ٥٠ -٥٣ )

٦) زانا (محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت :- ئایەتی :- ( كفروا ربهم ) بەکار هات بۆیان , زۆر جار دەوترێت :- ( كفروا بِربهِم ) بەلآم خوای گەورە لەم چیرۆکەدا فەرمووی :- ( كفروا ربهم ) واتە : جیاوازیەك لەنێوان ئەم دوومانایەدا دەبێت ....( كفروا ) واتە: ئینکاری بوونی پەروەردگاریان کردو دایان پۆشی , و ( كفروا بِربهم ) واتە : باوەڕیان پێنەهێنا لەگەڵ ئەوەی کەدانیان نابوو

بەبوونیدا , ئەمە جیاوازی یە , کاتێك ئەو تاوانە گەورەیان دەبینین کە ئەنجامیان دابوو , بێگومان لەناوبردنیا کارێکی دادپەروەرانەیە , ئێمەیش وەك خوای گەورە دەڵێت :- ( الا بُعداً لِثمود ) واتە : ئاگادارین بڕیاری دووری لەبەزەی خوا درا بۆ هۆزی ثە موود .

٧) (مامۆستا عمرو خالد ) دەڵێت :- خوای گەورە دەفەرمووێت :-﴿ كذبت ثمودُ المرسلين ﴾ ( الشعراو/ ١٤١ ) ئایا ثە موود باوەڕی بە هەمووپێغەمبەران نەکرد , چونکە دین یەکە , هەرکەس باوەڕ بە صالح (علیە السلام ) نەکات وەك ئەوەیە باوەڕ بەهەموو پێغەمبەران نەکات , و هەرکەس باوەڕ بە محمد و موسی و عیسی ( علیهم السلام ) نەکات , وەك ئەوەیە باوەڕی بەهەموو پێغەمبەران نەکردبێت , چونکە دینی خوا یەکە , چونکە پێغەمبەران گشتیان یەك سەرچاوەیان هەیە , ئەمەیش مانایەکی زۆر جوانە لە قورئاندا .

## ﴿ چیرۆکی لوط پێغەمبەر ( علیه السلام ) ﴾

لوط پێغەمبەر ( علیە السلام ) هاوسەردەمی ئیبراهیم (علیە السلام ) بوو , زۆر لەزانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە برازای بووە .[1] زانا( السعدي ) ووتویەتی :- قوتابی ئیبراهیم بووە , کە ئەویش لە پلەی کوڕبووندا بووە , خوای گەورە هەواڵی ژیانی ئیبراهیمی پێ ڕاگەیاند , و ناردی بۆ شاری (سدوم) لە (غور ) ی فلسطین .

(إبن كثير ) دەڵێت :- لوط ( علیە السلام ) لە شوێنی مامی بەفەرمان و مۆڵەتی ئەو دوورکەوتەوە , پاشان لە شاری (سدوم ) لە خاکی ( غور زغر ) نیشتە جێ بوو . کە ئەو شوێنە بە دایکی ناوچەکە دەژمێردرا , چەند شارو

---

١ / ئەمە لە تەورات وەرگیراوە کە نەبەڕاستی دەزانین و نەبە درۆ , بەڵام قورئان بۆی ڕوونکردوینەتەوە کە لەو کەسانەبووە باوەڕی بە ئیبراهیم ( علیە السلام ) هێناوە : - ( فأمَنَ لَهُ لوط ) یەکەمیان زانا (السعدي ) باسی کردووە .

شوێنێکی تریش لە دەورو بەری هەبوون , خەڵکێکی لە خراپترین و بەد ترین و بێ باوەڕترینی هەموو کەسەکان هەبوو , بەد ترین ژیان و بەسەر هاتیان هەبووە , ڕێگایان دەگرت و دەچونە ناو نادی یە بەد و خراپەکەیانەوە , نەهییان لە خراپە نەدەکردو ئەنجامیان دەدا , خراپترین کاریان دەکرد جۆرێکی ناپەسەندیان لە فاحیشەو داوێن پیسی داهێنا کەلەنەوەکانی ئادەم کەس لە پێش ئەواندا ئەو کارەی نەکردبوو , کە (نێر بازی ) بوو لەگەڵ ڕەگەزی نێرینە دا , و دەستیان لەوە هەڵگرتبوو کە خوای گەورە بەڕێگای دروست لەگەڵ ئافرەتاندا بۆی دانابوون , کە بەندە چاکەکان دەیان کرد .[١]

بانگەوازی ( لوط ) پێغەمبەر ( علیه السلام )

خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ (٨٠) إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ (٨١) وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلاَّ أَن قَالُواْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ (٨٢) فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ (٨٣) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴾ ( الأعراف / ٨٠- ٨٤ )

زانا ( محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت :- ( ولوطاً ) واتە : خوای گەورە وەك چۆن نوحی بۆ قەومەکەی نارد و هودی بۆ قەومە عاد و صالحی برایانی بۆ قەومی ثموود نارد , ( لوط ) بە ( منصوب ) ی هات .

لوط (علیه السلام ) چی بە قەومەکەی ووت ؟ پێی ئەوتن پەروەردگارم نەهی ئەو کارەتان لێ دەکات کە ئێوە دەیکەن , چونکە ئەدەبی پێغەمبەرایەتی وای لێ کرد بە شێوەی پرسیار بیڵێت , خوای گەورە فەرمووی :-

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ ﴾ ئەمەکارێك بوو کەس پێش ئەوان نەیکردبوو , بەڵام ئەوان بۆ شەهوەت و

٢ / (قصص الأ نبياء ) ل (١٩٢ ) .

ئارەزوو کردیان , لەگەڵ ئەوەی کە کارێکی ناپەسەندو قێزە ون بوو , و فیترەتی ساغیش ڕەتی دەکردەوە , بەڵام لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا بە مەبەستی تێر کردنی ئارەزوو دەرچوون لە سروشتی ئاسایی بوونی هەبو , ووشەی ( الفاحشة ) زیادەڕەوی یە لەکاری ناپەسەنددا , واتە : تەنها پیس نی یی , بەڵکو زیاد لە پێویست پیسە , چونکە ئەگەر کەسێك بەبێ مارە بڕین بچێتە لای ئافرەتێك ئەوە (فاحشة ) یە , بەڵام دەگونجێت مارەی ببڕێت و ببێتە هاوسەری حەلاڵی , بەڵام چونی پیاو بۆ لای پیاو ئەوە بە مانای زیاتر ناپەسەند (فاحشة ) یە , چونکە بۆ ئەو کارە دروست نەکراوە , هەرگیز ناگونجێت ببێتە حەلاڵی ئەوە ( فاحشة ) یەکەو خراپتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت .[1]

﴿ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ ﴾ بە ڕاستی کەس لە پێش ئەو قەومەوە ئەو کارەیان نەکردووە ئەگەر تەنها کەسێکیش بووبێت . خوای گەورە بە شێوەیەکی توند سەر زەنشتی کردن .

﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴾ ( الأعراف / ٨١ ) .ئەمە زیادە ڕەوی بوو , خوای گەورە ئافرەتانی داناوە تا پیاوان بە حەلاڵی ئارەزووی تیا وەربگرن و کردنی بە شوێنی بەرهەم هێنانی منداڵ , بەڵام ئەگەر ئەم کارە لەگەڵ پیاواندا کرا , ئەوە تێپەڕاندنی سنورە دورکەوتنەوەیە لەوەی کە خوای گەورە بەشەرعیی دایناوە , تێر کردنی ئارەزووەکانیانە لە پیاواندا , کە خوای گەورە حەرامی کردووە . خوای گەورە لە سورەتی (الشعراو ) دا دەفەرموویێت : - ﴿ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾

( الشعراء /١٦٦) ( لوط ) یپێغەمبەریان پێیان دەڵێت :-ئێوە بۆچی ئەو کارە ناپەسەندە ئەنجام دەدەن کە کێڵگەیەکی باشترتان لایە کەخوای گەورە پێیداون , کە هاوسەرەکانتانن ؟!! . کارەکەیان تێرکردنی ئارەزووبوو لەپیاواندا

[1] / ( قصص الأنبياء و معه سيرة الرسول ) .

کەوەك خۆیـان وابـوون , کەئەمـەش شـێوەی ئاژەڵانـە بـوو , تـەنها مەبەسـتیان ئـارەزووبوو , ئاگادارکردنەوەیـەکی تێدایـە کـە دەگونجێـت کەسـی ژێـر ببێتـە بـانگخواز پێیـان بڵێـت ئێـوە لـەم کارەتانـدا منـداڵتان دەسـت ناکـەوێت و پارێزگـاریش لەمانـەوەی جـۆر ناکـەن , وەك حـوای گـەورە هـەواڵ دەدات , دەفـەرموێت ( مِن دون النساء ) ئـەوان ئافرەتیان تێپەڕانـد کەشوێنی دروستی ئارەزووەکانیانـە لـەلای سروشـت ساغەکان ( بـل انـتم قـوم مَسـرِفون ) بەڕاسـتی ئێوە قەومێکی زیادەڕۆن لەم کارەتاندا .

﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلاَّ أَن قَالُواْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ ( الأعراف /٨٣)

( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- ئەوان هیچ وەڵامێکیان بۆ ( لـوط ) نەبوو تەنها ئەم وەڵامە نەبێت لەسەرکارە قێزەون و ناپەسەندەکەیان کە کردبویان کە ( لـوط ) ( علیـه السـلام ) لەسـەر ئـەوکارە سەرزەنشـتی کـردن , هەنـدێکیان بەهەنـدێکیان ووت : دەی لـوط و شـوێکەوتوانی دەربکـەن لـە بـاوەڕداران لـە شـارەکەتان , چـونکە ئـەوان کەسـانێکی پـاکن و لەچـاو ئـەم کـارەدا کـە ئێمـە دەیکـەین . ( الشـعراوی ) دەڵێت :- لـەکارە کـەیان هـیچ ( منطـق ) ێك نـەبوو , تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە قسـەی ( لـوط ) ( علیـه السـلام ) هەسـتی ئـەوەی لادروسـتکردن کـە تاوانەکـەیان ئـاڵۆزو ناپەسـەندە ووتیـان : بـالوط قەومەکـەی دەربکـەین لەشـارەکەمان , چـونکە ئـەو هـاتووە شـتێکمان لـێ تێکبـدات کەئێمـە لەزەتی پێ وەردەگرین .

( الزمخشري ) دەڵێت :- ( إِنَّهَمْ أُناسٌ يتطهّرونَ ) گاڵتـەکردن بـوو بـە لـوط و باوەڕداران و باکیان لەوکارە ناپەسەندەی خۆیان , ئەوان شانازیان پێوە دەکـرد کە ئەو کارە قێزەون و ناپەسەندەیان دەکرد . ﴿ فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ (٨٣) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴾ ( الأعراف / ٨٣-٨٤) .

( محمد علی الصابونی ) دەڵێت:- ئێمـە لـوط ( علیـه السـلام ) وکـەس و کـارە باوەڕدارەکەی و باوەڕدارانمان لەوسزایە ڕزگارکرد کە توشـی قەومەکـەی هـات , تەنها خێزانەکەی بوو کە ڕزگاری نەبوو لەگەڵ خراپەکاراندا .

( الطبری ) دەڵێت :- چونکە خێزانەکەی خییانەتی کرد لە لوط و بێباوەڕ بوو بە خوا ئیجا کاتێك سزاکە هات لەگەڵ ئەو کەسانەدا لەناوچوو کەلەناو چوون . پاشان جۆرێك لەبارانی سەیرمان بەسەریاندا باراند کەبریتی بوو لە کڵۆ گڵ و بەردی سور کراوە , خوای گەورە لەزۆریدا شوبهاندی بەباران , پاشان فەرمووی : ئەی گوێگر باش بڕوانە بزانە سەر ئەنجامی تاوان کاران چی بەسەر هات ؟ وبەرەو کوێ چوون ؟

## چیرۆکی لەناوچوونی قەومی لوط ( علیه السلام )

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وَلَمَّا جَاءتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَـذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ (٧٧) وَجَاءهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُواْ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَـؤُلاء بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ (٧٨) قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ (٧٩) قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ (٨٠) قَالُواْ يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ (٨١) فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ (٨٢) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾ ( هود / ٧٧-٨٣) .

( إبن كثير )دەڵێت :- زانایانی تەفسیر وتویانە :- کاتێك فریشتەکان لای ئیبراهیم ( علیه السلام )یان جێ هێشت کە ( جبریل و میکائیل و ئیسرافیل ) بوون ، ڕۆیشتن تا گەیشتنە خاکی ( سدوم ) لە شێوەی چەند گەنجێکی جوان ڕوخساردابوون ، تا تاقیکردنەوەیەك بوو لەلایەن خواوە بۆ قەومی لوط و گەیاندنی بەڵگەی خوایی بوو لەسەریان ، داوای میوانداریان لە لوط کرد ، کەلەکاتی ڕۆژئاوابوون دابوو ، لوط ( علیه السلام ) ترسا ئەگەر میوانداریان قبوڵ نەکات ، کەسانێکی تر ببنە میوانی ، وای دانا کە ئەمانە کۆمەڵێك خەڵکی ئاسایین ﴿سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَـذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴾ ( هود / ٧٧ ) .

واتە: لەوکاتەدا لوط ( علیه السلام ) تەنگە تاوو دڵگران کرا بە هاتنی فریشتەکان ، واتە : هاتنەکەیان بوو بە هۆی دڵگرانی لوط ، و ناتوانا و دەستە

پاچەبووله میواندارییان ، چونکه گومانی وابوو ئەوان ئادەمین و ، کاری خراپی قەومەکەشی ئەوەبوو کە پەلاماری میوانیان ئەدا بۆ کاری نێربازی ، ( لـوط ) یش بەرگری ئەم گەله بەدەی پیٚ نەدەکرا ، لەبەر ئەو ووتی :-ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی سەختی بەتینه ، بەجۆرێك کەس بەرگەی ئەو کاره ناگرێت .

﴿ وَجَاءهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُواْ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلاء بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ﴾ ( هود / ٧٨ ).

زانا ( الشوکانی ) دەڵێت :- قەومەکەی ( لوط ) کاتێك هەواڵی هاتنی فریشتەکانیان پیٚ گەیشت کەله شێوەی زۆر جواندابوون بەپەله و هەڵەداوان چون بۆ لای ماڵی ( لوط ) وەك ئەوەی پاڵنەرێکی بەهێز پاڵیان پێوە بنێت بۆ ئەنجامدانی کاری قێزەون و نێربازی بەرامبەر میوانە بەڕێزەکانی ، ئەوان پێش هاتنی میوانەکانیش هەر ئەو کاره ناپەسەندەیان دەکرد ، ووتراوە : پێش هاتنی ( لوط ) بە پێغەمبەر هەر کاری خراپەیان دەکرد ، ئەوان پیشەیان هەر نێربازی بوو لەگەڵ پیاواندا ، کاتێك هاتنه لای ماڵەکەی ( لوط ) مەبەستیان بوو دەستدرێژی بکەنه سەر میوانەکانی بۆ ئەو کاره ، ئینجا ( لوط )( علیه السلام ) هەستاو پێی ووتن : ئەی قەومەکەم ئافرەتانی ئەم شاره بخوازن هەموویان کچی منن به شێوەیەکی پاك و دروست و حەلاڵ ، چونکه پێغەمبەران وەك باوك وان بۆ قەومەکانیان ، و دەست لەو کاره خراپ و قێزەونه هەڵبگرن بەرامبەر میوانەکانم ، دەڵێن ( لوط ) خۆی تەنها دوان یان سیٚ کچی هەبووە ، پێشتر داوایان له ( لوط ) کردووە بیانداتیٚ بەلاٚم لەبەر پیسی کارەکانیان قەدەغەی کردووە بیانداتیٚ ، و دەڵێن : لەناو قەومەکەدا دوو سەر گەورەی گوێڕایەڵ هەبوون ، لوط ویستویەتی کچەکانی خۆی بدات بەو دووانه ، ووتراویشه ( هؤلاء بناتی ) هەموو ئافرەتان دەگرێتەوە ، چونکه پێغەمبەری قەومەکه باوکی هەموویان بووە ، کۆمەڵێکی تر وتویانی :- بۆیه ئەو قسەیەی ووت کەمەبەستی پێی دورخستنەوەی خراپەکاران بوو له خۆی ، که مەبەستی ڕاستی پێی نەبوو . ( هُن اطهَرُلکم ) واته : ئەمانه حەلاڵ و پاکترن ، له هەموو کارێك به دوورن که حەرام بێت جا له خوا بترسن و سەرپێچی مەکەن ، که ئەو کارەی دەیکەن له ( زینا ) داوێن پیسی ناپەسەندترە ، و سەرشۆڕو شەرمەزارو ڕیسوام مەکەن بەرامبەر میوانەکانم ، ئایا له ناوتاندا نی یه پیاوێکی ژیرو حەق ناس که ڕێنمویتان بکات و له خراپه بەرگریتان بکات ؟

﴿ قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴾ ( هود ٧٩ )

زانا ( محمد رشيد رضا ) دەڵێت :- واتە : بەڕاستی ئەو ئافرەتانەی کە کچی تۆن لە دینەکەدا لەسەر ئێمە حەرامن یان مەبەستیان ئەوەبووکە حەق لایان ئەوەیە نێرینە بخوازن و بچنە لایان کە مەبەستیان گاڵتەجاڕی بێت ، یان حەق و ڕاستی ئەوەیە لایان پێویستی پاڵی پێوە ناون ، واتە : بەڕاستی ئەی (لوط ) تۆ پێشتر زانیوتە ئێمە هیچ پێویستی و مەبەستێکمان لە کچەکانتدا یان هیچ حەزێکمان تیادا نییە کە بیان خوازین ، یان زانیوتە کە ئێمە لەو ئافرەتانەی کە تۆ بە کچانی خۆت ناوت بردون هیچ حەقێکی ڕابواردنمان تیاندا نی یە ، ئێمە لەسەر ئەوە نین لەگەڵیاندا بین ( وإنك لتعلمُ ما نريد ) بەڕاستی تۆ دەزانیت کە ئێمە مەبەستمان خواستن و چونە لای ڕەگەزی نێرەکانە ، تۆ باش دەیزانیت و هیچ گومانێکی تێدا نی یە ، ئیتر بۆچی هەوڵ دەدەیت ڕێگریمان بکەیت ؟[1]

﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴾ ( هود / ٨٠ ) .

( إبن كثير ) دەڵێت : زانایانی تەفسیر و کەسانی تریش باسیان کردووە ، کە پێغەمبەر ( لوط ) ( عليه السلام ) .

بەرەنگاری قەومەکەی کرد کە نەچنە ژوورەوە دەرگاکانیش داخرابوون ، ئەوانیش دەیانویست بیکەنەوەو بچنە ژورەوە ، ئەویش ئامۆژگاری دەکردن و نەهی لێ دەکردن لە پشتی دەرگاکەوە ، بەڵام کاتێك کارەکە لەسەری قورس و ناڕەحەت بوو ، و بارودۆخی گران بوو ، ئەوەی ووتی ووتی : ئەگەر ببوایە بۆم بە ئێوە و بەهۆی ئێوەوە هێزو دەسەڵاتی بەرگری و جەنگ کردن لەگەڵیان ، یان ئەگەر بکرایە بۆم کە خۆم بدەمەپاڵ هێزێکی بەتین لە خزم و دۆست و عەشیرەت

١/ ( تفسير المنار ) ( ١٢ / ١٣٥ )

، ئەوا دەمکرد و بەرگریم لێ ئەکردن ، واتە : بەڵام بە داخەوە هیچ کامیانم بۆ نی یە .[1]

ئینجا فریشتەکان ووتیان : - ( يا لوط إنّا رُسُلُ رَبَّكَ لن يصلوا إليك ) واتە : ئەی ( لوط ) بەڕاستی ئێمە نێردراوی پەروەردگارتین ، هەرگیز ئەوان ناگەنە لای تۆو زیان و خراپەیەك ناگەیەنن بە تۆ ، باسیان کردووە کە جبريل ( عليه السلام ) چوە سەر خراپەکاران وبە لێواری باڵەکانی کێشا بە دەم و چاویاندا ، چاوی هەموویانی کوێرکرد .[2]

دەربارەی ئایەتی :﴿ قَالُواْ يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴾ ( هود / ٨١ ).

زانا ( الشنقيطي ) دەڵێت :- خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردووە کە فەرمانی کرد بە پێغەمبەری خۆی (لوط) لەگەڵ کەس و کارەکەی لە بەشێکی شەودا بڕوات و دەرچێت ، لێرەدا ڕوونی نەکردەوە کۆتایی یان ناوەڕاست یان سەرەتای شەو بووە ، بەڵام لە سورەتی ( القمر / ٦٥ ) ڕوونی کردۆتەوە کە کۆتایی شەوو بەرەبەیان بووە .

﴿ولا يلتفِت منكم أحدٌ إلاّ امْرَ اتَكَ إنَّهُ مُصيبها ما أصاببهم ﴾ واتە : لەگەڵ کەس و کارەکەت بێجگە لە خێزانەکەت دەرچۆ و بڕۆ ، ئەومەبەو جێی بهێڵە لەناو قەومەکەیدا چونکە لەگەڵیاندا لەناو دەچێت . خوای گەورە دەربارەی لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی :- ( كانت من الغابرين ) ( الأعراف / ٨٣ ) .

واتە : لەو کەسانە دەبێت کە دەمێنێتەوە و لە لەناوچوان دەبێت . پاشان با هیچ کەس لە ئێوە لانەکاتەوەو سەرنجی دوای خۆی نەدات ، شەو ڕەوی بکە بە

---

٢/ تەفسیری قورئانی پیرۆز ، جزمی ( ١١/ ١٢ ).

١/ بەکورتی لە ( قصص القرآن ) ، ل ( ٢٠٠ ) وەرگیراوە .

کەسوکارەکەت بێجگە لە ژنەکەت ، بەڕاستی دووچاری ئەبێت ئەوەی کە دووچاری قەومەکەت ئەبێت ، ئەو ژنە بەدبەختە بێ بڕوا بوو دەستی تێکەڵ بوو لەگەڵ ئەو گەلە بێبڕوایەدا ، بێگومان سزاکەیان لەکاتی بەرەبەیانداپە ، ئایا ئەو کاتە نزیك نییە ؟ واتە : بەڵێ نزیکە .

﴿ فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴾ ( هود / ٨٢ ) .

زانا ( الشوكاني ) دەڵێت : کاتێك کاتی دیاریکراو هات بۆ ڕوودانی سزاکە ، شارەکەی(لوط)مان سەرەو ژێر کرد واتە : هەڵگەڕانەوە بە جۆرێك بو ، سەری کەوتە ژێرەوە و ژێرەوەی کەوتە سەرەوە ، چونکە جبریل ( علیه السلام ) باڵی خستە ژێری و بەرزی کردەوە لەسەر زەوی و هەتا لە ئاسمانی نزیك خستەوە ، پاشان هەڵی گێڕایەوە بە سەریاندا .[١]

( وأمطرنا عليهم حِجَارة من سجيلٍ مانضود ) .

زانا ( الشنقيطي ) دەڵێت :- زانایان ڕاوبۆچوونی جیاواز یان هەیە لەمەبەستی ( حجارە السجيل ) دا ، ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت لە قوڕ دروستکراوە ، بەلام لەو پەڕی بەهێزی و پتەویدا ، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە مەبەست لە ( سجیل )قوڕە ، ئایەتەکەی سورەتی ( الذاريات )ە کە دەفەرموێت: ﴿ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ (٣٣) مُسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾ ( الذاريات / ٣٣ – ٣٤ ) .باشترین تەفسیر بۆ قورئان هەر قورئانە.

﴿مُسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾ ( هود / ٨٣) .

( الشوكاني ) دەڵێت :- ( المسوّمه) واتە : نیشانەی هەبوو ، ووتراوە : وەك نقێمی مستیلە وابووە . ووتراوە :- لەسەر هەر دانەیەکیان ناوی ئەو کەسە نوسراوە کە بەری دەکەوێت ، ( عند ربّك ) واتە : لە گەنجینەکانی پەروەردگارەوە دەردەچوون ( وما هي من الظالمين ببعيد ) واتە : ئەو سزاو

---

٢/ ( فتح القدير ) ( ٢/ ٥١٥ ).

تۆڵەیە دوورنی یە لەستەمکارانەوە ، لە وێنەی ئەو گەلە ستەمکارەی ( لوط ) ، واتە دوور نییە لە ستەمکارەکانی ئوممەتەکەی تۆوە کە نزیکە وێنەی ئەو سزاو تۆڵەیان بۆ بێت .

## ﴿ پەندو وانە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١)زانا ( السعدی ) دەڵێت :- لەم چیرۆکەدا گەورەترین بەڵگە لەسەر کاری خراپی نێربازی هەیە کە لە پیسترین و بێزراوترین کاری ناشرینە ، و بەڕاستی سزای توند بۆ خاوەنەکەی دەهێنێت ، هەرکەس بەو کارەوە گیرۆدە بوو – پەنا بەخوا – لەگەڵ لەناو چوونی دینەکەیدا ئەوا ڕەوشتە جوانەکانی لێ دەبێت بە بێزراو و ناشرین و ناپەسەند ، و ناشرینەکانیشی لا جوان و پەسەند دەبێت ، و بەڵگەشە لەسەر لادانی ئەخلاقی .

٢)زانا ( محمد رشيد رضا ) دەربارەی ئەم کارە ناپەسەندە دەڵێت :-

أ- تاوانێکی گەورەیە لەسەر فیترەتی بەشەری .

ب- تێکدەرو لەناوبەرە بۆ گەنجان بەوەی کە زیادەڕەوی دەکەن لە ڕابواردندا ، چونکە بە ئاسانی دەستیان پیادەگات .

ج- سەرشۆڕیە بۆ پیاوان بەوەی کە تیاندا ڕوودەدات لە دەردی نەوەکانیان ، هەروەها سوکی و سەرشۆڕی ئیمانیشی تیایە .

د- هەروەها بۆ ئافرەتانیش بەد وخراپکەرە کە هاوسەرەکانیان ئەو کارەیان لەگەڵدا بکەن ، لەکاتێکدا کە براوەتەوە کە پێویستە خۆیان لەو شوێنەیان بپارێزن .

هـ- بە بڵاوبونەوەی ئەو کارە ، بەرهەم هێنانی نەوە کەم دەبێتەوە ، کە پێویستە لە باتی ئەو کارە هاوسەر داری هەڵبژێرن ، حەز لە کاری جووت بوون لە ڕێگەی نادروستەوە ، نەفرەت لە ئەنجامدەرەکەی کراوە .

و- هۆکارێکه بۆ ( هێنانەوەی ئاو بەدەست ) و جوت بون لەگەڵ ئاژەڵاندا ، خوای گەورە لەسەر ئەمە لە چیرۆکی ( لوط ) دا بەڵگەی لەسەر داوە ، کە فەرموویەتی :- ( إنّكم لتأتونَ الرِّجالَ شهوة من دونِ النساْ ) ، مەبەستی لەووشەی ( شهوة ) لە خۆیدا کە دانانێتی لە غەیری شوێنی خۆیدا ، بەڵکو شوێنی خۆی بریتیە لە هاوسەرداری شەرعی .[١]

٥)پەندی سێهەم : فەرموودەیەکە کە ئەمە ماناکەیەتی : لە ( أبی هریرە ) ەوە ( خوا لێی ڕازی بێت ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :- ( ئێمە لە ئیبراهیم ( علیه السلام ) شیاوترین بەگومان بردن لە کاتێکدا فەرموی :- ( ئەی پەروەردگار پیشانم بدە کەچۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە ؟ فەرمووی :- ئایا باوەڕت نییە ؟ووتی : بەڵێ ، بەلآم با دڵم ئاو بخواتەوەو دڵنیابم ) فەرمووی :- خوا ڕەحم بە لوط ( علیه السلام ) بکات بەڕاستی پەنای گرتبوو بە پەناگەیەکی بەهێز ، ئەگەر من ئەوەندەی ( یوسف ) ( علیه السلام) لە زینداندا بمامایەوە ، وەلآمی بانگخوازەکەی پاشام دەدایەوە ).[٢]

٦)زانا ( إبن کثیر ) دەڵێت :- دەربارەی خێزانی ( لوط ) دەڵێن : لەگەڵ قەومەکەیدا ماوەتەوەو ، وەهەندێکی تر دەڵێن :- لەگەڵ مێردەکەی و هەردوو کچەکەیدا دەرچوون ، بەلآم کاتێك دەنگە گەورەو بەهێزەکەو تێکچونی شارەکەی بیست ، ئاوڕی دایەوە بەلای قەومەکەیدا و سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد لە کۆن و نوێدا ، و ووتی: ( وا قوماه ) ئای قەومەکەم ! ئینجا بەردێکی بەسەردا باری و پێوەی نوساو گەیاندی بە قەومەکەی لە کاتێکدا کەلەسەر دینی ئەوان بوو ، و هەروەها هاوکاریان بوو لەسەر ئەو کەسانەی کە بە میوانی هاتبوونە لای لوط ( علیه السلام ) وەك خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ

١- ( تفسير المنار ) ( ٨/ ٥٢١- ٥٢٢ ) بەدەستکاریەوە .

٢- ( بوخاری ) لە ( أحاديث الأنبياء ) و (مسلم ) لە ( الفضائل ) دا ڕیوایەتیان کردووە .

عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴾ ( التحريم /١٠ ) .

واتــه : خێزانــی نــوح و لــوط لــەکاروباری دینــدا خیانــەتیان کــردوو شــوێن پێغەمبــەران نەکەوتن ،مەبەسـت ئـەوە نییـە کـە ( فاحشة ) یـان کردبێـت ، ئـەوە دوور بوە لـەوان ، بەڕاسـتی خـوای گـەورە هـەرگیز بڕیـاری ئـەوا بـۆ پێغەمبـەری خۆی نادات کاری خراپەو ( فاحشة ) بکات ، وەك ( إبن عباس ) و کەسانی تر لە پێشین فەرمویانـە ، هـەرگیز خێزانـی پێغەمبـەران داوێـن پیسـیان نـەکردووە ، وهەر کەس پێچەوانەی ئەمە بڵێت ، ئەوە هەڵەی گەورەی کردووە

لـە چیرۆکی ( إفـك ) دا بوختانیـان هەڵبەسـت بـۆ ( عائیشـه ) ، کاتێـك پـاکی ( عائیشه ) دەرکـەوت ، کاتێك ئـەوەی خراپـەکاران ووتیان پێـی ، خـوای گـەورە گلــەیی لــە بــاوەڕداران کــردو ئامۆژگــاری کــردن و ئاگــاداری کردنــەوە پاشــان فەرمووی :- ﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللهِ عَظِيمٌ (١٥) وَلَوْلا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ ﴾ ( النور / ١٥- ١٦ ).

واتــە : ئــەوە بــۆ هــەر دەمــاو دەم قســە لــە زمــانی یــەکتر وەردەگــرن ( بــەبێ لێکۆڵینەوە ) کاتێك بە زمانتان شتێك دەڵێن کە هیچ ئاگاییتان دەربارەی نی یە ، ئێو وا دەزانـن ئـەو بوختانـە شـتێکی سـادەو ئاسـانە لە کاتێکدا لای خـوا زۆر گـەورەو ناقۆلایـە ، دەبـوو کاتێـك گوێتـان لـەو بوختانـە بـوو بتـان وتایـە : ئێمـە بۆمان نییە قسەی وا بکەین ، پاکی و بێگـەردی بۆخـوا ، ئـاخر ئـەوە بوهتـانێکی زۆر گەورەو ناقۆلایە ، پاکی و بێگـەردی بـۆ خـوا ئەگـەر خێزانـی پێغەمبەرەکـەی بەو جۆرە بێت .[١]

---

٢- صحيح قصص الأنبياء ل ( ١٧٠ – ١٧١ ).

## ﴿ چیرۆکی شوعەیب پێغەمبەر ( علیه السلام ) ﴾

خـوای گـەورە (شـوعەیب ) (علیـه السـلام ) ی بـۆ قـەومی ( مـدین ) نـارد , کەشارێکی دەوروبەری شام بوو , کەلە دوای ئەو ناوچەی ( حیجاز ) دێت , کە ئـەو شـارەبوو موسـا ( علیـه السـلام ) ڕووی تێکـرد پـاش کوشـتنی پیـاوە میسرییەکە ڕای جیاواز لەوەدا هەیە کە خەزووری موسا (علیه السلام ) بوویێت یـان نـا , بـەڵام بـۆ چـونی بـەهێزتر ئەوەیـە کـە ئـەو نـەبووە , بـەڵام بـەناوی پێغەمبەران و پیاو چاکانیانەوە ناو دەبران .

خەڵکی ( مدین ) بێباوەڕ بوون و ( الأیكة ) یان دەپەرست , وەك ئەوەی کە ( إبن كثير ) ووتویەتی : بریتی بووە لە دارستانێکی چڕ و پڕ لەدار , لەگەڵ بێ بـاوەڕ بوونیـان بـە خـوا کێشانەیشـیان لـە خـەڵکی کـەم دەکـردەوە , و تـەرازووەکانیان سـوك دەکـرد , ئینجـا شـوعەیب ( علیـه السـلام ) بەبانگـەوازی هـەموو پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی بـانگی کـردن , کـە خـوا بپەرسـتن , پاشـان ئاگـاداری کردنـەوە لـەوەی کەلەسـەری بـوون لەسـەر پێچـی و خراپـەکاری , و ئاگـاداری کردنـەوە لەسـزای خـوایی , خـوای گـەورە چـیرۆکی ژیـانی لەچـەند شوێنێکدا باس کردووە , بە ئاشکرا وادیارە کە لەدوای قەومی ( لـوط ) هـاتوون . ﴿ وَيَا قَوْمِ لاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴾ ( هود / ٨٩ )

واتـە : ( شـوعەیب ( علیـه السـلام ) ووتـی :- ئـەی قـەوم و خزمـانم نـاکۆکی و دژایـەتیتان لەگـەڵ منـدا واتـان لـێ نـەکات ( ئـەو ئـایین و بـیرو بـاوەڕەی لەلایـەن خواوە هێناومانە بەدرۆی بزانن ) , جا ئەو کاتە ئەوەی توشی هۆزی نوح و هود و صالح بوو , توشی ئێوەش ببێت , خۆ هۆزی (لوط ) لێتانەوە زۆر دور نی یە) ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو نزیکی یە لەڕووی کات و شوێنەوە بووە .

بانگەوازی شوعەیب ( علیه السلام ) :

خوای گەورە لە سورەتی ( الأعراف ) دا فەرموویەتی : - ﴿ وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٨٥) وَلاَ تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا وَاذْكُرُواْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلاً

فَكَثَّرَكُمْ وَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ (٨٦) وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ (٨٧) قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ (٨٨) قَدِ افْتَرَيْنَا عَلَى اللّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِي مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّانَا اللّهُ مِنْهَا وَمَا يَكُونُ لَنَا أَن نَّعُودَ فِيهَا إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللّهُ رَبُّنَا وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا عَلَى اللّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ (٨٩) وَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ لَئِنِ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْباً إِنَّكُمْ إِذاً لَّخَاسِرُونَ (٩٠) فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ (٩١) الَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا الَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا كَانُواْ هُمُ الْخَاسِرِينَ (٩٢) فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ ﴾(لأعراف / ٨٥- ٩٣ )

گومانی تیا نی یە کە پێغەمبەرانی خوا ( علیهم السلام ) دڵسۆزترینی کەس بوون بۆ خەڵکی , و پێشەنگی بانگخوازانی خوا بوون لە بانگ کردنی قەومەکانیاندا , چۆن ووتووێژ یان لەگەڵ کردن و نەرمیان نواندوە لەگەڵیاندا و ئارامیان گرتووە لە سەر نەزانی و بێمێشکی و ئازاریان . ( محمد ی کوڕی إسحاق ) دەڵێت :- شوعەیب کوڕی ( میکیل ) ی کوڕی ( یشجر ) ی کوڕی (مدین ) ی کوڕی ( إبراهیم ) ( علیه السلام ) بووە , ودایکی ( میکیل ) یش کچی لوط (علیه السلام ) بووە , و شوعەیب چاوەکانی نابینا بووە و پێشی ووتراوە

( خطیب الأنبیاء ) ووتاربێژی پێغەمبەران . ١ لەبانگەوازی شوعەیب (علیه السلام ) دا , دەردەکەوێت کە ئەو ژینگەیەی ئەوی تیابووە , فەسادو خراپەی تیا بڵاو بوو : لە هاوەڵ پەرستی و خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناحەق و ڕێگرتن لەبانگەوازی خوا و , لەگەڵ ئەوەشدا کەلەناو نازو نیعمەت و خۆشگوزەرانی دابوون , شوعەیب(علیه السلام ) دەستی کرد بەبانگەوازەکەی وەك هەموو

١/ الأعلام والمواقع في القرآن الكريم , ل (٥٥) .

پێغەمبەرانی تر , کە بانگەوازی خەڵك بوو بۆ یەکتاپەرستی , چونکە کاری پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان بریتی یە لە بەبەندەکردنی خەڵکی بۆ خوا . وەك ( ربحي کوڕی عامر ) دەڵێت : ( خوای گەورە ئێمەی ناردووە تاخەڵکی لە بەندایەتی بۆ خەڵك دەربکەن بۆ بەندایەتی کردنیان بۆ خوا , و لەناڕەحەتی دونیا بۆ فراوانی و لەستەمی دینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام ) .

پێغەمبەران شارەزاترین کەس بوون لە بانگەوازی خەڵکیدا بۆ لای خوا و لە پێشتریش بوون .

﴿ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ﴾ ( الأنعام /١٢٤ )

واتە:- خوازانایە بەو شوێن و دڵ و دەروونەی کە شایستەیە پەیامی خۆی تیادا بنێت , بەڕاستی ئەوە لەشوعیەب ( علیه السلام ) دابە ڕوونی و جوانی دەرکەوتووە , هەروەها هۆکاری هەمە جۆری بۆ بانگ کردنیان بەکارهێنا , جارێك نەهی خراپە و فەسادی لێ دەکردن و جارێك لەسزای خوایی ئاگاداری دەکردنەوە کە بەخراپەکارا گەیشتبوون لە نەتەوە پێشووەکان وەك قەومەکانی نوح و عاد و ثمود و قەومی لوط , و جارێك نازو نیعمەتی خوای یاد دەخستنەوە , کە چۆن پارێزگاری لێ بکەن و گوێڕایەڵی خوابن , و جارێك بانگ خوازانی ئاڕاستە کرد ئەگەر کەسانی دڵ ڕەقوو گوێ داخراو بێئاگایان بینی ڕووبکەنە خوا کە بوارو دەروی خەیر لەنێوان ئەوان و قەومەکەیاندا بکاتەوە , بۆ ئەوەش کۆتا ووتە ی بانگەوازەکەی بۆ خراپەکاران و بێباوەڕان بریتی بوو لە ﴿وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ ﴾( الأعرف/٩٣)

واتە : ئەی قەوم و عەشیرەتم , سوێند بەخوا بەڕاستی پەیامەکانی پەروەردگارم بەچاکی پێ ڕاگەیاندن و دڵسۆزیم لەگەڵ کردن , ئیتر من چۆن خەم بخۆم بۆ قەومێك کە بێباوەڕن .؟ خوای گەورە دەفەرمووێت :-

﴿ وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾(الأعرف ٨٥)

( الزمخشري ) دەڵێت :- بەشوعەیب ( علیه السلام ) دەوترا ( خطیب الأنبیاء ) لەبەر ئەوەی بەجوانی دەچوو بۆلای قەومەکەی , قەومەکەی ئەهلی

تەرازو بازی بوون ( قد جاء كم بيّنَةٌ مِن ربكم ) لەلایەن پەروەردگارتانەوە موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکراتان بۆ هات کەشایەت بوو لەسەر پێغەمبەرایەتی من ، پێویست بوو لەسەرتان کە باوەڕم پێ بهێنێت و دەست بگرن بەوەی کە من فەرمانتان پێ دەکەم و خۆیشتان بپارێزن لەوەی کە نەهیتان لێ دەکەم ، تەرازو کێشانە بەتەواوی بەکاربهێنن و کێشی سوك مەکەنەوە ، ئەگەر ووتت : کامە موعجیزەکەی بوە ؟ دەڵێین :- بەڕاستی زانراوەکە ئەو موعجیزەی هەیە لەبەرئەم ئایەتە :- ﴿ قد جاءكم بيّنَةٌ مِن ربّكم ﴾ بەڕاستی دەبێت پێغەمبەران نیشانەو موعجیزەیان هەبێت کەشایەتی لەسەربدات و بەڕاست بناسرێت و جێگەی باوەڕبێت ، ئەگەر نا ئەوا بانگەوازەکەی تەواو نابێت . بەڵگەیەش لەسەر ئەمە فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ( ﷺ ) کەدەفەرمووێت :- ( مامِن الأنبياء نبي إلاّأعطى مِن الآيات..... ) [1]

واتە :- ( هیچ پێغەمبەرێك نی یە کە خوای گەورە چەند نیشانە یەکی پێ نە دابێت ..... ) و ئاگادارکەرەوەو هەواڵ گەیەنەربوون ، بێ ئەوەی موعجیزەکە یشی لەقورئاندا باسی کرابێت ، وەك ئەوەی کە زۆرێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باسنەکراون .[2]

﴿ فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ ﴾ ( الأعراف / ٨٥ )

واتە : لەبەرئەوەی بەڵگە و نیشانەی ئاشکراهەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی من ، کەواتە دەبێت گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانەکانم کە پێوانەو کێشانەکانتان ڕێك و ڕاست بکەن و فێڵ ی تیانەکەن ، کەم کوڕی و زیان مەگەیەنن بە خەڵکی لەشتە کانیاندا .

( القرطبي ) دەڵێت : ووشەی ( البخس ) واتە : کەم کردنەوە کەلە کاڵاو کەل و پەلدا دەبێت و بە عەیبدارکردنی و کەم نرخ کردنی ، یان فێڵ کردن لە نرخە

١/ ( بوخاری ) بە ژمارەی ( ٨/ ٦١٩ ) ڕیوایەتی کردوە .
٢/ الكشاف ( ٢/ ١٢٧ )

کەیدا کە زیاد بۆ خۆیان و کە میش بۆ خەڵکی لە کێشانەدا , کە هەردوکی خواردنی ماڵە بەناحەق , کە لەنەتەوە پێشوەکان و لەدواتریشدا لە سەرزمانی پێغەمبەرانەوە نەهی لێ کراوە .﴿ ولاتُفسيدوا في الأرضِ بَعْدَ إصلاحِها ﴾ خراپە لە ناو زەویدا بڵاو مەکەنەوە بەبێ باوەڕی و دەست بڕین و کەم کردنەوەی پێوانە و کێشانە و بڵاوکردنەوەی گوناهوو تاوان دوای ئەوەی کە زەوی چاك و پاك کراوە و هەرزانی و ئاوەدانی و دادپەروەری و کشتوکاڵی هەمە جۆری تیایە . هەموو پێغەمبەرێك کە بۆ قەومەکانی نێردراوە بۆ چاك کردنی باری ژیانی ئەوان بووە .﴿ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ( الأعراف / ٨٥ )

خاوەنی ( المنار ) دەڵێت : – ئامارژەیە بۆ ئەوانەی لەپێشتر باسکراون لەفەرمان و نەهی , واتە :– ئەوانە بۆتان چاکترن لەدین و دنیاتاندا , تەکلیفی زۆرلێ کردنی تیانیە , پەروەردگارتان تەنها فەرمانی کاری بەسودتان پێ دەکات , ونەهی شتانێکیشتان لێ دەکەن کەزیانە بۆتان , لەهەموو حاڵێکدا سودبەخش دەبێت بۆتان ئەگەر بیویستایە باری گران دەکردن بەڵام بەڕەحمە بۆتان و ئەو کارەناکات .[1]

﴿ وَلاَ تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَاطٍ ﴾ ( الأعراف / ٨٦ )

( الشوكاني ) دەڵێت : ووشەی ( الصراط ) واتە: ڕێگا واتە : لەسەرهیچ ڕێگایەك دامەنیشن , هەڕەشەی سزادان لەخەڵکی بکەن , دەڵێن : ئەوان لەسەر هەموو ڕێگایەك دادەنیشتن بۆ شوعەیب ( عليه السلام ) و هەڕەشە یان دەکرد , هەرکەس بیویستایە بێت بۆلای , و قوڕەیش بەرامبەر بەپێغەمبەر (ﷺ) ئەو کارەیان دەکرد کە ( إبن عباس و قتادة و مجاهد و السّدي ) و کەسانی تر ووتویانە .﴿ وتبغونها عِوَجاً ﴾ واتە :– دەتانەوێت ڕێگاکەلارو پێچاوپێچ بێت و ڕێك و ڕاست نەبێت , کەوایان دەڕوانی دینی خوای ڕێك و ڕاست نی یە , وەك گومڕایانی ئەم سەردەمە دەڵێن :– ( ئەم دینە بەسەر عەقڵدا جێ بەجێ نابێت )

---

١/ ( تفسير المنار ) ( ٨/ ٥٢٧ ) بەدەستکاریەوە .





چونکە لەگەڵ ئارەزوی خراپەکاری ئەواندا بەرێوە ناچێت .[1] ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلاً فَكَثَّرَكُمْ وَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴾

( الأعـراف / ٨٦ ) . بـیری ئەوکاتەبکەنـەوە کـەئێوە کـەم بـوون و ئینجـا خـوا زۆری کـردن , وەك لـە ( إبـن عبـاس ) ەوە ئەگێڕنـەوە : کـە ژمارەیـان کـەم بـووە ئینجا خـوا پیـت و فـەڕی خستە نـاو ڕۆڵـەو نـەوەکانیان و زۆریکـرد نـوو پـەرەی پێدان , کەواتە سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەپەرستن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی , سەرنج بدەن , ئایـە چۆن بـوو دوا ڕۆژی خراپـەکاران وەك گەلەکـەی ( لـوط ) و ( صالح ) و ئەوانی تر, کەخوای گەورە بەهۆی خراپەی خۆیانـەوە لـەناوی بـردن , کەواتە لەوانە پەند وەربگرن , ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ ﴾ ( الاعراف / ٨٧) .

( محمـد علـی الصـابونی ) دەڵێـت :- واتـە ئەگـەر دەستەیەك باوەڕیـان بـە مـن هێنابێت و لەوەدا کەبۆم هێناون و دەستەیەکیش کە باوەڕی پێ نەهێنابم , ئەوا ئارام بگرن هـەتا خـوا بـەبڕیاری دادپەروەرانـەی خـۆی لەیـەکمان جیادەکاتـەوە , بەڕاستی هەرخۆی باشترین بڕیار دەرو جیاکەرەوەیە .[2]

﴿ قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ ﴾ ( الاعراف / ٨٨) .

( إبن کثیر ) دەڵێـت :- ئەمـە هـەواڵێك بـوو لەلایـەن خـواوە کەپێغەمبـەر شـعیب ( علیه السلام ) ئاڕاستە کـافرانی کـرد کـە هەڕەشـەیان لـەو وبـاوەڕداران کردبـوو کەنەفیان بکەن لە شارەکەیان ناڕەحەتیان بکەن کەلە ئـاین و دەسـتووری خۆیـان هەڵگەڕێنەوەو بچنە ناو ئەوان , ئەمەگفتوگۆ بوو لە گـەڵ پێغەمبـەردا , مەبەسـت شوێن کەوتوەکانیشـی بووکـە لەسـەرئاین و دەسـتوری ئـەو بـوون , وئایـەتی :-

١- ( صفوة التفاسير ) ( ١/ ٤٤٧ )
٢- ( صفوة التفاسير ) ( ١/ ٤٤٧ )

﴿ اولو كنّا كرهينَ ﴾ واتە :- یان كەئێوە ئەنجامدەری ئەو كارانەن لەگەڵ ئەوەشدا كە ئێمە پێمان ناخۆشەو ناڕەحەتین بانگمان دەكەن بۆی , ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئاین و دەستوری ئێوە و بێینە ناوتان و لەگەڵتان بین لەسەر ئەوكارانەی تیایدان , ئەوا بەڕاستی كارێكی نالەبار وگەورەمان بەرامبەر خوا ئەنجامداوە لە هاوەڵ داناندا بۆخوا .[1]

﴿ قَدِ افْتَرَيْنَا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِي مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّانَا اللَّهُ مِنْهَا وَمَا يَكُونُ لَنَا أَن نَّعُودَ فِيهَا إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ رَبُّنَا وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ ﴾ (الأعراف ٨٩) . واتە :- بەڕاستی ئێمە درۆمان بەناوی خواوە هەڵ بەستووە , ئەگەر پەشیمان ببینەوە و بگەڕێینەوە ناو ئاینەكەی ئێوە , دوای ئەوەی كە خوا لە دەست ئەو ( خورافاتە ) ڕزگاری كردین , ئێمە بۆمان نیە بگەڕێینەوە بۆ ناوئاینی ئێوە , مەگەر ویستی خودای پەروەردگارمانی لەسەر بێت , زانست و زانیاری پەروەردگارمان فراوانە و هەموشتێكی گرتۆتەوە, هەر بەخوا پشت و پەنامان بەستووە, پەروەردگارا خۆت دادوەرییكە لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی لەنێوان ئێمەو قەوم و گەلماندا , چونكە تۆچاكترینی دادوەرانی.[2]

﴿ وَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ لَئِنِ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَاسِرُونَ (٩٠) فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ (٩١) الَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا الَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا ﴾ ( الأعراف /٩٠-٩٢ )

واتە :- دەستەو كۆمەڵی پیاوماقوڵ و گەورەكانی گەلەكە بڕوایان نەهێنا بوو وتیان :- سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە پەیڕەوی شوعەیب ( علیه السلام ) بكەن و شوێنی بكەون و دەرچن لەئاین و دەستووری باوك و باپیرانتان , بێگومان ئێوە زیان مەند دەبن , ئینجا بەهۆی ئەوەوە بومەلەرزە گرتنی و لێی دان , بومە

٣- تفسیر القران العظیم ( ٢/ ٢٢٢ )
٤- تەفسیری ئاسان . ل ( ١٦٢ )

لەرزەی بەتین و لەریشە هێنەر , بەهۆی ئەوەوە مردنیان بۆهاتوو لە جێگاو ولاتی خۆیان دا کەوتن بەبێ جولە , لە سورەتی ( هود ) دا دەفەرموێت :- دەنگ و پیاهەڵشاخان گرتنی و لیێ دان , رەنگە یەکەم جار دەنگ پیاهەڵشاخانەکە بووبێت ئینجا بومەلەرزە . ئەوانەی کەبڕوایان بەشوعەیب نەهێناو بەدرۆزنیان دانا بەجۆرێك لەناوبران کەنیشتەجێ نەبوون لەو ولاتەدا تیایدا ئەژیان کەواتە دەرکراو ئەوانە بوون کەجارێکی تر هات و چۆیان بەو شارو ولاتەدانەبێت . ئەوانەی کەبڕوایان نەهێنا بەشوعەیب و بەدرۆزنیان دانا , هەرئەوانە زیان بارو خەسارەت مەندن نەك بڕواداران و شوێن کەوتووانی شوعەیب . خوای گەورە لەسورەتی( هود)دا فەرمووی :-

﴿ وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مَّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴾ ( هود /٩٤ ) .

واتە :- کاتێك فەرمانی ئێمە هات بۆلەناو بردنیان , شوعەیب و ئەوانەی بڕوایان هێنا بوو لەگەڵیدا بەهۆی بەزەیی و لوتفی خۆمان ڕزگارمان کردن و دەنگ و نرکەی تیاچوون تاوانکار و بێبڕواکانی گرتەوەو , جاهەموویان لەشوێن و جێگەی خۆیاندا تیاچوون و بەچۆکدا هاتن لەکاتی بەرەبەیاندا .

﴿ فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ ﴾ ( الاعراف / ٩٣ ) .

( الزمخشري ) دەڵێت :- ( الآسى ) واتە: ئەوپەڕی غەمباری و ناڕەحەتی , داخووخەفەتی زۆر بوو لەسەر قەومەکەی , پاشان ئینکاری نەفسی خۆیکردوو ووتی :- چۆن دەبێت داخوخەفەتی لەسەر قەومێك زۆربێت لەبەر ئەوەی ئەهلی ئەوەنین خەفەتییان بۆبخۆیت بەهۆی کوفریانەوە ئەوەی توشیان هات شایستەی خۆیان بوو, وەرێپێدراوە کەبڵێت :- بەڕاستی من بێتاوانم لەسەربڕین , لەگەیاندنی پەیامی خوایی و ئامۆژگاری کردن و ئاگادار کردنەوە

لەوەی کەتوشتان دەهات بەڵام گوێتان لەقسەکانی من نەگرت , و باوەڕتان پێنەکردم , ئیتر چۆن داخ و خەفەتتان بۆ هەڵکێشم , چونکە شیاوی نین .[1]

خاوەنی ( الظلال ) دەڵێت :- بەڕاستی شوعەیب لەسەر ئاین و دەستوری خۆی بوو, ئەوانیش لەسەر ئاین و دەستوری خۆیان , ئەو نەتەوەیەك بوون ئەوانیش نەتەوەو ئومەت بوون , بەڵام پەیوەندی ڕەچەڵەك و قەومایەتی هیچ دەورێکی لەم دینە دا نیە و هیچ کێشێکی نیە لەتەرازوی خوادا , بەڵکو تێکەڵاویەك باقی دەبێت , بریتی یە لەتێکەڵاوی دینداری , وپەیوەندی توندو تۆڵ لە نێوان خەڵکی دا , بێگومان ئەوەش تەنها لە پەیوەندی بەهێزی خوایی دا دەبێت .[2]

## ﴿ وانە و پەندە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) پاش ئەوەی خوای گەورە لەسورەتی ( الأعراف ) دا چیرۆکی( نوح و هود و صالح و لوط و شعیب ) ی بۆ گێڕاینەوە کەچەندین پەند و ئامۆژگاری تیا بوو , کە زۆریان هاوبەش بوون لەیاخی بوونیان و هەڵگەڕانەوەیان لە پێغەمبەران , لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەران ( علیهم السلام ) ئەو پەڕی توانایان نواند و ئاگاداریان کردن و بیانویان بڕین , کەچی ئەوان تەنها یاخی دەبوون و دور دەکەوتنەوە , پاشان ئازارو سزای خوایی بۆ سەرکافران دابەزی , بوو بە پەند بۆ پەند وەرگران , و یادەوەریش بۆ باوەڕدارەکانی خوا , خوای گەورە ئەم چیرۆکەی بەچەند ئایەتێك کۆتایی هێنا کە هەمووی پەند و ئامۆژگاری و حیکمەتی بەنرخن , هێناونی تا ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت لێیان ڕابمێنێت و وورد بێتەوە , و تا ئێمەیش هەلوێستە لەبەردەم فەزل و گەورەیی خوادا بکەین , کەسزای خوا هات ناگەڕێتەوە لەسەر قەومی کافران .کەمانای

١- ( الكشاف ) ( ٢/ ١٣١ )
٢- ( فيي ظلال القران ) ( ٣ / ١٣٢٢ ) .

ئایەتــەکانیش بــە کــوردی ئەمەیــە :- ( لــە هــیچ شــارو وولآتێکــدا هــیچ پێغەمبـەرێکمان نـەناردووە ( کـە خەڵکەکـەی بـەدرۆیان زانیبێـت و بـە گوێیـان نەکردبێت ) مەگەر خەڵکی ئەو شوێنەمان بەتەنگانەو نەخۆشی گیرۆدە کردووە بۆ ئەوەی ( ڕاچڵە کێن و تێفکرن) ودەست بکەن بەنزاو پاڕانەوە و لالآنـەوە (٩٤ ) پاشـان شـوێنی تەنگانـەو ناخۆشـی یەکـەمان گـۆڕی بەشـوێنی خۆشـی و کامەرانی , هەتا بەتەواوی لە هەموو ڕویەکەوە زیادیان کردو کەوتنە خۆشی یەوە ( وایان لێهات کە خۆشی و ناخۆشی بەتاقی کردنەوە دادەنێن ) , ووتیان : بەڕاستی ناخۆشی و خۆشـی توشی بـاوك و باپیرانمـان بـووە ( ئەمـە شتێکی ئاسایی یە ) ! ئێمەش کو ت و پڕ گرتمانن لەکاتێکدا ئەوان هەستیان بەخۆیان نەدەکرد , لە ناومان بردن و تـەخت و تاراجیانمـان تێکدا (٩٥ ) ئەگـەر خـەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە , ئـەوا بێگومـان ئێمـە دەرگای فەڕو بەرەکەتی ئاسمان و زەویمان لەسەر دەکردنەوە , بە لآم ئەوان کە پـەیام و پێغـە مبـەرانی ئێمـەیان بـە درۆ زانـی , ئێمـەیش بـە هـۆی ئـەو کـارو کردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن (٩٦ ) ئایا خەڵکی شارەکان لـەوە دڵنیـان و ناترسـن کـە تۆڵـەی ئێمـە بێـت بۆیـان لـە شـەودا لـە کاتێکـدا کـە ئەوان نوستوون ؟! (٩٧ ) ئایا خەڵکی شارەکان دڵنیاشن و ناترسن لـەوەی کە تۆڵەی ئێمە بێت بۆیان لە چێشتەنگاودا , لە کاتێکدا ئەوان سەرگەرمی یاری و گەمـەن ؟! (٩٨ ) ئایـا دڵنیـا و بێبـاك بـوون لـە نەخشـەو پلانـی خـوا ( لەسـەر ئاستی تاك و کۆمەڵ یان لەسەر ئاستی حکومەت و گەلان )؟! جا کـەس بێبـاك نابێت لەنەخشەو پلانی خوا جگە لەقەومی خەسارەت مەندان نـەبێت . (٩٩) ئایا دەرنەکـەوت بـۆ ئەوانـەی دێن بەدوای دەستەو چینەکانی پێش خۆیـان , پاش لەناوچونی ئەوانەی کە تیایدا نیشتە جێ بوون , ئەگـەر بمـان ویسـتایە , ئـەوە بـەهۆی گوناهەکانیانـەوە توشمـان دەکـردن ( وەك چـۆن خـەڵکانی پـێش خۆیانمان لە ناوبرد ) و مۆرمان دەنا بەسەر دڵە کانیاندا , جا ئـەوان نایبیسـتن (١٠٠) ئـەی محمـد (ﷺ) ئـەو شـارو ناوچـانە هەنـدێك لـە هـەواڵ و بەسـەر هاتەکانیانت بۆ دەگێڕینەوە , سوێند بە خوا بێگومان پێغەمبەرانیان بۆ هـات , هاوڕێ لەگەڵ چەندەها موعجیزە دا , ئیتر وەنـەبێت ئەوانـە باوەڕیـان هێنابێـت بەوەی کە پێشتر باوەڕیان پێی نەبوو , ئابەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر

دڵی بێ باوەڕاندا (١٠١) بەشی زۆری ئەو خەڵکە سەرگەردانەمان دەست نەکەوت کە پەیمان شکێن نەبن و بەڕاستی زۆربەی ئەوانەمان بەدەرچوون لە ئاینی خوا دەست کەوت . (١٠٢ ) [1]

٢) ( إبن كثير ) دەڵێت :- هەرکەس وای لێك دابێتەوە لە زانایانی تەفسیر وەك ( قتادة و کەسانی تر ) کە ( أصحاب الأيكة ) نەتەوەیەکی تر بوون بێجگە لە خەڵکی ( مدين ) ئەوە قسەی لاوازە , بەڵکو پاڵپشتی قسەکانیان دوو شتە : یەکەمیان : - خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ كَذَّبَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ (١٧٦) إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ ﴾ (الشعراء / ١٧٦ -١٧٧ ) نەیفەرموە ( اخوهم ) برایان , وەك فەرموی : ﴿وإلى مَدْيَنَ اخاهُمْ شَعيْباً ﴾( الأعراف / ٨٥ ) .

دووەم :- باسی سزاکەیانی کرد بە ( يوم الظلة ) و باسی ئەوانیشی کرد بە ( بومەلەرزە یان دەنگی گەورەو بەهێز) . وەلاّم بۆ یەکەم : باسی ( برا ) ی نەکرد لەدوای ئایەتی ﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ ﴾

( الشعراء / ١٧٦ ) . چونکە بەبەندایەتی کردن بۆ ( الأيكة ) باسی کردن , باسی برای نەخستە پاڵیان کاتێك پاڵی دانە پاڵ قەبیلە , ئیتر ئەوە گونجا و شیا کە شوعەیب بە برا باسی کردن .

٣) ( محمد متولي الشعراوي ) دەڵێت :- بۆ ئەوەی هەرکەس مافی خۆی وەرگرێت و کەس مافی کەس نەخوات, دەبێت تەرازوو هەبێت بۆ هەموو هەنگاوەکانی ژیان , و تا هەموو جیهان ستەم نەکەن , کە گرانی و ناڕەحەتی بلاّو ببێتەوە و ماڵ و سەروەتی لاوازەکان نەخورێت , چونکە ژیان هەمووی بەتەرازووی داد بەڕێوە دەچێت , مامەڵەی خەڵك گشتی بە دەوڵە مەندوو هەژارو نەزان و زانایانەوە , دەبێت بە تەرازوو بەڕێوە بچێت و تەواو بێت, ئەگەر ئینسان قەناعەتی کرد , کە مافی خۆی بەتەواوی وەرگرتوە , ئەوا کۆمەڵگا بەهەموو ئەوانەی تیایەتی ڕێك و پێك وداد پەروەر بووە , کێشانەو

---

١/ تەفسیری ئاسان ل ( ١٦٢ - ١٦٣ )

پێوانە , بەزیادو بەکەمیش دەکرێت . لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی :-
﴿ وَلاَ تَنقُصُواْ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِنِّيَ أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ (٨٤)وَيَا قَوْمِ أَوْفُواْ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ(٨٥ ) ﴾

( هود / ٨٤ -٨٥ ) واتە : شوعەیب بە قەومەکەی ووت :- کەم و کورتی مەکەن لەکێشانەو پێوانەدا بەڕاستی من بەچاك دەتابینم و ڕزق و ڕۆزیتان باشە و لەخۆشیدان , بێگومان من دەترسم ئەگەر لە فەرمانی خوا دەرچن , ئێوە توشی سزای ڕۆژێك ببن کە گەمارۆتان بدات و لێی ڕزگار نەبن , ئەی قەوموو خزمەکانم با پێوان و کێشانەتان تێر و تەواوبێت و بە داد پەروەرانە ئەنجامی بدەن , شت و مەکی خەڵکی کەم نرخ مەکەن و ( فێڵیان لێمەکەن ) و خراپەکاری مەکەن لەزەویداو تۆوی خراپ مەچێنن .

٤)زانا ( السعدي ) ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەڵێت : - لە چیرۆکی ( شعیب ) دا کۆمەڵێك سوودو پەند هەن:-

ا - کەم کردنەوە لە کێشانەو پێوانەدا بەتایبەت , کەم کردنەوەی کاڵاو شتوو مەکی خەڵکی بە گشتی , لە گەورەترینی تاوانەکانن کەسزای دونیا و قیامەت بۆ خاوەنەکەی دەهێنێت .

ب- هەروەها بەڵگەی تیایە کەنوێژ هۆکارە بۆ ئەنجام دانی کاری خەیر و دەست گرتنەوە لە خراپەکان و ئامۆژگاری بۆ بەندەکانی خوا , وەکافران ئەمانەیان باش زانی بوو , بەوەی کەبەشوعەیبیان ووت :-
﴿ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاء إِنَّكَ لأَنتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ ﴾( هود / ٨٧ )

واتە : ( ئەی شوعەیب : ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات کە ئێمە واز بهێنین لەوەی باوك و باپیرانمان پەرستویانن , یاخود لەماڵ و سامانماندا , بە ئارەزووی خۆمان چیمان بوێت بیکەین و بەڕاستی تۆ زۆر هێمن و خاوەن ژیریت ) خوای گەورە فەرمویەتی :- ﴿إِنَّ الصَّلاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ ﴾ ( العنكبوت / ٤٥ )

لێرە دا حیکمەت و بەزەیی و ڕەحمەتی خوا دەردەکەوێت کەچەند نوێژێکی بەدوای یەکدا لەشەوو ڕۆژدا لەسەر فەرز کردووین بەبەردەوامی لەبەر گەورەیی

و سـودی زۆری شـوێنەواره جوانـەکانی , بـۆ ئەمـەش خـوای گـەوره سوپاسـی تەواوی دەوێت .

ج- کەسی دڵسۆزوو ئامۆژگاریکار بۆ خەڵکی , ئەو کەسەیە فەرمان و نەهیان دەدات بەسەردا , کەخە ڵکی بەتەواوی لێی وەربگرن , ئەگەر فەرمانی بەشتێك پیێ کردن , ئەو یەکەم کەس بێت ئەنجامی بدات , و ئەگەر نەهیی شتێکیشی لیێ کـردن , ئـەو یەکـەم کەسـبێت وازی لـیێ بهێنێـت . لەبـەر قسـەکەی شـوعەیب کەفەرمووی :

﴿ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ﴾ ( هود / ٨٨ )

واتـە: منـیش نامـەوێت قەدەغـەی شتێکتان لـیێ بکـەم , کەچـی خـۆم وەك ئێـوە نەکەم .

﴿ چیرۆکی مانگاکەی ( بنی إسرائیل ) نەوەی ئیسرائیل ﴾

خوای گەوره فەرمویەتی :﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ (٦٧) قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ (٦٨) قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ (٦٩) قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ (٧٠) قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ (٧١) وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٧٢) فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾

کورتەی چیرۆکەکە :-

خوای گەوره ویستی ئـەم چیرۆکەمان دەربـارەی هـەواڵی نـەوەی ئیسـرائیل بۆ بگێڕێتەوه ، دەربارەی ڕەقـی و تونـدی و لـە ئاین دەرچـونیان ، کـە چـۆن شتیان لەسـەر نەفسـی خۆیـان بـە توونـد گرتـووه ، هـەر بـەو جـۆرەش خـوای گـەوره لەسەری توونـد کردونەتەوه ، تا بزانین باشـترین خـەیرو چاکەکان هـەنگاو نـانی

خێرایە بۆ جێ بە جێ کردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ، بەبێ مناقەشەو قوڵ بوونەوەی زۆر ، کە ئەمانە دەبنە هۆی دروستبوونی بڕیاری تووند ، ئەوەش خوای گەورە نەهی لێ کردووە ، کە ئومەتەکەی پرسیاری زۆر بکەن ، وەك فەرموویەتی : - ( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار لە هەندێك شت مەکەن ، کە ئەگەر بۆتان ئاشکرا بکرێت سەغڵەتتان دەکات ، خۆ ئەگەر پرسیار دەربارەیان بکەن ، لەکاتی دابەزاندنی قورئاندا ئەوە بۆتان ئاشکرا دەکرێت ، خوا چاوپۆشی لێ کردوون و ( باسی نەکردون ) خوایش لێخۆشبوو بە حیلم و حەوسەڵەیە (١٠١) بێگومان کەسانێك پێش ئێوە پرسیاریان دەربارەیان کرد ، پاشان کە بۆیان ڕوون دەبۆیەوە بڕوایان پێ نەدەکرد و پێی بێ باوەڕ بوون ( کەواتە ئێوە وا مەبن ) (المائدە / ١٠١ - ١٠٢)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( وازم لێ بهێنن لە پرسیارکردن لەوەدا کە بۆم جێهێشتوون ، بەڕاستی ئەوانەی کە پێش ئێوە لەناوچوون ، بەهۆی پرسیارکردنی زۆر و جیاوازیان لەسەر پێغەمبەرانیان بووە ، ئەگەر فەرمانم پێ کردن بەشتێك ، ئەوا وەری بگرن ئەوەندەی کە دەتوانن ، و ئەگەر نەهی شتێکیشم لێ کردن وازی لێ بهێنن ).[١]

ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەم چیرۆکە دەکەن ، لەسەر شێوازی قورئانی تایبەت هاتوون ، کە پێشتر دەربارەی نەهاتوەو پەیوەندی پێوە نەبووە ، و زانایانی مێژویش پابەند نەبوون بە ڕێکخستنی کاتەکەیەوە ، ناوەڕۆکی چیرۆکەکە فیکری ئینسان دەجوڵێنێت بۆ تێڕوانین و نەفسی دەهەژێنێت ، و لە چیرۆکەکانی نەوەی ئیسرائیلدا ، ڕەچاوی ئەوە کراوە کە جۆرەها نازو نیعمەت و بەخششیان لەلایەن خواوە پێ دراوە ، و نموونەش لەسەر کافر بوون و دەرچوون لە دینی پێ هێنراوەتەوە ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانە شدا بەسزاکانی خوا پەندو عیبرەتیان وەرنەگرتووە , و بەچاکەو خراپە تاقی کراونەتەوە ,

---

١/ ( أحمد و مسلم و النسائي و إبن ماجة ) لە ( أبي هريرة ) هوە هێناویانە

دەبوو چۆن بونایە ئەگەر دوای هەموو شوێنەواری سزایەك تەو بەیان بکردایە , و لەشوێنەواری هەر تەو بەیەکیشدا نیعەتێکی تریان پێ بدرایە , بەلآم ئەوان پاش هەموو سزایەك گەڕاونەتەوە سەر لادان و کوفری خۆیان [1]

لەناو نەوەی ئیسرائیلدا تاوانی کوشتنێك ڕویدا , لەسەر دەمی موسادا , نەزانرا بکوژەکەی کێ بوو , هەریەکەو پارێزگاری لەخۆی دەکرد لەو مەسەلە یەدا , بەجۆرێك کە هەندێکیان هەندێکی تریان تۆمەتباردەکرد , کە ئەو بکوژەکەیە , فەرمانەکە گەیەندرایە لای موسا ( علیه السلام ) , تابڕیار لەنێوانیاندا بدات .

خوای گەورەیش ویستی بکوژەکە دەربخات بۆیان , بەهۆی موعجیزەیەکی ماددی هەستپێکراوە , خوای گەورە وەحی کرد بۆ موسا ( علیه السلام ) کەفەرمانیان پێ بکات بە سەربڕینی مانگایەك ! ئاخۆ چ مانگایەك بێت ؟! بەبێ دیاری کردنی سیفەتەکانی , ئەگەر هەرمانگایەك بگرن و بیهێنن و سەری ببڕن , ئەوا فەرمانەکەیان جێ بەجێ کردوەو کاری واجبیان ئەنجام داوە !

بەلآم سروشتی یەهودا وایە سستی دەنوێنن و مناقەشە دەکەن لەجێ بەجێ کردنەکەدا و ئەوە ڕەتدەکەنەوە , پرسیاریان کرد لە موسا لەتەمەنی مانگاکە , ئەویش ووتی :- نەبچووك بێت و نەگەورە . بەڵکو لەتەمەندا مام ناوەند بێت .

پاشان پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ڕەنگەکەی , فەرمووی مانگایەکی ڕەنگ زەردی تۆخ وتێربێت , تەماشاکەران دڵ خۆش بکات .پاشان پرسیاریان لێ کرد , چەند کاری کردبێت ؟ فەرمووی :- مانگایەك بێت لای خاوەنەکەی خۆشەویست بێت , و لەکێڵگەو کێلآندا کارنەکات و ئاودێری کشتوکاڵیشی پێ نەکەن . لەکۆتاییدا :- سەریان بڕی , هەرچەندە خەریك بوو ئەو کارەیش نەکەن

پاشان موسا ( علیه السلام ) فەرمانی پێکردن , کەپارچەیەك لەلەشی مانگا سەربڕاوەکە بدەن بەجەستەی کوژراوەکەدا . ئەوانیش ئەو کارەیان کرد , خوای

---

١/ ( تفسير القران الحكيم ) ( ١/ ٣٤٥- ٣٤٦ ) بەکورتی .

گەورەیش کوژراوەکەی زیندوکردەوە , و ڕۆح بۆ جەستەی گەڕایەوە , هەواڵی لەسەربکوژەکەی دا . ووتی : فلأنە کەس کوشتمی .

پاشان مرد . ئیتر ئەوەی ئیسرائیل تووشی سەرسوڕمان هاتن , و ئەوەی کەبینیان لایان زۆر سەیربوو .[1] خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً ﴾ ( البقره / ٦٧ )

موسا ( علیه السلام ) بەقەومەکەی ووت :- خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون مانگایەك سەربڕن .موسا سروشتی قەومەکەی دەزانێت , کە شت دوادەخەن لەجێ بەجێ کردندا , و دەیانەوێت فێڵ و تەڵەکە بکەن , لەبەر ئەوە فەرمانەکەی پاڵ دایە پاڵ خوا , ئەگەر پاڵی بدایەتە پاڵ خۆی ڕەنگە مناقەشە یان بکردایە و ڕەتیان بکردایەتەوە , لەگەڵ ئەوەی پابەند بوون بەفەرمانی پێغەمبەرەوە واجبە , چونکە فەرمان ناکات بەشتێك لەلایەن خۆیەوە , بەڵکو لەلایەن خواوەیە , گوێڕایەڵی ئەو گوێڕایەڵی خوایە .

قەومەکە پێویستیان بەوەهەیە کە مانگایەك سەربڕن تا بکوژێکی پێ بناسنەوە , لەگەڵ ئەمەدا خوای گەورە سیفەتی دیاری کراوی ئەو مانگایەی بۆ ڕوون نەکردنەوە , ڕەنگە ئەگەر دیاریکراو بوایە دوا بکەوتایە لەکاتی پێویست , ئەوەش ڕێپێدراونە بووە .

﴿ قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾ ( البقره / ٦٧ ).

واتە : بە مووسایان ووت : ئایا تۆ گاڵتەمان پێ دەکەیت ؟

وەلأمی موسا بۆ ئەوبێ مێشکی و گاڵتە جاڕی یەی ئەوان بریتی بوو لەوەی کە پەنا بگرێت بە خوا ، و بە نەرمی وەلأمیان بداتەوە ، کە بۆیان ڕوون بکاتەوە ، ئەوەی کە ئەوان گومانی پێ دەبەن ، تەنها بۆ کەسێك دەگونجێت کە نەفام بێت بەرامبەر قودرەتی خوا .

لەوەلأمیاندا ووتی :- ( من پەنا دەگرم بەخوا ئەگەر یەکێك بم لە نەفامان ) .

---

٢/ ( مع قصص السابقین فی القران ) ل ( ٥٧- ٥٨ )





وایان لێکدایەوە فەرمانی خوا جۆرێکە لە گاڵتەجاڕی ، و واگومانیان دەبرد کە موسا بەم داواکاریە دەیەوێت لە مەسەلە بنەڕەتی یەکانی خۆیان دوریان خاتەوە و سەرقاڵیان بکات .

﴿ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ ﴾ (البقره / ٦٨ )) .

واتە :- قەومەکەی وتیان : ئەی موسا لە پەروەردگارت داوا بکە بۆمان ڕوون بکاتەوە کە ئەو مانگایە کامەیە ؟ و سیفەتەکانی چۆنن ؟ ئینجا مووسا ووتی : پەروەردگار دەفەرموێت : ئەو مانگایە پیر نەبێت و ( پارێن )یش نەبێت ، بەڵکو لە تەمەندا مام ناوەند بێت ،ئینجا ئێوەش ئەو کارو فەرمانە ئەنجام بدەن کە پەروەردگاتان فەرمانی پێ کردوون ، و کەللە ڕەقی و توندی پیشان مەدەن ، چونکە خوایش لەسەرتان توند دەکاتەوە ( الدکتور . صلاح عبدالفتاح الخالدی) دەڵێت :- باشترین گۆشتی حەیوان و بەتامترینیان و چاکترینیان بۆ خواردن ئەوەیە کەتەمەنی مام ناوەندی بێت ، چونکە گۆشتی حەیوانی تەمەن بچووك کە لەسەرەتای گەشەکردندایە ، مادەی خۆراکی بە سودی کەمە ، و گۆشتی حەیوانی تەمەن گەورەیش جیر و ووشك دەبێت ، وە هەندێك لە سودە خۆراکیەکانی لەدەستداوە .[1]

دەربارەی ئایەتی : ( فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ ) زانا ( الالوسی ) دەڵێت : واتە : لەسەربڕینی مانگاکەدا ، ئیتر پرسیار دوبارەمەکەنەوە ، و کەللەڕەقی مەنوێنن .

﴿ قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ﴾ ( البقره /٦٩ ).

واتە : جارێکی تر ووتیان : ئەی موسا لە پەروەردگارت داوا بکە ، تا بۆمان ڕوون بکاتەوە ڕەنگی چۆن بێت ، خوای گەورەیش وەڵامی دانەوە بەوەی : کە ڕەنگی زەردی تێر بێت ، و تەماشاکەران دڵ خۆش بکات ، زانا (الالوسی)

---

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٦٥ ) .

دەڵێـت :- ( السـرور ) : بـریتی یـە لـە لـەزەت و خۆشـی لـەناو دڵـدا ، لـەکاتی بەدەسـت هێنـانی سـودێکدا ، یـان بینینـی کـارێکی سـەیرو نـاوازە ، بـەلاّم ( السرور) شتێکی ( خالص ) پوخت و شاراوەیە ، بەوە ناونراوە ، چونکە بە ( الاسرار ) لێك دراوەتـەوە ، وشـەیەکی تـر هەیـە ( الحبـور) کـە شـوێنەوارەکەی دەبینرێت ، لەڕواڵەتی خۆشی دەربڕینی دەم و چاودا ، کە هـەردوکیان لـە شتی پەسەندکراو دا بەکاردێن ( الفرح ) زۆر جار پەسەند ناکرێت ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ﴾ ( القصـص / ٧٦ ) . واتـە : ( بێگومـان خـوا ئـەو کەسـانەی خـۆش ناوێـت کـە کەشخەکەن بەسەروەت و سامانیانەوە لە خۆیان بایی دەبن ) . زانایانی تەفسیر دەفەرموون : ڕەنگی زەرد لە ڕەنگە دڵخۆشکەرەکانە .

﴿قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ﴾( البقره / ٧٠ ) .

واتـە :- وتیـان لەپـەروەردگارت داوابکـە ئـەی مووسـا ، تابـە تـەواوی بۆمـان ڕوون بکاتەوە بزانین ئەو مانگایە کامەیە ؟! چونکە بەڕاستی ئەم گاگە لەسـەری لێتکداوین و ڕەنگی زۆریان لەیەك دەچێت ، ئەو مانگایـەمان بـۆ نـا دۆزرێتـەوە ، بەڕاستی ئێمە ( ئەگەر خوا ویستی لەسەربێت ) ، ڕێنمونی وەردەگرین .

( الـرازی ) دەفـەرموێت :- ( الحسـن ) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویـەتی :- ( سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بە دەستە ، ئەگەر نەیانوتایـە : ( إن شا الله ) ئەوا بێگومان نێوان ئەوان و مانگاکە بۆ هەتا هەتایە دووردەکەوتەوە )

بزانـە ، کـە ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ، دەربڕینـی ئـەو وشـەیە لـە هـەموو کارێکدا ڕێپێـدراوە کە کارەکـەی بەدەسـت بێـت ، لەبـەر ئـەوە خـوای گـەورە بـە پێغەمبـەری فـەرموو ( هـەرگیز دەربـارەی هـیچ شـتێك و هـیچ کارێـك مـەڵی : مـن بەڕاسـتی سـبەینێ ئەنجامـدەری ئـەو کـارەم ، مەگـەر بڵێیـت ( إن شـاالله ) ئەگـەر خوا بیەوێ ( الکهف / ٢٣- ٢٤ ) .

ئەمە پشت بەستن بە خواو ، کاروباردانە دەست خوای تیایە .[1]

ئەمە پرسیاری سێ هەمیان بوو کەلە موسایان کرد ، وایان بینی کە نادیاری ئێستا لە سروشت و کاری مانگاکەدایە لایان ، لێرەدا هەستیان کرد بەسستی و دواخستنیان لە کارەکە دا ، و گەڕان بە دوای شتێکدا کە خەیری تیا نی یە ، و پۆزشیان بۆ موسا هێنایەوە .

بێگومان ئەو لەیەك چون و لێ گۆڕان و ساغ نەبونەوەیە بۆیان ، بریتی بوو لە باجێك کە بدرێت ، کەسانێك بیدات لە شەریعەتی ڕاستی خوایی دووركەوتونەتەوە ، کە ئاسانکاری بۆ کردوون[2] ئینجا موسا ( علیه السلام ) وەلأمیان دەداتەوە :-

﴿ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴾ ( البقرة / ٧١ ) .

واتە : موسا ( علیه السلام ) پێی وتن : بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت :- مانگایەك بێت ، ڕانەهێنرابێت و ئامادە نەکرابێت بۆ کێلأنی زەوی ، و ئاودێری کشتوکاڵیش ناکات ، بێ عەیبەو یەك ڕەنگەو هیچ پەڵەیەکی تێدا نیە ، ئینجا وتیان : ئا ئێستە ئیتر هەواڵی ڕاستەقینەت پێ داین ( دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بە دەستیان هێنا ) و سەریان بڕی ، هەرچەندە خەریك بوو ئەو کارەیش نەکەن .

لەم تێگەیشتنەوە ئەخلاق و ڕەفتاری یەهودمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، کەلە قسەو لێکدانەوەکانیاندا چەندێك ئەدەبی خراپ دەردەبڕن ، و هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەران چۆنە .

---

١/ ( التفسير الكبير ) ( ٣/ ١١١ ) بە کورتی .

٢/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٦٥ -٦٦ ) .

ئەوەی بە موسایان ووت ، ووتیان ، کە پێغەمبەریان بوو ، کە وایان لێك دایەوە باوەڕیان بە مووسایە ، کە هەر ئەو بوو ، لەسەر شۆڕی ڕزگاری کردن و ڕێنمایی کردن بۆ ئازادی و سەربەرزی .[1]

ووتیان : ئا ئێستا بەڕاستی پێت وتین ، وەك ئەوەی پێشتر حەقی بۆنە هێنابن ، و وەك ئەوەی پێشتر قسەی ناحەق و بەتاڵی بۆ کردبن ، و وەك ئەوەی گفتوگۆی پێشتری نێوانیان بەتاڵ و بێ بنەما بوبێت ، و وەك ئەوەی موسای پێغەمبەر ( علیه السلام ) لەناو بەتاڵدا مابێتەوە .

ئەگەر ئەوان لەگەڵ دەرچونی یەکەم فەرماندا کارەکەیان جێ بەجێ بکردایە , ئەوا پێشبڕکێیان کرد بوو , و ئەجرو پاداشتیان دەست دەکەوت لەسەری !

بەڵام ئێستاو دوایی هەموو ئەو پرسیارانە و دواخستنی و تەمبەڵی نواندنە کارەکەیان جێ بەجێ کرد , بەڵام ئەو ڕەگەزو هەڵەزێڕینە یان لەدەست چوو .

( فذبحوها وما كادوا يفعلون ) ووشەی ( ماکادوا ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی , دوای ناڕەحەتی و ماندوو بونێکی زۆر کارەکەیان بەدەست هێنا , کەبەڵگەیە لەسەر خاوو خلیچکیان لە جێ بە جێ کردنەکەدا .

هەر کەس کارێك بەناچاری و ناڕەحەتی جێ بەجێ بکات وەك ئەوە وایە جێ بەجێی نەکردبێت . چونکە خوای گەورە دەیەوێت , فەرمانپێکراو , کارەکە بەگەرم و گوڕی و هیمەت و زیندوێتی و شەوق و ڕاپەڕاندنەوە جێ بەجێ بکات . بە حەزوو خۆشی و ڕازی بوونەوە .[2]

﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٧٢) فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ ( البقرة / ٧٢ – ٧٣ ) .

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٦٦– ٦٧ ) .

٢ / ( مع قصص السابقين فی القرآن ) ل ( ٦٧ – ٦٨ ) بەکورتی .

زانا ( محمد رشید رضا ) دەڵێت :- ئەم ئایەتە سەرەتای چیرۆکەکەبوو کە سەر پێچی یەکی تیابوو , کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا , کە کوشتنی کەسێك بوو , پاشان ناکۆکی لەسەر بکوژەکەی , پاشان بڕیاردانی حوکمێك بۆ دۆزینەوەی ڕاستی یەکە بەسەر بڕینی مانگایەك , ئەمە لە زۆرلێکردنیان نەبوو لەپرسیارکردندا کە پێشتر ڕوویدا , ئایەتی : - ﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ﴾ ڕوداوی کوشتنەکەی دایە پاڵ ئومەتێك , ئەگەر بکوژەکەی کەسێك بوو بێت بەتەنها ئەوا هەموویان تیایدا بەشدار بوون وەك تەنها یەك کەس , هەریەکەیان تۆمەتەکەی لە خۆی بە دوور گرتووە و خۆی بەپاك داناوە , و نەفسی خۆی لەهەموو شتێك بە دوور گرتوە و کەسی تری تۆمەتبار کردوە , بکوژان و ئەو کەسانەی زانیویانە , بەشیان تیایدا هەبووە و , هەواو ئارەزوو زاڵ بوە بەسەریاندا و ڕاستی یەکانیان تیا شاردۆتەوە , پاش بیرخستنەوەی تاوانەکە , خوای گەورە فەرمووی ( واللهُ مُخْرِجٌ ماكُنتُم تكتمون ) لەگەڵ کەوتنی بەسەر قەومێکی پاکدا , کەیەکتری بەکوشتنێك تاوانبار دەکەن بۆ شاردنەوەی بکوژەکە , چونکە نەخشەو فێڵی ئەوان لای خوا ناشاردرێتەوە .[1]

ڕەنگە حیکمەت لە دواخستنی ڕونکردنەوەی هۆکارەکاندا , بۆ ئەوە بێت بیسەر هەڵوێستە بکات لەسەر وێنەو دیمەنی ناپەسەندی یەکانی یەهود و ئەخلاقی خراپیان , و هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەرانیان و فەرمانی پەروەردگاریان . ئەوان ئەو کەسانە بوو پێویستیان بەسەر بڕینی مانگایەك هەبوو , کە لێی سودمەند بوون , لەگەڵ ئەوەی کە کردیان , حاڵیان چۆن دەبوو ئەگەر سودمەند نەبونایە لێی ؟ خوای گەورە ویستی وا بوو , ئەوە دەرخات کە شاردبوویانەوە , و بکوژی ڕاستی بدۆزێتەوە .

هەروایش بوو , بەشێکیان لەلەشی مانگاکە وەرگرت و دایان بەجەستەی ئینسانە مردوەکەدا , پاشان ڕۆحی بۆ گەڕایەوە , و ئەویش دەربارەی بکوژەکەی خۆی قسەی کرد .

---

٣ / ( تفسير القرآن الحكيم ) ( ١ / ٣٥٠ , ٣٥١ ) .

﴿ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ﴾ واتە : بەشێکی لەشی مانگاکە بدەن بە بەشێکی جەستەی کوژراوەکەدا , زیندو دەبێتەوە و ئەویش بکوژەکە دیاری دەکات .

﴿ كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى ﴾ هەروەك چۆن خوای گەورە ئەم کوژراوەی زیندو کردەوە لەبەر چاوتان , هەر بەو جۆرە مردوی ناو گۆڕەکان زیندو دەکاتەوە .

﴿ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ خوای گەورە بەڵگەکانی تواناو دەسەلأتی خۆیتان پیشان دەدات تا بیربکەنەوە و ڕامێنن و بزانن خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

خوای گەورە بۆ قەومەکەی موسا لەسەر بڕینی مانگاکەدا حیکمەتی دەرخست , ئەوانیش کەسێکیان لێیان کوشتەوە , پاشان , هەر دەستەیەك تۆمەتەکەی لەخۆی بەدوور دەگرت و دەیدا بەسەر غەیری خۆیدا , شایە تیش لەوێدا نەبوو . خوای گەورە ویستی حەق و ڕاستی دەرکەوێت لەسەر زمانی کوژراوەکە خۆیەوە , و سەربڕینی مانگاکە هۆکارێك بوو بۆ زیندوو بونەوەی , ئەوەش بەپیاکێشانی بەشێکی لەشی مانگاکە بەجەستەی کوژراوەکەدا .

بەلأم , چی لەم هۆکارەدا هەیە , لەکاتێکدا خوای گەورە بەتوانایە بەسەر زیندو کردنەوەی مردواندا بەبێ هۆکاریش ؟ پاشان پەیوەندی مانگای سەر بڕاو لەگەڵ کوژراوی زیندو کراوەدا چی یە ؟

مانگا بۆ قوربانی سەر دەبڕرێت , هەروەك پیشەی نەوەی ئیسرائیل بووە , بەشێك لەلەشی سەربڕاوەکە ژیان بۆ جەستەی کوژراوەکە دەگێڕێتەوە , لەم پارچەیەدا ژیان نییە و توانای زیندوکردنەوەیش نییە , تەنها هۆکارێکە , کە دەسەلأت و توانای خۆیان بۆ دەردەخات کە ئینسان نازانێت ئەو قوردرەتە چۆن کار دەکات . ئەوان شوێنەوارەکەی دەبینین , بەلأم نهێنی و ناوەڕۆکەکەی نازانن و نایشزانن ڕێگای کارکردنەکەی چۆنە , ﴿ كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى ﴾ , بەو جۆرەی ئەو کارەتان بینی , کە نازانن چۆن ڕویدا , هەر بەو شێوەیەو بە ئاسانی مردوان زیندو دەکاتەوە .

﴿ گرنگ ترین پەندو وانە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە ﴾

١) زانا ( القرطبي ) دەڵێت :- لەئایەتی : ﴿قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾ بەڵگەی ئەوە هەیە کە قەدەغەیە گاڵتە بەدینی خواو موسوڵمانان بکرێت , بێگومان ئەوە نەفامی یەو خاوەنەکەی شیاوی سزای سەختە , ئایا نابینیت پێغەمبەریش ( ﷺ ) گاڵتەی پێ دەکرا و لە دوای خۆیشی نەتەوەکەی .

٢) ( القاسمي ) دەڵێت : - ( الراغب ووتویەتی ) :- هەندێك لە خەڵکی وتویانە : ﴿ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ (٦٨) قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ (٦٩) قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ (٧٠) قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴾ بەڵگە هەیە لەسەر نەسخ کردنەوەی شتێك پێش ئەنجامدانی , چونکە لەیەکەم جاردا فەرمانیان پێ کرا بەسەر بڕینی مانگایەك بەبێ دیاری کردن , بۆیان هەبوو کەهەرمانگایەك سەربڕن کە خۆیان بیانەوێت , بەڵام لە دووەم و سێ یەم جاردا , فەرمانیان پێ کرا بەسەر بڕینی مانگایەکی تایبەت کراو و مەرجدار , وەك ئەوەی نەهییان لێ کرابێت لەوەی کە پێشتر فەرمانیان پێ کرا , بەڵام بەو جۆرە نەبوو , یەکەم فەرمانێکی ڕەها بوو , و دووەم و سێ یەم وەك ڕونکردنەوەوا بوو بۆی , کاتێك لێی گەڕانەوە , بەڵام سەر بڕینی مانگاکە یان لە کۆڵ نەکەوت , بەڵکو سیفاتەکانی زیادی کرد لەسەریان , هەر لەئایەتەکە بەڵگەی ئەوە هەیە کە ڕێپێدراوە ڕونکردنەوە دوابخرێت بۆ کاتی پێویست .

٣) ( شیخ أبو بکر الجزائري ) لە ( هداية الآيات ) دادەڵێت :-

- ڕونکردنەوەی ئەوەی نەوەی ئیسرائیلی قەومی موسا ی لەسەر بوو , خراپی ڕەوشتیان دەردەخات , تا موسوڵمانان لە نمونەی ئەو کارانە خۆیان بپارێزن .
- حەرامە ڕەخنەگرتن لەکەسی ( شارع ) شەرع و یاسادانەر پێویستە تەسلیم بوون بە فەرمان و نەهی یەکانیان , ئەگەر نەشزانرێت سودی فەرمان و نەهی و

هۆکارەکانی چین .

- هەنگاو نان بۆ وەرگرتنی ئاسانتر , و ڕقبون لە توندکردنەوەی فەرمانەکان.
- ڕونکردنـەوەی سـودی جیاکردنـەوەی شـتەکان بـە وتنـی ( إن شـاء الله ) , ئەگەر یەهود نەیان وتایە : ( إن شاء اللهُ لمُهتدونَ ) , ئەوا ڕێنمایی نەدەکران بۆ ناسین و دیاری کردنی مانگای دیاری کراو .
- پێویستە خۆ لەو وشانە بە دور بگیرێت , کە لێیانەوە ئەوە وەربگیرێت , بێڕێـزی بەرامبـەر پێغەمبـەران بکرێـت وەك وتیـان : - ( آلْـئنَ جِئْـتَ بـالحَقِّ ) ئەوەی لێ وەردەگیرێت کەوا تێ گەیشتبون , کە ئەم جارە کە دواجار بوو حەق و ڕاستی پێ ڕاگەیاندن , لە چاو جارەکانی پێشوودا .

٤) هۆکاری ڕاستەوخۆ لە پابەندبوون یان پابەند نەبووندا بریتی‌یە لە ( دڵ ) , ئەگەر دڵ پڕ بوو لـە ئیمـان بـە خـوا و گەورەیی و ڕێز گرتن لـە فەرمانـەکانی , ئـەوا حـەزی لـە جێ بە جێ کردنـی کارەکـان لا دروسـت دەبێـت , و پێشـبڕکێ دەکات بۆ جێ بە جێ کردنی , ئینجا دڵ فەرمانەکە بۆ ئینسان دەردەکات , ئەندامەکانیشی بە خێرایی وەڵامی دەدەنەوە .

بـەڵام ئەگـەر دڵەکـە خـوای تیانـەبوو , ئـەوا ڕێـز لەفەرمانـەکانی ناگرێـت , ونایەوێت جێ بە جێیان بکات , هـەوڵ دەدات بۆ هـەڵهاتن و بیانوو هێنانـەوە , وەك ئەوەی فەرمانەکە بۆ لایەنێکی دەربکات , ئیتر ئەندامەکەی لاواز دەبێت لە ڕووی ئەنجامدانی یەوە , ئەگەر ئینسانێکمان بینی چالاك بوو , و خێرا بوو لە گوێ ڕایەڵیدا , و بۆ خـەیرو چاکە پێشبڕکێی دەکرد , و جدی بوو لـە پابەنـد بـوون و جـێ بـە جـێ کردنـی فەرمانەکانـدا , ئـەوا دەزانـین کـە دڵـی سـاغ و تەندروسـتە , و بـاوەڕی بـە خـوا هەیـە , و خـوا بەگـەورە ڕادەگرێـت , ئەگـەر ئینسـانێکمان پێچـەوانەی ئەمـە بینـی , لـەش گـران و لاواز و بـێ دەسـەڵات , و خۆی لـە حوکمـەکانی خـوا دەدزیـەوە زوو هـەڵ دەهـات لێیـان , ئـەوا دەزانـین دەردەکە لـە دڵیدایـە , کاتێك بەدەردەکـە زانـرا , ئەوا چارەسـەری گونجاوی بۆ دیاری دەکرێت , بەئاسانی پێی دەگات , و پەروەردە کە سەر کەوتوو دەبێت.

٥) سەرقاڵ نـەبوون بـەکارە ناوەنـدی و مەسـەلە پـەراوێز خراوەکانـەوە , چونکە گـەڕان بـە شوێنیانـدا بەکـەڵك نایـەت و سـوو نـادات , و تـەنها کـات و هـەوڵ بـە فیڕۆدان دەبێت , و لە جێ بە جێ کردنی پەکی دەکەوێت .

٦) توند کردنەوەو ئاڵۆزکردن ( باج ) یکە , تووشی ئەو کەسانە دەبێت , کە ڕازی نابن بەڕونکردنەوەی پەروەردگار , و ئەنجامە ڕاستەکان , و هەروەها دەکەوێت بەسەر ئەو کەسانەیشدا کەلەرێگای ڕوون و ئاسان لا دەدەن بۆ ووردەکاری و پەل و پۆکانی , کە سودو بەرهەمیان تیا نی یە . ئەوانە جولەکەو یە هود بون , کە فەرمانەکەیان لەسەر خۆیان قورس کرد , و خوای گەورەش زیاتر لەسەری قورس کردن , ئەگەر هەرمانگایەکیان سەر ببڕیایە , ڕێپێدراو بوو بۆیان .لەبەرئەوە خوای گەورە نەهی کردوە لەموسڵمانان لەسەر ئەو وردەکاریانە کەسودیان نی یە , و پرسیارکردنیش تیایاندا هەربێسودە .

لە ( ابی هريرە ) وە , دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری بۆ دەخوێندنەوە , فەرمووی :- ئەی خەڵکینە ! بەڕاستی خوای گەورە حەجی لەسەر فەرزکردن . پیاوێك ووتی :- ئایا هە مووساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا ؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو , هەتا پیاوەکە سێ جار پرسیارەکەی ووتەوە , ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :- ئەگەر بم ووتایە : بەڵێ , ئەوا فەرزدەبوو , و نەتان دەتوانی ئەنجامی بدەن . پاشان فەرمووی : وازم لێ بهێنن و پرسیارکردنی زۆر لەوەدا کە بۆم جێ هێشتوون , بێگومان کەسانی پێش ئێوە بەهۆی پرسیارکردنی زۆریانەوەو بونی جیاوازیان لە سەر پێغەمبەرانیان تیاچوون , ئەگەر فەرمانم بەشتێك پێ کردن , ئەوەندەی لێ وەربگرن کە دەتوانن , و ئەگەر نەهی شتێکیشم لێ کردن , وازی لێ بهێنن .[1]

١/ ( مسلم ) لة ( كتاب الحج ) دا ريوايةتى كردوة .

## ﴿ چیرۆکی طالوت ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :-﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ قَالُواْ وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَآئِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ (٢٤٦) وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٢٤٧) وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٤٨) فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُوا اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٢٤٩) وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٥٠) فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاء وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ (٢٥١) تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ ( البقرة / ٢٤٦ – ٢٥٢ ) .

## ﴿ ڕونکردنەوەی کورتە چیرۆکەکە لە قورئاندا ﴾

ئایەتەکانی قورئان ئاماژە دەکەن بۆ چیرۆکێك کە بەسەرنەوەی ئیسرائیلدا ڕویداوە , لەکات و سەردەمێکی ژیانیاندا , کەلە خاکی پیرۆزدابوون , چەوساوەو ژێرخراوبوون لە بەردەم دوژمنەکانیاندا , و دوژمنەکانیان

( تابوت ) یێکیان لێ بردبون کە سەکینەت و هەیبەت و ئارامی خوایی پێوە بوو, و هەندێك شتی لەکەل و پەل و شوێنەوارو پاشماوەکانی بنەماڵەی موساو بنەماڵەی هارونی تیایە .

قەومەکە هەستیان بەسەر شۆڕی و تاڵی و ناڕەحەتی و ڕوخانی خۆیان و کەمی و سەرکزی خۆیانیان دەکرد ، ئەم هەستەلای هەموویان هەبوو ، ویستیان ئەم حاڵەتی سەرشۆڕیە یان بگۆڕن ، وبەجۆرێك کەزەلیلی و ڕوخانەکەیان بگۆڕن بە سەرکەوتن ، وتیّ گەیشتن کە تەنها ڕێگا بۆ ئەم کارە جەنگ و جیهادە .

لەبەرئەوە پیاوە گەورەو ناودارو دەسەلأتدارەکانیان پەنایان برد بۆ پێغەمبەرەکەیان ، وداوایان لیّ کرد پاشایەکیان بۆهەڵبژێرێت و دیاری بکات کاروباریان بەڕێوەبەرێت ، وپێشەوایەتیان بکات بۆ سەربەرزی و سەرکەوتن ، و لەڕێگەی خوادا لەگەڵ دوژمنەکانیدا بجەنگێن .

ئەم پێغەمبەرەیش سروشت و هەڵس و کەوتیان دەزانێت و دەزانێت لەدواوەن و هیمەتیان لاوازو خاوە ، بێگومان ئەوان کاتێك فەرمانی جەنگیان پیّ بکرێت ، پاشتر لێی پاشگەزدەبنەوە ، و دادەنیشن ، ئینجا پێی وتن :- ئایا کاتێك ئێمە داوای جەنگاندنمان لیّ کردن ، ئایا دەجەنگن یان پشت هەڵدەکەن ؟ بێگومان من دەزانم ئێوە دوادەکەون و سەر پێچی دەکەن .!

ئەوانیش پێغەمبەرەکەیان دڵنیاکردەوە ، کە بێگومان لەمەودوا دەجەنگن و دواناکەون و سەرپێچی ناکەن ، و ئەوەی قەدەغەی جەنگ و کوشتاری لەوان کردوە ، نەبونی پاشاو سەرکردەیەکە ، پێشەوایەتیان بکات ، ئەوە سەرشۆڕیەکە ئەوانی پێوە دەژین و ئەوان لەخاك و شوێنی خۆیان دەرکراون ، ولەبەردەم دوژمنەکانیاندا ڕوخاون ، و سورن لەسەر ئەوەی دوژمن بڕوخێنن و شوێن و خاکی خۆیان ڕزگاربکەن ، ئیتر بۆچی نەجەنگن ؟

کاتێك پێغەمبەرەکەیان قسەکەیانی بیست و تێبینی گەرم و گوڕی و ئامادەباشیانی کرد ، داوای لەپەروەردگاری کرد ئەو پاشایەیان بۆ بنێرێت ، وخوای گەورەیش وەحی بۆنارد کە ( طالوت ) پاشاو سەرکردەیانەو پێشەوایەتیان دەکات بۆسەرکەوتن و سەربەرزی و ڕزگاری .

بەوە ناڕەحەت بوون و دوورکەوتنەوە ، لە کاتێکدا وایان لێك دەدایەوە پاشاکە لەبنەماڵەی پاشاو کەس و کاری پاشاکانەوە هاتبێت ، بەلأم ( طالوت ) لەو بنەماڵەو کەسانەنی یە ، پاشان کەسێکی هەژارەو ماڵ وسامانی نی یە بەشی بکات و ئامادەی بکات بۆ پاشایەتی ، ئینجا ڕەخنەیان

لەپێغەمبەرەکەیان گرت و ووتیان :- ئەوە لە کوێ شیاوو گونجاوە , کە ببێتە پاشا بە سەر ئێمەوە , لەکاتێکدا کەئێمە لەپێشترو شیاوترین بە پاشایەتی تائەو , و بەو بەشێك لە فراوانی ماڵ وسامانی دنیایی نەدراوە !

پێغەمبەرەکە سەری سوڕما لەهەڵوێستی قەومەکە , کەئەوان پاشایەکیان دەوێت , کاتێك خوای گەورە ( طالوت ) ی بەپاشا بۆ هەڵبژاردن , ئەوان ڕەخنەیان گرت , ئینجا پێغەمبەرەکە ئەو سیفەتانەی بۆ ڕون کردنەوەکە پێویستە بۆ مەرج و لێهاتویی پاشا , و بێگومان بەپێی تەرازوی پەروەردگار ئەو گونجاوترین کەسە بۆ پاشایەتی , بەڕاستی خوا بەسەر ئێوەدا هەڵیبژاردوە , و خوای گەورە کاربەجێ و شارەزایە بەهەموو شتێك , و خوای گەورە ئاستێکی باشی لەزانست پێ داوەو توانایشی بۆ ڕەخساندوە , و خوای گەورە لاشەیەکی بەهێزو گەورەیشی پێداوە , ئیتر بۆچی ڕەخنەی لێ بگرن ؟ بێگومان خوای گەورە موڵك و دەسەڵات و پاشایەتی بە کەسێك دەدات خۆی بیەوێت , و بێگومان دەسەڵاتی خوا فراوانە و خاوەنی زانستی لەڕادەبەدەرە , و زاناو شارەزایە بەهەموو شتێك .

پێغەمبەرەکەیان ویستی ئەو ڕەخنە گرتنە لەمێشك و هەستیاندا لابەرێت , کەلەسەر ( طالوت ) هەیانە . وبەڵگەو نیشانەکەشی بۆ ڕونکردونەوە , کەخوای گەورە بۆیان دێنێت , بەڵگە یە لەسەر ئەوەی کە خوا ڕازیە بەوەی کە ( طالوت ) ببێتە پاشایان , و پێی ووتن : نیشانەی پاشایەتی یەکەی , ئەوەیە کە سندوق (تابوت ) ێکیان بۆدێت, کە سەکینەت و ئارامی و هەیبەتی خوایی پێوەیە و لەگەڵ خۆی دەیهێنێت و پاشماوەی کەس و کاری موسا و هارونیشی تێدایە ، فریشتە ئەو سندوقە هەڵدەگرێت و دەیهێنێت ، بەڕاستی ئەوە نیشانەیەکی بۆ ئێوە تێدایە ، ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

سندوقەکەیان بۆ دێتەوە کە هی خۆیان بووە ، بە تەنها بۆیان دێت ، بەبێ جەنگ و کوشتار و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا ، کە لەوانیان سەندبوو ، فریشتە هەڵی دەگرێت و بۆیان دێنێتەوە ، ئەو نیشانەیەی کە پێغەمبەرەکەیان بەڵێنی پێدان هاتەدی و ، فریشتە سندوقەکەیان هەڵگرت و گەیاندیانەوە پێیان ، و هاوکات بوو لەگەڵ بوون بە پاشای ( طالوت ) بەسەریانەوە ، کە پێیان ناخۆش بوو !

( طالوت ) پاشایەتی و دەسەلاتی گرتە دەست ، و قەومەکەی ئامادەکرد و هەلینان بۆ جەنگ ، دژی دوژمنە کافرەکانیان . کاتێك دەری کردن بۆ جەنگ ، بە لێهاتوویی و شارەزایی و زیرەکی و زانستەوە مامەلەی لەگەلدا کردن ، و ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی باسکردبوون ، بۆی جێ بە جێ کردن ، لەوەی کە خوا زانستی باش و تواناو جەستەیەکی گەورەی پێ بەخشی بوو .

بێگومان ئەو دەزانێت کە قەومەکەی گەرم و گوڕن بۆ جەنگ و خێرا دەردەچن بۆی ، و دەیشزانێت کە ( توڕەو ) گەرم و زیان بەخشن ، و بەلام خێرا نامێنن ، و دەیشزانێت کە بەلێن دان و ئاوات خواستن وەك تاقیکردنەوەی کرداریی نیە ،و دەیشزانێت کە زۆرێك لەو دەرپەڕین و هەلچوون و گەرم و گوڕیانە ، لەکاتی تاقیکردنەوەی کرداریدا لەناو دەچێت ، و زۆرێك لە بەلێن و ئاوات خواستنەکان لەکاتی جێ بە جێ کردندا لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بەتال دەکرێنەوە ، لەبەر ئەوە تاقی کردنەوە تا بزانێت و ببینێت لەسەر چین .

لەشارەکەیان دەرچونەدەر بۆ دوژمنانیان ، کاتێك لێیان جیابوونەوە ئاوەدانی و شوێنەکەیان جێ هێشت ( طالوت) ووتی :- خوای گەورە بە دەریایەکی ئاو تاقیتان دەکاتەوە ، کاتێك بەسەریدا تێدەپەڕن و دەڕۆن لێی مەخۆنەوە ، هەرکەس سەرپێچی فەرمانی من بکات و لێی خواردەوە ، ئەوە لە سەربازو سوپاکەی من نی یە ، با شوێنم نەکەوێت ، چونکە سەربازێکی ڕێك و پێك و گوێڕایەل نی یە. بەلام هەرکەس لێی نەخواتەوە و، پابەندی فەرمانەکە بوو و گوێ ڕایەلی کرد ، بەڕاستی ئەوە لە دەستەی منە .

وەك زیرەکی و لێهاتویی خۆی ، ڕێگەی دا بە هەریەك لە پیاوەکان ، کە بۆیان هەیە بەدەستیان تەنها یەك مشتی لێبخۆنەوە ، کە دەمی پێ تەڕ بکات و تینوێتی یەکەی سوك ببێت ، ئەگەر ویستت گوێڕایەل بیت ، داوای شتێك بکە بتوانرێت بکرێت !

کاتێك گەیشتنە ڕوبارەکە ، سەرپێچی ( طالوت ) یان کرد ، ولێیان خواردەوە ، تەنها کەمێکیان نەبێت پابەندی فەرمانەکە بوون و گوێڕایەلی سەرکردەیان بوون .

( طالوت ) کۆمەلی سەرپێچیکارانی جێ هێشت ، ئینجا لەگەل ئەو کۆمەلە کەمە باوەڕدارە گوێڕایەلە ڕۆیشت ، هەتا گەیشتە خاکی جەنگە جیاکەرەوەکە .

سـەربازەکانی سـەیری سـەربازی دوژمنیـان کـرد ، ترسـان لـە جـەنگ کـردن لەگەڵیاندا ، وترس چووە دڵیان لەوەی ڕووبەڕویان ببنەوە .

و دوژمنانی کافر بەسەرکردایەتی جالوت ژمارەیان لەوانە زیاتر بوو ، زۆرێك لە کۆمەڵەکەی ( طالوت ) لەگەڵ (طالوت ) دوان و ووتیان :- ئێمە ئەمڕۆ تواناو تاقـەتمان نیـە بـۆ جـەنگ لەگـەڵ ( جـالوت )، و سـەربازەکانیدا ، و نـاتوانین جەنگیان لەگەڵ بکەین ، لەبەر ئەوە هەرگیز لەگەڵیان ناجەنگین هـەموو ئەوانـەی لە جەنگەکە ترسان بە ترسەوە سوپاکەیان جێهێڵاو ( طالوت ) وژمارەیەکی زۆر کەم لە سوپاکەی مانەوە ، ئەوانەش ئەو کەسانە بوون کە دڵنیا بوون دەگەنـەوە بە خـوا و حـەزیان لـە بەهەشـت و نـازو نیعمەتەکەیـەتی .ئـەم کۆمەڵـە پیـاوە زۆر کەمـە فێربـوون ، ئـەم کۆمەڵـە ترسـێنەرە بنـەمای سـەرکەوتن و بـەرگریکردنن ، پێیان وتـن :- ئایا چـەند دەسـتەو تـاقمی کـەم ( یـان زۆر دەسـتەو تـاقمی کـەم ) زاڵ بـوون و سـەرکەوتن بەسـەر دەسـتەو تـاقمی زۆر بـە فـەرمانی خـوا ، و خـوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە .

( طـالوت ) لەگـەڵ کۆمەڵـە پیـاوە زۆرکەمـە بـاوەڕدارە ئارامگرەکـەدا چـونە جەنگـەوە , کاتێك جەنگەکـە دەسـتی پـێ کـرد , داوای سـەرکەوتنیان لـە خـوای گـەورەکرد لێـی پاڕانـەوەو داوای یارمـەتیان لێ کـردو زۆربـە کـوڵ پـەنایان بـرد , ووتیان : ئەی پەروەردگارا خۆگری و ئارامگریمـان پـێ ببەخشـە و ( دڵ ودەرون ) و پێکانمان دامەزراوبکەو , سەرمانبخە بەسەر کۆمەڵی کافراندا .

خـوای گـەورە وەعدەکـەی بـۆ جـێ بـەجێ کـردن , و سـەرکەوتنی بـۆ نـاردن , چونکە ئـەوان ڕاسـتیان کـرد لەگـەڵ خـوادا , کـە بـەڵێنیان پـێ دابوو, بەفـەرمانی خوای گەورە دوژمنەکانیان شکاند .

لـەناو کۆمـەڵی پیـاوە ئارامگرەکانـدا ( داود ) ( علیـە السـلام ) هـەبوو ,کەلـەو کاتـەدا نـە پێغەمبـەر بـوو نـە پاشا , پـاش ئـەوە بوویـە پێغەمبـەرو پاشـا – خـوا زانـاترە – ئینجـا داود ( عیلـە السـلام ) ڕوبـەڕووی جـاڵوت بوویـەوەو کوشـتی . پـاش ئـەوە خـوای گـەورە پاشـایەتی و موڵـك و حیکمـەتی بـە ( داود ) دا و لەوەیش کە خۆی دەیویست فێری کرد.

ئینجـا( طـالوت ) بـە کۆمەڵـە بـاوەڕدارە سـەرکەوتوەکەیەوە گەڕایـەوە بـۆ مەملەکەتەکـەی خـۆی ، پـاش ئـەوە وڵات ڕزگـاربوو و سـندوق ( تـابوت)ەکـە

گەڕایەوە و دوژمن شکاو دۆڕا , وقەومەکەیشی جێگیرو دامەزراو بوون .پاش ئەوەی حەقیقەتی نەوەی ئیسرائیل دەرکەوت , گەڕایەوە و زۆرێك لەشاراوەکانیان و سروشت و ڕەفتاریان دەرکەوت . پاش ئەوەی زانی ڕاستی داواکاریەکانی کۆمەڵەکە چی یە , گەڕایەوە زانی چۆن مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵەکەدا بکات , وزانی کامانەن کۆمەڵە خەڵکی تێکۆشەرو دامەزراو , بێگومان ئەوانە کەمن لەناو کۆمەڵدا. پاش ( طالوت ) ( داود ) ی پێغەمبەری پاشاو جێنشین ( علیه السلام ) حوکمی ( بنی إسرائیل ) نەوەی ئیسرائیلی کرد .خوای گەورە فەرموویەتی :﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ( البقرة / ٢٤٦ )

زانا ( محمد علي الصابوني ) دەڵێت :- واتە : ئەی محمد (ﷺ) ئایا هەواڵی ئەو قەومەت پێ نەگەیشتووە ؟ ئەم پرسیارە بۆ سەرسوڕمان و شەوق دروستکردنە لای گوێگر , ئەوقەومە , نەوەی ئیسرائیل بوون , لەدوای وەفاتی موسا ( علیه السلام ) وەك ئایەتەکە ئاماژەی پێداوە ﴿إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ واتە : کاتێك قەومەکە بە ( شمعون ) ی پێغەمبەری خۆیانیان ووت : پێشەواو سەرکردەیان پاشایەکمان بۆ دابنێ و دیاری بکە و بیکەرە سەرکردەمان , تالەگەڵیدا لەپێناو خوای گەورە دا بجەنگین ﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ﴾ واتە : پێغەمبەرەکەیان پێی ووتن : من دەترسم جەنگتان لەسەر فەرزبێت و پاشان لەگەڵ دوژمنەکەتان نەجەنگێن , و خۆتان بپارێزن لەگەیشتن پێیان .﴿وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَآئِنَا﴾ واتە :- چ هۆکارێك هەیە قەدەغەی بکات لەئێمە کە لەپێناوی خوادا نەجەنگێن دژی دوژمنەکانمان کە بەدڵنیایی لە ماڵ و خاك ومنداڵ ونەوەمان دەربەدەر کراوین ؟ لەگەڵ ئەو ترس و ناهاوسەنگیەی کەتوشی دەرونیان هاتبوو , خوای گەورە فەرمووی :﴿ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ ﴾ واتە: کاتێك جەنگیان لەسەر فەرزکرا , زۆریان سەریان شۆڕکرد لەجیهادو پشتیان هەڵکرد , تەنها دەستەیەکی کەمیان نەبێت , ئارامیان گرت و دامەزراوبوون , ئەوانیش ئەو کەسانەبوون کەلەگەڵ ( طالوت ) دا لەدەریاکە پەڕینەوە .

( القرطبي ) دەڵێت : ئەوە کاروپیشەی نەتەوە نیعمەت بەسەرا ڕژاوەکانە , کەمەیلیان بەلای دنیادا هەیە , ئاوات بەجەنگ دەخوازن لەکاتی سەربەرزیدا , بەڵام کاتێك کاتی جەنگەکە هاتە پێشەوە , دەترسێن و دەڕوخێن و دەگەڕێنەوە سەرسروشتی خۆیان . ﴿ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴾ واتە : خوای گەورە زانایە بەستەمکاران , و هەڕەشەیان لێ دەکات لەسەر ستەمەکانیان , بەوازهێنان لە جەنگ و سەرپێچی کردنیان لەفەرمانی خوا .[1]

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( البقرە / ٢٤٧ ) .

زانا ( الرازی ) دەفەرموێت – کەئەمە کورتەکەیەتی :- بزانە کاتێك خوای گەورە لەئایەتی یەکەمدا ڕوونی کردەوە , کە وەڵامی داواکەیان دایەوە ، پاشان ئەوان پشتیان هەڵکرد ، ڕوونی کردەوە یەکەم هۆکاری بۆ پشت هەڵکردنیان بریتی بوولە ئینکاریکردنی فەرمانی ( طالوت ) ، ئەوەش چونکە داوایان کرد لە پێغەمبەرەکەیان کە داوا لە خوای گەورە بکات ، کەپاشایەکیان بۆ دیاری بکات ، ئەویش وەڵامی دانەوە کە خوای گەورە ( طالوت )ی بە پاشا بۆ ناردن .

پاشان خوای گەورە دیاری کرد بۆیان تا ببێتە پاشایان گوێڕایەڵیان نەکرد و پشتیان لە حوکم و دەسەلأتەکەی هەڵکرد و ووتیان :- ( أنّى يكونُ لَهُ الملكُ علينا ) زۆر دوورکەوتنەوە لەوەی ڕازی بن ئەو پاشایان بێت ، زانایانی تەفسیر دەڵێن :- هۆکاری ئەو دورکەوتنەوەیەش بریتی بوو لەوەی کە پێغەمبەرایەتی تایبەت بوو بە نەوەیەکی دیاریکراو ، لەنەوەکانی ( بنی إسرائیل ) کەنەوەی ( لاوی کوڕی یعقوب ) بوو ، کە هارون و موسا لەوان بوون ، نەوەی پاشایەتیش نەوەی ( یهوذا ) بوون ، کە داود و سولەیمان لەوان بوون ، بەڵام ( طالوت ) لە

---

[1]/ صفوة التفاسير ( ١/ ١٥٢ ) بە دەستکاریەوە .

هیچ کام لەم دوو نەوەیە نەبوون ، بەڵکو لە نەوەی ( بنیامین ) بوو ، لەبەر ئەم هۆکارە ئینکاریان کرد پاشایان بێت ، وایان لێکدایەوە خۆیان شیاوترن بۆ پاشایەتی تا ( طالوت ) پاشان ئەوان ئەو تانەو تەشەرەیان دڵنیا کردەوە بە تانەو تەشەرێکی تر کە ووتیان :- ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەژارە

﴿ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( البقره / ٢٤٧ ) . ئەوان تانەو تەشەریان لێدا لە مافیدا کە پاشابێت بەدووشت :

یەکەم : ئەو لە بنەماڵەی پاشایان نی یە .

دووەم : ئەو هەژارە ، خوای گەورە ڕونیکردەوە کە ئەو کەسێکی شیاوە بۆ پاشایەتی .

* هۆکاری یەکەم :- بۆ ڕەتدانەوە ئەم تۆمەتە ، خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ ﴾.

بزانن قەومەکە کاتێك دانیاننا بە پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرە دا ، کە هەواڵی پێدان لەلایەن خواوە کە (طالوت)ی کردە ، پاشایان ، ئەوە بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوەیە بۆ دامەزراندنی پاشایەتی یەکەی ، ئەگەر ئەوە جێگیر بووکە پاشایە ، ئەوا گوێڕایەڵی واجب دەبێت ، و هەموو ڕەخنەیەك لەکار دەکەوێت .

* هۆکاری دووەم :- بۆ ڕەتدانەوەی تۆمەتەکەی تر خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ بەوەش دانی نا بە دوو وەسفی ( طالوت )دا : یەکەمیان : زانست ، دووەمیان : هێزو توانا .

ئەم دوو وەسفەیش باشترین و بەهێزترین هۆکارن بۆ گونجاوی ئەو کە مافی بێت بۆ پاشایەتی لە چاو قسەکەی ئەواندا ، ئەویش لە چەند ڕوویەکەوە ڕوون دەکرێتەوە :-

١- بێگومان زانست و هێزو توانا لە تەواوکاری یە ڕاست و پێویستەکانن ، بەڵام سەروەت و سامان و ناو وشۆرەت لەوانەنی یە .

٢- بە دڵنیایی زانست و هێز و توانا لە تەواوکاری یە دەستکەوتوەکانن بۆ جەوهەری نەفسی ئینسان ، بەڵام سەروەت و سامان و ناوبانگ دووشتی جیان لە دەرەوەی زاتی ئینسانن .

٣- زانست و هێزو توانا ناگونجێت لە ئینسان بسەنرێنەوە ، بەلاّم سامان و ناوبانگ دەگونجێت لە ئینسان وەربگیرێنەوە .

٤- بێگومان زانست بەکارو باری جەنگ , و بونی هێزو توانای زۆر لەسەر جەنگ کردن , دەبێتە هۆی سود وەرگرتن لە پاراستنی بەرژەوەندی وولاّتدا و دورخستنەوەی شەڕی دوژمنان لێی , ئەمە باشترە لەسود وەرگرتن لەپیاوێك کە ناوبانگ و دەوڵەمەندی درابێتە پاڵ , ئەگەر زانستی نەبوو بەرێك خستنی بەرژەوەندی یەکان و نەیتوانی دوژمنان لەناوبەرێت و دوریان بخاتەوە , ئەوە جێگیربوو بەوەی کەباسمان کرد کە پاشایەتی خستە پاڵ پیاوی زاناو بەتوانا , لەپێشترو چاکترە لەکەسێك کە ناوبانگ و دەوڵەمەندی بخرێتە پاڵ .[1]

﴿ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ ﴾ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەزانستی دەستکەوتوو لای دروستکراوانی خوا , بێگومان خوای گەورە دەستی خستون , وپێی داون . هەندێك لەزانایان مەبەست و بۆچونیان لەسەر ووشەی ﴿ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ ﴾ وادەربڕیوە کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە ( طالوت ) لاشەیەکی گەورە و تۆکمە , لە ڕووی بالاّی بەرزو ڕێك ولەش پڕی و جوانی یەوە , ئەمەش هیچ گرفتێکی تیانیە , وتراوە : جوانترینی نەوەی ئیسرائیل بووە , وتراوە : مەبەست لێی ( القوة ) هێزبووە , ( الرازی ) دەڵێت : ئەم قسەیە لای من ڕاستترە , چونکە سودی لێ وەردەگرێت بۆ لەناوبردنی دوژمنان کە هێزو ئازایەتی ولێهاتوویی یە نەك بالاّی بەرزو جوانی .

﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء ﴾ دانپیانانی پێغەمبەرەکەیان کە موڵك و پاشایەتی بۆخوایە و بەندەکانیش موڵکی خوان , بەهەرکەسێکی دەدات کە خۆی بیەوێت , کەسیش مافی ڕەخنەگرتنی لەکارەکانی خوا نی یە , چونکە ئەو بەویستی خۆی مامەڵە لەدەسەلاّتی خۆیدا دەکات . ﴿ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ئێوە تانەوتەشەرتان دا لە (طالوت) کە هەژارە ,بەلاّم خوای گەورە خاوەنی فەزڵ

---

١/ ( التفسير الكبير ) ( ٦/ ١٤٨ ) بەکورتی و بەدەستکاریەوە .

و ڕەحمەتی فراوانە , وزانایشە بەهەمووشتێك , زانایە بەوکەسەی کە گونجاوو شیاوە بۆ پاشایەتی و زانایشە بەحاڵی ئەوپاشایە لەئێستاو لەداهاتویشدا بە زانستی خۆی هەڵی دەبژێرێت . ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ ( البقرة / ٢٤٨ ) .

واتە :- پێغەمبەرەکەیان ( علیه السلام ) پێی وتن :- نیشانەی پاشایەتی طالوت و هەڵبژاردنی بەسەرئێوەدا ئەوەیە , کە خوای گەورە سندوقەکەتان بۆدەگێڕێتەوە کەلێتان سەندرابوو , وەك ( الزمخشري ) دەڵێت : سندوقی تەورات بوو , کەموسا ( علیه الاسلام ) کاتێك بجەنگایە پێش خۆیی دەخست , چونکە دڵ و دەرونی ئەوەی ئیسرائیلی ئارام دەکردەوە و لەجەنگەکە هەڵنەدەهاتن , لەو سندوقەدا ئاسودەیی و ئارامی تیایە لەلایەن پەروەردگارەوەو هەروەها پاشماوەکانی بنەماڵەی موساو بنەماڵەی هارونی تیایە . کە گۆچانەکەی موساوجل و بەرگەکەی و هەندێك لەتابلۆکانی تەورات , کەفریشتەکان هەڵی دەگرن و دەیهێنن .

( إبن عباس ) دەڵێت : فریشتەکان هاتن لەنێوانی ئاسمان و زەویدا سندوقەکەیان هەڵگرتبوو , هەتا لەبەردەمی ( طالوت ) دا دایاننا و خەڵکەکە سەیریان دەکرد , ﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ واتە : بەڕاستی لەدابەزینی تابوتەکەدا نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرا دیارە , کەئەویش ئەوەیە خوای گەورە طالوتی بە پاشا هەڵبژارد بەسەر ئێوەدا , ئەگەر ئێوە باوەڕداربن بەخواو ڕۆژی قیامەت .

﴿ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُوا اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ ( البقرة / ٢٤٩ ) .

( محمد علي الصابوتي ) دەڵێت :- واتە : کاتێك طالوت بە سوپاکە یەوە لە ( بیت المقدس ) دەرچوو تێ پەڕی , هەشت هەزارکەس دەبوون , بەناو خاکێکی وشك و بێناودابردنی , توشی گەرماو تینوێتی زۆرهاتن , ئەویش پێی وتن

بەڕاستی خوای گەورە تاقیتان دەکاتەوە بە ئاوی ڕوبارێك , کە لەنێوان ( اذن و فلسطين ) دایە .جا هەرکەس لەئاوی ئەو ڕووبارەی خواردەوە باهاوەڵی من نەکات , و هەرکەسیش لێی نەخواردەوەو نەیخستە سەردەمی , بێگومان ئەوە سەربازی منە , کە لەگەڵ مندا دەجەنگن , و هەرکەس مستێك ئاو بەدەستی بخواتەوە, ئەوە گرفت نی یە , تەنها بۆئەوەی گەروی تەڕبکات و تینوێتی یەکەی سوك ببێت , بەلاَم سوپاکە تەنها ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێت لەئاوی دەریاکە یان خواردوە .

( السدي ) دەڵێت ( حەفتاوشەش هەزار ) یان خواردیانەوە تەنها ( چوار هەزار ) یان نەیان خواردەوەو خۆیان ڕاگرت . کاتێك لەدەریاکە پەڕینەوە لەگەڵ ئەوکەسانەی ئارامیان گرتبوو لەسەر خواردنەوەی ئاوەکە , و چاویان کەوت بە ژمارەی زۆری سوپای دوژمن و ترسیان لێ نیشت , دەستەیەکیان . ووتیان :- ئێمە توانامان نی یە بجەنگین لەگەڵ دوژمن , لەگەڵ ئەوەی کە سەرکردەی سوپاکەیان ( جالوت ) ە , ئێمە کەمین و ئەوان زۆرزۆرن بەلاَم ئەوکەسانەی کەدڵنیابوون دەگەنەوە بەخوا , ئەو کەسانە بوون کە بەپاکی هەڵبـژێردرابون و لە زاناو چاکانی شوێنکەوتوانی ( طالوت ) بوون ,ووتیان :- بەڕاستی زۆرێك لە کۆمەڵی کەم بەفەرمانی خوا سەرکەوتون بەسەر کۆمەڵی زۆردا , و سەرکەوتن بە زۆری ژمارە نی یە بەڵکو لەلایەن خواوەیە , و خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە .[1] ﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ ( إبن كثير ) دەڵێت :- کاتێك لەبەرامبەر جالوت و سەربازەکانی یەوە وەستان , پاڕانەوەو داوایان کرد لە خوا , کە ئارامیان پێ ببەخشێت .واتە : لە ئاسمانەوە بیڕژێت بەسەریانداو لەناخی دڵ و دەرونیاندا جێگیری بکات و لەرزۆکیان نەکات . و هەنگاوەکانیان جێگیرو دامەزراویکات لە بواری جەنگدا و سەرکەوتنیان پێ بدا بەسەر دوژمنانی

---

١/ ( صفوة التفاسير ) ( ١/ ١٥٣ ) بەکورتی .

خۆیان و خوادا لەکافران و ئەو کەسانەی ئینکاری بەڵگەو نیشانەکانی خوایان دەکرد ، وخوای گەورەو بەتواناو بیسەرو بینەر کاربەجێ و شارەزا، وەڵامی داواکەیانی دایەوە و ئەوەی پێ گەیاندن کە خۆیان حەزیان پێ بوو .[1] ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاء وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ( البقرة / ٢٥١) .

( القاسمي ) دەڵێت : واتە: کۆمەڵەکەمەکە ، کۆمەڵە زۆرەکەی دووژمنانیان تێك شکاند ( بِإِذْنِ اللّهِ ) بەپشتیوانی خوای گەورە کەسەرکەوتنی پێدان ، کەئازایەتی دا بە کەمەکەو ترسی خستە دڵی کۆمەڵە زۆرەکەوە ، ( داود ) کەیەکێك بوو لەسەربازانی ( طالوت ) توانی ( جالوت ) بکوژێت، کە سەرکردەی بەهێزەکان بوو ئینجا خوای گەورە پاشایەتی بەخشی بە داود بەسەر نەوەی ئیسرائیل دا و دانایی و تێگەیشتن و پێغەمبەرایەتی پێدا ، ولەدروستکردنی زرێ و زۆر شت شارەزای کرد ، ئەگەر خوای گەورە کۆمەڵێکی خراپ بەدەستی کۆمەڵێکی باش لەناو نەبات ، ئەوا بەهۆی زۆر بوونی کافران و دەرکەوتنی هاوەڵدانان و سەرپێچی یەوە فەساد و خراپە سەرزەوی دەگرێتەوە، ﴿ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴾ واتە: خوای گەورە منەتی کرد بەسەریاندا بەلەناو بردنی دووژمنان ، وکەسانی لاوازی بەهێزکردو ، پاشایەتی ودەسەڵات و حیکمەت و دانایی دا بەهەندێکیان ، ولەهەموو زانستێکی بەسودی پێ دان تاخراپەکارانی خراپەمانی پێ لەناوبەرن .[2]

﴿ تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ ( البقرة/ ٢٥٢) .

( القاسمي ) دەڵێت:- واتە: ئەوانەی کەباسکران لەمراندنی هەزاران کەس و زیندو کردنەوەیان و بون بەپاشای طالوت و هاتنەوەی سندوقەکە، وڕوخاندنی

---

٢/ ( قصص الأنبياء ) ( ٤٨٢) بەکورتی.

٣/ ( محاسن التأويل ) ( ٣/ ٢٠٩) بەدەستکاریەوە .

جالوت , کە داود کوشتی ودواتر بویە پاشا , ئەمانە نیشانەو جیٚ دەستی خوایی بوون , هەواڵ بوو لەغەیبەوە , کەبەڵگەن لەسەرتواناى تەواوى خوا و حیکمەتەکانی و لوتف و بەزەی( نَتْلُوهَا عَلَيْكَ ) واتە: ئیٚمە ( جبريل) دەنیٚرین بۆلاى تۆ پیٚت بگەیەنیٚت بەدڵنیایی و ڕاستی کەهیچ گومانیٚکی تیانەبیٚت, ئەی محمد ( ﷺ ) بەڕاستی تۆیەکیٚکی لەپیٚغەمبەران , بەوەی کە ئەم نیشانانە دەبنە بەڵگە لەسەر تۆ, بەبیٚ مامۆستایەکی بەشەر کیٚ ئەمانەی فیٚری تۆکرد.

﴿ وانەو پەندە ئیمانیەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- زانا ( محمد رشيد رضا ) دەڵیٚت :- من هەندیٚك لەو سوننەت و ئەحکامە کۆمەڵایەتیانەتان بۆ باسدەکەم کەلەم چیرۆکەدا بۆم دەرکەوتووە:-

یەکەم: ئەگەر هەرنەتەوەیەك دەستدریٚژی کرایە سەر سەربەخۆی و دوژمن داییبەسەری دا و مافەکەیان خوارد , ئەوا هەستیان بەئاگادیٚتەوە بۆ لابردنی ئەو سستەمە و بیرلەڕیٚگە چارەیەك دەکەنەوە بۆی , تیٚدەگەن کە دەبیٚت ئەو یەك بونەیش سەرکردەیەکی داد پەروەرو پیٚشەوایەکی ئازاو بەجەرگ ئاراستەی بکات , ئینجا بەدوایدا دەگەڕیٚن تا دەستیان بکەویٚت .

دووەم:- هەست کردن نەتەوەو گەل بەواجب بونی پاراستنی مافەکانیان , بیٚگومان ئەوە لەسەر ڕاستی و تەواوى تایبەتمەندی یەکانیان دەبیٚت , وەك زانرا لە داواکردنی پاشایەکدا لەلایەن کەسە گەورە و ناودارەکانەوە.

سیٚ یەم :- لەکارو باری نەتەوەکاندا ئەوە بەدی دەکریٚت کە بیرو بۆچونی جیاواز هەیە لەهەڵبژاردن و دیاری کردنی سەرۆکدا , و ئیسلام ئەو کارەی داوەتە دەست مەسەلەی ( الحل والعقد ) دەبیٚت خەڵك شویٚنی بکەویٚت .

چوارەم :- خەڵکی ڕیٚك ناکەون لەسەر چاولیٚکەری یان شویٚنکەوتنی ئەوەی پیٚچەوانەی بەرژەوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکانیان بیٚت .

پیٚنجەم :- نەتەوەکان لەحاڵەتی نەزانیاندا وای دەبینن کە شیاوترین کەس بەپاشایەتی و سەرۆك , خاوەن سامانەکانن .

شەشەم :- ئەو مەرجانەی کەپیٚویستە لەهەڵبژاردنی کەسی پاشادا هەبیٚت , ئەوانەن کەلەم ئایەتەدا سودمان لیٚ وەرگرتوە :﴿ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾

حەوتـەم :- ﴿ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ ﴾ ئەوەی ئەم ئایەتە پێمان دەگەیەنێت , تواناو دەسەلأت و ویستی خوای گەورە , سوننەتە گشتی یەکانی جیٚ بە جیٚ دەکات لە گۆڕینی باری نەتەوەکاندا , بەمەرجێك ئەوان ناخی خۆیان بگۆڕن , و دەسەلأتیش لە ستەمکاران دەسێنێتەوە و دەیداتەوە دەست چاکەکاران .

هەشـتەم :- گوێڕایەڵی سەرباز بۆ سەرکردەکەی , لە هەموو کارێکدا کە فەرمانی پێدەکات و نەهی لیٚ دەکات , مەرجی سەرکەوتن و دامەزراوی کارە .

نۆیەم :- دەستەی کەم بەهۆی دامەزراوی و ئارامگرتنەوە سەردەکەون .

دەیەم :- باوەڕ بوون بە خواو بەڕاست دانانی ئەوەی کە پێی دەگەیتەوە لە قیامەتدا , لەبەهێزترین هۆکارەکانی ئارامگرتن و دامەزراوی یە لەهەڵوێستە جوانەکاندا .

یانزەیەم :- ڕووکردنە خوا بەدوعاو پاڕانەوە لەکاتی جەنگدا سود بەخش دەبێت , وەك ئەم ئایەتە بەڵگەی لەسەر دەدات ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ ﴾ کە خوای گەورە بەستی بەئایەتی دووعاکەوەو بەخێرایی بەدوای ئەو دا هێنای .

دوانزەیەم :- لەناوبردنی هەندێك کەس بەدەستی هەندێکی تر لەسوننەتە گشتییەکانە , کەئەمڕۆ زانایانی ( الحكمة ) بە ( تنازع البقاء ) ناکۆکی مانەوە , لێکی دەدەنەوە .

سیانزەیەم :- ئایەتی ﴿ لَفَسَدَتِ الأَرْضُ ﴾ پشتگیری ئەو سوننەتە دەکات کەزانایانی کۆمەڵناسی بە ( الأنتخاب الطبيعي ) هەڵبژاردنی سروشتی لێکی دەدەنەوە یان ( بقاء الأمثل) مانەوە بۆ باشترین .

بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەم ئایەتەیە کەدەفەرموێت : ﴿ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ ﴾ ( الرعد / ١٧ ) واتە : ئەوەی کەف و کوڵەو بیٚ سوودە دەڕوات و دەپوکێتەوە , بەلأم ئەوەی کە سوود بەخش و بەکەڵکە بۆ خەڵکی لەسەر زەویدا هەر ئەوە دەمێنێتەوە [١]

٢-دکتۆر ( صلاح عبدالفتاح الخالدي ) دەڵێت : لەئایەتی ﴿ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ﴾

١/ ( تفسير القران الحكيم ) ( ٢/ ٤٩٢- ٤٩٨ ) بەکورتی و دەستکاریەوە .

بەناونەهێنان و دیاری نەکردنی پێغەمبەرەکە گەیاندنی سەرگوزشتەیەکی خۆشی تیایە بۆئەو کەسانەی لەم چیرۆکە دەڕوانن , وەك ئەوەی داوایان لێ بکات ڕۆمەچن بۆ دۆزینەوەی ناوی ئەو پێغەمبەرە , و هەوڵ مەدەن بزانن کێ بووە , وەك ئەوەی قورئان پێیان بفەرمووێت : ئێمە بەویستی خۆمان ناوەکەیمان شاردۆتەوە وسیفەتەکانیمان نادیارکردوە , ئەگەر بمان ویستایە دیاری بکەین دیاریمان دەکرد , و ئەگەر بمانزانیایە لە ئاشکراکردنیدا خەیروچاکە هەیە بۆتان دەمانکرد , ئێوە پێویستە بەوە قەناعەت بکەن کە بۆمان هێناون .

٣- پێغەمبەرەکەیان زیرەك و داناوشارەزابووە , کاتێك پێی فەرموون : ﴿ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سیفەتەکانیان شارەزابووە و سروشتیانی ناسیووە , و ئاگاداربووە بەسەر سیفەتی ترسنۆکی و پاشەکشێ کردن و پەیمان شکاندن و پشت هەڵکردن و پاڵ دانە وەیان لەئەرکەکانیان , بەڕاستی ئەمانە کەم و کورتی بوون لەسیفەتی جولەکەدا .

٤- ( طالوت ) قەدەغەی کرد لە قەومەکەی لەئاوی دەریا بخۆنەوە کەبەسەریدا تێپەڕین , لەگەڵ ئەوەی خواردنەوەی ئاو لە بنەڕەتدا ڕێپێدراوە , بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە بۆ پێشەواو کاربەدەست هەیە کە هەندێك جار ڕێگە لە شتە ( مباح ) ڕێپێدراوەکان بگرن و قەدەغەی بکەن لەبەردەستەکانیان یان هەندێکیان لەبەکارهێنانی .

بەو کارە شتەکە حەرام ناکات , چونکە حەرام کردن و حەڵاڵ کردن مافی خوایە , بێجگە لەخوا کەس ئەو مافەی نی یە .

دەتوانێت هەندێك جار ڕێگە لەو شتانە بگرێت و قەدەغەیان بکات , بۆڕێکخستنی ژیان و پەروەردەکردنی نەفسەکان , گوێڕایەڵی پێشەوا لەم کارەدا بەپێی شەرع دروستە سەرپێچی کردنیشی حەرامە , چونکە دەقی لەسەر هاتووە .

٥- بەڵگەیەك لەوە وەردەگیرێت , کە ( طالوت ) قەدەغەی کرد لەسوپاکەی ئاو لەدەریاکە بخۆنەوە , بەڵام ڕێگەی پێدان کە هەرپیاوێکیان بۆیان هەیە مستێك ئاو بخواتەوە , بێگومان ئەو تەکلیفێکیان لیٚ ناکات کە لە توانایاندا نەبێت , بەڵکو تەکلیفەکە لەتواناياندابوو .

پاشان زۆری لیٚ نەکردن لە تەکلیفە کەدا , و هەمووەرگاکانی لیٚ دانەخستن , بەڵکو قەدەغەی کردن لەشتێك بەڵام ڕێگەی شتێکی تری پێدان , لەم تەکلیفەشدا زیرەکی و لێهاتویی و شارەزایی بەدەرونی سەربازەکانی دەرکەوێت, و دەیزانی چۆن پەروەردەی کەسانی تری پیٚ بکات و پێشەوایەتیان بکات .ئەو قەدەغەی کرد لێیان لە دەریاکە بخۆنەوە , کە ئەو خواردنەوەیەش بریتی بوو لەبین پێوەنان و دەم خستنە ناوئاوی دەریاکەوە , بەبیٚ بەکارهێنانی هۆکارێك , بەڵکو ڕاستەو خۆ بەدەمیان دەیان خواردەوە .

ڕێگەی دا بەهەریەکە یان بەدەستێکی مستێك ئاو بخواتەوە کە ئەوەش تینوێتی دەکوژێت و دەیرەوێنێتەوە .

٦- نهێنی ئەو دەربڕینە چی بوو کەخوای گەورە لەئایەتی ﴿ وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي ﴾ دا , ووشەی ( الشرب) ی گۆڕی بە ( الطّعم ) ؟

مەبەست لە ( الطّعم ) بۆ چەشتن بووە واتە : ئەو کەسەی دەمی بۆنەبات و لیٚی نەچێژێت تەنها ئەو کەمە دیاری کراوە نەبێت بێگومان ئەوە لەکۆمەڵی منە.

( القرطبي ) دەڵێت :- ( خوای گەورە نەیفەرمووە : ﴿ وَمَن لَّمْ يَشربه ﴾ چونکە عادەتی عەرەب وابووە , ئەگەر شتێکیان دوبارەکردایەتەوە , دەبوو بەوشەیەکی تر دوبارەی بکەنەوە , و زمانی دەربڕینی قورئان ڕەوانترینی زمانەکانە ) .

( الرازي ) دەڵێت : ئەگەرئینسان زۆر تینووی بوو , پاشان ئاوی خواردەوە , وویستی باسی ئەو ئاوە بەتام و لەزەتەوە بکات , دەڵێت :- بەڕاستی ئەم ئاوە وەك هەنگوین وابوو , بەخوار دنێکی بە لەزەت و خۆش و بەتام باسی دەکات . ئەگەر تینوێتی یەکە گەیشتە ئەو ئاستەی کە ئاوی خواردەوەو بەو خواردنە بەتامە باسی کرد , ئەوا پێویستە ئەو ناوبانگەی پیٚ بدات .

﴿ چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەم ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٢٧) لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ (٢٨) إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاء الظَّالِمِينَ (٢٩) فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٣٠) فَبَعَثَ اللّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ (٣١) مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءتْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴾ ( المائدة / ٢٧ – ٣٢ )

پێش دەستپێکی چیرۆکەکە :

خوای گەورە هەواڵ دەداتە پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) کە دوژمنەکانی دەیانەوێت دەستدرێژی بکەنە سەری و , وئامادەنین بچنە ناو دینەکەوە , چونکە حەسوودیان بە محمد (ﷺ ) برد , لەسەرئەوەی کە خوا فەزڵ و ڕێزی پێدابوو , و بەپەیامی ئاسمانیش ڕێزداری کردبوو , لەوەی کەپێشتر هاتبوو خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُواْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ﴾ ( المائدة /١١)

واتە: ( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە , یادی نازونیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان , کاتێك هەندێك کەس ویستیان دەست درێژی بکەنە سەرتان , خوایش دەستدرێژی یەکەی ڕاگرتن و ئێوەی پاراست .

خوای گەورە محمد پێغەمبەر (ﷺ ) ی ڕێزدار کرد چونکە لەپارێزگاران بوو , و ( جولەکەو نصاری ) یش شیاوی نەفرەت بوون بەهۆی یاخی بوون و سەرپێچیانەوە , ئەم ئایەتەی خوای گەورەیش زۆر گونجاوە , کە دەفەرموێت :﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴾ خوای گەورە دەیپارێزێت هەر کەسێك خۆی بیەوێت و ڕێنومایی دەکات بۆ ڕێزداری , و سەریش دەشێوێنێت لەهەر کەس

بەهۆی خراپەی خۆیەوە کە خۆی بیەوێت و سەر شۆڕی دەکات و ، بەدادپەروەرانە تاقی دەکاتەوە ، گوێڕایەڵی یەکان گوێڕایەڵی تریان لێ دەبێتەوە و سەرپێچیش ، سەرپێچی تری لێ دەکەوێتەوە ، و پاداشتی چاکەیش هەر چاکەیە لەدوای خۆی ، و سزای خراپەیش هەر خراپەیە لە دوای خۆی ، لەمەشدا دڵدانەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی هەبوو . ئایەتەکان لەگەڵ خۆیاندا گونجاون ، خوای گەورە پێش ئەوەی یاسای تۆڵەکردنەوەی کوژراو دیاری بکات و خوێن ڕشتن بە گەورە دابنێت ، گێڕایەوە کە چۆن شەڕ و خراپە لەسەر زەوی دەستی پێ کرد ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : ( هیچ نەفسێك بەستەم ناکوژرێت ، مەگەر کوڕەکەی ئادەم کەیەکەم کەس بوو ، بەشێکی لەو خوێنەدا هەیە ، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا )[١] ئەم چیرۆکە سەرەتای ململانێ ی نێوان حەق و نا حەق و خەیرو شەڕ دەگێڕێتەوە ، و چۆن سەرپێچی یەکە پەشیمانی و داخ و حەسرەتی بە دوای خۆیدا هێنا ، کە دەگونجێت کەسی ژیر خۆی لێ بپارێزێت ، کە سزای دنیایی بوو ، سزا قیامەتی یەکانیش بەرەو ئاگری دەبات کە خراپترین شوێنە ، بەشێوەیەکی گشتی ئەمە گێڕانەوەی سەرپێچی و گوێڕایەڵی و شەڕو خەیر بوو .

خوای گەورە فەرمووی : ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ ( المائدة / ٢٧ ) .

واتە : ئەی ( محمد ) (ﷺ) چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەم ( هابیل و قابیل ) بەسەر ئەو کۆمەڵی جولەکەی چاو چنۆکدا بخوێنەرەوە ، بەهەق و ڕاستی ، ئەم چیرۆکەی بۆ باسکردن و بیری خستنەوە ، کە چیرۆکێکی حەق و ڕاستە ﴿ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ﴾ واتە : کاتێك هەر یەکەیان

---

١ / ( البخاری ) بە ( ٦ / ٤١٩ ) لە ( أحاديث الأنبياء ) دا ڕیوایەتی کردوە .

بڕیاری قوربانی یەکیاندا و کاتەکەی نزیك بویەوە لە یەکێکیان کە ( هابیل ) بوو وەرگیراو قبولْ کرا , بەلاَم لە ( قابیل ) وەرنەگیرا. هەندێك لەزانایان وای بۆ چوون , کە ئەو دوو کوڕەی کە لە چیرۆکەکەدا بەناوی کوڕی ئادەم باسکراون , لەڕاستیدا لە پشتی خۆی نەهاتوون , بەڵکو لەنەوەو وەچەکانی یەتی , وە بەپێی دیاری کردنیش لەنەوەی ئیسرائیلن .

بەڵگەشیان لەسەر ئەمە کۆتا ئایەتی چیرۆکەکەیە : ﴿ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴾ کوشتنی یەکێکیان بە دەستی ئەوی تریان , هۆکار نەبوو بۆ بڕیاردانی تۆڵە کردنەوەی کوژراو و سزادانی لەسەر نەوەی ئیسرائیل , ئەگەر دوو کوڕ بوونبن ڕاستەوخۆ لەپشتی ئادەم خۆی هاتبن .

ئەم دوو کوڕەی ئادەم لەنەوەی ئیسرائیل نەبوون , لەبەربونی ماوەی درێژ لە نێوان ئادەم نەوەی ئیسرائیلدا , ئەگەر لەنەوەی ئیسرائیل بوون نەشارەزا نەئەبوو کە چۆن براکەی دفن بکات , هەتا قەلەڕەشێك ڕێنمایی بکات , چونکە لەناو نەوەی ئیسرائیلدا کەسێك نەبوو نەزانێت چۆن مردوو دفن دەکرێت , چاو لێکردنی بکوژ لەقەلەڕەشێك لە دفن کردندا , و لەوەوە فێر بێت براکەی دفن بکات , بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕووداوەکە لەسەرەتای بەشەری یەوە لەسەر ڕووی زەویدا ڕوویداوە , وایش دەردەکەوێت کەیەکەم تاوانی کوشتن بێت بەئەنقەست لەسەر ڕووی زەویدا ڕوویدا بێت – خوا زاناترە – .

بەڵگەیش لەسەر ئەوەی کە دوو کوڕ بوون لەپشتی ئادەم , خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ ﴾ ووشەی ( الأبن ) لەکەسێك دەنرێت کەلەپشتی ئەو هاتبێت و کوڕی ڕاستەوخۆی ئەو بێت , و بەپێی ( مجاز ) یش لە ( نسب ) دەنرێت , یاسای مامەڵە کردن لەگەڵ قورئاندا , بریتی یە لە هێنانی ووشەی قورئانی لەسەرمانای زمانەوانی حەقیقی و ڕاستی خۆی , ئێمەیش لەڕاستی و حەقیقەتەوە لانادەین بۆ ( مجاز ) , مەگەر کاتێك بەکارهێنانی مانا حەقیقی یەکە قورس و نابار بێت . لێرەدا هیچ شتێك نیە خۆمانی لێ بپارێزین لەبەکارهاتووی مانای حەقیقی .

هەروەها بەڵگەیەکی تریش فەرموودەکەی پێغەمبەرە , کە ئیمامی ( مسلیم و بوخاری ) لە ( عبدالله ی کوڕی مسعود ) ەوە ڕیوایەتیان کردووە , کە

فەرموویەتی :( لاتُقْتَلُ نفسٌ ظلماً , إلاّ كان على إبنِ آدم الأول كِفلٌ مِن دمِها لأنَهُ كانَ اوّلُ مَن سنَّ القتل )[١].( پێشتر مانامان کرد) .

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوڕەکە لە پشتی ئادەم هاتووە , چونکە دەفەرمووێت : ( إبن أدم الأول ) لێرەدا یەکەمی کاتی و مێژوویی یە .

ئەو یەکەم کەس بووە سوننەتی کوشتنی داهێناو یەکەم بکوژبووە , بەوکارە دەرگای خوێن ڕشتنی کردەوە , و بانگی ستەمکاران و خراپەکارانی کرد بۆ پەیڕەو کردنی ئەم تاوانە ناپەسەندە﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ﴾ خوای گەورە بەپێغەمبەر (ﷺ) ی فەرموو : کەچیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەم بەحەق و ڕاستی وەك خۆی بگێڕێتەوە , و پێغەمبەریش (ﷺ) چیرۆکەکەی بەحەق و ڕاستی بۆ خەڵکی خوێندەوە . هەردوو براکە لەکارێکدا جیاوازی کەوتە نێوانیان – کەنازانین چی یە – ئەوانیش بۆ بڕیاردان چونە لای باوکیان ئادەم ( علیە الاسلام ) , ئەویش داوای لەهەریەکەیان کرد کە قوربانی یەك بۆخوا پێشکەش بکەن و بڕیاربدەن , حەق لەگەڵ هەرکامیان بوو , خوا لەویانی قبوڵ دەکات , و ئەوەی تریشیان دەبێت بەهەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە , چونکە لەسەرحەق نە بووە !

قوربانیەکەش شتێکی تایبەت بووە – ناتوانین دیاری بکەین – کەهەریەکەیان بۆخوای بکەن , دەگونجێت خواردن یان خواردنەوە یان پێداویستی یان ئاژەڵ یان کشتوکاڵ بێت , دەگونجێ شتی تریش بێت . لەیەکێکیان وەرگیراو لەوەی تریان وەرنەگیرا . نازانین کەخوای گەورە چۆن وەری گرت , قورئان پێمان دەڵێت کە بەدوای چۆنێتی قبوڵ کردنەکەدا نەگەڕێین , چونکە هیچ سودێك بەدەست ناخات .

ئینجا شەڕ لەدڵی برا ڕقاوی یەکەدا جێگیربوو بەرامبەر براکەی , وشەیتان

---

١ / ( البخاری ) لە ( كتاب الأنبياء ) و ( خلق آدم ) دا و ( مسلم ) لە ( القسامة ) دا ڕیوایەتیان کردوە .

فریوی داو , دڵی داخست کەوەڵامی حەق و ڕاستی بداتەوە , یان بگەڕێتەوە بۆ سەرڕاستی . ئەم برایە زانی کە لەسەر حەق نی یە , بەڵکو حەق لەگەڵ براکەیەتی . چونکە خوای گەورە قوربانیەکەی ئەوی قبوڵ کرد , دەبێت ئەم بەهەڵوێستی خۆیدا بچێتەوەو , لەبۆچونەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە .

بەڵام لەکوێ ئەم کارە بکات , شەیتان زاڵبوو بەسەریدا , هەموو هەوڵێکی لێ تێکدا , کە بەهێمنانە بیربکاتەوە , و هەموو دەرگایەکی گەڕانەوەو بەخۆداچونەوەی لێ داخست , تەنها یەك شت لای ئەو مایەوە , بریتی بوو لەسووربون لەسەر هەڵەو تاوان ,و سەرخستنی بۆچونی بەتاڵ , و نەفسی شەڕانی .

خۆزگە شەیتان تا ئەم ئاستە لەم برا ڕق لەدڵەڕازی بوایە و وازی لێهێنایە ، ئایا شەیتان بەوە ڕازی دەبێت کە دۆستەکانی خۆی لە قۆناغێکی کارە بەتاڵەکاندا ڕادەگرێت ؟ نەخێر بەڵکو دەیانبات بۆ قۆناغێکی تری کاری بەتاڵی خراپتر و ناشرینتر :

شەیتان ئەم برا ڕق لە دڵەی گوێزایەوە بۆ قۆناغێکی مەترسیدارتر ، کەبیرکردنەوە بوو لە کوشتنی براکەی ،و نەخشەدانان بۆ ئەو کارە !

تەنها ئەو بیرکردنەویەش بۆ خۆی تاوانێکی گەورەیە . ئەو ووشە ترسناك و مەترسیدارەی ئەم برا ڕق لە دڵەوە دەربڕی بریتی بوو لە (لَأَقْتُلَنَّكَ ) ئەمەش چەند ئاماژەیەك لە خۆی دەگرێت :

١- ئاماژەیە بۆ ئەوە شەیتان لە نەفسیدا جێگیر بووە و زاڵ بوو بەسەریدا .

٢- ئاماژەیە بۆ خۆ بە گەورە زانینی و لوتبەرزی ، وەڵام نەدانەوە و قبوڵ نەکردنی ئەو حەقەی لای براکەیەتی .

٣- هەموو مانایەکی برایەتی و ئینسانی بەرامبەر براکەی لە دڵیدا لابرد .

برا باوەڕدارەکە بەچی وەڵامی هەڕەشەی براکەی دایەوە ؟ خوای گەورە فەرمووی:

﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٢٧) لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ (٢٨) إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاء الظَّالِمِينَ ﴾ (المائدة/ ٢٧-٢٩)

برا باوەڕدارەکە قاعیدەیەکی قورئانی ئیمانی جێگیر پێشکەش دەکات ، کە لای خوای گەورە قبوڵ و وەرگیراوە دڵنیای دەکاتەوە و لە شتێکدا کورتی دەکاتەوە ، کە خوای گەورە تەنها لە خۆپارێزانی وەردەگرێت ، چونکە تەقواو لە خواترسان مەرجی وەرگرتنی کردەوکانە لای خوا .

وەك چۆن بەروبوم لە ڕوەك و درەختەکان پەیدا دەبن ، کردەوەیش چاك و دروست و وەرگیراو نابێت ، ئەگەر لە ئیمان و تەقواوە سەرچاوە نەگرێت .

خوای گەورە تەنها کردەوەکانی ناوێت ، بەڵکو شوێنەوارەکەی لەناو نەفسی خاوەنەکەیدا دەوێت .

پاش ئەوەی برا باوەڕدارەکە بنەمای وەرگرتنی کردەوەکانی لای خوای گەورە پێشکەشی برا ستەمکارەکەی کرد ئەویش بە هەڕەشەی خراپی خۆی بە کوشتن وەڵامی دایەوە ، بەڵام وەڵامی ئەم نەرم و هێمن بوو ، ووتی (سوێند بە خوا ئەگەر تۆ دەستدرێژی بکەیت بۆ من ، بۆ ئەوەی بمکوژیت ، من دەستدرێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم).

وەڵامێکی هێمن و هێواش و لەسەر خۆ بوو بۆ هەڕشەی براکەی ، و براکەی دڵنیا کردەوە کە ئەم بیر لە کوشتنی ئەو ناکاتەوە ، و هێمنی و سەلامەتی و لەسەر خۆیی خۆی بۆ ڕاگەیاند ، کە ئەمەش لە باوەڕەوە سەرچاوەی گرتووە .

برا باوەڕدارەکە دەست درێژی ناکات بۆ کوشتنی براکەی .تابرا ڕق لە دڵەکەی تەفسیری خراپی ئەم هەڵوێستەی نەکات و ، وا گومان نەبات کە بیرکردنەوەی ئەو لە کوشتنی لە بێدەسەلاتی و بێ ئاگایی دایە . بۆیە هەڵوێستەکەی بۆ ڕوونکردەوە ، و هۆکارەکەی بۆ باسکرد ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ بەڕاستی من لە سزا و تۆڵەی خوای پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم .

پاشان برا باوەڕدارەکە هۆکارێکی تری بۆ زیادکرد ، کە دەستدرێژی نەکات بۆ کوشتنی ئەو ، ئەویش لەم ئایەتەدایە :- ﴿ إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ ﴾ .

واتە : ( من بەو دەستد درێژی نەکردنەم ) بەڕاستی دەمەوێت بە گوناهی من و گوناهی خۆیشتەوە بگەڕێیتەوە ، ئەو جا دەبیتە نیشتەجێی ناو ئاگر ، هەر ئەوەشە پاداشتی ستەمکاران .

ئەوە دەگەیەنێت کە بکوژ بە تاوانی دووکەسەوە دەگەڕێتەوە ، هی خۆی و کوژراوەکە .

بۆ تاوانی بکوژەکە ، ئەوە هیچ گرفتێکی تیا نی یە ، چونکە تاوانی خۆی کردوە بە کردەوە .

بەڵام ، کاتێك بە تاوانی کوژراوەکەیشەوە دەگەڕێتەوە ، ئەمە چی دەگەیەنێت؟ ئایا بکوژ هەموو تاوانەکانی کوژراوەکەی دەچێتە سەر ، بەجۆرێك کوژراوەکە تاوانی پێوە نەمێنێت ؟ من وا گومان نابەم .[1]

ڕەنگە ماناکە بەم جۆرە بێت : بکوژەکە بە تاوانی کوژراوەکەوە دەگەڕێتەوە ، بە تایبەت تاوانی کوشتنەکە ، ئەگەر کوژراو بکوژبوایە دەبوو بکوژ تاوانەکەی هەڵگرتایە ، کاتێك هەوڵی کوشتنێك لە نێوان دوو کەسدا بدرێت،ڕەنگە تاوانی کوشتنەکە بەیەکسانی بەر هەردووکیان بکەوێت , چونکە ئەگەر دوو موسڵمان بەشمشێرەوە ڕووبەڕووی یەك بونەوە بۆ کوشتنی یەکتریَ , ئەوا هەردوو کیان لەناو ئاگردان . بکوژەکە لەناو ئاگردایە , چونکە تاوانی کوشتنەکەی ئەنجامداوە , و کوژراوەکەش لە ئاگردایە , چونکە سور بووە لەسەر کوشتنی بەرامبەرەکەی .

﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ ( المائدة / ٣٠ ) . واتە : سەرئەنجام نەفسی سەرکەشی هانیداو کوشتنی براکەی لائاسانکردوو کوشتی , ئیتر خۆی خستە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانەوە .

کوشتنی ئەم برایە , خەسارەتمەندی یەکی ڕەها بوو , ئایا ئەم برایە هیچ سودێکی لەمە دەستکەوت ؟ و مەبەست و ئامانجەکانی جیٚ بە جیٚ بوون ؟ ئایا گەیشت بەوەی کە شەیتان بەڵێنی پیٚ دابوو ؟ بێگومان ئەو هیچ بەرهەمێکی لەکارەکەی کۆنەکردەوە , کە کوشتنی براکەی بوو , بەڕاستی ئەو خەسارەتمەندی یەکی گەورەی تووشهات . ئەم خەسارەتمەندی یەش هەموو

---

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ( ٢٠٨-٢١٦ ) بە کورتی و دەستکاریەوە .

وەلأمدانەوەی وەسوەسەکانی شەیتان بوو .

ئەم خەسارەتە بەسەر هەموو کەسێکدا دەکەوێت کە سەرپێچی فەرمانی خوا بکات .

﴿ فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ﴾ ( المائده / ٣١ ) .

زانا ( السعدي ) دەڵێت :- کاتێك براکەی کوشت , نەیزانی چی لێ بکات , چونکە یەکەم مردوو بوو لەنەوەی ئادەم , ئینجا خوای گەورە قەلەڕەشێکی نارد , چاڵێکی هەڵکەند لەسەر زەوی یەکدا تا قەلەڕەشێکی مردووی تری تیا بشارێتەوە , تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە چونکە لاشەی مردوو عەیب و عاری دەردەکەوێت , بەو جۆرە چارەنوسی سەرپێچی کاران پەشیمانی و خەسارەتمەندی یە[1]

زانا ( محمد رشيد رضا ) دەڵێت :- لەکاتێکدا ئەم تاوانی کوشتنە یەکەم تاوان بوو , لەناو نەوەی ئادەمدا ڕویدا, کە ئینسان بوو بەرپرس بوو لەداهێنانی ئەم کارەو هەڵبژاردنی , لەکاتێکدا ئینسان لەهەموو کارەکانیدا ئیختیاری دراوەتێ و سەرپشك کراوە , یەکەم بکوژ نەیزانی چۆن جەستەی برا کوژراوەکەی بشارێتەوە , کە ناڕەحەتی دەکرد بەئاشکرا سەیری جەستەو عەورەتی بکرێت , خوای گەورە فێری کردین یەکەم بکوژ لەقەلەڕەشێکەوە فێری شاردنەوەی جەستەی کوژراوی براکەی بوو , ئەم کارەش پێمان دەڵێت کە ئینسان لە پێگەیشتنی سەرەتایدا لەوپەڕی سادەیی دا بووە , لەبەر ئەوەی ئامادەبونی هەیەو بەسەر هەموو ئاژەڵ و دروستکراوەکانی تردا ڕێزی هەیە , سود لە هەموو شتێك وەردەگرێت لە ڕووی زانست و تاقی کردنەوەوە , پلە بە پلە بەرەو پێش دەچێت .

---

١ / ( تيسير الكريم المنان ) ( ٢ / ٢٨٠ ) .

ئەوەش بەوەی کە خوای گەورە قەلەڕەشێك دەنێرێت بۆ ئەو شوێنەی ئەوی لێ یە ، چاڵێك لەزەوی یەکەدا هەڵدەکەنێ بەقاچەکانی ، وەك ئەوەی بۆ شتێك بگەڕێت باڵندەکان ئەم کارە بۆ دەستکەوتنی خۆراك دەکەن ، قەلەڕەشەکە درێژە دەدات بەکاری گەڕانەکەی لە زەویدا ، چونکە خوای گەورە فەرمووی : ( يبحَثُ ) ، نەیفەرموو ( بَحَثَ ) کەبەردەوامی لەکارەکەیدا دەگەیەنێت ، کاتێك بەردەوام بوو ، چاڵێکی لەزەویدا هەڵکەند ، کاتێك بکوژەکە چاڵەکەی بینی ، سەری سوڕماو پەشۆکا لەشاردنەوەی جەستەی براکەی – پاشان سەرسوڕمانەکەی لاچوو ، ئینجا ڕێنمایی کرا بۆ ئەو کارەی پێویست و خوازراو بوو ، ئەویش شاردنەوەی جەستەی براکەی بوو لە چاڵێکی زەویدا ، ئەمە لەئایەتەکەدا دەست پێشکەری بۆ کراوە .[1]

﴿ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ ﴾( المائدة / ٣١). واتە : ( قابیل ) ی بکوژ بەداخ و حەسرەتەوە وتی لەناو چوون بۆ خۆم ، ئایا من هێندە لاوازو بێ دەسەڵات بووم ، کە وەك ئەم باڵندەیە بم ، کەجەستەی براکەم لەژێر خۆڵی زەویدا بشارمەوە ، وەك قەلەڕەشەکە کردی؟

﴿ فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ ﴾ پەشیمانی ڕووی تێکرد لەسەر ئەوەی کە ڕێنمایی نەکرا بوو بۆ شاردنەوەی جەستەی براکەی ، نەك پەشیمانی لەسەر کوشتنی براکەی ، ( إبن عباس ) دەڵێت : ئەگەر پەشیمانیەکەی لەسەر کوشتنی براکەی بوایە ، ئەوا دەبویە پەشیمانی تەوبەو گەڕانەوە بۆی .[2] بەدوای ئایەتەکانی چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەمدا ئەم ئایەتە دێت کە دەفەرموێت :- ﴿ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ﴾

١ / ( تفسير القرآن الحكيم ) ( ٦ / ٣٤٦ ) بەدەستکاری یەوە .
٢ / ( صفوة التفاسير ) ( ١ / ٣٣١ ) .

واتە : ( لەبەر ئەوەی کارەساتی کوشتنی ناڕەوای ئاوا ڕوونەدات , ئێمە پێویستمان کرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل , ئەوەی کەسێك نە بە ناحەق بکوژێت و , لە جیاتی کوژراوێك نەبێت , یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا , ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵکی کوشتبێت , ئەو کەسەیشی کەسێك لە مەرگ ڕزگار بکات , هەروەك ئەوەیە , هەموو خەڵکی لە مەرگ ڕزگار کردبێت , و ژیانی پێ بەخشی بن )[1] .

نەوەی ئیسرائیل لەبەر ئەوەی دیاردەی کوشتن و خوێن ڕشتن لەناویدا زۆر بوو , و بلاوەی کرد , پێغەمبەران و ئەوە کەسانەی فەرمانیان بەڕاستی و دادپەروەری دەکرد لە ناو خەڵکیدا , ئەوانیشیان دەکوشت , هەر دوو پێغەمبەر ( زەکەریا و یەحیا ) ئەوان کوشتیان , ئەوان مەبەستیان بوو هەردوو پێغەمبەران ( عیسی و محمد )

( علیهما السلام ) بکوژن .

﴿وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾( المائدة/ ٣٢ )

واتە : سوێند بێت بە خوا بەڕاستی پێغەمبەرانمان بەبەڵگەو موعجیزەی ئاشکراو دیارەوە هاتووە بۆ لایان ( تا پابەندی حەق و داد بن ) کەچی زۆربەیان دوای ئەو ڕێنمایی یانە هەر زیادە ڕەو بوون لەم سەر زەمینەدا لەستەم و کوشتنی نا حەقدا .

---

٣ / ( تەفسیری ئاسان ) ل ( ١١٣ ) .

﴿ پەندو وانە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- لەم چیرۆکەدا نرخی خوێنی مرۆڤ بەگەورە گیراوە , ئەمە لەشەریعەتە پێشوەکاندا , و لەم دینەیشدا ڕێزی گەورەتر و زیاتر بووە , پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( سبابُ المُسلِمِ فسوقٌ وقتالُهُ كفر )[1]

واتە : ( جنێودان بە موسڵمان دەرچوونە لە حەق و ڕاستی و جەنگ کردنیش دژی کوفرە ) .

هەرکەس بیەوێت بەتەمای خواو ڕۆژی قیامەت بێت , پێویستە لەسەری خوێنی برای موسڵمان نی بە تۆمەتی بچوك حەلاڵ نەکات , ئەگەر ترسا لە خوێنی کەسێکەوە دەگلێت بالەترسی فیتنە بە دینەکەیەوە هەڵبێت و بڕوات.

٢- هەروەها لەم چیرۆکەدا بەرهەمی تەقواو لە خوا ترسان دەردەکەوێت , کە چۆن بۆتە هۆکاری قبوڵ بوونی ئەو کارانەی کەبەندە ڕزگار دەکات لە دنیاو لە قیامەتدا .

٣- هەروەها لەم وانانەی کەلەم چیرۆکەدا وەردەگیرێت بریتی یەلە : گەورەیی داهێنراو لەدینی خوادا , هەرکەس بیدعەیەکی گومڕا کەر دابهێنێت , ئەوا تاوانەکەی و تاوانی ئەو کەسانەیش هەڵدەگرێت کە کاری پێ دەکەن , هەروەك چۆن کەسێك داهێنراوێکی جوان و بەسود دابهێنێت , پاداشتی کارەکەو ئەو کەسانەشی چاوی لێ دەکەن بۆی دەنوسرێت هیچ لەپاداشتی ئەوانیش کەم نابێتەوە .

٤- بونی پیاوێکی بکوژ کوڕی ئادەم بێت و لەپشتی ئەو هاتبێت , ئاماژەیەکی گرنگ دەدات , لەگەڵ ئەوەی کە ئادەم ( علیه السلام ) پێغەمبەرە , بەلأم کوڕەکەی ڕێگای بێباوەڕی و تاڵی هەڵبژارد , هەندێك لە پێغەمبەران

---

١ / ( بوخاری و موسلیم ) لە ( الأیمان ) دا ڕیوایەتیان کردوە .

کوڕی لە حەق و ڕاستی دەرچوو , و کافریان بووە , وەك ( کوڕی ئادەم و کوڕی نوح ) , هەندێك لە پیاو چاکانیش کوڕی لە سنور دەرچوویان دەبێت , ئەمە باوکانی چاکەکار عەیبدار ناکات , بەمەرجێك بە ئەرك و واجبی خۆیان هەستن بەرامبەر کوڕەکانیان , بانگەوازیان بکات و ئامۆژگاریان بکات و یادیان بخاتەوە

٥- بەڕاستی خوای گەورە کاری کەسانی لەخوا ترس و خاوەن تەقوا وەردەگرێت , هەرکەس حەز دەکات خوای گەورە کارەکانی قبوڵ بکات , پێویستە تەقواو لە خوا ترسان لە خۆیدا بەرجەستە بکات .

٦- ئەگەر کەسێك زانی حەق لەلای براکەیەتی پێویستە لەبڕیاری خۆی دابەزێت و ڕێگە بە هیچ شتێك نەدات پەیوەندی برایەتی و خۆشەویستی تێك بدات .

٧- باوەڕدار ناگونجێت باوەڕدار بکوژێت , مەگەر بەهەڵە .

٨- ئەوەی قەدەغەی کوشتن و خوێن ڕێژی لەباوەڕدار دەکات , ترسانە لە خوای پەروەردگاری جیهانەکان , نەك لاوازی و بێ دەسەلاتی و ترسنۆکی و کەم شارەزایی .

٩- کەسی تاوانکار کاتێك تاوانێك ئەنجام دەدات , هەموشتێکی لە دەست دەچێت .

١٠- ئەو ئینسانانەی لەسنور دەردەچێت و یاخی دەبێت زۆر جار بێ دەسەلات دەبێت بەرامبەر چارەسەری هەندێك لەگرفتەکان مەسەلە سوك و ئاسانەکان .

١١- یەهودو جولەکە لە هەموو نەتەوەکان زیاتر مومارەسەی کوشت و بڕو دوژمنایەتی و ستەم و خوێن ڕێژی دەکەن .

## ﴿ چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت ﴾

خوای گەورە لەسورەتی ( الكهف ) دا فەرموویەتی : ﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا (٩) إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا (١٠) فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا (١١) ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا (١٢) نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى (١٣) وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا (١٤) هَؤُلاء قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّوْلا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا (١٥) وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحمته وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا (١٦) وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا (١٧) وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ وَكَلْبُهُم بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا (١٨) وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا (١٩) إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا (٢٠) وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لا رَيْبَ فِيهَا إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَانًا رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا (٢١) سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاء ظَاهِرًا وَلا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا (٢٢) وَلا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا (٢٣) إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَى أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا (٢٤) وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا (٢٥) قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ ( الكهف / ٩- ٢٦ ) .

﴿ کورتەی چیرۆکەکە لە قورئانەوە ﴾

لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە دەڕوانینە چیرۆکی ( أصحاب الكهف ) یارانی ئەشکەوت , ناچینە سەر گێڕانەوەو قسەو باسە ئیسرائیلی یەکان , کە هەندێك لە مێژوو نوسان و زانایان تەفسیر هێناویانە , چونکە قورئان بەرنامەی ڕاست و دروستەو , بەجوانی مامەڵە لە چیرۆکی پێشینیاندا دەکات , هەروەك بە جوانی بۆی ڕوونکردوینەتەوە , هەروەك ئێمەیش ڕازی بووین بەوەی بۆ خۆمان .

یارانی ئەشکەوت , کۆمەڵێك گەنجی باوەڕدار بوون بەخوا , وەك قورئان ئاماژەی پێداوە لە حەوت کەس پێك هاتبوون . ئێمە هیچ شتێك دەربارەی ناوو کاریان , یان ئەو شارەی کەتیایدا بوون یان ئەو پاشایەی لەسەردەمی ئەواندابووە نازانین , یان ئەو دینەی کە ئەوانی لەسەر بوون , یان ئەو ئەشکەوتەی چونە ناوی .

ئەم دەستە گەنجە باوەڕدارە هەڵوێستەیەکیان کرد بۆ گەڕان و تێڕوانین , بەڵام بەئەنجامێکی یەکلاکەرەوە وە دەرچوون , کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە : تەنها یەك خوا هەیەو پەروەردگاری جیهانیانە , ئەوان تەنها باوەڕ بەوە دەهێنن , لەغەیری ئەو کەس ناپەرستن .

ئەوان زانیان کە قەومەکەیان کافرن , چونکە غەیری خوایان دەپەرست, ئەم کافربونەیشیان ستەم و درۆو درۆهەڵبەستنی لا بەدیهێنابوون , جاکێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێت ؟

ئەم کۆمەڵە گەنجە باوەڕدارە بیریانکردەوە لەهەنگاوی داهاتوو , ئەویشیان دەستکەوت کەلەقەومەکەیان گۆشەگیربن , چونکە باوەڕدارن و قەومەکەیان کافرن , بوارێك بۆ مانەوەی ئەوان نەماوە لەناویاندا .

لە شارەکەوە دەرچوون بۆ شاخ ، و بڕیاریاندا بچنە ناو ئەشکەوتێکەوە لە شاخەکەدا ! داوایان لە خوای گەورە کرد کە ڕەحمەتی خۆی برژێت بەسەریاندا لەناو ئەشکەوتەکەدا ، خوای گەورەیش وەڵامی دانەوە ، کە ڕەحمەتی خوایان لەسەر دەبێت ، بە جۆرێك کە خوای گەورە کاریان بۆ ئاسان دەکات ، و بەڵگە و نیشانەکانی بۆ ڕام کردن ، فەرمانی کرد بە خۆر کە نەدات لە جەستەیان ، تا ئازاریان نەدات ، لەبەیانیدا لەسەر جەستەیان ، لادەچوو ، و بەریان نەدەکەوت ، هەروەها لە کاتی خۆرئاوابونیشیان لایدەدا لێیان بۆ ئەوەی ئازاریان نەدات ،

ئەوان لە ناوەڕاست و شوێنێکی فراوانی ئەشکەوتەدا بوون ، یەکێکی تر لە نیشانەکانی خوا بۆ ئەوان لەناو ئەشکەوتەکەدا چاوەکانیان کراوەبوو ، کەسێك سەیری کردنایە وایدادەنا کە بەخەبەرن و سەیری ئەو دەکەن ، بەڵام لە هەمان کاتدا خەوتو بوون .

هەتا زەوی جەستەیان نەڕزێنێت،خوای گەورەهەڵی دەگێڕانەوەجارێك بۆسەرلای ڕست وجارێك بۆ سەر لای چەپ سەگێکیشیان لەگەڵدا بوو ، کە ئەویش لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکەدا پاڵکەوتبوو هەر دوو دەستی درێژ کردبوو ، هەروەك ئەوان خەوتبوو .

هەتا کەس دەستدرێژیان نەکاتە سەر کە خەوتبوون ، خوای گەورە ترس وبیمی هاویشتبوویە دڵی هەر کەسێك کە سەیری دەکردن ، بە جۆرێك ئەگەر سەیری بکردنایە ، پشتی هەڵدەکردو هەڵدەهات و ڕای دەکرد لە ترسا ، و دڵی پڕ دەبوو لە ترس .

بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ خەوتن ، بە جۆرێك بۆ ماوەی سێ سەدو نۆ ساڵ لەسەر ئەو شێوەیەمانەوە !

پاش ئەو ماوەیە ، خوای گەورە لە خەوەکەیان بێداری کردنەوە ، پرسیاریان لە یەکتری دەکرد لە ماوەی نوستنەکەیان ، ڕایان جیاواز بوو لە دیاریکردنی ماوەکەیدا ، هەندێکیان وتیان :- ڕۆژێك یان بەشی ڕۆژێك نوستون !

بەڵام زۆر ڕۆنە چون لە دیاریکردنی ماوەکەیدا ، چونکە زانیارییان لەسەری نەبوو ، زانینی ماوەکەیان دایە دەست خوا ، ووتیان : پەروەردگارتان زاناترە کە چەندێك ماونەتەوە لە خەوەکەدا .

ئینجا بایەخدان بە کارێکی گرنگتر ، کەسێکیان لە خۆیان ڕاسپارد ، کە بچێت بۆ شارەکەی کە لێی هاتبوون . لەو پارەیەی لایان بوو دایان پێی ، و ڕایان سپارد کە خواردنیان بۆ بکڕێت تا بیخۆن ، و داوایان لێکرد کە خواردنێکی پاك و باش و حەڵاڵ و دروستیان بۆ هەڵبژێرێت . هەر وەك داوایان لێکرد کە وریا و بە ئاگاو چاوکراوەبێت ، بە جۆرێك کەس پێی نەزانێت و هەستی پێ نەکات لەو کۆمەڵەیە ، چونکە لە قەومەکەیان دەترسان ، ئەگەر پێیان بزانن شوێنەکەیان دەدۆزنەوە ، پاشان دەیانکوژن ، یان توشی فیتنەیان دەکەن ، بەوەی کە بیانگێڕنەوە بۆ سەر دین و دەستوری خۆیان ، بیانگێڕنەوە بۆ هاوەڵپەرستی .

ئەو کەسەیان چوو بۆ شارەکە تا خواردن بکڕێت ، سور بوو لەسەر بە ئاگایی و چاوکراوەیی و خۆشاردنەوە ، بەلاَم خوای گەورە کارێکی تری ویست ، ویستی نیشانەیەکیان لەسەر بەدیبهێنێت ، و ببێتە بەڵگە لەسەر دەسەلاَتی لە زیندوکردنەوەی مردواندا ، کارەکەیانی ئاشکرا کرد ، قەومەکەیش ئەوانیان دۆزیەوە ، بوو بونە قەومێکی باوەڕدار بە خوا ، ئەو جیل و نەوە کافرە نەمابون ، کە ئەم گەنجانە لە دەستیان هەڵهاتبوون بۆ ئەشکەوتەکە ، و جیل و نەوەیەکی باوەڕدار بە خوا ، پەیدا بوو بوون .

کاتێك خەڵکە باوەڕدارەکەی ئەم شارە پیاوە باوەڕدارەکەیان بینی ، لەگەڵی چوون بۆ ئەشکەوتەکە ، کاتێك گەیشتنە ئەشکەوتەکە , حەوت پیاوە باوەڕ دارەکەیان بینی مرد بوون , بەلاَم ئەم جارەیان بەمردنی ڕاستی .

جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەریان , و خەڵکەکەیش ئاژاوەو ناکۆکی لە نێوانیاندا هەبوو لەسەر کارەکە , چیان لێ بکەن ؟ , هەیانبو دەیووت : خانوو بینایەکیان بەسەرەوە دروست بکەن , پەروەردگاریان زاناترە پێیان .

بەلاَم کاربەدەستان بڕیاریاندا , کە مزگەوتێك بەسەر شوێنەکەیانەوە دروستبکرێت . هەربەو جۆرەش بوو , کە بینای مزگەوتەکەیان بەسەرەوە دروستکرا !

بەو کارە لاپەڕەیەك لەلاپەڕەکانی ئیمان و ئیخلاس و دنیا نەویستی و پەنابردن بۆ خوا پێچرایەوە , و چیرۆکی یارانی ئەشکەوت مایەوە , خەڵکی و هاوەلاَنی خاوەن ئایینە ئاسمانی یەکان دەیگێڕنەوەو دەیگەیەنن . باوەڕدارانیش هەڵوێستە لەبەر دەمیدا دەکەن , تاوانەی ئیمانی و دڵسۆزی و دامەزراوە لێوەربگرن .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا ﴾ ( الكهف / ٩ ) .

( إبن كثير ) دەڵێت : ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خوای گەورەوە دەربارەی یارانی ئەشکەوت , دەفەرمووێت : ئەی محمد , ئایا تۆ وای دادە نێت کە هاوەلاَنی ئەشکەوت و ( الرقيم ) لە بەڵگەو نیشانە زۆر سەیرو ناوازەکانی ئێمە بن , کاری ئەوان لە تواناو دەسەلاَتی ئێمەدا سەیر نیە , چونکە بێگومان دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی شەوو ڕۆژ و بە دوای یەکدا هاتنیان و

ڕامکردنی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان , وشتانی تریش , لەنیشانە گەورەکانن کەبەڵگەن لەسەر توانای خوا , ئەو بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا کە بیەوێت , هیچ شتێك دەسەڵاتی ئەو لاواز ناکات , ئەوانە لە هاوەڵانی یارانی ئەشکەوت سەیرو عجیبترن .

دەربارەی ( الرقیم ) شەش بۆچون هاتوە بەکورتی :-

یەکەم : لەوحێك بووە , ناوی کەسەکانی لەسەر نوسراوە , تا کەسێك چووە ئەو شوێنە بیزانێت کە چیرۆکیان چی بووە .

دووەم : ناوی ئەو شارەبووە کە ئەو کۆمەڵە بڕوادارەی لێ دەرچوە .

سێیەم : ناوی شاخەکە بووە .

چوارەم : بەزمانی ڕۆم ( الدواە ) بووە ، واتەشتێکە وەك (پێستە) لەسەری نوسراوە .

پێنجەم : ناوی سەگەکە بووە .

شەشەم : ناوی ئەو شیوە بووە کە ئەشکەوتەکەی تێدابووە .[١]

﴿ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴾ ( الكهف / ١٠ )

واتە : باسی ئەو کاتە بکە , کە ئەو کۆمەڵە لاوە بەناوبانگە لەبەر مەترسی لەخۆیان و ئایینەکەیان لەقەومەکەیان هەڵهاتن و پەنایان برد بۆ ئەو ئەشکەوتەی کەکردیان بە جێ و شوێن بۆ خۆیان , و ووتیان :- ئەی پەروەردگارمان بەلوتفی خۆت , لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەتێکمان پێ بدە و بەزەیت پێماندا بێتەوە ، کە ببێتە هۆی لێبوردن و سڕینەوەی گوناهەکانمان و فەراهەم بهێنە بۆمان لەم کارەی کەواین تیایدا ، ڕێبردن و کەوتنە سەر ڕێگایە ، کە بمانگەیەنێت بە مەبەستی خۆمان .

---

١ / ( قصص القرآن ) ی ( محمود المصري ) ل ( ١٤٨ ) .

﴿ فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا (١١) ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا ﴾ (الكهف / ١١-١٢) . کاتێك کۆمەڵە لاوە باوەڕدارەکە گەیشتنە ئەشکەوتەکەی کە نیەتیان وا بوو تیایدا بمێننەوە بۆ ماوەی چەند شەو و ڕۆژێکی دیاریکراو ، تا لەوێدا بمێننەوە یان کۆچ بکەن بۆ شوێنێکی تر لە ترسی دینەکەیان هەڵهاتبون ، بەلاّم ئەو چاوانەیان کە چاودێرییان دەکردن و شەونخونی یان پێوە دەکرد ، خوای گەورەکردنی بە بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەو ڕوون ، کە خوای گەورە خەوی هێنا بەسەریاندا ، کە خەوێکی قورس بوو ، و خوای گەورە پەردەیەکی ئەستور و دەنگ بڕیشی دابە سەر گوێیەکانیاندا ، کە هیچ دەنگێك نەبیستن تا بۆ ماوەی سالاّنێکی دورو درێژ بخەون . پاش ئەو خەوە درێژە کە دیاریکراو نەبوو لایان ، خوای گەورە بە خەبەری کردنەوە ، تا خەڵکی ئەم موعجیزەیەی بۆ ڕوون ببێتەوە ، و کێش بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەو ماوەیەی ژماردووە ، با ئەو موعجیزەیە بە ڕوونی و دروستی بگێڕێتەوە ، دوو دەستە هەبوون کە ماوەکەیان خەملاّندبوو جیاوازی لە نێوانیاندا بوو ، کۆمەڵێکیان دەیان ووت : ڕۆژێکە یان کەمتر ، کۆمەڵەکە ی تریان دەیان ووت : هەر خوا خۆی دەزانێت . مانەوەی ئەو کۆمەڵە لاوە بە شاراوەیی و نادیاری ، دەنگ و هەراو پرسیارکردنی لەناو خەڵکەکە دا دروستکردبوو ، هەموو شوێنێك بە دوایاندا گەڕابوون بەلاّم نەیان دۆزیبونەوە و هیچ شوێنەوارێکیشیان دەستنەکەوتبوو ، خەڵکی ڕۆژی دیارنەمانەکەیان بە مێژووی دیاری کراو نوسیبوە ، کە فلاّن ساڵ و لە سەردەمی فلاّن پاشادا بووە ، هەر بەو جۆرە ئەو کۆمەڵە لاوە چووبونە ناو ئەو مێژوەوە ، دەستەی دوەمیش ئەو کەسانە بوون کە هەستیان پێ کردن و دۆزییانەوە ، ماوەی مانەوەکەیان بە پێی ئەوە پێوا کە لەناو ئەشکەوتەکە و سەر شێوەی خۆیان بینیان ، کەلە سەر شێوە و حاڵی خۆیان بوون ، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری یەکلایی کەرەوە ، نە لای دەستەی یەکەم بوو ، نە لای دەستەی دووەم بوو ، بەڵکو خوای گەورە بەڕاستی ڕوونی دەکاتەوە :

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ ( الكهف / ١٣ ) .

واتـه : ئـەی محمـد (ﷺ ) ئێمـه هـەواڵی گرنگـی ئـەوانت بـه ڕێـك و پێكـی و ڕاستی بۆ دەگێڕینەوه ، بەڕاستی ئەوانه کۆمەڵە لاوێکی بەهێزبوون کە باوەڕیان به پەروەردگاری خۆیان هێنابوو، و ئێمەیش ڕێنمونیمان زیادکردن و بەو جۆره خستمانه دڵیانەوه ، کە چۆن بکەن ؟ و چی بکەن ؟

ئەم کۆمەڵە گەنج و لاو بوون ، لەسەرەتای تەمەندا بوون بە گوڕ و حەماس و دڵ گـەرم بـوون ، کـه قۆنـاغی هیمـەت و دامـەزراوی بـوو لـه تەمەنیانـدا ، ئـەم سیفەتەیش لـه قورئانـدا بـەڕێزه و سـتایش کـراو و پەسـەندە خاوەنەکـەی ، لـه کاتێکدا کە بە کردەوە چاکەکان هەڵدەسێت .

ئیبراهیم پێغەمبەر ( علیه السلام ) کاتێك بتەکانی قەومەکەی شکاند بە گەنج ( فتـی ) باسـکرا ، قەومەکـەی ویسـتیان بـەم باسـکردنه لـه ڕێـزو هەیبـەتی کـەم بکەنــەوه ، و تۆمــەتباری بکــەن ، وەك ئــەوەی بڵــێن : گــەنجێکی هەرزەیــه و چارەنوسـی کارەکـانی خـۆی نازانێـت و ئەنجامەکـەی دیـاری نـەکردوه ، ئەگـەر گەورە و پێگەیشتو بوایە ئەو کارەی نەدەکرد .

﴿ وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴾ (الكهف / ١٤ ) . واتـه : دڵـەکانیانمان دامـەزراو کرد و ترسمان تێدا نەهێشت و ئیرادەمان بەهێزکرد و ئارامیمان پێ بەخشین تا دڵەکانیان تەواو جێگیر بوو ، لـه حـەق و ڕاستی دڵنیـابوون و شانازیان کـرد بـه ئیمانەکەیانه وه ، کاتێك چوونە لای پاشا ستەمکارە بێباوەڕەکە لەبەردەمیدا ڕاوەسـتانو گوێیـان بـه هـیچ شـتێك نـەداو ووتیـان :- پـەروەردگاری ئێمـه دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی یەو دەڵێن : نەخێر بۆ پەرستنی ئەو بتانـەی کە ئێمەی بۆ بانگ دەکەن ، هەرگیز ئێمەهاوەڵ بۆ خوا بڕیار نادەین ، ئەو تاکو

تەنهایەو هاوەڵی نی یە ، ئەگەر ئێمە کەسێك بێجگە لەو بپەرستین ، ئەوە لە حەق لامانداوە و ڕاستیمان نەپێکاوە،ولەستەم و گومڕایی دا زیادەڕۆیمان کردوە[1]

زانا ( الشنقيطي ) دەڵێت :- لەم ئایەتەوە تێ دەگەین ، هەرکەس لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگاریدا بێت ، خوای گەورە دڵی بەهێز دەکات ، و دامەزراوی دەکات بەرگەی نارەحەتیەکان بگرێت و بە جوانی وئارامگربێت.

﴿ هَؤُلاء قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّوْلا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴾ ( الكهف /١٥ )

ووتیان : ئائەوانە قەومەکەی خۆمانن ( لەڕێبازی ڕاست لایان داوە لە جیاتی خواناسی ) شتی تریان کردووە بە خوای خۆیان و دەیپەرستن ، دەبا بەڵگەیەکی ئاشکرایش بێنن لەسەریان ، جاکێ ستەمکارترە لەوەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت ؟! .

لاوە باوەڕدارەکان ئەوەیان ڕەتکردەوە کە قەومەکەیان دەیانپەرستن ، کوفرو بێ باوەڕی و هاوەڵ دانان بووبۆ خواداوایان لە قەوکەیان کرد کە ، بەڵگەو نیشانەی ڕونی لەسەر بهێننەوە ، ئایا ئەوەی ئەوانی لەسەرن ڕێپێدراوە ؟ قورئان دەیەوێت هەموان زانستی و پەیامداربن لە بیرو باوەڕو بیرکردنەوە و تێڕوانینیاندا ، هیچ بیرو بۆچون و بنەمایەك وەرنەگرن کە لەگەڵ ڕاستی دا نەبێت ، هەتا ئەو سیفەتە گرنگەی ئەوانی لەسەرن جێگیر بێت ، دەبێت بەڵگەو نیشانەی ڕوون پێشکەش بکەن کە خۆیان لەسەرین ، دەبێت ئەو بەڵگانەش هەموو عاقڵێکی ساغ وەریان بگرێت و لەگەڵ بۆچوونی ڕاستدا یەکبگرنەوە .[2]

---

١/ ( صفوة التفاسير ) ( ٢/ ١٧٨ ) بەدەستکاریەوە .

٢/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٢٩٨) بە کورتی .

﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحمته ويُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا﴾

( الكهف/ ١٦ ) . هەندێکیان ووتیان :- کاتێك کە ئێوە بە دڵ دوورکەوتونەتەوە و جیابونەتەوە لەم گەلە و لە هەر شتێك ئەوان ئەیپەرستن جگە لە خوا ، دەی بە جەستەیش جیاببنەوە و دوورکەونەوە لێیان ، بڕۆن بۆ شوێنێك بتوانن خواپەرستی تیا بکەن بێ ترس ، کەواتە لەناو ئەوانە دەرچن و پەنا ببەن بۆ ئەشکەوت ، ئیتر ئەشکەوتێکی دیارو ناسراو بوو بێت لای خۆیان یان هەر ئەشکەوتێك ، بیکەن بە جێگەو شوێنی خۆیان ، ئەگەر ئێوە ئەو کارە بکەن ، پەروەردگارتان دەروی خەیرتان لێ دەکاتەوە ، و لە خەیرو ڕەحمەتی خۆی بەشدارتان دەکات بە زۆری و فراوانی ، و بە ئاسانی بۆتان فەراهەم ئەهێنێت لەم کارەی خۆتاندا ، هەر شتێك کە سودی لێ وەربگرن و هۆکاری ژیانتان بێت .

* ئەم کۆمەڵە باوەڕدارەکەی بڕیاریاندا لە قەومەکە دوور بکەونەوە ؟

وەڵام :- پاش ئەوەی لە بارو دۆخی ئەو شوێنەی کە تیایدا دەژیان کۆڵیانەوە ، بڕیاریاندا لە قەومەکەیان دوور بکەنەوە ، ڕوانیان بۆ هێزی قەومە بێبڕواکە ، بینیان هەموو هۆکارێکی هێز و دەسەڵاتیان لا هەیە ، و خۆیشیان هیچیان نی یە لەو هێزە ماددی یە .

واتە ، ئەگەر ڕووبەڕوی قەومەکەیان ببنەوەو جەنگیان لەگەڵ بکەن ، ئەوا جەنگەکە لە بارو گونجاو نابێت بۆ یان ، پێشتر ئەنجامەکەی زانراوە ، کە ئەوان تیایدا سەرکەوتونابن ، ئیتر بۆچی تیایدا بمێننەوە ؟

پاشان سەیری هەڵوێستی قەومەکەیان کرد , بینیان لەسەر کوفر سوورن , گوێناگرن بۆ هیچ ووشەیەك لەبانگەوازی خوا , و وەڵامی ئەو کەسەیش نادەنەوە کە بانگەوازیان دەکات , بەڵکو پیلانی پێ دەگێڕن و ئازارو سزای دەدەن , و لەگەڵی دەجەنگن و خوێنی دەڕێژن , کەواتە موناقەشەو بانگەواز سودی نیە لەگەڵیاندا . زانیان کەمانەوەیان هیچ سودێکیان پێ نادات , ناگونجێت لەگەڵ ئەو قەومەدا بمێننەوە , بەڵکو ترسی ئەوەی هەیە قەومەکە توشی فیتنەیان بکەن و لە ئیمانەکەیان پاشگەزیان بکەنەوە .

کەبڕیاریان دا بڕۆن و بچنە ئەشکەوتەکە , بڕیارێکی ڕاست و سەرکەوتوو بوو

، و لەگەڵ حاڵەتی ئەواندا گونجاوو لەبار بوو . لەبەر ئەوە خوای گەورە وەڵامی دووعاکەیانی دایەوە ، و ڕەحمەتی خۆی فراوان کردوو ڕشتی بەسەریاندا ، و لەناو ئەشکەوتەکەیشدا هەموو هۆکارێکی ژیانی بۆ ڕەخساندن [1]

﴿ وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴾ ( الكهف / ١٧ ) .

واتە : کاتێك خۆر هەڵدێت ، دەبینیت تیشکەکەی لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکەوە لا دەدات و لەسەر ئەوان لا دەچێت ، و کاتێکیش کە خۆرئاوادەبێت تیشکەکەی بەئاڕاستەی لای چەپدا لا دەدات و لەسەر ئەوان دوور دەکەوێتەوەو لێیان نادات ، نەلەکاتی هەڵهاتن نەلەکاتی ئاوابوونیدا ، ئەمەش ڕێزێك بوو لەلایەن خواوە بۆیان تاگەرمی یەکەی ئازاریان نەدات ، ئەوانیش لەو کاتەدا لەناو بۆشایی یەکی فراوانی ناو ئەشکەوتەکەدا ڕاکشا بوون ، بەجۆرێك کە تیشکی خۆرەکە لێیان نەدات ، نەلەسەرەتای ڕۆژدا نەلەکۆتاییدا ، ئەم کارەیش بەڵگەیەکی بە هێز بوو لەسەر توانای خوای گەورە.

( إبن عباس ) دەفەرمووێت : ئەگەر خۆرەکە بەسەر ئەواندا هەڵبهاتایە دەیسوتاندن ، و ئەگەر ئەم دیوو ئەو دیویان نەکردایە واتە هەڵنەگەڕانایەنەوە لەسەر لایەکەوە بۆ سەر لایەکی تر ، ئەوە زەوی یەکە جەستەیانی دەڕزاندوو دەخوارد ، خوای گەورە هەرکەس هیدایەت بدات بۆ ئیمان و ڕێنمایی بکات بۆ ڕێگای بەختەوەری ، ئەو کەسە بەڕاستی هیدایەتدراوە ، و هەرکەسێکیش بەهۆی کردەوە خراپەکانی یەوە ، خوای گەورە سەری لێ بشێوێنێت ، ئەوا هەرگیز کەسێکی دەست ناکەوێت ڕێنمایی بکات [2] . ئەم ئەشکەوتە کۆمەڵێك سیفەتی جوغرافی گەردوونی هەبوو ، خۆر لەکاتی هەڵاتنی بەیانیدا نەدەچووە

---

١ / ( مع قصص السابقين فى القرآن ) ل ( ٣٠٠ — ٣٠١ )

٢ / ( صفوة التفاسير ) ( ٢ / ١٧٨ — ١٧٩ ) .

ناو ئەشکەوتەکەیان ڕاستەوخۆ , بەڵکو کەمێك بەلای ڕاستیدا لایدەدا , و لەکاتی ئاوابونیشدا لێیان نزیك نەدەبویەوە , بەڵکو جێیی دەهێشتن و تێیدەپەڕاندن , واتە لەکاتی خۆر هەڵهاتن و خۆرئاوا بووندا تیشکەکە لێی نەئەدان , دەبێت دەروازەی ئەشکەوتە کە ڕووی لەکوێ بوو بێت ؟ کەواتە ڕووی لەباشور بووە بەئاڕاستەی خۆرئاوا , لەکاتی خۆر هەڵهاتن لەوەرزی زستاندا تیشکی خۆرەکە لەگەڵ دەمی ئەشکەوتەکەدا تەریب دەبوو , و تیشکەکەی نەدەچووە ژوورەوە , و لەکاتی خۆرئاوا یشدا , تیشکەکە لەدەمی ئەشکەوتەکە لای دەدا بەرەو باکوری ڕۆژئاوا , ئایەتەکە ئەمەی لە ووشەی ( تقریضهم ) دا ڕوون کردۆتەوە , لە وەرزی هاوینیشدا دەمی ئەشکەوتەکە زۆر لەخۆرەکەوە دوور دەبوو , بەجۆرێك تیشکی خۆرەکە لەم وەرزەدا بەرەو باکور بوو , لەپشتی دەمی ئەشکەوتەکەوە تێدەپەڕی , وتراویشە دەمی ئەشکەوتەکە ڕووی لەباکور بووە , ئەمەش پێچەوانەی لێکدانەوەکەی پێشوو دەبێت , کەواتە هەوای فێنك و خۆش دەچووە ناو ئەشکەوتەکە و لێی دەدات و غازی ناو ئەشکەوتەکە و گەرمی خۆرەکە ئازاری لەشیان نادات , هەموو کاتەکانی تری ماوەی ڕۆژ بێجگە لەو دوو کاتەی باسکران , تیشکی خۆر دەدات لەدەوروبەری دەمی ئەشکەوتەکە , ئەوەش پێویستە بۆ پاك و خاوێن کردنی هەوای ناو ئەشکەوتەکە , ئەگەر دەرگای ئەشکەوتەکە ڕوو لە ڕۆژ هەڵات بوایە , ئەو کاتە دوانزە مانگ تیشکی خۆر دەکەوتە ناو ئەشکەوتەکە , لەکاتی هەڵهاتنی خۆردا , و ئەگەر ڕوو لە ڕۆژ ئاوابوایە , تیشکی خۆر لە ئێوارانـدا ئەچوە ناوی , ئابەو جۆرە خوای گەورە ئەم ئەشکەوتە نایابەی فەراهەم هێنا بۆ ئەو کۆمەڵە لاوە باوەڕدارە و ڕێی ئەوانی تێ خست .

﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ وَكَلْبُهُم بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴾ ( الكهف / ١٨ ) .

زانا ( إبن كثير ) دەڵێت : هەندێك لە زانایان باسیان كردوە , ئەوان كاتێك خوای گەورە گوێچكەكانی داخستن لەبیستن بە هۆی خەوەوە , چاوەكانیان نەنوقابوو , بۆ ئەوەی نەبا خێرا فەوتان ڕووی تێ بكات , كاتێك بە ئاشكرا لەبەر هەوا مایەوە , ئەوە هۆكارێكی باشتر بوو بۆ مانەوەی .[1] كاتێك كەسێك بەوێدا بڕۆشتایەو سەیری بكردنایە , وای دەزانی بەخەبەرن , چونكە ئەو نیشانەیەی خەوتوو لە بێدار جیا دەكاتەوە لای ئەو كۆمەڵە لاوە نەبوو , كە چاوەكانیان نوقابێت , بەڵكو كراوە بووە , وەك بێدارێك خەوتبون , ئەم دیوو ئەو دیوویان دەكرد و هەڵدەگەڕانەوە , هەر وەك چۆن خەوتوو وا دەكات , ئەگینا جەستەیان دەفەوتا و دەڕزی لەسەر خاكەكە ئەمەش حیكمەتی خوا بوو بۆ ئەو ماوە درێژە خەواندنی , ئەم دیوو ئەو دیویان دەكرد , هەروەك چۆن خەوتوو بەلای ڕاست و بەلای چەپدا هەڵدەگەڕێتەوە , ڕوحەكانیان لەماوەیەك بۆ ماوەیەكی تر لە جەستەیان دەردەچوو , دەگەڕایەوە ناوی , لەو جۆرە نەبوو كە مردنی بەسەر دابێت و ئیتر جارێكی تر نەگەڕێتەوە , بۆ جەستەیان , وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ( كە ئەمە ماناكەیەتی ) :- ( هەر خوایەكە كە گیانەكان دەكێشێت لەكاتی مردنیاندا , هەروەها ئەو گیانەش كە نەمرد لەخەوەكەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە , جا ئەو كەسەی كە خوا بڕیاری مردنی دابێت , ڕۆحەكەی دەگرێت و ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی , و ئەو كەسەیش كە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تاكاتێكی دیاری كراو . ) ( الزمر / ٤٢ ) . سەگی هاوەڵانی ئەشكەوتیش باسكراوە , وا باسكراوە كە یەكێك بووە لەگەڵ ئەواندا , هەمیشە عادەتی سەگیش وایە بۆ چاودێری یە , كەلەدەرەوەی ماڵ و شوێنە دیاری كراوەكان دەمێنێتەوە , و بەشێوەی پشودان خۆی دەدات بەزەویدا و چاوەكانی بەئاڕاستەی شوێنەكە یان ماڵەكە دەكاتەوە , ئەم حاڵەتەیش بەدیكرا كاتێك لاوەكان چوو بوونە ناو ئەشكەوتەكەوە

---

١ / ( تفسير القرآن العظيم ) ( ٣ / ٧٦ ) به كورتی .

سەگەكەيشيان هەردوو دەستى درێژ كرد بوو لەبەر دەم دەرگاى ئەشكەوتەكەدا , وەك ئەوەى چاوەڕێى ئەوان بكات بۆ هاتنە دەرەوە , ئەوەى بەسەر يارانى ئەشكەوتەكەدا هات , بەسەر سەگەكەيشدا هات . ووتراوە خواى گەورە واى لێكرد لەدەرەوە چاوەڕێ بكات و نەچوە ناو ئەشكەوتەكەوە لەگەڵيان , بۆئەوەى قەدەغەى چونە ژوورەوەى فريشتەكان نەكات بۆ ناو ئەشكەوتەكە , چونكە فريشتەكان ناچنە ماڵێكەوە هەيكەل و سەگى تيابێت .﴿ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴾ . دەڵێت : ووتەكە لێرەدابۆ پێغەمبەر (ﷺ) و دەيشڵێن بۆ ئەو كەسانەبووە كە سەيرى كردون لە چاخ و سەردەمە جياوازەكانـدا , ترسـاون كەتەماشـايان كـردوە , قـژى دريـژو نينـۆك و مـوو لەشـيانى داپۆشـيبوو . هـەروەها ووتراويشـە لەترسـى ديمەنەكـەيان چـونكە شـوێنى ڕوودانـى موعجيزەيـەك بـوو , كـە بەڵگـەبوو لەسـەر دەسـەلآتى خـواى گەورە لەهێشتنەوە ئەوان لەژياندا لەوماوە درێژەدا .[1]

﴿ وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا﴾ ( الكهف / ١٩ ) .خواى گەورە هـاوەڵانى ئەشـكەوتى لەخەوەكـەيان بەخەبـەرهێنا كەسـىْ سـەدو نۆسـاڵى پێچـوو , بەڕاسـتى ئەمـەش لەلێكدانـەوەى قورئانـدا ئاوڕلێدانەوەيەكى جوانە لەخەبەر كردنەوەى ئەوان ﴿ وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ ﴾چونكە كارەكـە لەزيندوكردنـەوەى مـردوان دەچـوو لەگۆڕەكەيانـدا ! ئەگـەرنا , ئايـا دەگەنجێت ئينسانێك بۆماوەى سىْ سەدو نۆساڵ بخەوێت ولەشى بەپارێزراوى و سـاغى مابێتـەوە , پـاش ئـەوەى لەخەوەكـەى بەخەبەربێتـەوە ؟ بەڕاسـتى موعجيزەيـەكى خـوايى ئاشـكرايە , بەڵگەيـە لەسـەر دەسـەلآتى خـواى گـەورە و ئيرادەو ويستى جىْ بەجێكارى .

١/ ( قصص القران الكريم وسيرة سيد المرسلين ) ل ( ٢٩٩– ٣٠٠ )

سودی ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە بەزیندوو کردنەوە باسی کردوون , چونکە جەستەو هەستەکانیان و جل و بەرگ و پێداویستی یەکانیان بە پاریزراوی مابونەوە , و هیچی لێ کەم نەبوو بوویەوە .

﴿ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءلُوا بَيْنَهُمْ ﴾ لەئەنجامی بەخەبەربونەوەیان پرسیارکردن لەنێوانیاندا ڕوویدا , پرسیاریان لەیەکتری کرد لەماوەی مانەوەکەیان لەئەشکەوتەکە دا , یەکێکیان ووتی :- بەخەوتوویی چەندێك لەناو ئەشکەوتەکەدا ماوینەتەوە ؟ یەکێکیان وەلامی دایەوە , ووتی :- ڕۆژێك یان بەشی ڕۆژێك , ڕەنگە ڕۆژێکی تەواو خەوتبین یان بەشی ڕۆژێك .

بەم شێوەیە لێکیان دایەوە , هەر چی لەناو ئەشکەوتەکەدا بوو لەدەوروبەری ئەوان وای دەگەیاند , بەڵگەیەك نەبوو لەسەر ماوەی درێژی خەوەکەیان هیچ شتێك لەدەوری ئەوان نەتێك چووبوو نەفەوتابوو نەووشك بوو بوویەوە نەڕزی بوو .

ڕەنگە هەندێکیشیان ئەم وەلامەیان بەتەواوو دروست لەقەڵەم نەدابێت , زانییان کەئەوان بێدەسەلاتن لە دیاری کردنی ماوەی مانەوەکەیان , دایانە پاڵ زانستی خوای گەورە ووتیان : ﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ﴾ .[1] هەندێکیان ووتیان : خوا زاناترە بەماوەی مانەوەمان , گەڕان بە دوایدا هیچ سودێك نادات , ئەوە وەرگرن کەگرنگترە بۆتان و سودی تیایە , ئێستا ئێمە برسیمانە ﴿ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ ﴾ واتە کەسێك لەخۆتان بنێرن بۆشارەکەی کەلێی هاتوین , باڕەم دراوە زیویانە ببات و بچێت ﴿فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴾ با باشترین و خۆشترین و بەتامترین خواردنی حەلاڵمان بۆهەڵبژێرێت و بیکرێت بۆمان , ﴿ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴾ ووریاو نەرم و نیان و لەسەرخۆبێت لەکاتی چوونە ناو شارەکەوە و کرینی خواردنەکەدا , تا هیچ کەس بەکارەکەمان نەزانێت .

---

١/ ( مع قصص السابقين في القران ) ل ( ٣١٢ - ٣١٣ )

﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا﴾ ( الكهف / ٢٠ ) هاوەڵانی ئەشکەوت بۆئەو هاوڕێیەیان ڕونکردەوە کە ناردیان بۆشار , شاراوەو نەرم و نیان و نهێنی پارێز بێت , چونکە ئەگەر قەومەکەیان پێیان بزانن و , کارەکەیان ئاشکرابێت , ئەوا دەگەنە ئەشکەوتەکەیان , سەردەکەون و زاڵ دەبن بەسەریاندا و بەردبارانیان دەکەن و دەیانکوژن یان دەیانگێڕنەوە بۆ سەردین و دەستوری پڕوپوچی خۆیان , دەیانکەنەوە بەبێ باوەڕو هاوەڵ پەرست , ئیتر بەم کارە هەرگیز سەرفرازنابن .

لەمەوە تێدەگەین کەهاوەڵانی ئەشکەوت سووربوون لەسەرئەوەی کارەکەیان بشارنەوە , کە قەومەکەیان هەستیان پێ نەکەن , لەبەرئەوە ویستیان خۆیان لەچاوی ئەوان بشارنەوە .[١]

﴿ وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لا رَيْبَ فِيهَا إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَانًا رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾ ( الكهف / ٢١ ) .

ئەم بەخەبەربونەوەیە بۆ هاوەڵانی ئەشکەوت سەرەتا دۆزینەوەو دەرکەوتنی کاری ئەوان بوو , تاببێتە موعجیزەیەکی دیار بۆهەمووخەڵکی , بەڕاستی خوای گەورە کارەکەی ئەوانی دەرخست و ئاشکرای کرد لەڕێگای شێوازی پارەکەیانەوە کە نوێنەرێکیان لەخۆیان نارد بۆکڕین و هێنانی خواردن , کاتێك پارەکەی دابەو کەسەی شتی لێ کڕی , شێوازەکەی گۆڕابوو بە جۆرێکی تر , ئەو دراوە هی ئەو سەردەمەبوو کەچوبوونە ناو ئەشکەوتەکەوە , هی سەردەمی پاشایەکی کۆن بوو , کاتەکەی تێپەڕی بوو , ئیتر خەڵکی شارەکەو بازاڕەکە لەدەوری کەسێکی غەریب کۆبوونەوەو دەستیان کرد بەپرسیارکردن لێی , تاکارەکە گەیشتە لای کاربەدەستی وڵات , ئەمەش کارێکی کوت وپڕو لەناکاو بوو بۆ خەڵکی , ئەوان ئەو گەنجە باوەڕدارانە بوون , لەتاو ستەم و زۆرداری

---

٢/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل( ٣١٨ ) .

پاشای ئەو وولاتە هەڵهاتبوون , کەبێباوەڕو هاوەڵ دانەربوو . ئێستا ئەو سەردەمە گۆڕاوەو کەسەکان کەسانێکی ترن و لەسەر دینێکی ڕاست و پەسەندن و گرنگی دەدەن بەکاری ئەو گونجە باوەڕدارانە , ئینجا هەموو خەڵکەکە چوون بۆلای ئەشکەوتەکە تاگەنجەکانی تریش ببینن , کاتێك نوێنەرەکەیان چویەوە لایان هەواڵیان بداتێ بەوەی کەدەستی کەوتبوو ,و ئەو سەردەمەش سێ سەدساڵ زیاتری تێپەڕاندبوو , خەڵکەکەیش ئەوانە نەبوون بیانناسنەوە , چونکە سەردەمەکەیان گۆڕابوو کەسی نزیك و خۆشەویستی ئەوانی تیانەمابوو , هەمووبەیەك دەنگ ووتیان : ئێمە بۆماوەی چەندێك ماوینەتەوە ؟ ﴿ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا ﴾ ( الكهف / ٢٥ ) هەموو بەدەنگی بەرز هاواریانکرد بۆ ئەوەی کەبیستیان ئەو ماوە درێژە ماونەتەوە و سەریان سوڕما , زانیان کە شوێنەکەیان لەگەڵ خەڵکی ئەم سەردەمەدا نی یە , حیکمەتیان بۆدەرکەوت و ڕاستی هەڵوێستی ئەوانیان بۆدەرکەوت , بێگومان خوای گەورە پشتیوانی دۆستانی خۆیەتی , کەسێك لەگەڵ خودادا

بێت ناترسێت , بەپێی ساڵی خۆری سێ سەد ساڵ و بەپێی ساڵی مانگی سێ سەدو نۆساڵ مانەوە بەخەوتوویی , پاشان خوای گەورە گێڕانیەوە بۆ ژیانی نوێ , ئەوان نمونەیەك بوون بۆ ئەو کەسانەی بینیان, کەلەسەر ئارام گرتن و ئیمان و دامەزراوی بوون , وبونە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی دوای خۆیان بۆ دامەزراوی لەسەر بیروباوەڕ , کەس زاتی ئەوەی نەکرد بچێتە ناو ئەشکەوتەکە و بۆشایی یە فراوانەکەی ناوەڕاستی کە ئەوانیی تیابوون, وچاوەڕێیان کرد بێنە دەرەوە , بەلام نەهاتنە دەرەوە , وخوای گەورەش بۆ هەمیشەیی مراندنی بەمردنی ڕاستی , هەرلەم شوێنەدا خەڵکی شارەکەیان دیوارێکیان دروست کرد , وقەدەغەیان کرد کەس بچێتە ژورەوە بۆلایان تاقیامەت لەو شوێنەی خۆیاندا بمێننەوە.[١]

---

١/ ( قصص القرأن الكريم وسيرة سيد المرسلين ) ل ( ٣٠١ – ٣٠٢ )

﴿وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لا رَيْبَ فِيهَا ﴾ واتە: هەروەك چۆن ئەوانمان بەخەبەر کردەوە لەخەوەکەیان , هەربەو جۆرە خەڵکمان هێنایە سەیرکردنیان , تابیاندۆزنەوە بەڵگەو نیشانەیان لێوەربگرن لەسەر ڕاستی زیندوکردنەوە , دڵنیابن کەبێگومان قیامەت دێت , وچیرۆکی یارانی ئەشکەوت دەبێتە بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرا و یەکلاکەرەوە لەسەر توانای زیندووکردنەوە , بێگومان خوای خاوەن تواناو تەقدیر بەتوانایە بەسەر زیندوکردنەوەی یارانی ئەشکەوتدا پاش خەوەکەیان کەسێ سەد ساڵ و زیاتربوو , وبەتوانایشە بەسەر زیندوکردنەوەی دروستکراوەکانیشدا دوای مردنیان ﴿ إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ﴾ کاتێك قەومەکەی ناکۆکی کەوتە نێوانیان دەربارەی فەرمانی یارانی ئەشکەوت پاش ئەوە خوای گەورە ئاشکرای کردن و پاشان مراندنی ﴿ فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَانًا ﴾ واتە: هەندێك لەخەڵکی وتیان : لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە بینایەك دروست بکەن , تاببێتە نیشانەیەکی دیار بەسەرمانەوە , ﴿ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ﴾ واتە: خوای گەورە زانا و شارەزایە بەحاڵیان و کاریان , ﴿بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾ کۆمەڵێکی تر کە زۆرینە بوون وتیان : بێگومان مزگەوتێکیان بەسەرەوە دروست دەکەین لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە کەنوێژی تیابکەین و خوای تیابپەرستین .[١] ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاءً ظَاهِرًا وَلا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴾ ( الكهف / ٢٢ ) .

زانا ( إبن كثير ) دەڵێت :- خوای گەورە هەواڵ دەدات و دەفەرموێت : خەڵکی جیاوازیان هەیە لەژماردنی یارانی ناو ئەشکەوتدا , سێ بۆچون دەگێڕنەوە , کەچوارەمی تیانیە , کاتێك دوو بۆ چونیان لاوازبوو ﴿ رَجْمًا بِالْغَيْبِ﴾ هەر

---

١/ ( صفوة التفاسير ) ( ( ٢/ ١٧٩ ) .

لەگۆترە بوو , قسەبوو بەبیٚ زانیاری , وەك ئەوەی کەسێك شتێك بهاوێت بۆ شوێنێك نازانێت ئامانج دەپێکێت یان نا, ئەگەر پێکای ئەو بەبیٚ مەبەست . پاشان بۆچونی سێیەم دەگێرێتەوە و بیٚ دەنگ بوو لەسەری لەسەر ئەوە دانی پیاناو بڕیاری دا ﴿ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ڕاستی گێڕانەوەکە , کەلەوانی تر ڕا ستتر وەردەگیرێت , ئایەتی: ﴿ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم ﴾ ڕێنماییە لەم کارەداو چاکترینە کەزانستی ئەم دەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە , کەپێویست ناکات کەس تیایدا ڕۆبچێت بەبیٚ زانیاری , بەڵکو ئەگەر فەرمانێکمان بەرچاوکەوت بیلێیت , وئەگەرنا لەسەری بوەستین , ﴿ مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ ﴾ واتە: تەنها کەمێك لەخەڵکی نەبێت کەس ژمارەیان نازانێت , ( قتادة ) فەرموویەتی : ( إبن عباس ) فەرموویەتی : من لەو کۆمەڵەکەمەم, خوای گەورە جیای کردونەتەوە , ئەوان حەوت کەس بوون , ولە ( عكرمة ) ەوە , وئەویش لە ( إبن عباس ) ەوە :

﴿ مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ ﴾فەرموی من لەو کۆمەڵەکەمەم , کە حەوت کەس بوون , ئەمە سەنەدەکەی ڕاستە تا

( إبن عباس ) کە حەوت کەس بوون , لەگەڵ ئەوانەی پێشودا ڕێکەوتون . ﴿ فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاء ظَاهِرًا ﴾ واتە لەم بابەتەدا موجادەلە مەکەو لەژمارەیان مەکۆڵەرەوە تەنها موجادەلەیەکی سوك و ئاسان و ئاشکرا نەبێت .کاری زانینی ئەوە هیچ گەورەیی تیانیە ﴿ وَلا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴾ واتە : ئەوان زانستیان بەوکارەنیە تەنها ئەوە نەبێت کە دەیلێن لەخۆیانەوە و ئەوان لەخۆیانەوە قسەلەنهێنی و شاراوەکان دەکەن , کەهیچ نێوەندو سەنەدێك نی یە, بیگەیەنێتە قسەی کەسێکی ( معصوم ) و پارێزراو , بێگومان ئەی محمد (ﷺ) خوای گەورە حەق و ڕاستی بۆتۆ هێناوە کەهیچ گومان و پێچ وپەنایەکی تیانیە , کەبڕیاردەرە لەسەر کتێب و ووتە پێشوەکان .[1]

---

١/ ( تفسير القران العظيم ) ( ٣/ ٧٨) بەکورتی.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە نەهی کرد لە پێغەمبەر ( ﷺ) کە پرسیارلە خاوەن کتێبەکان( یەهود و نەسارا ) بکات دەربارەی یارانی ئەشکەوت , چونکە زانستی ئەوەیان لانیە , وهیچ ڕاستی یەکیشیان بۆ دیاری ناکرێت کە جێی متمانەبێت. ئەم لێکدانەوەیەش تەنها تایبەت نیە بەیارانی ئەشکەوت بەڵکو گشتی یەوهەموو چیرۆکە قورئانیەکان دەگرێتەوە لەگەڵ هەوڵی پێشینەکان.ئاڕاستەکردنی ئەم فەرمانە بۆ پێغەمبەر ( ﷺ) , واتە بۆ ئومەتەکەیشی پرسیار لە خاوەن کتێبەکان ناکەین و هیچیان لێوەرناگرین , چونکە ئەوان کتێب و ووتەی خوایان تێکداوەو گۆڕیوە , وکەسانی ئەمین و دەست پاك نین لە هەواڵی مێژویی و ڕاستیەکاندا .پرسیارلە خاوەن کتێبەکان ناکەین و لێیان وەرناگرین , چونکە چیرۆکی پێشینەکان و ڕوداوەکانیان لەبابەتە غەیبی یەکانن لای ئێمە , ڕوداوە غەیبی یەکان و چۆنێتیان تەنها خوای گەورە دەیان زانێت, تەنها لەخوای گەورەوە وەردەگیرێت .[1] ﴿وَلا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا (٢٣) إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَى أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا ﴾ ( الكهف / ٢٣-٢٤) ئەم ئایەتە ئاڕاستە کراوە بۆ پێغەمبەر ( ﷺ) و هەموو موسڵمانان بۆئەوەی هەموو کارێك کەلەداهاتودا دەیکەن ببیەستن بەویستی خواوە , بڵێت: ﴿إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ ﴾ سبەینێ ئەو کارە دەکەم , و ڕێنمایی دەکات بۆ( ذکر ) یادی خوا لەکاتی لە بیرچونەوەداو ببیەستێت بەویستی خواوە ﴿اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ ئەم ئایەتە ئاماژەدەکات بۆکاتی دابەزینی چیرۆکی یارانی ئەشکەوت بەجۆرێك کەپێغەمبەر بەڵێنی دا بەکافرانی قوڕەیش کەوەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە لە ڕۆژی داهاتودا کەئاڕاستەی پێغەمبەر ( ﷺ ) یان کردبوو , ئەویش پێی فەرموون : سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە . لەبیری چوو بڵێت : ﴿ أَن يَشَاء اللَّهُ﴾ ئەگەر خوا ویستی بوو سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە.

[1]/ ( مع قصص السابقين فى القران ) ل( ٣٣٠-٣٣١) .

( جبریل ) بۆماوەی پانزە ڕۆژ وەڵامەکەی لەسەر دواخست , ئەویش لەسەر پێغەمبەر ( ﷺ) قورس و ناڕەحەت بوو , کافران گاڵتەیان دەکرد و پێدەکەنین , ودەیانووت: هاوەڵەکەت دەستی لێ هەڵگرتوویت, ئەم دواکەوتنەش مەبەستێکی خوازراو بوو , تاخوای گەورە ئەم وانەیەمان فێربکات , ئەم بنەما ئیمانیەمان پێشکەش بکات کە ئایەتەکە باسی کرد.

* ئایا پێغەمبەر ( ﷺ) شتی لەبیر دەچێت ؟ .

ئەم لەبیرچونەوەی پێغەمبەر ( ﷺ) زیانێك لە پێغەمبەرایەتی ئەو نادات , و هیچیش لەپاکی و پارێزراوی ئەو کەم ناکاتەوە. ئەوە ڕاستە کە پێغەمبەر (ﷺ) شتی لە بیر ناچێتەوە ﴿ سَنُقْرِؤُكَ فَلا تَنسَى﴾ ( الأعلى /٦) بەڵام ئەم لەبیرچونەوەیە نەفی کراوە, ئەمە بەویست و ئیختیاری خۆیەتی, بەڵام خوای گەورە ئەگەر ویستی لەبیری بچێت , ئەوا دواترلە بیری دەچێتەوە , لەبەر ئەوە بەدوای ئەم بەڵێنە دا ئەم ئایەتەی هێناوە : ﴿ إلاَّ مَا شَاء اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى ﴾( الأعلى /٧) . ئەو لەبیرچونەیەی کەنەفی کراوەو نابێت لەلەبەرکردنی قورئاندایە بۆی , چونکە بێگومان خوای گەورە دەستەبەریئەوەی کرد کە قورئان لەبەر بکات و لەبیری نەچێتەوە , تەنانەت حەرفێکیشی لەبیرنەچێتەوە .

بەڵام لەبیرچونەوە لەغەیری قورئاندا , ئەوە کارێکە دەگونجێت ببێت , بەڵکو لەپێغەمبەریشدا (ﷺ) ڕویدا , کاتێك لەبیری چوو کەلە ناو نوێژدا بوو , پاشان سوجدەی ( سهو) ی برد , پێش ئەوەی سەلام بداتەوە ! . بێگومان لەبیرچونەوەی پێغەمبەر ( ﷺ) بەڵگەیە لەسەر بەشەری بوونی , چونکە لەبیرچونەوە پێویستە بۆ ئینسان , بەڵگەیشە لەسەر پێغەمبەرایەتی یەکەی , چونکە خوای گەورە بیری دەخاتەوە و هەواڵی دەداتێ بەوەی کەلە بیرچویویەوە. کەسانێك دەپرسن: پێغەمبەری خوا (ﷺ ) چۆن شتی لەبیر دەچێت و سەهو دەکات لە ناو نوێژدا؟ وبیر لەچی شتێك دەکاتەوە ؟ دەربارەی ئەمە شاعیرێك دەڵێت:

یاسائِلي عن رسولِ الله كيفَ سها والسَّهْوَ في كُلِّ قلبٍ غافلٍ لاهِ
قدغابَ عن كُلَّ شيءِ قَلْبُهُ , فسها عمّاسوَى الله , في التعظيم لِلهِ

* پێغەمبەران ( علیهم السلام ) شتیان لە بیر دەچێتەوە :-

لەبیر چونەوە تەنها بۆپێغەمبەری خۆمان نە بوو , بەڵکو بۆ پێغەمبەرانی تریش بووە .

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵمان دەداتێ کەسولەیمان ( علیە السلام ) لەبیری چووە بڵێت : ﴿ إن شَاء اللّهُ ﴾ . ئیمامی ( بوخاری ) لە ( أبی هریر ) ەوە ( خوای لێی ڕازی بێت ) گێڕاویەتی یەوە , ئەویش لەپێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی :- ( سولەیمانی کوڕی داود ) ( علیە السلام ) ووتی :- سوێند بەخوا دەبێت ئەم شە و بەسەر سەد حەرەم یان نەوەدو نۆحەرامدا بگەڕێم بسوڕێمەوە , هەریەکەیان کوڕێکی سوارچاکی ببێت , لەڕێگەی خوداد بجەنگێت , هاوەڵەکەی پێی ووت : بڵێ ﴿ إن شَاء اللّهُ ﴾ . بەڵام نەیوت ﴿إن شَاء اللّهُ ﴾ ئەو حەرەمانە سکیان پڕنەبوو تەنها ئافرەتێکیان نەبێت , ئەویش لەتە کوڕێکی بوو , سوێند بەوکەسەی گیانی محمد (ﷺ) ی بەدەستە , ئەگەر بیوتایە :﴿إن شَاء اللّهُ ﴾ هەموویان دەبوون و دەبونە جەنگاوەری سوارچاك و لەڕێگەی خوادا دەجەنگان .[1]

هەر لەسورەتی ( کهف )دا ئەوەمان دەستکەوتووە , کە موسا ( علیە السلام ) بەڵێنی دا بە هاوەڵە چاکە کارەکەی ( خضر ) ( علیە السلام ) کەپرسیاری هیچ شتێکی لێ نەکات و ڕەخنەی لێ نەگیرێت لەسەر هیچ شتێك , بەڵام کاتێك بینی کەشتی یەکەی کون دەکرد , ڕەخنەی لێ گرت و ووتی :- ئایا بۆچی کونت کرد , بۆ ئەوەی کەسەکانی ناوەوەی نوقم ببن ؟ سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی ناشایستەی گەورەت کرد . کاتێك هاوەڵەکەی بەڵێنەکەی بیرخستەوە , موسا دانی نا بەلەبیرچونەوەی خۆیداو ووتی :- لێم مەگرە بەوەی کە لەبیرم چویەوە , وفێرببم لەسەر م قورس و گران مەکە .هەروەك قورئان هەواڵی داوە پێمان , کە باوکی مرۆڤایەتی و یەکەم پێغەمبەر ئادەم ( علیە السلام ) لەبیری چوو, ولە

١/ ( البخاري ) كتاب ( ٥٦ ) الجهاد , باب ( ٢٣ ) من طلب الولد للجهاد حديث رقم ( ٢٨١٩ )

بەری درەختەکەی ناو بەهەشتەکەی خوارد , ئەویش لەم ئایەتەدا هات :-
﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾ ( طه / ١١٥ )
واته : بێگومان ئێمە پێشتر پەیمانمان لەئادەم وەرگرت ( کەنزیکی درەختی قەدەغەکرو نەکەوێت ) کەچی بیی چوو, بەمەرجێك نەمان بینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەر پێچی یەبدات . [1] هەندێك کەس دەپرسن : بۆچی لە ئایەتەکەدا خوای گەورە ( إستپناء ) ی بەکارهێناوە , واتەجیاکردنەوە؟ ﴿ إلاّ أن يَشَاء اللّـهُ ﴾ بۆچی ئەم داهاتووەی بەستوە بە ویست و ئیرادەی خواوە ؟ ئایا ئەو ئینسانە ئەوەندە بێ دەسەلاتە لە داهاتوودا ئەو کارە بکات ؟ بۆچی بێدەسەلاتە؟. بێگومان داهاتوو بەنیسبەت ئینسانەوە غەیب و نادیارە , چونکە بەدەست خواوەیە بەتەنها , وخوای گەورەیش ئەوەندە هۆکاری نەداوە بەئینسان کە بیانگرێتەبەر لەسەر جێبەجێکردن , ئەوە دیاری بکات کەلەداهاتوودا بۆ ئەوە ڕوودەدات, یان کارەکە لەداهاتوودا ئەنجامبدات. لەبەر ئەوەی کەداهاتوو غەیب و شاراوەیە , لەبەر ئەوە کەس نایزانێت تەنها خوا نەبێت , چونکە کلیلی نهێنی یەکان لای خوان :

﴿ قُل لاَّ يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّـهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ ( النمل / ٦٥ )

﴿ اللّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَى أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا ﴾ ( الكهف / ٢٤ ) واتە: ( یادی پەروەردگاریش بکە کاتێك لەبیرت چوو بڵێیت: ( إن شَاء اللّهُ ) لەئەنجام دانی هەرکارێکدا بڵێ :- ئومێدەوارم پەروەردگارم ڕێنمویم بکات بۆ بەڵگەیەکی نزیکتر لەمە تابەو شێوەیەی کە پێی چاکە و لای پەسەندە جێبەجێی بکەم . ﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا (٢٥) قُلِ اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا ﴾ ( الكهف / ٢٥-٢٦ ) خوای گەورە

---

١/ ( مع قصص السابقين فى القران ) ل( ٣٣٠-٣٣٣ ) .

هەواڵ دەداتە پێغەمبەر (ﷺ) بەماوەی مانەوەی هاوەڵانی ئەشکەوت لەئەشکەوتەکەیاندا , لەوکاتەی خەوی هێنا بەسەر یاندا تابەخەبەری کردنەوە و خەڵکی ئەو سەردەمە دۆزینیەوە و پێیان زانین , کەماوەی مانەوکەیان سێسەد ساڵ بوو کەبەساڵی مانگی ( ۹ ) نۆساڵی زیاترە , کەجیاوازی لەنێوان هەر سەد ساڵی مانگی خۆریدا بریتیە لە سێ ساڵ , لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ ثَلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا ﴾ , وئایەتی:- ﴿قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا ﴾ واتە: ئەگەر کاتێك پرسیارت لێکرا لەمانەوەیان , وتۆیش زانیاریت لانەبوو دەربارەی ئەوە , ڕاگرتنەکەشی لای خوا بووە , ئەواتۆ هیچ شتێك مەڵێ , بەڵکو وەك ئەمە بڵێ :-

﴿ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾ واتە: کەس نایزانێت تەنها خوا نەبێت , و ئەو کەسانەش کە خوایگەورە ئاگاداری کردون.[1] ﴿أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا ﴾. واتە: ئای کەچەندە بینەرو بیسەرە خوای گەورە , هیچ کەس نی یە جگە لەوزاتە پشت و پەنای خەڵکی بێت, بێگومان ئەو خوایە لەکارو فەرمانڕەوایەتیەکەیدا , وهیچ کەس ناکات بەهاوتاو هاوبەشی خۆی.

## ﴿ پەندو وانە ئیمانی یەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- زانا ( القرطبي ) دەڵێت : ئایەتی ﴿ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴾ ( الكهف / ١٠ ) . ئەم ئایەتە ئەوە دەردەبڕێت کەپێویست دەکات ئینسان بەدینەکەیەوە هەڵبێت و کۆچبکات , کەس وکارو ماڵ و منداڵ و نزیك و هاوڕێیان و نیشتمانی جێ بهێڵێت لەترسی فیتنەو ئەوەی لەناڕەحەتی بەئینسان دەگات . پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە لەگەڵ هاوڵەکانیدا و نیشتمانی خۆیان جێ هێشت و

١/ ( مختصر تفسير إبن كثير ) ( ٣/ ٧٠ ) .

کەس و کارو ماڵو منداڵیان بەتەنها و بێ ئەوان مانەوە , ئەمەش لەپێناوی ئەوەدا کە دینەکەیان سەلامەت بێت و لەفیتنەی کافران ڕزگاریان بێت .

٢- زانا ( الشنقیطي ) دەربارەی ئایەتی:- ﴿ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ ﴾ ( الكهف / ١٩) . دەڵێت : لەووشەی ﴿ أَزْكَى ﴾ دا . زانایان دوو بۆچونیان هەیە:

یەکەم : مەبەست لەووشەی ﴿ أَزْكَى ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە خواردنەکە لەخۆیدا پاك و حەڵاڵ بێت , لەحەرام یان شتێك لەو بچێت تیای نەبێت.

دووەم: مەبەست پێی واتە ( اكثر ) واتە زۆر و زۆرتر بێت , وتراوە ( زكا الزرع إذا كثر ) واتە ( کشتو کاڵەکە زۆربوو گەشەی کرد) . بۆچونی یەکەم ئەوەیان کە قورئان بەڵگەی لەسەر داوە , چونکە خواردنی حەڵاڵ و کردەوە چاکەکان , خوای گەورە فەرمانی پێکردوە بۆ باوەڕداران .وەك فەرمانی پێکردوە بەپێغەمبەران و فەرموویەتی:- ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ ( المؤمنون / ٥١) وەفەرموویەتی:- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ (البقرة/ ١٧٢) ,

لەقورئاندا زۆرجار ووشەی ( الزكاة ) بەمانای ( الطهارة ) هاتووە , واتە ( پاك و خاوێن ) . خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى ﴾ ( الأعلى ١٤) , وفەرموویەتی :- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ ( الشمس/٩ ) , وفەرموویەتی:- ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ﴾ ( النور /٢١) وەفەرموویەتی:- ﴿ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾ ( الكهف / ٨١ )

فەرمویەتی:-﴿قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴾ ( الكهف /٧٤) وچەندین ئایەتی تریش .

ووشەی ﴿زَكَاةً﴾ لەم ئایەتانەداو نمونەکانیان مەبەست پێی ( الطهارة) پاکی یە لەهەموو چڵکی گوناهو سەرپێچی یەك . ئەوەی گونجاو بوە لەگەڵ حاڵی ئەو کۆمەڵە گەنجە و باوەڕدارە چاکەکارو باش و لەخواترسەدا , مەبەستیان ئەوە بوە کەخواردنەکەیان حەڵاڵ و پاك بێت نەك زۆر . هەندێك لە زانایان دەڵێن:

پەیمانی ئەو کۆمەڵە لاوە باوەڕدارە بەرامبەر بەشارەکە لەوەدابووە کەهەندێك باوەڕداری تیا بووە باوەڕەکەیان دەشاردەوە و کافرانیشی تیابووە , ئەوان دەیان ویست خواردن لە باوەڕدارەکان بکڕن نەك کافرەکان. ئەوە مەبەستیان بوو لەپاکی خواردنەکەدا ﴿ أَزْكَى طَعَامًا ﴾ وتراوە لەخاوەن کتێبەکان و مەجوسیشی تیابووە , وزانیاری تەواویش لای خوای گەورەیە .[١]

٣- زانا ( ناصر مكارم الشيرازي ) دەڵێت : بەکارهێنانی دەستەواژەی :- ﴿ مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵە لاوە کاتێك پەنایان برد بۆ ئەشکەوتەکە , هەموو هۆکارێکی ئاشکرای ژیانیان جێ هێشت , تەنها هیوایان بەڕەحمەت و بەزەی خوای گەورە بوو.[٢]

٤- ووشەی ( لِنعلَمَ ..) ئەوە ناگەیەنێت کە خوای گەورە بیەوێت شتێکی تازە بزانێت , ئەم لێکدانەوەیە لەقورئاندا زۆر بەکارهاتووە , مەبەست لەمە بریتی یە لە جێ بەجێ کردنی زانستی خوایی , واتە ئێمە ئەوانمان بەخەبەرکردەوە لەخەوەکەیان تا ئەم مانایە جێ بەجێ ببێت , هەتا هەر یەکێکیان پرسیارلەوی تریان لەماوەی مانەوەکەیان لەخەوەکەیاندا بکات .

٥- ئیمان و کۆمەکی خوایی :-

لەزۆرێك لە ئایەتەکاندا بەڕونی ڕاستی کۆمەکی خوایی بۆ باوەڕداران دەردەکەوێت. کاتێك ئینسان لەڕێگای خوادا هەنگاوەکانی داناو هەڵی نا, ولەو پێناوەدا بێدار بویەوە, ئەوا کۆمەکی خوایی دەیگرێتەوە , خوای گەورە فەرمووی :﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ ولە شوێنێکی تردا فەرمووی:- ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ ﴾ لەکۆتایی ئایەتەکاندا ئەوان چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوایان دەکرد: ﴿ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحمته﴾ .ئایەتە قورئانیەکانی تریش بەڕونی پشتیوانی لەم ڕاستیە دەکەن , کاتێك بەندە

---

١/ ( أضوأ البيان ) ( ٤/ ٤٤-٤٥ ) .

٢/ ( الأمثل فى تفسير كتاب الله المنزل ) ( ٩/ ١٨٥) .

لەپێناوی خوادا تێدەکۆشێت, خوای گەورە هیدایەتی دەدات بۆ ڕێگای ڕاست : ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ ( العنكبوت / ٦٩ ) بێگومان ڕێگەی حەق و ڕاستی پڕە لەبەر بەست و نارەحەتی , بەبێ بەزەیی و لوتفی خوایی بە ئینسان قورس دەبێت لەسەری ئەم ڕێگایە ببڕێت و بگات بە ئامانج.[١]

٦- چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت بە دیارترین بەڵگەی قورئانی لێکدەدرێتەوە لەسەر توانای ڕێزگرتن و کەرامات لەچاکەکاران , کەلە ژیانی ڕاستی دا ڕویدابێت , بەجۆرێك چیرۆکەکە ئاماژەدەکات بۆ کۆمەڵێك ڕێزو کەرامەت کەلەو کۆمەڵەگەنج و لاوەدا ڕویداوە.

٧- قورئان چیرۆکی یارانی ئەشکەوت بەهەق وڕاستی گێڕاوەیەوە , ئەمەش واتە هەموو ئەوشتانەی لەقورئاندا هاتوون لەهەواڵ و گێڕانەوەکان حەق و ڕاستن و هیچ گومانیان تیانیە . هەرشتێك لەگەڵ قورئاندایەك نەگرێتەوە, حەق و ڕاستی تیانیە.

٨- ستەم کارترین کەس ئەوەیە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێت , چونکە درۆ بەدەم خەڵکەوە هەڵبەستن بۆخۆی تاوانە, ودرۆ بەدەم خواوە تاوانێکی گەورەترە , بەڵگەیە لەسەر نەفامی و لاچونی خەیر لەنەفس و دڵی خاوەنەکەیدا.

٩- چیرۆکەکە ئەوەمان پێ دەگەیەنێت کەڕێگە پێدراوە هاوبەشی و نوێنەرایەتی کردن هەبێت, بەجۆرێك کە ئەوان کەسێکیان کردە نوێنەر و بریکاری خۆیان بچێت بۆ شارەکە بۆ کڕینی خواردن , وپارەکانی خۆیانیان داپێی بۆ ئەو کارە.

١٠- لەگەڵ ئەوەی هاوەڵانی ئەشکەوت سوربوون لەسەرنەوەی خۆیان بشارنەوە, بەڵام خوای گەورە قەومەکەی گەیاندەئەوەی کەبیان دۆزنەوە , وکارەکەیان دەرکەوت و ئاشکرابوو , ئەمەش بۆ حیکمەتێك بوو خوا خۆی

---

٣/ ( الأمثل فی تفسير كتاب الله المنزل ) ( ( ٩/ ١٩٠) .

ویستی , تابەڵگەیەکی کرداریيان بداتیّ لەسەر زیندوکردنەوەی ڕۆژی قیامەت .

١١- لێکدانـــەوەو نەخشـــەدانانی ئینســـان و بەرنامـــەکانی هەنـــدێك جاردوادەکـــەون و ســـەرناگرن و بـــیّ دەســـەلاّت دەبێـــت لەئەنجامـــدانیان, چونکەخوای گەورە نەیویستوە بەدەست بێن و جێبەجیّ بن, ئەمەش واجب بونی گرتنە بەری هۆکارەکان ڕەت ناکاتەوە, وپاشان پشت بەخوا ببەستێت .

١٢- لەبیرچونەوە بۆ ئینسان کارێکی پێویستە , لەدنیادا ئینسانێك نیە شتی لەبیرنەچـــێتەوە , وهەنـــدێك جـــاریش بیرچـــونەوە لەفـــەرزو واجبـــەکان و پەرستشەکاندا دەبێت , کەلە شەیتانەوەیە.

١٣- چـیرۆکەکە لـەناوەڕۆکی خۆیـدا زیـاتر لـە پـانزە بەڵگـەی هـەڵگرتووە , بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەقورئان لەلایەن خواوەیە, ولەدانراوی پێغەمبەر ( ﷺ) نی یە , ئەگەرنا لەکویّ ئەم وردەکاریانە دەزانێت کە مرۆڤ نایان زانێت ؟

١٤- زانا( الشنقيكى ) دەڵێت : لەئایەتی:-﴿إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا﴾ ( الكهف / ٢٠ ) هەنـدێك لـەزانایان لـەم ئایەتـە ئـەوەیان وەرگرتـووە لەتایبەتمەندیـەکانی ئـەم ئومەتە ئەوەیە لەسەر زۆر لێکردن ( عوزر ) یان لێوەردەگیرێت و مۆڵەتیان پیّ دەدرێت , بـەلاّم ئـەم ئایەتـە کـەدەبارەی هـاوەڵانی ئەشکەوت هـاتووە , زۆریـان لێکراوە لەسەر ئەوکارە و ئەوانیش ملیان نەداوەو نەچونەتە ژێرباریان, لەگەڵ ئەوەشـدا خـوای گـەورە دەربارەیـان فـەرمووی : ﴿وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ( عـوزر ) و مۆڵـەت پێـدان لـەدینی ئەوانـدا نـەبووە لەسەر زۆر لێکردن , فەرموودەکەی ( طارق کوڕی شهاب) یش شایەتی لەسـەر ئـەم مانایـە دەدات , کـە دەربـارەی ئەوکەسـە بـوو کەبـەزۆر مێشـێکی پێکرایـە قوربـانی لەترسـی ئـەوەی بیکـوژن, چـونکە خاوەنەکـەی کـەلێیی قەدەغـەکردبوو کەقوربانی بکات بۆ بتەکان ئەگەر بەکوشتنی

میشـیکیش بیـت.پیغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی:- ( بێگومـان خـوای گـەورە سێ شتی لەسەر ئومەتەکەی من هەڵگرتووەو بەتاوان بۆیان ناژمێرێت :- هەڵەو لەبیرچونەوە , کارێك بەزۆر پێی ئەنجام بدرێت).[1]

١٥- قسەو بەڵگە هێنانەوەی هەندێك لەکەسە کەم شارەزاکان بڵاوە لەسەر ئایـەتی:- ﴿ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾ ( الكهف / ٢١) کەدەڵێن : دروست و ڕێگە پێدراوە بینای مزگەوت لەسەر گۆڕ پیاو چاکان دروست بکرێت , ئەمە نەشارەزیی و نەزانیە بەرامبەر ئەو شوێنانە , ئەمە گێڕانەوەی قسەی کەسە ناودارو دەسەڵاتدارەکانە , کەزۆرینـەیان نـەزانن , ئەوان دەیانەوێت یادی ئەو کۆمەڵە لاوە باوەڕدارە بەزیندوویی بمێنێتەوە, کە ئەوڕێزوکەرامەتە گەورەیان بۆ جێگیر بوو , ئەم قسەیان بەڵگەیەکی شـەرعی نـی یـە , جێگـەی ناکۆکیـە . پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی :- ( خـوای گـەورە نەفرەتی کردوە لە یەهود و نەسارا , کەگۆڕی پێغەمبەرانیان کردۆتە مزگەوت.[2]

---

١/ ( إبن ماجە ) بەژمارە ( ٢٠٤٣) لة ( الطلاق ) دا ڕیوایەتە کردوە.

٢/ ( البخاري ) لە ( الصلاة ) بە ژمارەی ( ١/ ٥٣٢ ) و ( موسلیم ) بە ( ٥ / ١٢/ ١٣ ) لە ( المساجد ) دا ڕیوایەتیان کردوە .

## ﴿ چیرۆکی خاوەنی دوو باخچەکە ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا (٣٢) كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئًا وَفَجَّرْنَا خِلالَهُمَا نَهَرًا (٣٣) وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالاً وَأَعَزُّ نَفَرًا (٣٤) وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا (٣٥) وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا (٣٦) قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً (٣٧) لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا (٣٨) وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ إِن تُرَنِ أَنَا أَقَلَّ مِنكَ مَالاً وَوَلَدًا (٣٩) فَعَسَى رَبِّي أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ السَّمَاء فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا (٤٠) أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَبًا (٤١) وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا (٤٢) وَلَمْ تَكُن لَّهُ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا (٤٣) هُنَالِكَ الْوَلايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴾ ( الكهف / ٣٢- ٤٤ ) .

ئەم چیرۆکە دوو تێڕوانینی جیاوازمان بەرامبەر ژیان پێشکەش دەکات ، و لەو دیاردەو پێداویستی یانەی کە تیایەتی .

تێڕوانینی پیاوێکی باوەڕدار، کە هیچی لە پێداویستی یە دنیایی یەکان نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا تێڕوانینی ئیمان و هاوسەنگی ئیسلامی لەدەست نەدابوو ، بە وردی ڕوانی بوی بۆ ئەو شتە دنیایی یانە ، و هاوسەنگی یەکی ڕاست و دروستی بۆ دانابوون .

و تێڕوانینی پیاوێکی بێ بڕوایش ، کە خوای گەورە دوو باخچەی جوانی پێ بەخشی بوو ، کە لە جۆری باخی ترێ بوو ، کە چوار دەوریان بە داری خورما گیرابوو ، و کشت و کاڵیش لە نێوان دارەکاندا دەچێنرا . خوای گەورە فەرمانی کرد بە هەردوو باخچەکە ، کە بەرهەمی چاکی خۆی بە خاوەنە کافرەکەی ببەخشێت ، لە هەموو جۆری ئەو بەروبوم و خواردنانەی کە تیایەتی ، ئەوانیش وەڵامی فەرمانەکەی خوایا دایەوە .

و بەرهەمی خۆیانیان پێشکەش کرد ، هەر دوو باخەکەش هیچیان لێ خەسار نەبوو .

ئەم پیاوە کافرە ، بەوەی کە لە دنیاو خۆشی و ڕابواردنەکەی هەیبوو ، توشی فیتنەو تاقیکردنەوە هات ، دڵنیا بوو لەوەی کە ئەمە هەموو شتێکە بۆ ئەو ، و خوای گەورە و ڕۆژی قیامەتی لە بیرچویەوە ، خۆی بەسەر هاوڕێ باوەڕدارەکەیدا هەڵکێشا ، و گەورەیی بەسەریاندا نواند ، و وای لێکدایەوە کە خۆی لەو گەورەتر و ڕێزدارترە لەناو خەڵکی و لەلای خوا ، بە هاوڕێیەکەی ووت ، لە کاتێکدا کە گفتوگۆ و مناقەشەی لەگەڵ دەکرد و خۆی هەڵدەکێشا :- مـن مالو سەروەت و سامانم لە تۆ زۆرترە و ماڵ و منداڵیشم بەهێزترن لەوانەی تۆ . چونکە ئەو دیاردەکانی ڕێزداری و گەورەیی ، بە ماڵ و ڕابواردن و مەتاعی دنیایی پێوانەکرد ، وای بینی کە خۆی بەو ماڵ و سامانەی هەیەتی لە پێشترە لای خەڵکی کە پشتیوان و دۆست و کەسی زۆر و ناوبانگی هەیە .

چوو بۆ لای باخچەکەی ، و چوە ناوی ، لە کاتێکدا کە ستەمی لە نەفسی خۆی کردبوو ، کە بەهۆی کوفرەکەیەوە دڵی داپۆشرابوو ، دڵنیایی خۆی دەربڕی ، کە ئەمە هەمیشەیی دەبێت و نافەوتێت و بریتی یە لە هەموو شتێك ووتی :- من گومان نابەم هەرگیز ئەمە لەناو بچێت ، و گومان نابەم هەرگیز قیامەت هەڵسێت .

پاشان ووتی :- سوێند بە خوا ، ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم ، ئەوا دڵنیام ، کە لای ئەویش جێگاو ڕێگاو چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادەکراوە . چونکە خوای گەورە لە دنیادا ڕێزی گرتووم و ئەم باخەی پێ بەخشیوم ، لەبەر ئەم ڕێزلێگرتن و نازو نیعمەتەیش ، بێگومان خەیر و چاکەی زیاترم دەداتێ !! .

بەڵام هاوەڵە باوەڕدارەکەی دەستی گرتبوو بە هاوسەنگی ئیمان و تێڕوانینی باشی خۆیەوە ، ئەو تێڕوانینەی کە ئەم پیاوە دەوڵەمەندە کافرە هەیبوو ، هەڵی نەخەڵەتاند ، هەروەك لەبەر دەمیشیدا لاواز نەبوو ، و نەترساو بێ دەنگیش نەبوو ، بەڵکو بە شێوازی موسڵمان ی متمانە بە خۆ بوون و دامەزراو و بەرچاو ڕوون گفتوگۆی لەگەڵ کرد .

لەکاتێکدا گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد ، پێی ووت :- ئایا بێ باوەڕ بوویت بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروستکردوە ؟!

پاشان نوتفە بوویت ، پاشان کردیتی بە پیاو ؟! بەڵام من دەڵێم کە ( الله ) ( بەدیهێنەری هەموو بونەوەرە ) هەرئەو پەروەردگارمە ، هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێك بۆ ئەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم .

هاوەڵەکەی ڕێنمایی کرد بۆ ناسینی فەزڵ و ڕێزی خوایی ، و بەو دیاردانەی کە لەناو دەچن لە خۆی بایی نەبێت و پێی ووت :- دەبو کاتێك چوویتە ناو باخەکەتەوە ، بتوتایە : ( ماشاءالله ) هەرچی خوا ویستی لەسەر بێت ، هەر ئەوە دەبێت ، ئەم هەموو نازونیعمەتە هەر هەمووی بەخششی خوایە و ، دەیبەخشێت بە هەر کەس خۆی بیەوێت ، هیچ هێز و توانایەك بۆ هیچ کەس نیە ، تەنها بە هۆی خواوە نەبێت .

لە پاشهاتی کوفرو لادانی و یاخی بوونەکەی و لە خۆبایی بونەکەی بە دوو باخەکەی و ئەوەی کە تیایەتی ئاگاداری کردەوە ، کە خوای گەورە بە توانایە بەسەریدا ، کەلەناوی بەرێت و وێرانی بکات ، ئەنجامی کافری و لادانەکەی پیشان بدات ، داوای کرد لە خوای گەورە کە ڕەشەبایەکی بە هێزی تێکشکێنەر هەڵبکات ، کە هەردوو باخەکەی وێران بکات و بفەوتێنێت ، و هەرچی ترێ و داری خورما و کشت و کاڵی تیایە هەمووی لەناو بەرێت ، هەریەکەیان بکاتەوە بە خۆڵ ، کەساف و تەخت و وەك بیابانی لێ بێت . و ئەو ڕوبارەشی لە نێوان هەردوو باخەکەدابوو لەناوبەرێت ، و ڕۆی بچێنێت بە ناخی زەویدا بە فەرمانی خوا ، ئایە دەتوانێت بیگێڕێتەوە ؟ خوای گەورە ئەنجامی کوفرو خراپەکاری یەکەی پیشانی پیاوە کافرەکەدا ، و نیعمەتەکەشی لەناوبرد ، و ڕەشەبایەکی بەهێزی تێك شکێنەری بۆ هەڵکرد ، هەرچی لەناو دوو باخەکەیدا بوو ، وێرانی کرد و لەناوی برد ، هەروەك چۆن هاوڕێ باوەڕدارەکەی لێکی دابویەوە و بۆی ڕوانیبوە ، کابرای کافر لە کاتێکدا پەشیمانی دەربڕی کە سودی پێ نەگەیاند ، ئینجا ( بە دەم ئاخ و داخ و هەناسەی ساردەوە ) دەستی دەدا بەیەکدا ، خەفەتی هەڵدەکێشا بۆلەناو چوونی ئەوەی کە تێیدا خەرجی کردبوو ، پاش ئەوەی کە هەمووی لەناو چوو .

و باخەکە هەمووی بەسەر یەکدا ڕوخاو و تەپی بوو ، ئەم کابرا کافرە ئاواتی دەخواست ، کە باوەڕی بە خوا بوایە و سوپاسگوزاری بوایە دەیوت :- ﴿ وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ خۆزگە من هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ خوا بڕیار نەدەدا .

ئینجا قورئان بۆمان ڕوون دەکاتەوە ، کە پیاوە کافرەکە خەسارەت مەندو لەناو چوو بوو ، کاتێك ئەو کارەساتە بەسەر خۆی و دوو باخەکەیدا هات لە سزای خوایی و فەرمانی ، دەستەیەك یان سوپایەك یان هێزێك یان حیزبێك نەبوو پشتیوانی بکات و بیپارێزێت و سزای خوای لەسەر ڕاوەستێنێت ، و خۆیشی سەرکەوتوو نەبوو ، ئالەو کاتەدا و لە جۆرە حاڵانەدا ، یارمەتی و کۆمەك تەنها لە خوای حەق و ڕاست و دروست وەردەگیرێت ، سەرکەوتوو براوە و بەختەوەر ، ئەو کەسەیە کە خوا لەگەڵی بێت ، هەر خوا پشتیوان و پارێزەرو یارمەتیدەرە ، و ئەو کەسەیە کە خۆشی بوێت ، کە خوای گەورە نازو نیعمەت و دەوڵەمەندی دنیایی نەدابوو پێی ، ئەوەی

بەس بوو کە خوای گەورە ئیمان و دڵنیایی و متمانەی پێ بەخشی بوو .

دنیا هەموو دەڕوات و دەبڕێتەوە , بەوەشەوە کەتیایەتی لەماڵ ونیعمەت و منداڵ و نەوەو جوانی , جوانیەکانی دنیابەخێرایی دەڕۆن و لەناودەچن , وەك باخەکانی ئەو پیاوەکافرە , بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کەبەرهەمیان دەمێنێتەوە , شتانی چاکترە لای پەروەردگارو ئومێدو هیوای چاکتریشی لێ دەکرێت بۆ خاوەنەکانیان , وەك ئەوەی کە دەست پیاوە باوەباوەڕدارە بەرچاو ڕونەکە کەوت .

تەنها ئەوەش لەسەر خەڵکی پێویستە کەبزانن کام لەم دوو نمونەیە هەڵدەبژێرن :- نمونەی پیاوە باوەڕدارە بەرچاوڕونەکە , یان نموونەی پیاوە کافرە خراپەکارو لادەرو لەخۆبایی یەکە .

بەڵکو لەسەریشیان پێویستە بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان ڕازی بن , پاش ئەوەی کە زانیمان کە چارەنوسی ئیمان و چارەنوسی کوفرو لادان و لەخۆبایی بوون چی یە .

خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا (٣٢) كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئًا وَفَجَّرْنَا خِلالَهُمَا نَهَرًا ﴾( الكهف /٣٢-٣٣ )

دکتۆر ( محمد منير الجنباز ) دەڵێت : ئەم چیرۆکە نمونەیەکی جوانە بۆ دووپیاو کە دەمەقاڵی دەکەن , یەکێکیان دووباخی هەیە لە باخی تریێ , کە چواردەوری بەداری خورما داپۆشراوە , ولەنێوان دارخورما و داری تریێ یەکانیشدا کشت وکاڵی هەمەجۆر کراون , ئەمەش وەك ئەو باخانەی شاری ( مەدینە ) دەبن , کە لەوان دەچن و ئەو باسە هەڵدەگرن , لەگەڵ چاندنی جۆرەها سەوزە بابەت و دەغڵ ودان و قەرسیل لەنێوان بۆشایی دار خورماو دارتریێ یەکاندا , ئەم شێوازە لەناوچە گەرمەکاندا زۆرن , کەپێویستیانە بەو سێبەرە تالە ژێریدا بژین . دار خورماکان سێبەر بۆداری تریێ یەکان دەکەن و , دار تریێ یەکانیش سێبەربۆ سەوزەو چێنراوەکانی تردەکەن. ئەمانەش جۆرەکشتوکاڵێکی نموونەییێ لەوناوچانەدا , دەڵێن لەناوچەی ( اللد ) ی ( قدس ) بووە ,

﴿ كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئًا وَفَجَّرْنَا خِلالَهُمَا نَهَرًا ﴾ خوای گەورە باسی باخەکانی کرد, کەبەرهەمێکی زۆرو باشیان لە بەروبووم هەبوو , کە لەسەرباشترینی جۆربوون کە بەخشی بووی , لەهیچ شتێکی کەم نەبوو , بەرهەمی دڵگیرو پێگیشتوو , هەمووی لەکاتی خۆیدا بوو , لەخورماو تریێ و سەوزەبابەتەکان , خوای گەورە کانی و ئاویشی بۆفەراهەم کردبوو , کەشادەماری کشتوکاڵ کردنە .﴿وجعلنا من الماءِ كُلَّ شيءٍحي ﴾ ئەم دووباخە لەسەرئەم شێوە باسکردنە , دونمونەی تەواوبوون , هیچی کەم نەبوو لەوەدا کە هۆکاری دنیایی تیا گیرابێتە بەر [١]

﴿ وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالاً وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴾ ( الكهف / ٣٤ )

---

١/ ( قصص القران الكريم وسيرة سيد المرسلين . ل ( ٣١٢ – ٣١٣ )

زانـای تەفسـیر ( القـاسمی ) دەڵیـت :- خـاوەنی ئـەم دوو باخـە بێجگـە لەباخەکـەی جۆرەها سـەروەت و سـامان و مـاڵی هەبووبەهاوڕێیەکـەی ووت کـە گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکـرد , ڕەدی قسـەکانی دەدایـەوەو , بەووشـەی ( هـەژار ) تانەو تەشـەری لێدەدا , و بەماڵ و سامان و بونی ناوبانگی فەخری دەکرد بە سەریدا , وپێـی ووت :- مـن سـەروەت و سامان و پشـتیوان و کـەس و کـارو دۆستم زۆرە .

﴿ وَدَخَـلَ جَنَّتَـهُ ﴾ واتـە : هاوەڵەکـەی بـرد و چـوو بـەناو باخەکانیـدا دەیسوڕاندەوە و شانازی پێوەدەکرد , وەك ئایەتەکە ئاماژەی پیێ دەدات و گفتو گۆکردنەکەی لەگەڵیدا .

﴿ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ﴾ واتە : بەوەی کە واجب دەبێت ئەو نیعمەتە نەمێنێت , بـەهۆی کـافربوون و لـەخۆبایی بوونەوەیـە, ئـەم پیـاوە بـیێ بـاوەڕە سـتەمی لەخۆیکرد و نەفسی بەرەو لەناوچون برد, یان کارێکی کرد بوو کەلە شوێن و جێگەی خۆیدا نەبوو , وبەدڵنیایـەوە ووتـی : هـەرگیز ئەم باخانـە لـەناو ناچن , وبـیێ بـاوەڕبوو بەمەسـەلەی زیندوکردنـەوە , وەك خـوای گـەورە لەئایەتەکـەدا فـەرمووی: ﴿ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا ﴾ باوەڕی وابوو کەهەمیشەییەو نافـەوتێت, وژیـان و شـوێنێکی تـر نیـە بێجگـە لەمەیکەئـەوی لەسـەرەو هەستەکانی دەیزانێت , لەبەرئەوە ووتـی:-﴿ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾[1] ئایەتەکە ئەوەی جێگیرو دامەزراو کرد کەستەم کردنەکە بۆ خاوەنی باخەکان بوو , فەرمووی:- ﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ﴾ ئەو ستەم کـاربوو , لەکاتێکـدا باخـەکانی هـیچ سـتەمێکیان نـەبوو.کەسـێك لـەقورئان ووردبێتـەوە سـەری لـەم دەربڕینـە دەسوڕمێت , لەهەڵوێستی ئەم پیاوەدا .

---

١/ ( محاسن التأويل ) ( ١١/٤٢ ) .

باخێك لە كشتوكاڵ و تریێ و خورما پێك هاتووە , دادپەروەرەكە ستەمی نەكردوە , وهیچ شتێكی لەبەرو بوومەكەی خۆی نەشاردۆتەوە. ڕوەك و گڵ و بێ گیانن , قورئان نەفی ستەمی لێدەكات. ئینسان لەعەقڵ و ڕوح و جەستە پێك هاتووە, وهەست و سۆزو بیركردنەوەی هەیە , لەگەڵ ئەوەشدا ستەم كارەو ستەم دەكات, ئەم پیاوە ستەم كارە چوە ناو باخە بێ تاوانەكەیەوە , لەبەرو بومەكەی كردەوە كە بەجوانی پێشكەشی كردبوو, بەڵام ئەو ستەمی پێوەكردو لەڕاستی لایدا و نازو نیعمەتی خوای داپۆشی! بەڕستی كارێكی سەیرە , ڕوەكێك بەڕێزەوە بەرهەمی خۆی دەدات و ستەم ناكات , وئینسانی ڕژدی و بەخیل لەخۆی بایی دەبێت و ستەم دەكات .

﴿ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾ ( الكهف / ٣٦ ) ئەم پیاوە كافرە ئینكاری ڕۆژی قیامەتی كرد , كەدەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری و لێپرسینەوەی دەكات و كردەوەكانی نیشان دەداتەوە. پاشان وەك گاڵتە كردن و گاڵتە جاڕی نەك دڵنیایی بەهاوڕێ هەژارەمەی ووت :- تەنانەت ئەگەر ڕاستیش بێت من بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم, ئەوە لەم باخانەی خۆم باشترم دەداتێ , كەوا دەرئەكەوێت هەمیشە لەناو نازو نیعمەتدا دەبێت, وهاوڕێ یەكەشی لەهەمووكاتێكدا هەر نائومێد دەبێت , ئەمە شێوازی پێوانە كردنی كەسە گومڕاو سەر لێشێواوەكانە , كەبەجوانی و ڕازاوەیەكانی دونیا هەڵخەڵەتاون , ودەڵێن: ئێمە ماڵ و سامان و نەوەمان زۆرە و , ئێمەولەكەسانە نابین كەسزا دەدرێن.

بەڕاستی كافران زۆر نەزانن , وادەزانن كە قیامەت وەك دنیایە , وبەهەمان شێوەی دونیا سەروەت و سامان و نەوەیان دەبێت و لەناو نازو نیعمەتدا دەبن , خوای گەورە لە سورەتی ( فصلت ) دا ( كەئەمە ماناكەیەتی) فەرموویەتی( سوێند بەخوا , ئەگەر ئادەمیزاد خێر و خۆشی بەسەردا بڕژێت و پێی بچێژین , لەدوای ئەو تەنگانەیەی كە توشی هاتبو , بەمتمانەیەكی زۆرەوە دەڵێت:- ئەمە بەرەنجی شانی خۆم پەیدام كردوە و خوا خۆشی دەوێم , وابزانم قیامەت زۆر دورە ڕەنگە هەرنەشبێت , خۆ ئەگەر بم گێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم ئەوە دڵنیام كە خۆشی و نازو نیعمەتم لای ئەو بۆ ئامادەیە )

( فصلت /٥٠ ). لەسورەتی ( مریم ) دا ( کەئەمە ماناکەیەتی ) فەرموویەتی: ( ئایا ئەو جۆرە کەسانەت بینیوە, کەباوەڕی بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نییە و دەڵێت : سوێند بەخوا من سامان و کوڕو نەوەم پێدەدرێت ) لەسورەتی ( سبأ ) دا , ﴿وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالاً وَأَوْلادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ ( سبأ / ٣٥ ) ( کە ئەمە ماناکەیەتی) فەرموویەتی :- ( دەیانوت : ئێمە سامان و نەوەی زۆرترمان هەیە , ئێمە لەقیامەتدا لە سزادراون نین )

﴿ قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً (٣٧) لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ ( الكهف ٣٧- ٣٨ )

دکتۆر ( محمد منیر الجنباز ) دەڵێت : کاتێك پیاوە بێباوەڕەکە ئینکاری زیندوبونەوەی کرد وقسەیەکی کرد کە بەهۆیەوە فڕێ دەدرایە ناو ئاگری دۆزەخەوە , ئینجا هاوڕێ باوەڕدارەکەی دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی و لەو پێ هەڵخلیسکانە ئاگاداری کردەوە , کە ئەو بێ باوەڕە بە بەدیهێنەرەکەی , کە ئەو ماڵ ودەوڵەمەندی و شانازی و لەخۆبایی بونەی گۆڕیوە بۆ کەللە ڕەقی و ئینکاری کردنی ڕۆژی لێپرسینەوە , ئەمەش نمونەی ئەو کەسانەیە کە ماڵ و سامانیان بەڕێگای هەمە جۆرکۆکردۆتەوە , کەستەم لێکراوەکان سکاڵاَلە دەستیان دەکەن و پێیان دەڵێن : بێگومان ڕۆژێك هەیە و دێت کە ئێوەی تیا موحاسەبە دەکرێن لەسەر ئەو ستەمەی کە لەئێمە تان کردوە , وەڵامی ئەوان بریتی دەبێت لە :- وازی لێ بهێنن بۆئەو ڕۆژەی کەدێت , بەسوك سەیرکردن و گوێ پێ نەدانەوە , وەك ئەوەی سکاڵأبکەن لەدەست هاتنەکەی , بێ گومان ئەم هاوەڵە هەژارەی بەقەناعەت بوو بەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشی بوو , و زۆربەوەفابوو بۆهاوەڵە دەوڵەمەندەکەی بەهۆی ئەو ڕقەی لێی بوو , ئەم لەناو گومڕایی دا جێی نەهێشت , وای بینی کەباوەڕدار لەبانگەوازکردن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی و دەرخستنی ڕاستی یەکان بەر پرسیارە , لەبەرئەوە بیری خستەوە کە خوای گەورە ئەوی لە نوتفەیەك دروستکردوەو پاشان کردویەتی بە پیاوێکی تەواو , ئایا دەبێت ئەمە هەڵس وکەتت بێت بەرامبەر دروستکەرو بەدیهێنەرەکەت کە کەللە ڕەق و ئینکاری بێت ؟ پاشان هەڵوێستی خۆی بەرامبەر پەروەردگاری وئیمانی دامەزراوی بۆ ڕونکردەوە کە دڵی لێیان پڕبووە , چونکە ئەو لە تێڕوانینی ماددی و دەوڵەمەندیەوە بۆژیانی دونیا

ناڕوانێت , بەڵکو لەتێڕوانینی ئیمانەوە کە لەسەروی هەموو شتێکەوەیە لای باوەڕدار , بۆ ژیانی دنیا دەڕوانێت , چونکە ژیان لای ئەو قۆناغێکە و تێ دەپەڕێت و ماڵی ئەنجام دانی کردەوە چاکەکانە , دەبێت تویێشووی تیاکۆبکاتەوە بۆقیامەتی, بۆئەوەی هەڵوێستی ئیمانی خۆی بۆڕونبکاتەوە پێی ووت :- ( بەلاّم من دەڵێم : بەڕاستی ( الله ) پەروەردگارمە , تەنهایەو هاوەڵی نیە و بەرچاوڕونی کردم و ڕێنمایی کردم بۆ یەکتاپەرستی .

﴿ وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ ﴾ پێویست بوو لەسەرت هەرکاتێك کە دەچویتە ناوباخەکەتەوە , خوای گەورەت بەتاك وتەنها بزانیایە و زیکرویادی ئەوت بکردایە و بتوتایە :-

﴿مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ ﴾ خۆت لەشەڕی حەسوودان بپارستایە و , کە تەنها خوای گەورە پارێزەرە بۆئەم نازونیعمەتانە .﴿ إِن تَرَنِ أَنَا أَقَلَّ مِنكَ مَالاً وَوَلَدًا ﴾ ( الكهف / ٣٩ )

خۆت بەبەرز مەزانە بەسەرمنداو , بەکەمی ماڵ و منداڵ ونەوەم تانەوتەشەرم لێ مەدە , لەو نازونیعمەتەی کە تۆی تیایت , پێویستە لەسەرت کەبەشی غەیری خۆتی لێ بدەیت و سوپاسی خوای لەسەر بکەیت و سوپاسگوزاری ئەوبیت لەسەر ئەو نازونیعمەتانە , نەك فەخرو شانازی بەسەر بەنەکانی خوادا بکەیت , ئایا نازانیت , کە ئەو کەسەی ئەوانەی بەتۆبەخشیوە , بەتوانایە بەسەریدا کەلێت وەربگرێتەوە , و بیدات بەکەسێکی غەیری خۆت , من تکام لای خواوایە , کە خەیرو چاکەی باشترم بداتێ لەوەی کە بەتۆی داوە.

﴿فَعَسَى رَبِّي أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ ﴾ لەماڵ و منداڵ وپاداشتی باش ونەبڕاوە , و لەسەرئینکاری و کەللە ڕەقی یەکەت , تۆیش سزابدات . ﴿ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ السَّمَاء فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴾ , لەم ئایەتەدا ووشەی ﴿ حُسْبَانًا﴾ بە چەند شێوەیەك ماناکراوە : لەوانەکە لەگەڵ دەقەکە دا دەگونجێت , بای تێکشکێنەرو بەهێز یان سەرمای توند کەهەموو کشت و کاڵەکە بەسەریەکدا بشکێنێت و دای تەپێنێت , یان بەردو زیخ لە ئاسمانەوە , یان هەربەلاّیەك کە لە ئاسمانەوە داباریێت وەك کوللەو مێروی زیان بەخش , بەلاّم ﴿ صَعِيدًا زَلَقًا﴾ واتە زەوی یەکی تەخت و ڕووت و بێ سەوزایی , بە جۆرێك پێی لێ هەڵبخزێت , وەك ئەوەی پێی بڵێت :- ئەی بێ باوەڕ , ئایا ناترسیت خوای

گەورە ئەو نازو نیعمەتەت لیٚ بسێنیٚتەوە کە تۆی تیایت , کە تۆ فەخرو شانازی بەم دوو باخەوە دەکەیت , وەك ئەوەی لە دروستکراوی دەستی خۆت بێت و خوای بەخشندەت لە بیر چوو بیتەوە . ئایا ناترسیت کە خوای گەورە بەلاٚو ئافاتی بۆ بنێرێت و لەناویان بەرێت ؟ [1] ﴿ أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَبًا ﴾ ( الكهف / ٤١ ) . یان خوای گەورە فەرمان بکات بە زەوی ئاو لەباخەکانت بگرێتەوە و ڕۆی بچێنێت بەناخی زەوی یەکەدا ئینجا هەرچی لەباخەکەدایە بفەوتێت و تۆیش نەتوانیت هەرگیز داوای هیچ بکەیت , کە خوای گەورە بۆت بگێڕێتەوە . ئینجا بەخێرایی هەرچی کشتوکاڵ و سەوزایی هەیە دەفەوتێت و ووشك دەبێت .

تۆ بەم کەللە ڕەقی و ئینکاری کردنەت بۆ نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارت , شیاوی ئەو نازو نیعمەتە نەبویت , ئەو دوو باخەیش بەنیسبەت تۆوە تاقی کردنەوەیەکی قورس و گران بوو . بەلاٚم لەڕاستیدا تۆ لە تاقی کردنەوەکەدا سەرکەوتو نەبویت و چۆکت داداو پشتت شکا , و سزای سەخت و بە ئازارت بۆ بڕیار درا .

﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ ( الكهف / ٤٢ ) .

کابرا بیٚ باوەڕەکە وای لیٚهات دەستەکانی دەدا بەیەکداو هەڵگێڕو داگێڕی دەکرد , داخ و خەفەت و پەشیمانی دەردەبڕی بۆ لەناوچونی باخەکانی و ئەو مەسرەف و ماندو بونەی کە تیایدا کرد بوی , باخەکە هەمووی تێك و پێك شکاو داتەپێی بەسەریەکدا , و هیچی بەسەر هیچەوە نەما .

هەر حسابی لێك دەدایەوەو دەبژارد بزانێت چەندی ماوەو چەندی تیا مەسرەف کردوە . ووشەی ( ما انفقَ فيها) ووشەیەکی گشت گیرە , بۆ هەموو شێوازەکانی مەسرەف کردن , لە ماددی و مەعنەوی .

---

١/ ( قصص القرآن الكريم و سيرة سيد المرسلين ) ل ( ٣١٤ — ٣١٥ )

ماڵ و سامانێکی زۆری تیا خەرج کردبوو , بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەناو چوو .
کاتێکی زۆری تیا بەسەر برد , کەلەو پێناوەدا بەسەری برد بەڵام سەرئەنجام هەمووی خەسارەتمەندی و بێ سود بوو لە توانای جەستەی خۆی زۆر ماند و بوو لەگەڵیدا , ئەوەی کەبەناویدا دەڕۆیشت و هەنگاوی تیا هەڵدەنا , ئەوەشی لە دەستچوو و نەما .

نەخشەی زۆر پرۆژەی تری کێشاو بەرنامەی بۆ دادەنا , بەڵام هەمووی لەبەردەمیدا لە ناوچوو هەرەسی هێنا.خەون و خەیاڵی زۆری پێوە دەبینی , و ئاوات و لێکدانەوەی زۆری بۆ دەردەبڕی , کە هەمووی خەو بوو, وهەر بەو خەیاڵەوە دەژیا , و پشتی پێیان بەستبوو , بەڵام ئەوانەش تیا چوون , و ڕاستی واقع و ڕوداوەکان هەمووی داپۆشی .

پاشان زمانی هاتە گۆو ووتی:﴿ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ واتە : خۆزگا من هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ خوا بڕیار نەدەدا .

ئەم پیاوە چ پەشیمانی یەکی تووش هات و چ زیانێکی لێکەوت و چەند خۆی بۆ ژیانی دونیا ماندوو کرد ، چەندێك تەمەنی بەسەر بردوو لە گومڕایدا ژیا ![1]

( الرازی ) دەڵێت : لە کاتێکدا هاوەڵە باوەڕدارەکەی ووتی : ﴿لَكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ (الكهف/٣٨) . ئینجا ئەویش ، خوای گەورەی بیرکەوتەوە لەو کاتەدا و ووتی :﴿ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾[2]( ماناکرا) .

﴿ وَلَمْ تَكُن لَّهُ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴾ ( الكهف / ٤٣ ) .

زانا ( الشوكانی ) دەڵێت : واتە : دەستە و کۆمەڵێك نەمابوو کە ئەم پیاوە پەنایان بۆ بەرێت و ئەوان پشتیوانی بکەن ، ئەو کەسانەی کە پێشتر ئەو شانازی پێوە دەکردن ، سودیان پێ نەگەیاند کەس نەیتوانی لە خەشمی خوا دەربازی بکات و ، خۆیشی سەرکەوتوو نەبوو .

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٣٧١ –٣٧٢ ) .
٢/ ( التفسير الكبير ) ( ٢١ / ١٠٩ ) .

﴿ هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴾ ( الكهف / ٤٤ ) .
ئەم ئایەتە ڕاستی یەکی قورئانیمان پێ دەڵێت ، کە بنەمایەکی ئیمانی هەمیشەیی یە ، کە تەنها خوای گەورە پشتیوان و یارمەتی دەرە ، و پشتیوانیشی تەنها شیاوی خوایە ، خوا پشتیوانی هەرکەس بکات ، ئەو کەسە براوەو سەرکەوتووە ، و هەرکەسیش لە خوا دابڕێت ، خەسارەتمەند و سەر شۆڕە ، ئەگەر پشت بە خوا بەسترا ، ئەوا سەرفرازی و خەیر بەدەست دێت ، و خاوەنەکەی دەگات بە پاداشتی نەبڕاوە .

ئەم کارەش زۆر بە جوانی لە چیرۆکی ئەم دوو پیاوەدا دەردەکەوێت ، ئەوپیاوەی کە باوەڕی بە خوایە و ، هاوەڵەکەی کە بێ باوەڕبوو ، و شانازی بە هەردوو باخەکەیەوە کرد .

خوای گەورە لە کۆتایی چیرۆکەکەدا نموونەی ژیانی دنیمان بۆ دێنێتەوە و دەفەرموێت :- ﴿ وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴾ ( الكهف / ٤٥ ) .

قورئان ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە بە دوای چیرۆکەکەدا ، کە چۆن هەر دوو باخەکەی لەناوبرد لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ، و لاپەڕەی بوونی پێچایەوە ، دوای ئەوەی کە خاوەنەکەی ئومێدی بەردەوامی پێی بوو ، کە بمێنێتەوە و لەناو نەچێت .

ژیانی دونیا هەمووی – وەك لەم نموونەیەدا – هاتووە ، کورتە و خێرا تێدەپەڕێت و لەناو دەچێت ، وەك

نموونەی ئاوێکە کە خوای گەورە لە ئاسمانەوە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەیبارێنێت کە تێکەڵ بە زەوی دەبێت و ڕووەکەکانی پێ بەیەکدا دێت ، لەدوای ماوەیەکی کەم ( هەموو ئەو ڕووەك و گژو گیایە ) دەبێتە پوش و

پەلاَشێکیووردو خاش ، و ڕەشە با بەم لاوبەولادا بلأوی دەکاتەوە .

ئـەم نمونەیـە ، ژیـانی دنیـا لەسـەر فلیمێکـی خـەیاڵی پیشـان دەدات , کەماوەکەی کورتە , وزنجیرەکانی کورتن و زووتیٌ دەپەڕن , ئەمە نموونەیەکە لەپیشاندانی دیمەنی خێرا لە قورئاندا .[1]

﴿ الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ پاش ئەوەی خوای گەورە نمونەی کورتی ژیانی دنیایی پیشانداین , کە زۆرزوو دەڕوات و نامێنێت , ئینجا بۆی ڕونکردینەوە , ئەوەی کە لە دنیادایە وەك سێبەرو تاریکی یەك وایە و دەڕوات , فەرمووی :- مـاڵ و سـامان و منـداڵ و نـەوەکان , ئەمانـە بریتـی نیـن لەهـەموو ژیانی دنیا , و ئەمانە گرنگترین شتیش نین , بەڵکو جوانی یەکن بۆژیانی دونیا , و واتـە بـەو تێڕوانینـە تەماشـایان بکـەین و لەسـەر ئـەو بنەمایـە مامەڵـە یـان لەگەڵدا بکەین .

ووشـەی ﴿ زِينَـةُ ﴾ ئـەو مانایـە دەدات , و بـەو سـێبەرە دەوترێـت , چـونکە بـەواتای شـتێکی دەرەکـی یـە , کەبـەکاردێت بـۆ جـوانی و خۆڕازاندنـەوە , کـە لەڕاستیدا بەشێك نی یە لەڕاستی یەکان و بنەماکانی کار .

زانـا ( راغـب الاصـهانی ) دەڵێـت : ( جـوانی و زینـەتی ڕاسـتی , ئەوەیـە کـە ئینسان ناشیرین ناکات و تێك نادات لە حاڵی خۆیدا , نە لەدنیاو نە لە قیامەتدا . بەلأم ئەوەی کە خۆی پیٌ دەڕازێنێتەوە لە حالـةٌ تێك بـەدەر لـە حالـەتێکی تـر , ئەوە لە ڕوویەکەوە تێکدان و ناشیرین کردنە .

﴿ زِينَةَ ﴾ جوانیش بەپێی پوختەی قسەکردن سیٌ جۆرە :-

١- جوانی نەفس , وەك زانست و بیروباوەڕە چاك و پەسەندەکان .

٢- جوانی بەدەن و جەستە , وەك هێزو بالأی بەرزو بە شان و شەوکەت .

٣- جوانی دەرەکی , وەك سەروەت و سامان و ناوبانگ و شۆرەت .

ماڵ و سامان و کـوڕو نـەوە , بـەجوانی یـەکانی ژیـانی دنیا لێـك دراونەتـەوە ,

---

١/ ( مع قصص السا بقين في القران ) ل ( ٣٧٤- ٣٧٥ )

نابێت پشت گوێ بخرێن , بەوەی کە جوانی دنیان , بەلأم لەڕێگەی باوەڕبوون بەخوا دا بەکاربهێنرێن , وخاوەنەکەشی سەرقاڵ بکات بەوەی کە ڕووبکاتە خوا.!

دەبێت موسڵمان وا مامەڵە لەگەڵ ئەو جوانیانەی دنیادا بکات , کە تەنها جوانین , و بۆ جوانکردن و چاککردنی ژیان , نابێت لەوە گەورەتر تەماشا بکرێت , و ڕۆڵی لەوەی گەورەتریشی پێ نەدرێت , والێکنەدرێتەوە کە بریتی یە لە هەموو شتێك , یان سەرقاڵی بکات و لەخوا دووری بخاتەوە .

﴿ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلاً ﴾ ئەگەر ماڵ و منداڵ و ئەوە جوانی ژیانی دونیابن , ئەوا بێگومان قورئان ڕێنماییمان دەکات بۆ شتێکی دامەزراو لەژیانی دونیادا , کە پێویستە زۆر بایەخی پێ بدرێت , و کەهەموو تەمەنی پێوە سەرقاڵ بکەیت و , وکاتی زۆر تیا بەسەر بەریت , کە ئەویش کردەوە چاکەکان و بۆخوا ژیانە , کەلای خوا چاکترن و پاداشتی باشیان هەیە , واتە غەیری ئەو هیواو ئاواتانە ی تیایە کە خاوەنەکەی دەیخواست , ئەگەر هیواکانی لەسەر ئەوە بیناکرد , ئەوا ئەو هیوایەی لەدەست ناچێت .

کە ئەو کردەوە چاکانەیش وەك ( إبن عباس ) و ( جُبیر ) و کە سانی تری پێشین ووتویانە , بریتین لە هەرپێنج نوێژەکە. و ( عبدالرحمن ی کوڕی زیدی کوڕی اسلم ) یش ووتویەتی : هەموو کردەوە چاکەکانن .

بە پێی قسەی زانایان ، هەموو ئیسلام دەگرێتەوە ، لە دروشم و یاسا شەرعی و کردەوەکان ، قورئان بە ( باقی) ناوی بردووە ، چونکە کۆمەڵە کردەوەیەکن ، بەڕاستی (باقی)ن ، لە ژیانی خاوەنەکەیدا شوێنەواری دەمێنێتەوە، و لەناو دابو نەریتە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەیشدا هەر دەمێنێتەوە ، و لە تەرازوی ڕۆژی قیامەتیشدا بۆ خاوەنەکەی دەمێنێتەوە ، پێویستە موسڵمان ڕوویان تێ بکات و گرنگیان پێ بدات و زۆر ئەنجامیان بدات .

﴿ پەند و وانە بەسودەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی ڕاستەو لە ڕابردوودا ڕوویداوە و ، چیرۆکێکی خەیاڵی و دروستکراو نی یە .

٢- نمونە هێنانەوە لە قورئاندا مانای تێڕوانینەکان لە نەفسی ئینسان نزیك دەکاتەوە ، وئەو مانایەشی کەبەو نموونەیە هێنراوەتەوە لە دڵدا دامەزراو جێگیر دەکات .

٣- دوو پیاوە باوەڕدار و کافرەکە لە چیرۆکەکەدا ، نمونەی دوو بەشەرن کە لە هەموو کات و شوێنێکدا زۆر جار هەن و دەبینرێن .

٤- پێویستە بانگخوازان سوود لە شێوازی قورئان وەربگرن ، بۆ بانگەوازو ڕونکردنەوە ، ئەوەش بە هێنانەوەی چیرۆك و نموونە جوانەکان .

٥- خوای گەورە هەندێك جار مۆڵەت بە کافر دەدات ، و نازو نیعمەتی زۆری دەداتێ ، کە ئەوەش بۆ تاقیکردنەوەیە ، بەڵگەیەك نییە بۆ خۆشویستن لە لایەن خواوە ، یان ڕازی بێت بە کارەکەی .

٦- خوای گەورە هەندێك جار باوەڕدار تاقی دەکاتەوە ، بەوەی ڕزقو ڕۆزی لێ تەسك و کەم دەکاتەوە ، ئەو نازو نیعمەتەی دنیا کە دەبڕێتەوەو نامێنێت ، لێی دادەپۆشێت ، ئەمەش بەڵگەنیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ڕقی لێی بێت ، مەتاع و ڕابواردنی دنیایی لای خوا سوك و ئاسانە لەوەی کە بوارێك بێت بۆ ڕێز لێ گرتن یان ئیهانەکردنی خاوەنەکەی ، بەڕاستی خوای گەورە دنیا دەدات بە کەسانێك کە خۆیان حەز دەکەن و بەکەسانێکیش کە حەزی پێ ناکەن ، بەڵام دین نادات بە کەسێك کە پێی خۆش نەبێت .

٧- خوای گەورە بە تەنها خۆی ڕزق و نازو نیعمەت دەبەخشێت ، و ئینسان و هەوڵ و توانا و پڕۆژەکانی و سەرەت و سامانەکەی تەنها هۆکاری ماددی بینراون .

٨- لە قورئاندا ئاوڕدانەوەیەکی هونەری جوان هەیە لە شێواز و ڕێکخستنی باخەکان ، ئەوەش لە دابەشکردن و تەرتیب و چاندنی سەوزە و بەرهەمە جیاوازەکان لە شوێنی گونجاوی خۆیان ، وەك نمونەی ئەو دوو باخە .

٩- زەوی ستەم ناکات و ، هیچیش لەبەرهەمەکانی خۆی قەدەغە ناکات و ناگرێتەوە ، بەبێ جیاوازی و تایبەتمەندی بە هەموو کەسێکی دەدات ، لەگەڵ

ئەوەشدا خەڵکی کافر دەبن و ستەم دەکەن و بەخشش و خەیرەکانیان لە خەڵکی دەگرتەوە ، ئایا ئەوان پەیڕەوی ئەو زەوی یە ناکەن لە بەخششی خۆیدا.؟

١٠- خاوەنی دوو باخەکە ، کە بێ بڕوا بوو داپۆشینی حەق و لە خۆبایی بوون کوێری کردبوو ، و ڕاستیەکانی نەدەبینی ، بە شێوازی لە خۆ بایی بوون و فێڵبازی مامەڵەی دەکرد ، هەروەها ئەو کەسانەش کە بە ڕواڵەتی دنیای بڕاوە لە خۆ بایی دەبن ، هەر بەو جۆرەن .

١١- لەو تێڕوانینە گومراییەی کەسە لە خۆ باییەکان ئەوەیە ، وا گومان ، دەبەن کە خوای گەورە لە قیامەتدا ڕێزیان لێدەگرێت ، چونکە لە دنیادا ڕێزی لێ گرتوون ، و باوەڕداران هەرگیز لە ڕۆژی قیامەتدا ڕێزیان لێ ناگیرێت ، چونکە لە دنیادا لە ماڵ و سامان و مەتاع بێ بەش کراون .

١٢- لە بنەماکانی تێڕوانینی ئیسلامی ئەوەیە ، کە شتێك نابێت و ڕوونادات ، تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە دەیەوێت ، هەرچی ئەو بیەوێت دەبێت . و هەرچیش ئەو نەیەوێت نابێت ، تەنها خوای گەورە خاوەنی هێزو دەسەڵاتە ، ئەگەر خوا هێز بە کەسێك نەدات ، ئەوا هێزی نابێت .

١٣- ووشەی ( ما شاالله لا قوه إلاّ باالله ) دەربڕینێکی ئیمانی جوانی قورئانیە , خاوەنەکەی کاتێك دەیڵێت کە بەشتێك لەکەس و کارو منداڵ و ماڵەکەیدا سەرسام بێت, بەوەش سوپاس گوزاری خوادەکات , وبەوە هەنگاو دەنێت بۆ بەردەوام بوونی نیعمەتەکەی و , لەشتێکدا بەکاری دەهێنێت کە پەروەردگاری پێی ڕازیبێت .

١٤- سزای خوا توشی کافران و لەخۆبایی یان دێت , بەجۆرێك هەرچی نازو نیعمەتیان هەیە تیا دەچێت , ئەوەش سزای ئەوەیەکە هەستاون بە کاری پوچەڵ و بێ ماناو نادروست.

١٥- کاتێك نازو نیعمەت نامێنێت و ڕزق لەناو دەچێت , ئینسانی کافرو لەخۆبایی توشی داخ هەڵکێشان و پەشیمانی دێت , بەڵام کاتەکە بۆ پەشیمان بوونەوە سودی تیا نەماوە.

١٦- لەکاتی دابارینی سزاو ناڕەحەتیدا , کەسی لەخۆبایی ڕاستی ئامۆژگاری کەسە چاکەکارەکانیان بۆ دەردەکەوێت کە دڵسۆبون و ئامۆژگاریان

دەکردن ، ئاواتی دەخواست باوەڕیان پێ بکات تاتوشی ئەم داخ هەڵکێشانە نەبێت.

١٧- ئەو کەسەی لەگەڵ خودا دابێت لە ڕاستیدا هیچ زیانێکی لێ ناکەوێت ئەگەر دنیاو نازو نیعمەتەکانیش لەدەست چوو بێت . و هەر کەسیش لەگەڵ خوادا نەبێت ، ئەوە هیچی دەست نەکەوتووە ، ئەگەر خاوەنی هەموو شتێکیش بێت لە دنیادا .

١٨- لەسەر باوەڕداری ژیر پێویستە ، گرنگی بە شتە بنەڕەتیەکان بدات ، ئەو شتانەی کە چاکن و باقین بەسەرشتە لەناو چووەکاندا پێش بخات ، و شتە جێگیرەکان بەسەر ئەو شتانەدا پێش خات کە زوو دەڕۆن و لەناو دەچن ، و شتە داهاتووەکان بەسەر شتە بەپەلەکاندا پێش بخات ، و زۆر لەو کارانە بکات کە لە داهاتودا بۆ ژیانی بەسوودو ، و سوودمەند دەبن و دەستی دەکەوێتەوە لە کاتێکدا کە پێویستی پێیان دەبێت .

## ﴿چیرۆکی موسا و بەندە چاکەکارەکە﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا (٦٠) فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا (٦١) فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا (٦٢) قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا (٦٣) قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا (٦٤) فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا (٦٥) قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا (٦٦) قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (٦٧) وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا (٦٨) قَالَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ صَابِرًا وَلا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا (٦٩) قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا (٧٠) فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا (٧١) قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (٧٢) قَالَ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا (٧٣) فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلامًا فَقَتَلَهُ

قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا (٧٤) قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (٧٥) قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا (٧٦) فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا (٧٧) قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا (٧٨) أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا (٧٩) وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا (٨٠) فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا (٨١) وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾ ( الكهف / ٦٠ – ٨٢ ) .

چیرۆکی موساو ( خضر ) به‌نده چاکه کاره‌که به درێژی له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) باسی هاتووه ، یه‌کێك له‌و فه‌رموودانه‌ی باسی ده‌که‌ین ، که ئه‌مه ده‌قه کوردی یه‌که‌یه‌تی : ( سعيد )ی کوڕی ( جبير ) ده‌ڵێت : ووتم به (إبن عباس )( عليهما السلام ) ، ( نوف البكالى) وا گومان ده‌بات که موسای به‌نی ئیسرائیل ، له موسای هاوڕێی ( خضر ) جیاوازه ووتی : ئه‌و دوژمنی خوایه‌و درۆ ده‌کات ، له ( أُبی ) کوڕی ( كعب )م بیستووه : ده‌یووت :- بیستوومه له پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌یووت : موسا ( عليه السلام ) هه‌ستا له‌ناو ( بنى إسرائيل )دا ، و وتاری خوێنده‌وه ، پرسیاری لێکرا ، کێ زاناترین که‌سه له ئاده‌میزاد ؟

فه‌رمووی : من زاناترین که‌سم ، خوای گه‌وره سه‌رزه‌نشتی کرد له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زانسته‌که‌ی نه‌گێڕایه‌وه بۆ خوا ، ئینجا خوا ( وه‌حی) بۆ نارد که به‌نده‌یه‌ك له به‌نده‌کانی من وا له ( مجمع البحرين ) شوێنی به‌یه‌ککه‌یشتنی دوو ده‌ریاکه ، له تۆ زاناتره ، موسا (عليه السلام ) فه‌رمووی : ئه‌ی خوایه چۆن پێی ده‌گه‌م ؟ پێی ووترا : ماسیه‌ك له زه‌میله‌یه‌کدا هه‌ڵبگره‌و بڕۆ ، له‌هه‌ر لایه‌کدا ماسیه‌که‌ت لێ وون بوو ، ئه‌وا له‌وێدایه ، موساو هاوڕێکه‌ی که(يوشع) ی کوڕی (نون) بوو، که‌وتنه ڕێ ، موسا ماسیه‌کی له‌ناو زه‌میله‌دا هه‌ڵگرت ، خۆی و هاوڕێکه‌ی

ڕۆشتن ، تا گەیشتنە لای بەردێکی گەورە ، موساو هاوڕێکەی خەویان لێ کەوت ، ماسیەکەش لەناو زەمیلەکەدا کەوتە جوڵە جوڵ و دەرچوو ، خۆی خستە ناو دەریاکەوە ، خوایش ئاوە ڕەوانەکەی وەستاند ، هەتا وەك تاقێکی سەرگیراوەی لێهات ، بوو بە ڕێگا بۆ ماسیەکەو بوو بە جێگای سەر سوڕمانیش بۆ موسا و هاوڕێیەکەی ، ئەو ڕۆژو شەوە ڕێگایان کرد ، هاوڕێیەکەی موسا بیری چوو هەواڵی ماسیەکە بە موسا بدات ، کاتێك ڕۆژ بویەوە موسا بە هاوڕێیەکەی ووت : ( خواردنەکەی بەیانیمان بۆ بهێنە ، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا ماندووین ) .

دەفەرموێت : ماندووش نەبوون هەتا لەو شوێنە تێپەڕی کە فەرمانی پێ کرابوو ، هاوڕێیەکەی پێی ووت : ( لە بیرتە لەو کاتەدا ، کە لە پەنای بەردە گەورەکەدا لاماندا ، لە یادم چوو باسی ماسیەکەت بۆ بکەم ، شەیتان لە بیری بردمەوە ، کە چۆن بە شێوەیەکی سەر سوڕهێنەر ڕێگای خۆی بۆ ناو دەریاکە گرتە بەر ) موسا (علیه السلام ) فەرمووی : ( ئەوە ، ئەو مەبەستەیە کە ئێمە دەمانەوێت ، بۆیە هەر بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە ) .

شوێن پێی خۆیانیان هەڵدەگرت ، هەتا گەیشتنە لای بەردەکە ، پیاوێکی بینی خەوتبوو ، بە پارچە جلێك خۆی داپۆشیبوو ، موسا ( علیه السلام ) سەلامی لێکرد ، ( خضر ) بەندەکە پێی ووت : کەی لەم زەویەی تۆدا سەلام هەیە ؟ ووتی : من موسام ، ووتی : موسای نەوەی ئیسرائیل . ووتی : بەڵێ ، ووتی : بەڕاستی تۆ زانستێکت لا هەیە خوا فێری کردوویت من نایزانم ؟ منیش زانستێکم لا هەیە ، خوا فێری کردووم ، تۆ نایزانیت ، موسا (علیه السلام ) پێی ووت : ئایا لەگەڵتا بێم ، بۆ ئەوەی هەندێك لەو ڕێنمایی یانەی کە فێر کراویت ، فێری منیشی بکەیت ؟

ووتی : بەڕاستی تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت و ئارامگربیت , ئایا چۆن دەتوانیت خۆت بگریت لەسەر شتێك کە پەی بەئاکامی و ئەنجامی نابەیت , ووتی :- دەمبینیت - إن شاالله - خۆگر دەبم , و لەفەرمانی تۆ دەرناچم , بەندەکە پێی ووت :- ( ئەگەر دوای من کەوتیت , پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە , هەتا دواتر بۆت باسدەکەم ) ووتی :- بەڵێ , بەندەکەو موسا ڕۆیشتن بە کەناری دەریاکەدا , کەشتی یەك بەلایاندا تێپەڕی , قسەیان لەگەڵ کرد

هەڵیانگرێت , ( خضر ) بەندەکەیان ناسی , بەبێ کرێ هەڵیانگرتن , کەچی ( خضر ) بەندەکە پەلاماری دا , تەختەیەك لەتەختەکانی ئەو کەشتی یەی هەڵکێشا , موسا ( علیه السلام ) پێی ووت : کۆمەڵێك ئێمەیان بە بێ کرێ هەڵگرت , کە چی تۆ پەلاماری کەشتی یەکەیانتدا و کونت کرد ) بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی لە ئاودا بخنکێن بەڕاستی شتێکی زۆر گەورەو ناڕەوات کرد . ووتی : من نەموت , تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت , ووتی : ئەم لەبیرچونەم لێمەگرەو لەم کارەمدا تەنگە تاوم مەکە ) .

دوای ئەوە لە کەشتی یەکە دەرچوون و بەکەناری دەریاکەدا دەڕۆیشتن , توشی منداڵێك هاتن لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد , ( خضر ) بەندەکە گرتی و کوشتی , موسا ( علیه السلام ) پێی ووت : ( ئایامنداڵێکی بێ تاوانت کوشت , بێ ئەوەی ئەو هیچ کەسێکی کوشتبێت , بەڕاستی کارێکی زۆر ناشیرینت کرد , ووتی :- من پێم نەوتیت : تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت ؟ ) ئەم جارەیان لەجاری ڕابردوو توونـد تربوو , موسا ( علیه السلام ) فەرمووی:- ( ئەگەر جارێکی تر من پرسیارم لێکردیت , ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە ) چونکە لەگەڵ من گەیشتیتە ئەو ئاستەی گلەییت لێ ناکرێت . ڕۆیشتن ... تاگەیشتنە گوندێك و داوای خواردنیان کرد لە خەڵکی ئەو گوندە توشی دیوارێك هاتن , خوار بوو بویەوە , ڕاستی کردەوە ) دەڵێت : کەمێك خوار بوو , ( خضر ) بەندەکە دەستی دایە ژێری و ڕاستی کردەوە , موسا ( علیه السلام ) پێی ووت : هاتینە ناو گوندێك بە میوانی وەریان نەگرتین , نانیان نەداینێ , ( گەر بت ویستایە کرێیەکت وەردەگرت لەسەر ئەم دیوار ڕاستکردنەوەیەت . ( خضر ) بەندەکە فەرمووی : ئەمە جیابوونەوەی نێوان من و تۆ یە , ئێستا ئاگاداریشت دەکەم لەسەر ئەو شتانەی توانات نەبوو خۆتی لەسەر بگریت و ئارامگربیت ) .

پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :- ( خوا ڕەحم بە موسا بکات , پێم خۆش بوو

خۆی بگرتایە , هەتا هەواڵیان زیاتر بۆ ئێمە باسبکرایە ) فەرموویەتی :- ( چۆلەکەیەك هاتە سەر لێواری کەشتی یەکەو دەنوکی دا لە دەریاکە ,( خضر ) بەندەکە بە موسای فەرموو : زانستی من و تۆ لە زانستی خوای کەم نەکردۆتەوە مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی ئەو چۆلەکە لە دەریاکەی کەم کردەوە).[1]

## ﴿ پێش دستپێکی چیرۆکەکە ﴾

گومانی تێدا نی یە کە ئەم چیرۆکە ڕێژەیەکی زۆر گەورە لەپەندو وانە و سودو ئامۆژگاری گرنگی تیایە . سەرەتاکەی وەك لەفەرموودەکەدا هاتووە , گلەیی خوا بوو لە موسا ( علیه السلام ) کاتێك زانستی پاڵ دایە پاڵ نەفسی خۆی , و نەیگێڕایەوە بۆ لای خوای گەورە , پاشان لێبوردنی تیایە , ئینجا ڕۆیشت کە زانست فێر بێت , پاشان بەو ئەدەبەی کە لەگەڵ ( خضر ) دا هەیبوو , کە دەرخستنی ئەدەمی قوتابی بوو بۆ مامۆستاکەی کە ووتی : ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ واتە : ( ئایا شوێنت بکەوم تالە و زانست و زانیاری یەی پێت بەخشراوە منیش بەهرەدار بکەیت ؟ ) و چۆن ( خضر ) زانی کە موسا ئارامگر نابێت و خۆی ناگرێت و ئینکاری دەکات لەو کارانەدا کە بەڕواڵەت خراپن , بەلأم لە ناوەڕۆکدا حیکمەت و مەبەستی شاراوەی تیایە , کە تەنها خوا دەیزانێت , و موسایش زۆر حەزی بە حەق بووە بە جۆرێك خۆی نەگرت و بۆ ماوەیەکی درێژ هاوڕێیەتی ( خضر ) بکات , ئەویش هەواڵی پێدا: کە تۆ ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆگربیت , و لە چیرۆکەکەدا ئەدەبی فێر بوونی زانست بەدی دەکرێت , و ئەدەبی زاناو فێر خوازی تیایە و ئەدەبی کەسی زانا لەگەڵ پەروەردگاریدا .

لەو ئەدەبانە نابێت شەڕ نیسبەت بدرێتە پاڵ خوا , وەك ئەدەبێك بەرامبەر خوا , لەگەڵ ئەوەی خوا بەدیهێنەری خەیرو شەڕە , بەلأم شەڕ پاڵ نادرێتە پاڵ

---

١ / ( بخاري ) لە ( الأنبياء ) بە ژمارە ( ٣٢١٩ ) و مسلم لە ( الفضائل ) دا ڕیوایەتیان کردوە .

 

خوا , بەڵکو لە هەموو ئەو شتانەی کە خوا تەقدیری دەکات و دەیهێنێت حیکمەت و مەبەستی شاراوەی تیایە لای بەشەر , ئەم ئەدەبەیش لە ئایەتی ﴿فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾ دا دەردەکەوێت , کەکاری خراپکردنی کەشتی یەکەی پاڵ دایە پاڵ خۆی . و لەئایەتی

﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا ﴾واتە :- ( جا پەروەردگارت ویستی کاتێك گەنجینەکەیان دەست بکەوێت کە گەورەو بە هێز بن , ئەوسا دەریبهێنین ) .

ئینجا دێینە سەر ڕونکردنەوەی چیرۆکەکە لە ڕوانگەی ئایەتە قورئانی یەکانەوە . خوای گەورە دەفەرموێت :-

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴾ ( الكهف / ٦٠ ) واتە : ئەی محمد

( ﷺ ) باسی چیرۆکی موسا یادی خەڵکی بێنە , کاتێك بە هاوەڵی لاوی خۆی ووت :من کۆڵنادەم و دەڕۆم , ئەگەر چەندەها ڕۆژم پێ بچێت , تا دەگەمە ئەو شوێنەی کە دوو دەریاکە بەیەك دەگەن , یان دەگەمە ئەنجام , یاخود ماوەیەکی زۆر دەڕۆم و دەگەڕێم ( خوای گەورە ویستی موسا پێغەمبەر( علیه السلام ) تێ بگەیەنێت , کە بەندەی وای هەیە , لەبواری تردا شارەزان , لەبەر ئەوە ڕێنمونی کردوە , تا بگەڕێت بە شوێن ئەو جۆرە کەسانەداو , لەوانیش سود وەربگرێت ) .

ئەو ( موسا ) یەی لەئایەتەکەدا هاتووە , بەپێی بۆ چوونی زۆرینەی زانایانی تەفسیر,( موسی ی کوڕی عمران )ە , کەیەکێکە لە پێغەمبەرانی ( أولوا العزم ) , وەك لە پێشتر لەفەرمودەکەدا باسەکەی بە درێژی هات .

کوڕە گەنجە لاوەکەیش ( یوشع ی کوڕی نون ) ە , بە ( فتی ) ناو براوە , چونکە لەگەڵ موسادا بووە و زانستی لێ وەردەگرت و خزمەتی دەکرد .

زانا ( قتادة ) دەڵێت : دوو دەریاکە : دەریای ( فارس ) و دەریای ( الروم ) ن , دەریای ( فارس ) ڕوەو ڕۆژهەلاتە و دەریای ( الروم ) ڕوەو خۆرئاوا . ﴿ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا ﴾ ( الكهف ٦١) .

موسا ( علیه السلام ) و لاوەکە هەردووکیان ڕۆیشتن تا گەیشتە شوێنە دیاری کراوەکە , لەبەر هیلاکی زۆر هەردووکیان خەویان پیاکەوت , لەو کاتەدا ئەو

ماسی یەی ناو زەمیلەکەیان کەوتە جوڵە جولْ و , لە زەمیلەکە خۆی فڕێ دایە دەرو بەرەو دەریاکە چوو , و خۆی تیا نوقم کرد .

﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا ﴾ (الكهف / ٦٢ ) .

کاتێک هەردوکیان لەخەوەکەیان خەبەریان بویەوە , ڕێگایان گرتەبەرو ڕۆیشتن , بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە لەو ماسی یەی کە لە بیریان چوو بوو , هەر بەردەوام بوون لەسەر ڕۆیشتن , تا زۆر ماندو بوون , ئینجا دانیشتن بۆ ئەوەی ماندویەتیان دەرچێت , لێرە دا و لەم کاتەدا موسا ( علیه السلام ) داوای کرد لە لاوەکەی کە خواردنەکە ئامادە بکات , کەلەناو زەمیلەکەدا بوو لەگەڵ ماسی یەکەدا , وەڵامی ( یوشع ) لاوەکە بریتی بوو لە :

﴿ قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا﴾ ( الكهف / ٦٣ ) .

باسکراوە کە موسا ( علیه السلام ) فەرمانی چاودێری و پاراستنی ماسی یەکەی سپارد بە ( یوشع ) لاوەکە , بەوەی کاتێك ماسی یەکە جوڵەی تێ کەوت , هەواڵی بداتێ , بەڵام ( یوشع ) وتی : ئەمە کارێکی ئاسانە , بەڵام لەبیری چویەوە لەو کاتەی کە پێویست بوو لێی ئاگادار بێت , لەگەڵ ئەوەدا وتی : ئایا ئەو بەردە گەورەیەت بیر دێت کەلە تەنیشتیدا پشوماندا , ئا لەوێ ماسی یەکە لە زەمیلەکە دەرپەڕی و ڕێگای خۆی لە دەریاکەدا گرت و ڕۆیشت , منیش کە ئەو کارەم بینی زۆر سەرم سوڕما ئەوەی کەلەبیری بردمەوە تەنها شەیتان بوو کە بۆتی باس بکەم , موسی ( علیه السلام ) موناقەشەی لاوەکەی نەکرد لەسەر ئەم لەبیرچونەوەیە , کە نیوەی ڕۆژێك ڕێیان بریبوو , بەڵکو زۆر دڵی خۆشبوو , پێی ووت : ئەوە ئەو مەبەستە بوو کە دەمانویست , ئینجا بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە جێ پێکانیان هەڵدەگرت , تا بگەڕێنەوە هەمان شوێن کە لای بەردەگەورەکە بوو , کە شوێنی گەیشتنیانە بە ( خضر ) بەندە چاکەکارەکە . لە خۆشیدا هەرچی ماندو بوون بوو لەبیریان چویەوە , لەلای بەردەکەدا پێی دەگەن , شوێنی دەرچونی ماسی یەکەش لە زەمیلەکە بۆ ناو دەریاکە , ڕێگایەکی لەناو دەریاکەدا جێ هێشتبووەکە وەکو تاقی هەڵکەندراوی لێکردبوو , ئاوەکە ڕاوەستابوو , وەك ئەو شێوەیەی کە ماسی

یەکە خۆی تیَ فڕیَ دا بوو . کە ئەمەش نیشانەیەکی ڕوونەو لەسەر شویَنەکەو هیچ گرفتیَکی تیا نی یە . لەو شویَنە دا کە ئاوڕیَکیان دایەوە , بینیان پیاویَك لای بەردەکەدایە , خۆی بەبەرگیَك داپۆشیوە , ئینجا موسی ( علیه السلام ) سەلامی لیَکرد , بەندەکە پیَی ووت : کەی لەم زەوی یەی تۆ دا سەلام هەیە ؟! سەری سوڕما لیَی لەسەلام کردنەکە لە زەوی یەکدا , کە لەم دەستەواژەی سەلامە بەتالَە , زانی کە ئەو کەسەی سەلامەکەی لیَ کردوە غەریبە ئینجا ووتی : من موسام , ئەو ووتی : تۆ ئەو موسایەیت کە بۆ ئەوەی ئیسرائیل نیَردراویت ؟ فەرمووی : بەلَیَ , هاتوم بۆ لای تۆ تا هەندیَك لەو زانستەی خۆتم فیَر بکەیت کە لیَی فیَربویت و بەهرەداربوویت . خوای گەورە ( خضر ) ی بە ( زانست ) ەوە باسکردوە . ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾ ( الكهف / ٦٥ ) ووتراوە :

( الرحمة ) واتە : پیَغەمبەرایەتی , و ( العلم ) واتە خوای گەورە لە هەندیَك لە شاراوەکان ئاگاداری کردوە , کەلە چیرۆکەکەدا دەردەکەویَت .

کۆمەلَیَك بەلَگە لەسەر ئەوە هاتوون کە ( خضر ) پیَغەمبەر بووە , کە تەنها هەولَ ( إجتهاد ) ی زانایانەو ( نص ) دەقی لەسەر نەهاتووە مەسەلەکە ڕست بکاتەوە . لەوانە :-

١- ئایەتی﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا ﴾ ئەم ( الرحمة ) یە ڕەحمەتی پیَغەمبەرایەتی یە , کە خوای گەورە بەوەی داوە .

( خضر ) ئەو ڕەحمەتی پیَغەمبەرایەتی یەی کە پیَی بەخشراوە , دلَنیای دەکاتەوە , کاتیَك لەشی کردنەوەی کارەکانیدا کە موسا بینی , پیَی ووت ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾ , واتە من ئەم سیَ کارەم کرد , کە وەکو ڕەحمەتیَکی تایبەتی بوو لە لایەن پەروەردگارتەوە .

٢- هەروەها ئایەتی ﴿ وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ خوای گەورە لە زانستی هەندیَك کار ئاگادارو شارەزای کردبوو, و هەوالَی شاراوەکانی هەندیَك لەشتەکانی پیَ ووتبوو .

ئەوە زانستە ( لدن ) ی یەش لەم ئایەتەدا زانستی پیَغەمبەرایەتی بووە .

٣- قسەکەی موسا ( علیه السلام ) بۆ ئەو : ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ ئەگەر پیَغەمبەر نەبووبیَت , موسا داوای لیَ ناکات لیَوەی فیَری

زانست ببێت . و بەم شێوازە لەگەڵی نەئەدواو تکای لیّ نەدەکرد و تەسلیمی نەدەبوو ئەم گفتو گۆیەش لە نێوانیاندا ڕوینەدەدا .

٤- ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە , ( معصوم ) پارێزراو نەدەبوو , واتە ڕەنگ بوو لە هەندێك کاریدا تووشی هەڵە ببوایە , ئەگینا چۆن پێغەمبەرێکی ( معصوم ) پارێزراو شوێنی دەکەوێت و دەیەوێت لێوەی فێر ببێت ؟ ئەگەر لە کارێکدا هەڵە بکات , ئیتر چۆن شوێن پێی هەڵبگرێت , تەنها پێغەمبەران پارێزراون .

٥- پێش دەستی کردنی ( خضر ) بۆ کوشتنی منداڵێك , بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی یەکەی , چونکە کوشتنی نەفسێك بەبێ حەق کارێکی ڕێپێدراونی یە , ئەگەر ئەو پێغەمبەر نەبوبێت , بەکافر بوونی ئەو منداڵەی نە دەزانی و , بەتایبەت کە موسای لەگەڵەو پێغەمبەریشە , بەکافری منداڵەکەی نەزانیوە , پاشان ڕونکردنەوەی ( خضر ) بۆ ( موسی ) بەوەی کەلەبەر کافر بونەکەی کوشتویەتی , بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هەواڵی پێداوەو , فەرمانی پیّ کردوە .

٦- ( خضر ) پاش ئەوەی کارەکانی ڕونکردەوە بە موسای ووت : ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ﴾ واتە : من بەکارو فەرمان و عیلمی خۆم ئەم کارانەم نەکردوە لە خۆمەوە , بەڵکو خوای گەورە فەرمانی پیّ کردووم , کە ئەوەش لە ڕێگای ( وەحی ) یەوە بوو .

٧- گلەیی خوا لە موسی ( علیه السلام ) کاتێك ووتی : من لە هەموو کەس زاناترم , خوای گەورە پێی فەرموو : ( بەندەیەك هەیە لە شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو دەریاکە , ئەو لە تۆ زاناترە ) , ( خضر ) لە ( موسا ) زاناتر بوو, لەو مەسەلانەدا . کە ناگونجێت ( الولي ) خوا پەرست لە پێغەمبەر زیرەکتربێت.

٨- قسەکە ( خضر ) بۆ موسا ( علیه السلام ) : من لەسەر زانستێکم لەلایەن خواوە , خوای گەورە فێری کردووم کە تۆ نایزانیت , و تۆیش لەسەر زانستێکیت کە خوا فێری کردویت , کە من نایزانم .[1]

---

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٣٩٩ – ٤٠٠ )

﴿ تێبینی و ڕونکردنەوە ﴾

قورئان هیچ ( نص ) دەقێکی لەسەر پێغەمبەرایەتی (خضر) نەهێناوەو لە هیچ شوێنێکدا ئاماژەی پێ نەداوە . ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بەڵگەکان ڕاست نین و ڕەت دەکرێنەوە . ئەو بەڵگانەی لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو هێنراون ( إجتهادی ظنی ) هەوڵدان و لێکدانەوەن و لە گومانەوە نزیکن , زانایان یەکدەنگ نین لەسەر پێغەمبەرایەتی , بەڵکو بابەتی هەوڵدانی خۆیان بووە . هەرچەندە کارەکە جیاوازی ڕاو بۆ چونی لەسەرە , هەرکەس ئینکاری پێغەمبەر بوونی بکات , کافر نابێت , بەڵکو بۆچونی ئەو پێچەوانەی کۆمەڵی زانایانە , ڕەنگە قسەکەی ئەو جێگەی ڕاستی بێت .

﴿ قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ ( الكهف / ٦٦ )

موسا ( علیه السلام ) بە (خضر) ی ووت : ئایا مۆڵەتم دەدەیت هاوڕێیەتیت بکەم و شوێنت بکەوم لەسەر ئەوەی کە هەندێك لەو زانست وعیلمەتم فێربکەیت کە لەلایەن پەروەردگارتەوە فێرکراویت , کە وانستە بۆ ڕێنمایی دۆزینەوەی خەیر ؟

( القاضي ) دەڵێت :- لەم کارەدا ئەو پەڕی لێبووردەیی و ئەدەبی جوان ڕەچاوکراوە , موسا ( علیه السلام ) خۆی بەدوور لە زانیاری باسکرد , وداوای مۆڵەتی لێ کرد کە شوێنی بکەوێت , و داوای لێ کرد کە ڕێنمایی بکات و سودی لێ وەربگرێت , بەفێرکردنی هەندێك لەو زانستەی کە ئەو لێی بەهرەدابوە , هەروەها دەشگونجێت داواکردنی قوتابی بێت لە مامۆستا .[1]

﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (٦٧) وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا ﴾ ( الكهف / ٦٧ – ٦٨ )

واتە : تۆ ئەی موسا ناتوانیت خۆت بگریت و ئارامگربیت لەوەی کە لەزانستی من دەیبینیت , چونکە ئەو زانستەی بەتۆ دراوە , توانای ئەوەت

---

٢/ ( محاسن التأويل ) ( ١١/ ٦١ , ٦٢ )

ناداتیٚ کە نهێنی ئەو کارە بزانیت , ئیتر تۆ چۆن دەتوانیت خۆگرو ئارامگربیت , لەسەر ئەوەی کە بە هەڵە دەیبینیت , کە هەواڵی حیکمەتی کارەکەت پێ نەدراوە , و ڕێگاکەیشت بەئاشکرا نەپێکاوە .

پێغەمبەران دان بەهەڵەدا نانێن و پەسەندی ناکەن , وڕێگا پێدراویش نی یە کە لێی بیٚ دەنگ بن , چونکە ئەوان لەسەر حیکمەتی کاری خۆیان کاردەکەن .

﴿ قَالَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أمْرًا ﴾ ( الكهف / ٦٩ )

لێرەدا مەرجی ( خضر ) لەسەر ( موسا ) ئەوە بوو , کەلە هیچ کارێکدا قسەنەکات کە دەبینێت , یان داوای ڕوونکردنەوەی نەکات , بەڵکو چاوەڕیٚ بکات کە ( خضر ) خۆی کارەکەی بۆ ڕوونبکاتەوە .

موسا لەسەر ئەوە سووربوو کە زانستی زیادبێت و دەشتوانێت ئارامگربێت , پاش ئەوەی ( خضر ) مۆڵەتی دابە

ڕاستی کارەکە ئینجا ( موسا ) بەڵێنی دا ئارامگربێت و بەستیشی بەویستی خواوە . وە وتیشی سەرپێچی فەرمانە کانت ناکەم . ﴿ قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٠ )

موسا لەگەڵ ( خضر ) ڕێکەوتن کە هاوڕێیەتی بکات لەگەشتەکەی یدا , تالێیەوە فێری زانست ببێت , لەسەر مەرجێك کە پرسیاری هیچ شتێکی لیٚ نەکات , تا ( خضر ) هەواڵی ڕونکردنەوەی بۆباس دەکات .

﴿ فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴾ ( الكهف / ٧١ )

هەردووکیان ڕۆیشتن , تاگەیشتنە لێواری دەریاکە , ( خضر ) داوای لەیەکێك لەکەشتیەکان کرد کەبیانبات بۆ شوێنێکی تر لەسەر کەناری دەریا , کەشتی وانەکە ( خضر ) ی ناسی و کرێی لیٚ وەرنەگرتن , کاتێك سەرکەوتن و کەشتیەکە ڕۆیشت , ( خضر ) پارچەیەك تەختەی لەکەشتیەکە کردەوە و عەیبداری کرد , موسایش ئەم کارەناڕاست و هەڵەیەی بینی , ڕەخنەی لە (خضر ) گرت , وپێی ووت : نوقمی دەریا بن , بەڕاستی کارێکی زۆرگەورەو ترسناکت ئەنجامدا , و جێگای سەرسوڕمانە و زیانی گەورەیە , ئایا ئەمە پاداشتی کەشتیوانەکەیە کە بەبیٚ کریٚ گەیاندینی ؟

ئینجا ( خضر ) , ( موسا ) ی بیر هێنایەوە بەومەرجەی کە لەنێوانیاندا بوو , وپێی فەرموو :- ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٢ )

( خضر ) بەندە زاناکە ووتی : ئەم ووت تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگربیت ؟! .

ئینجا موسا داوای لێبووردنی کردو عوزری بۆ هێنایەوە لە شکاندنی مەرجەکەی و پەلەکردنی لە ئینکاری کردنی لەسەر کارەکەی ( خضر ).

﴿ قَالَ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٣ )

بەڕاستی ئەم کارە لەبیرچونەوە بوو لەلایەن منەوە , بۆ مەرجەکەی نێوانمان , لەناڕەحەتی ئەو کارەی کەبینیم , جائێستا تکام وایە بەئاسانی مامەڵەم لەگەڵدا بکەیت , واتە لێم ببوریت لەسەر پەلەکردنەکەم .

کاتێك دەڕوانینە ئەم مەسئەلەیە لە ئایەتەکەدا چەند ( سەرگوزشتە ) یەکی لێ دەردەهێنین :-

١- پێغەمبەران هەندێك کات شتیان لەبیر دەچێتەوە , بەلام ئەم لەبیرچونەوەیە نەفی پارێزراوییان لێ ناکات .

خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی فەرموو :- ﴿ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ ( الكهف / ٢٤ ) واتە : کاتێك لەبیرت چویەوە , یادی پەروەردگارت بکە .

خوای گەورە دەربارەی ئادەم ( علیه السلام ) دەفەرمووێت :

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا ﴾ ( طة / ١١٥ )

واتە : سوێند بەخوا , بێگومان ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت ( کەنزیکی درەختی قەدەغە کراو نەکەوێت ) کەچی بیری چوو ,بەمەرجێك نەمان بینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەوسەر پێچی یە بدات. لەبیر چونەوەی پێغەمبەران , لەدیاردەبەشەریەکانە , چونکە ئەوان بەشەرن , ولەبیر چونەوەش پێویست و لازمە بۆ نەوەکانی ئینسان .ئەم لەبیر چونەوەیە لەشەیتانەوە نەبووە , چونکە شەیتان دەسەڵاتی بەسەر پێغەمبەراندا نیە .

جیاوازی دەبینرێت لەنێوان قسەکەی ( یوشع ی کوڕی نون ) ﴿ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ ﴾ ( الكهف / ٦٣ ) . ولە قسەکەی موسادا:﴿ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ﴾ دەبینین (یوشع) بیرچونەوەکەی دایە پاڵ

شەیتان , لەکاتێکدا کە موسا ( علیە السلام ) بیرچونەوەکەی دایە پاڵ نەفسی خۆی .

٢- ئەوەی ئینسانی موسوڵمان دەیبینێت کەپێچەوانەی شەرعی خوایە , ئینکاری دەکات , و ناتوانێت لەسەری بێ دەنگ بێت , وەك ئەوەی موسا ( علیە السلام ) بەرامبەر کاری کەشتی کونکردنەکەی ( خضر) کردی .

٣- بینینی کارە خراپەکە - بەپێی ڕواڵەتی دەرەکی موسا وای لێکرد کەپەیمانەکەی لەبیر چویەوە, کەبەسەر خۆیدا بڕیبوی, ئەمەش لەبەر هەستیاری موسابووە , وبەپێی بۆ چونی نەفسی خۆی ڕەتی کردەوە .

﴿انطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٤) پاشان دابەزینە سەر وشکانی و کەوتنە ڕێ , هەتا گەیشتنە منداڵێکی بچوك , کە لەگەڵ منداڵانی تردا یاری دەکرد , ئینجا ( خضر ) بەندە زاناکە گرتی و سەری لە جەستەی کردەوە و کوشتی , بەڕاستی دیمەنێکی زۆر گەورەو قورس بوو , نزیك بوو موسا ( علیە السلام ) عەقڵی لەدەست بدات کە ئەمەی بینی ئەم کارەیان زیاتر هەژاندی تاکە شتی یەکە , ئایا ئەم منداڵە چی کردوە تابکوژرێت ؟ من لەکوێدام , ئایا شەریعەت لەناو ئەم قەومەدا نی یە کە حوکمیان بکات , ئایا ئەم کارە چی بوو ڕویدا من بینیم ؟ بەڕاستی موسا ( علیە السلام ) کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدا و ئینکاری ئەم کارەشی کرد . و ووتی :- سەیرە , ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت , بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێت و ( شایستەی کوشتنەوە بێت ) سوێند بەخوا کارێکی ناپەسەندو ناڕەوات ئەنجامدا !! .

ئەوەی لەشەریعەتی موسادا هەبوو , کەسێك لەباتی کەسێکی تر بکوژی دەکوژرێت , و ئەم منداڵە یش بچوك و بێ تاوانە , و هیچ تاوانێکی کوشتنی ئەنجامنەداوە , وەك گوڵ خونچەیەکی تازەکراوەی جوان وایە , پاك و بەدوورە لەهەموو جۆرە تاوانێك , بۆچی بەم شێوەیە بکوژرێت ؟ لەئەنجامی ئەوەی کە موسا نەیتوانی ئەم جارەش خۆڕاگربێت , ( خضر ) کارەکەی لەسەر قورسترکرد و گلەیی لێ کرد , بۆیە فەرمووی :-

﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٥ )

واتە : ئایا پێم نەوتیت کە بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا

 

ئارامگرییت و دان بە خۆتدا بگریت ؟

لەم جارەیاندا حەرفی ( لك ) ی بۆ موسا زیادکرد , ئیتر لێرەدا موسا ( علیه السلام ) ئاستی کۆتایی بۆ خۆی دیاری کرد, کە ئەگەر پرسیاری کرد ئەوا جیابوونەوەیان ڕوودەدات :

﴿ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٦ ) .

واتە : موسا ( علیه السلام ) ووتی :- ئەگەر دوای ئەم جارە پرسیاری هەرشتێکم لێ کردیت , ئەوە هاوڕێیەتیم مەکە, بەڕاستی بەڕای من مافی خۆتەو لەلایەن منەوە لێبوردراویت ( چونکە من بەئاسانی لە هەڵسوکەوتی تۆ تێ ناگەم ) .

بەپێی عادەتیش تا سێ جار مۆڵەت دەدرێت , ئیتر لەوەو دوا زیاد ناکرێت, ئیتر موسا کارەکەی لەسەر نەفسی خۆی یەك لایی کردەوەو بڕیاری کۆتای ڕاگەیاند .﴿ فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا (٧٧) قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا (٧٨) ﴾ ( الكهف / ٧٧-٧٨ ) .پاشان ڕۆیشتن دەرچون , هەتا گەیشتنەوە خەڵکی شارۆچکەیەك , کەلەباشوری ( السیناء ) بووە , بەبەخیلی ناسرابوون لەبەر ئەوکارەیان ڕەتیان کردەوەکە میواندariyan بکەن و خواردنیان بدەنێ , پاشان بەبرسیەتی دەرچون , ئینجا لەناو شارەکەدا دیوارێکیان بینی ' لاربوو بوویەوە خەریك بوو دەڕوخا , ئینجا ( خضر ) بەندە زاناکە هەڵی چنیەوە و ڕێك و پێك و چاکی کردەوە , ئالێرەدا موسا ( علیه السلام ) نەیتوانی بێ دەنگ بێت بەرامبەر ئەم هەڵوێستە, بۆیە ووتی: ئەگەر بتویستایە کرێیەکت بەرامبەر ئەم کارە وەردەگرت. ڕەنگە برسیەتی زۆر و بەخیلی خەڵکی شارەکە هۆکاری بووبن , تاموسا ئەم قسەیەی کردبێت, بۆیە وای بەباش زانی کرێ وەربگرێت , ئەوە کارەکە بوو بەسێ جار, موسا ( علیه السلام ) سەری سوڕما وای لێکدایەوە کە خەڵکی ئەم شارە شیاوی ئەم ڕێزلێگرتنە جوانە نین, ئینجا ( خضر ) هۆکاری لێك جیابوونەوەی بۆ باسکردو ووتی: ﴿ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ﴾ واتە:ئیتر لێرە بەدواوە کاتی جیابوونەوەی من وتۆیە.

کاتێك ( خضر ) حیکمەتی چاك کردنەوەی دیوارەکەی بۆ ڕونکردەوە ووتی :
﴿ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾

**لەم ئایەتەنەدا سێ خاڵی گرنگ وەردەگیرێن:**

١- خەڵکی شارەکە بەخیل و دەست نوقاو بوون , لەمەدا گەیشتبوونە کۆتایی , کاتێك دوو پیاوی غەریب بەدوایاندا ڕۆیشتن , خواردنیان پێ نەبوو , واچاك و جوان بوو , ڕێزیان لێبگرتانایەو خواردنیانبدایە پێیان , بەبێ ئەوەی خۆیان داوای بکەن . بەڵام نەیان کرد , بەڵام ( خضر ) و ( موسا ) لەناچاریدا داوای خواردنیان لێدەکەن تابیخۆن بەڵام لەبەر زۆر بەخیلیان , خواردنیان پێ نەدان و , دەستیان نابەڕویانەوە .

٢- دیوارێکیان لەناو شارەکەدا بینی خەریك بوو دەڕوخا , بەڵام قورئان , بەجوانی لێکدانەوە و دەربڕینەکەی خۆی ویستی ڕوخانەکەی پاڵ داتەوە پاڵ دیوارەکە خۆی , واتە: دیوارەکە دەیویست بڕوخێت.

هەندێك لەزانایان دەڵێن : ئەمە لەشێوازی دەربڕینی ( مجاز ) ی قورئانە , ئەگەر نا, خۆدیوار بێ گیان و بێ زمانە , وخاوەنی هیچ (إرادة) ویستێك نی یە . بەڵکو ( إرادة ) ویست , لەسیفەتی زیندوەکانە , بەڵام لەپێشتر وایە کە ئەم دەربڕینە ( مجاز ) ی نی یە و ( حقیقی ) ڕستی یە .! هەموو دروستکراوێك ( ویست ) ی خۆی هەیە, ئەگەر ڕوەك و بێ گیانیش بێت , بەڵام ئەم ویستە وەك ویستی بەشەر یان زیندوەکانی ترنیە!.

پاشان کێ دەڵێت دیوار مردووە یان بێ گیانە؟ بێ گومان ژیانی تیایە , ولێی دێت , وبەئاستی خۆیشی دەبێت , بەڵام هەرگیز وەك ژیانی بەشەر نیە . ژیانی تیایە , بەڵام وەك ژیانی زیندوەکان نا , واتە ( إرادة ) ویستی هەیە , بەڵام وەك هی زیندوەکان نا. ئەگەر تێبینی دەربڕینی ﴿ جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ ﴾ بکەین , دەبینین تێڕوانینێکی فەنی جوان و ناوازەی تێدایە , وپێناساندنێکی دیواریشی تێدایە, - کەسفەتێکی زیندوەکانی بۆ داناوە - کە إرادة - یە , ئەگەر شێوەو دیمەنەکەی بێنینە بەر چاوی خۆمان , نزیکەوای ببینین کە دیوارەکە دەیەوێت بکەوێت و بڕوخێت , ئەگەر ( خضر ) چاکی نەکردایەوە .

٣- چاك كردنەوەی دیوارەكە لەلایەن ( خضر ) ەوە , بەبیّ ئەوەی كەسێك داوای لیّ بكات , وەبەبیّ ئەوەی لەگەڵ كەسێكدا ڕێكەوتبێت كرێی لێوەرگرێت , ئەوە دەگەیەنێت كەموسڵمان حەزی لەكاری خەیرە , و سورە لەسەر پێشكەش كردنی یارمەتی بۆ كەسانی تر , ئەگەر داواشیان لێنەكردبێت ئەوە دەگەیەنێت كەكاری خەیرە , پێویستی بەمۆڵەت وەرگرتن نیە .

٤- ( خضر) لەچاكردنەوە و ڕاستكردنەوەی دیوارەكەدا لەسەر حەق بوو , چونكە خوای گەورە ئاگاداری كردبوو بەبوونی ( كنز ) گەنجینەیەك لەژێریدا , ئەگەر دیوارەكە بڕوخایە , وخەڵكی بەخیلی شارەكە بیانبینیایەوە پێیان بزانیایە , دەستیان بەسەر یدا دەگرت .

٥- گەنجینەكە هی دوو منالّی بیّ باوك بوو لەشارەكەدا , كەبچوك بوون , ئەگەر دەریكەوتایە , ئەمان بیّ دەسەلاّت بوون كە دەریبهێنن و بیانپارێزن لەناو خەڵكی شارەكەدا , لەبەر ئەوە ( خضر ) دیوارەكەی چاك كردەوە تائەوكاتەی گەورە دەبن .

٦- ئایەتی: ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەدایك وباوكی چاكەكار شوێنەواریان لەسەر چاك بوون و پاراستنی منداڵەكانیان هەیە . بەهۆی چاكەی باوكەكەوە خوای گەورە ( خضر ) ی نارد , تادیوارەكە بۆ دوو منداڵەكە هەڵبچنێتەوە

٧- شاردنەوەی ماڵ و سامان لەژێر دیوارەكەدا لەلایەن پیاوە چاكە كارەكەوە , بەڵگەیە لەسەر ڕێگە پێدانی هەڵگرتنی ماڵ و سامان و پاشەكەوت كردنی , و بەكار هێنانی لەكاتی پێویستی دا .

﴿ قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾ ( الكهف / ٧٨ )

واتە: ( خضر ) بەندەزاناكە ووتی : - ئیتر ئالێرە بەدواوە كاتی جیابوونەوەی نێوان من و تۆیە , من پاش كەمێكی تر تۆ ئاگادار ئەكەم لە حەقیقەت و سەر ئەنجامی ئەو شتانەی كەنەتتوانی لەبەرامبەریانەوە ئارام بگریت .

﴿ أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴾ ( الكهف / ٧٩ ) .

زانا ( الشنقيطي ) دەڵێت: لەدیوی ئاشکرای ئەم ئایەتەدا وادەردەکەوێت , کەئەم پاشایە دەست بەسەر هەموو کەشتیەکدا دەگرێت , ئیتر بێ عەیب بێت یان عەیبداربێت , بەڵام لەئایەتێکی ترەوە تێدەگەین کە دەست بەسەر کەشتیە عەیبدارەکارەکاندا ناگرێت , وەك فەرموویەتی :﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا﴾ واتە: ویستم عەیبداری بکەم , تادەستی بەسەردا نەگرێت , ئەمە حیکمەتی کونکردنی کەشتیەکەبوو . پاشان ( خضر ) ڕونی کردەوە کەمەبەستی لەکونکردنی کەشتیەکەیە , بۆ خاوەنی و کەسانی ناوی سەلامەت دەبێت , لەوەی کەئەو پاشایە داگیری بکات , چونکە عەیبدارکردنەکەی دەیپارێزێت خاوەنی ئەم کەشتیە , کەسانێکی هەژار ( مسكين ) بوون , لەبەر هەژاری خۆیان , بەرگەی دەست بەسەر داگرتنی کەشتیەکەیان نەدەگرت , و ڕەنگ بوو خێزان و منداڵەکانیان برسی بوونایە , بەهۆی ئەم دەست بەسەر داگرتنە , ڕەنگ بوو ئەو پاشا گومڕایەش هەرچی لەناو کەشتیەکەدابوو هەموویانی بکوشتایە , ئایا ( خضر ) نەبوو کەمافی دابەهەموو هەژارە پاك و بێ تاوانەکان , کەکرێیان لەموسا وەرنەگرت لەگەڵ هەژاریەکەیشیاندا ؟ کەشتیەکەی ئەوانی لەدەست بەسەر داگرتن پاراست , بەڕاستی ئەمە نهێنی یەکی گەورەیە , کێ دەیزانێ لەپشت زیان گەیاندنی بەم کەشتیە سودێکی گەورەتر دەست دەکەوێت , ئەگەر خوای گەورە (خضر ) ی لێ ئاگادار نەکردایە لەوەی کەڕوودەدات , کەلەلای کەسانی تر نادیاربوو .

**کاتێك ( خضر ) ئەم کارەی کرد چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێت :-**

١- هەژارەکان کەشتیەکیان هەبوو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ( مسكين) هەژار , دەشێت هەندێك ماڵ یان کەل و پەلی هەبێت , بەڵام بەشی هەموو پێداویستی یەکانی ناکات , بەڵام ( الفقير ) نەبوو , ئەو کەسەیە کە خاوەنی هیچ شتێك نی یە .

٢- وشەی ( وَراء ) واتە ( أمام ) پێش یان بەردەم واتە : لەپێشیانەوە پاشایەکی ستەم کار هەیە , هەرکاتێك کەشتیەکی چاك و بێ عەیب بەلایدا بڕوات , داگیری دەکات , و دەستی بەسەردا دەگرێت , نەموسا و نە کەسانی تر بەمەیان نەدەزانی , لەکاتێکدا خوای گەورە (خضر)ی لەمە ئاگادار کردبوو, وە وەحی بۆکرد کەکەشتیەکە کون بکات تاپارێزراو بێت .

٣- لەهەڵسوکەوتی ( خضر ) ەوە تێ دەگەین , کەپاشاکە تەنها کەشتی چاك و بێ عەیبی دەگرت .

٤- کاری پاشاکە شتێکی سەیر پیشان دەدات , چونکە کاری ئەو بریتیە لە پاراستنی بەردەستەکان و گەلەکەی, بەکەس و شت و مەك ومالّ و سامانیانەوە , وەدەبێت پارێزەریان بێت و نەهێڵێت کەس دەست درێژی بکاتە سەریان , بەلاّم ئەم پاشایە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی ڕێگر. و پلە وپایەو سوپاکەی تەرخان دەکات بۆ ئەم کارە , ئەمەش کارێکی گەورەو بەلاّیەکی ناڕەحەتە.

٥- لەکاتی گەندەڵی کاربەدەستاندا , خەڵکی ڕزگاریان نابێت بێجگە لە بانگ خوازان و چاکەکاران , بەجۆرێك کە ئەوان دەبنە هیواو کەسانی ڕزگارکەر , کەڕووبەڕووی ستەم و خراپە کاری و زۆرداری و لادان دەوەستێنەوە , وەك ئەو کارەی کە ( خضر ) کردی .

٦- ئاوڕدانەوەیەکی جوانی تێدایە کە بریتە یەلە:( خضر ) توانی کەشتیەکە بپارێزێت , لەڕێگای عەیبدارکردنیەوە , هەندێك جار چاکسازی گشتی پێویستی بەکەمێك عەیبدارکردن هەیە , وهەندێك جار چاکە تێکەلاّوی هەندێك خراپەدەبێت , ئەگەر کاتێك کارەکە بەو جۆرە بوو , ئەوا بێگومان کەسی چاکە کار , واخۆی دەبینێتەوە ناچاری ئەوە کارە دەبێت .

ئیسلام واجبی دەکات کەسزا جێ بەجێ بکرێت بۆ پاراستنی نەتەوە و دین و ئەخلاق , کوشتنەوەی بکوژ و بەرد بارانکردنی داوێن پیس و بڕینی دەستی دز , لەڕووی ئاشکراییەوە , خراپە کردن و شکاندن و لەناو بردنی ڕۆحەکانە , بەلاّم گرنگن تاچاکەو چاکسازی بێتە بەرهەم ﴿ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا (٨٠) فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾ ( الكهف / ٨٠-٨١ ) .

واتە: منداڵەکەیش ( کەکوشتم ) دایك وباوکێکی ئیمانداری هەبوو, ترساین لەوەی کەبەسەرکەشی و بێدینی و خوانەناسی هیلاك و ماندویان بکات ( چونکە هەرلەئێستاوە سەرکەشی و لاساری پێوە دیاربوو ) . بەوکارەمان ویستمان کەپەروەردگاریان ( لەجیاتی ئەو ) پاکتر و چاکتریان پێ ببەخشێت , وبەمنداڵێکی خاوەن بەزەیی و میهرەبانتر بەهرەوەریان بکات ( منداڵەکەیش بەهەشتی بێت ) .

ئەگەر هەڵوێستەیەکی خێرا لەسەر ئەم ئایەتە بکەین , ئەم خاڵانەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت :-

١- کوشتنی منداڵێکی بچوک لەلایەن ( خضر ) ەوە , کارێکە لەڕواڵەتدا دەبێت ئینکاری بکرێت . لەبەرئەوە موسا ئینکاری کرد , ئەم کارەی موسایش بانگەوازکردن بوو بۆ دژایەتی کردنی خراپە ,و ئاشکراکردن و دەرخستنی خراپەکان .

٢- قسەکەی موسا بۆ ( خضر ) ی کرد : ﴿ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾ بەڵگەی تیایە لەسەر ئەوەی , کەبەپێی شەرع کوشتن دروستە , کەکوشتنەوەی بکوژە بەرامبەر بەو نەفسەی کەکوشتویەتی, لەبەر ئەوە موسا

( علیه السلام ) ئینکاری کوشتنی منداڵەکەی کرد , چونکە شیاوی کوشتن نەبوو , چونکە ئەو کەسێکی نەکوشتوە تالە بریا بکوژرێتەوە.بەڵگەی قورئانی لەسەر ئەمە هاتوە وەك دەفەرموویت :- ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴾ ( المائدة / ٤٥). واتە: ( لەتەوراتدا پێویستمان کردوە لەسەریان , کەبەڕاستی هەرکەسێك , کەسێك بکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە , وچاوی یەکێك کوێربکات , دەبێت چاوی کوێربکرێتەوە و , لوتی یەکێك عەیبداربکات , دەبێت لوتی عەیبداربکاتەوە , وگوێی یەکێك ببڕێت , دەبێت گوێی ببڕێتەوە , دانی یەکێك بشکێنێت , دەبێت ددانی بشکێنرێتەوە , وبرین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەندرێتەوە) .

لەم ئایەتەیشدا بەڵگەیەك ترهەیە کەکتێبە ئاسمانیەکان لەزۆرێك لەحوکمەکاندا ڕێك کەوتون و بڕیاریان یەك بووە.

٣- موسا ( علیە السلام ) لە ڕەخنە گرتنەکەیدا جیاوازی کرد لە نێوان کارەکانی ( خضر )دا ، کاتێك کەشتی یەکەی عەیبدار کرد، پێی فەرموو :- ﴿ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴾ بەڵام لەکاتی کوشتنی منداڵەکەدا فەرمووی :-

﴿ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴾ .

( إمراً ) واتە : ناشایستەو گەورە .

( نُكراً ) واتە : زۆر ناپەسەند و ناڕەوا .

( نكراً ) زیاتر ئینکاری کراوە لە ( امراً ) ، وەك ئەوەی قۆناغی دووەم قورستر

بووە لە ئینکاری کردندا ئەمەش تەنها بۆ ئەم دوو کارە بووە ، لە ڕواڵەتدا دیارە کاری کوشتنەکە زیاتر ناڕەوا و ناپەسەند بووە ، لەبەر ئەوە بە ووشەیەکی تر دەری بڕی .

٤- لە جاری دووەمدا ( خضر ) بە مووسای ووت : ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ بەڵام لە جاری یەکەمدا لەکاتی عەیبدارکردنی کەشتی یەکەدا پێی ووت :- ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، تێبینی ئەوە دەکەین ووشەی (لك )ی بۆ زیاد کرد ، ئەم زیاد کردنە بۆ ( تأكيد ) دڵنیاکردنەوە بوو لێی دڵنیاکردنەوە لە جاری دووەمدا ، چونکە مووسا ( عليه السلام ) بۆ دووەم جار ئینکاری کرد ، وەك ئەوەی ( خضر ) پێی بڵێت : ئایا پێم نەوتیت ، بەتۆم نەوت ؟. من بە دڵنیایی باش دەزانم تۆ خۆگرو ئارامگر نابیت لەگەڵ مندا ، دڵنیام کە تۆ ڕەخنە دەگریت ، من ئەوەم بە تۆ ووت ، و دڵنیام کردەوە لێت .

٥- موسا هەستی کرد بەوەی کە دەبێت شەرم بکات لە ڕەخنە گرتنی لە ( خضر )، لەبەر ئەوە پێی ووت :- ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلا تُصَاحِبْنِي ﴾ لەم کارەدا ( موسى ) پەلەکردنی پێوە دیاربوو .

٦- (خضر) ڕونیکردەوە ، ئەوەی کە پاڵنەر و هۆکار بوو بۆ کوشتنی ئەو منداڵە ، ئیمانداری دایك و باوکی و کافری خۆی ، ئەگەر بمایەتەوە تا کاتی گەورەبوونی ، لەگەڵ ئەوەی کە هەردوکیان باوەڕداربوون ، بەڵام منداڵێکی بێ باوەڕیان بوو . ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیاو چاك هەندێك جار منداڵی ناباشی دەبێت ، و هەندێك جار بێ بڕوا دەردەچن . ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە باوك کەم و کورتی بنوێنێت لە ئامۆژگاری کردنی منداڵەکانیدا ، دەبێت پەروەردەیان بکات و ئاراستەیان بکات و هەڵیان بسەنگێنێت ، ئەمەش واجبە لەسەری ، ئەگەر کەم و کورتی بنوێنێت و بەو کارانە هەڵنەسێت ، ئەو تاوانبارە ، ڕەنگە هەندێك جار منداڵەکە کافر بێت و لە دەست باوکی دەرچێت ، لەم کاتەدا باوك دەسەڵاتی بەسەریدا نابێت ، لەسەر ئەمەش لۆمە ناکرێت .

٧- بێگومان باوکی چاکەکار ڕازی نابێت تەنها یەکێك لە کوڕەکانیشی کافر یان یاخی یان خراپەکار بێت ، بەڵکو ئازار دەگات بە دڵی و خەفەتبار دەبێت و لەسزادا دەژی ، قسەکەی ( خضر ) ئاماژەی داوە بەمانە ، وەك فەرمووی :-

﴿مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا ﴾ واتە :( ترساین لەوەی کە بەسەرکەشی و بێدینی و خوانەناسی هیلاك و ماندوویان بکات ) .

٨- هەندێك جار مردنی ئەوەی گومڕاو سەرلێشێواو دەبێتە مایەی ئیسراحەت و حەوانەوەی دایك و باوکی و دەروکردنەوە لێیان ، وەك ( خضر ) ووتی :- ﴿ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾ کاتێك ئەوکوڕە گومڕایەیان مرد ، دایك و باوکەکە داوادەکەن لە خوا کە بۆیان قەرەبوو بکاتەوە ، و داوا لە خوای گەورە دەکەن کە بۆیان بگۆڕێت بە پاکترو چاکتر و بەبەزەیی ترو میهرەبانتر .

٩- ئایەتەکە ئاماژەی تیایە ، کە کەس لە ئێمە ڕێگەی پێ نادرێت پەیڕەوی ئەم کارانەی ( خضر ) بکات ، بۆ هیچ کەس ناگونجێت منداڵێك بکوژێت ، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو دەیزانی کافر دەردەچێت کە گەورە بوو ، و خوای گەورە بوو هەواڵی دا بە ( خضر ) بەم کارە ، و داهاتوی ئەو منداڵەی پیشاندا ، چونکە داهاتوو غەیب و شاراوەیە ، تەنها خوا دەیزانێت , خوای گەورە بۆ هەندێك لە پێغەمبەرانی خۆی دەردەخات , کە خۆی بیەوێت .

بەڵام خەڵکی تر بێجگە لە پێغەمبەران , بێگومان غەیب نازانن . کێ بەو کەسە دەڵێت ئەم منداڵە کافر دەردەچێت؟ کەلە دوای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەحی ڕاگیراوە ؟ .

﴿ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾( الكهف/٨٢) واتە : ئەو دیوارەی کە هەڵم چنی و ڕاستم کردەوە , بێ ئەوەی کرێ ی لەسەر وەرگرم , کەلاربوو بوویەوە و خەریك بوو دەڕوخا , لە ژێریدا گەنجینەیەکی زێرو زیوو شاردرابویەوە , هی دوو منداڵی بێ باوك بوو و باوکیشیان پیاوێکی چاکەکارو لە خواترس بوو , و خوای گەورەیش لەبەر باوکیان , ئەم گەنجینەیەی بۆ پاراستبوون , زانایانی تەفسیر ووتویانە : چاکی باوك سوودی بۆ منداڵەکانیان هەیە , خوای گەورە بەم کارە ویستی ئەو دوو مداڵە گەورەببن و پێ بگەن و پاشان ئەو گەنجینە شاراوەیە لە ژێر دیوارەکەدا دەربهێنن , ئەمەش ڕەحمەت و بەزەیی بوو لەلایەن خواوە بۆ ئەوان , ئینجا ( خضر ) ووتی : من ئەم کارەم لە

خۆمەوە نەکرد و بەفەرمانی خۆم نەبوو , ئەوەی تۆ بینیت لە عەیبدارکردنی کەشتی یەکەو کوشتنی منداڵەکەو چاککردنەوەی دیوارەکە , لە کارو هەوڵدانی خۆم نەبوو , بەڵکو بە فەرمانی خوا کرد من , وڕونکردنەوەی ئەم کارانەش , کە تۆ نەتتوانی خۆت بگریت و ئارامگربیت بەرامبەریان و ڕەخنەت لەسەر گرتن , بەم جۆرە بوو کە بۆم باسکردیت و هەواڵم پێدایت.

پاش ئەوەی کە ( خضر ) نهێنی ئەنجامدانی کارەکانی بۆ موسا ( علیه السلام ) لێکدایەوە , و ڕاستی یەکەی بۆ دەرخست , ئیتر موسا ( علیه السلام ) زانی ( خضر ) لەسەر حەق و ڕاستی بووە لەو کارانەیدا کە ئەنجامی دابوو, و دڵنیابوو کە بەرژەوەندی لەو کارانەدا بووە کە ئەو ئەنجامی داوە .

﴿ سوودو وانە گرنگەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- زانا ( القاسمی ) دەڵێت :- ( السیوطي ) لە ( الأكليل ) دا ووتوەیەتی :- لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت هیچ گرفتێك نی یە لەسەفەردا کەسێك هاوڕێ و هاودەم و خزمەتکاری هەبێت , خۆشتر و باشتر وایە کەسەفەرەکە بۆ فێربونی زاست بێت ) وتوێشووی سەفەریش ئامادەبکرێت .

لەگەڵ ئەوانەشدا نەڤ ئەوە نەکرێت کە پشت بە خوا ببەسترێت و نیسبەتدانی لە بیرچونەوە و کارە ناڕەواکان بۆ پاڵ شەیتان دروستە و نابێت نیسبەت بدرێتە پاڵ خوای گەورە ، و دەبێت کەسی مامۆستا و فێرکەر لێبووردنی هەبێت بەرامبەر ئەو کەسەی لێوەی فێردەبێت و ، ئەگەر پلەکەیشی لە پلەی ئەو خوارتر بوو.

زانا (البیضاوي ) دەڵێت :- لە سوودەکانی ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە مرۆڤ نابێت بە زانستی خۆی سەرسام ببێت ، و دەسپێشکەری نەکات بۆ کارێك کە خۆی بە جوانی دانەناوە ، ڕەنگە نهێنی یەکی تیابێت و ئەو نەیزانێت ، و

بەردەوام بێت لەسەر فێربوونی زانست و خۆی بە بچوك و کەم بزانێت لای مامۆستاکەی ، و ڕەچاوی ئەدەبی جوان بکات لە قسەکردندا ،و کەسی تاوانکار لەسەرکردنی تاوان بە ئاگا بهێنێتەوەو لێی ببورێت ، تا ئەو کارەی لەسەری سوربوە جێ بە جێی بکات و پاشان لێی دوور بکەوێتەوە .[1]

٢- زانا(القاسمی) هەر خۆی دەڵێت:لە(الأنتصاف)دا هەندێك سەرگوزشتە دەربارەی ئایەتەکان هاتووە لەوانە :-

( الناصر ) دەڵێت : ئەوەی هۆکاری پاڵنەر بوو بۆ موسا دەستپێشکەری بکات ، بۆ ئینکاری کردنی ئەو کارانە و پاراستنی حەق و ڕاستی ، لە کاتێکدا ( خضر ) کەشتی یەکەی عەیبدار کرد ، فەرمووی :﴿ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا ﴾ نەیفەرموو : ( لِتُغرِقنا ) نەفسی خۆی لە بیرچوو ، و سەرقاڵ بوو بە غەیری خۆیەوە ، لەو حاڵەتەدا کە هەرکەس دەیوت ( نفسی نفسی ) ( خۆم خۆم ) کەس گوێی بە ماڵ و منداڵ نەدەدا ، ئەوەش دیمەنی حاڵەتی نوقم بوون بوو ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە پێغەمبەران و هەڵبژێردراوانی خۆی لە ئامۆژگاری کردنی حەق ئاگادارکردەوە و سۆز و میهرەبانی پێداون و نەرمی لە دڵیاندا چاندووە .

٣- زانا ( عبدالرحمان بن ناصر السعدی ) دەڵێت :- لەم چیرۆکەدا چەند وانەیەکمان دەست دەکەوێت لەوانە :-

لێبوردەیی کەسی بەڕێز بۆ فێربوون لەو کەسەی کە پلەی لەهی ئەو خوارترە ، بێ گومان موسا لە ( خضر ) لە پێشتر بووە و ڕێزدارتر بووە .

- فێربوونی زانایەکی پلەبەرز و ڕێزدار لەو زانستەی کە هێشتا فێری نەبووە ، لەو کەسەوەی کە فێری بووە و لێی بەهرەدار بووە ، با پلەی لەویش نزمتر بێت ، موسا یەکێك بووە لە پێغەمبەرە گەورەو ناودارەکانی ( اولی

١/ ( محاسن التأويل ) ( ١١/ ٦٨ – ٦٩ ) بە دەست کاریەوە .

العزم ) کە خوای گەورە زانستێکی وا زۆری پێ بەخشی بوون ، کە بە کەسی غەیری خۆیانی نەبەخشی بوو ، بەڵام لەو زانستە تایبەتەی لای ( خضر ) هەبوو لای ئەو نەبوو ، لەبەر ئەوە زۆر حەزی دەکرد فێری ببێت .

– زانستی بە سوودو بەکەڵك ئەو زانستەیە کە ڕێنمایی بکات بۆ حەق و ڕاستی ، هەر زانستێك بەو جۆرە بوو ، ئەوە بەسوودە ، هەرچیش لەو شێوازە نەبوو ، یان ئەوەتا زیانبەخشە ، یان هیچ سودێکی تیا نی یە وەك فەرمووی :– ﴿أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ ( الكهف / ٦٦ ) .

– هەر کەس ئارامگر و خۆڕاگر نەبێت لەسەر هاوڕێیەتی کردنی زانا و بەهێزو خۆڕاگر نەبێت لەسەر ڕێگای فێر بوون ، ئەوە کەم و کورتی نواندوە و ئەهلی گەیشتن بەو زانستە نی یە ، و هەر کەس ئارامگرتنی نەبوو ، زانستی دەست ناکەوێت ، و هەر کەسیش ئارامگرتنی بەکارهێنا و لەگەڵی یەکانگیر بوو ، هەموو کارێکی دەست دەکەوێت کە هەوڵی بۆ داوە ، بێگومان ( خضر ) عوزری لە مووسا قبوڵ کرد کە نەیتوانی ئارامگربێت لەسەر دەستکەوتنی زانستە تایبەتەکە .

– ئاگادارکردنەوەیەکی تیایە لەسەر یاسایەکی بەناوبانگ و گەورە ، کە بریتیە لە لابردنی شەڕێکی گەورە ، بە ئەنجامدانی زیان و شەڕێکی بچوك و سوك ، و ڕەچاوی بەرژەوەندی گەورەتر بکرێت , بەلەدەستدانی کەم و بچوکەکەیان , بێگومان کوشتنی منداڵێکی بچوك شەڕوتاوانە , بەڵام ئەگەر بمێنێتەوە تاگەورەتربێت , شەڕەکەیش زیاتروگەورەتربێت , ومانەوەی منداڵەکەیش بەبێ کوشتنی , لەگەڵ ئەوەی کەبەئاشکرا بەخەیر دەردەکەوت , بەڵام خەیرەکە لەوەدا بووکە دایك وباوکی لەسەردینی خۆیان بمێننەوە , ئەمەیان لە پێشترو خەیروچاکترە , لەبەرئەوە ( خضر ) کوشتی دوای ئەوەی کە خوای گەورە ئیلهامی ڕاستی بۆکرد , ئیلهامی شاراوە بە پلەی نیشانە ئاشکراکان دێت لە حەقی غەیری خۆیدا . – یاسایەکی گەورەتریش هەیە , بریتی یە لەوەی کەئینسان کارێك لەسەرماڵ وسامانی غەیری هی خۆی بکات , ئەگەر بەرژەوەندی و دوورخستنەوەی شەڕی تیابوو , ئەم کارە ڕێگە پێدراوە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن , تەنانەت ئەگەر بوو بەهۆی لەناوچونی

هەندێك ماڵ وسامانیش , وەك ئەوەی کە ( خضر ) کەشتی یەکەی عەیبدارکرد, بەم هۆیەوە لە داگیرکاری پاشاکە ڕزگاری کرد . - بۆبەندەکان واجوان وگونجاوە کەلە هاوڕێ یەکەی جیانەبێتەوە لەحاڵێك لەحاڵەکاندا , بەڵکو بەوەفابێت لەگەڵیدا , تائەوکاتەی بوارێك بۆئارامگرتن نامێنێتەوە , بەیەکەوەمانەوەی دوو هاوڕێ و هاوەڵ لەگەڵ یەکتری , لەغەیری ئەوکارانە کە حەزەروقەدەغەیان لەسەرە , ڕێگە پێدراو وپەسەندە , وهۆکارن بۆمانەوەی ئەوهاوەڵێ بونەو دڵنیاکراوەتەوە , هەروەك نەبوونی ڕێکەوتن هۆکارە بۆدابڕان و لێك جیابوونەوە .[1]

٤- ئاشکراو شاراوەکان لەمەسەلە گرنگەکانن کەلەم چیرۆکەوە فێردەبین , لەسەرمان پێویستە پەلەنەکەین لەدەرکردنی بڕیاردا بەئاڕاستەی ڕوداوەکاندا , کەلە ژیانماندا ڕوودەدەن , کەڕەنگە هەندێك کات نەبێتە جێگای سەرسوڕمان لامان , زۆرێك لە ڕووداو هەن حەزبەبینیان یان بیستنیان ناکەین, بەڵام پاش ماوەیەك ڕووندەبێتەوە کەئەم ڕووداوانە هیچ نەبوون , بەڵکو تەنها جۆرێك بوون لەڕووداوی شاراوەی خوایی, قورئان ناوەڕۆکی ئەم ڕاستیە لەئایەتی : ﴿عَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾( البقرة /٢١٦ ) دا ڕوندەکاتەو, واتە (ڕەنگە شتێکیان لاناخۆش بێت, کەچی خەیر لەوەدابێت, هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت, کەچی شەڕلەوەدابێت, بێگومان هەرخوادەزانێت (خەیرلەچیدایە ) ئێوە نازانن ) .

١ / ( تيسر الكريم المنان في خلاصة تفسير القران ) ( ١٤٧- ١٤٩) بەکورتی .

## ﴿ چیرۆكی ( ذي القرنَيْنِ ) ﴾

خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت :- ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا (٨٣) إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا (٨٤) فَأَتْبَعَ سَبَبًا (٨٥) حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا (٨٦) قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُّكْرًا (٨٧) وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا (٨٨) ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا (٨٩) حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا (٩٠) كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا (٩١) ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا (٩٢) حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً (٩٣) قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا (٩٤) قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا (٩٥) آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا (٩٦) فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا (٩٧) قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاء وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاء وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾ ( الكهف / ٨٣- ٩٨ ) .

**پێش ده‌ستپێكردنی چیرۆكه‌كه :-**

ئه‌مه چیرۆكی چواره‌مه له‌سوره‌تی ( الكهف ) دا , چیرۆكه‌كه وه‌ڵام بوو بۆ هاوه‌ڵ دانه‌رانی مه‌ككه كه پرسیاریان له‌پێغه‌مبه‌ر ( ﷺ ) كرد , ده‌رباره‌ی ئه‌و پیاوه‌ی كه‌به ( ذي القرنين ) ناسرابوو , شێوازی قورئان له‌گێڕانه‌وه‌ی چیرۆكدا , خۆی له درێژه‌پێدان و ڕوونكردنه‌وه‌ی زۆرلاده‌دات , كه‌هیچ حیكمه‌ت و په‌ندو وانه‌یه‌كی له‌پشته‌وه‌نی یه.

ته‌نها به‌و ئامآژه‌و په‌ندو ئامۆژگارییانه ئیكتیفاده‌كات كه له‌ناو چیرۆكه‌كه‌دا هاتووه , وخه‌ڵكی له‌سه‌ر ( ذي القرنين ) ڕاوبۆچونی جیاوازیان هه‌یه : ئایا پێغه‌مبه‌ر بووه یان پاشا ؟ هیچ كه‌سێكی ( معصوم ) هه‌واڵی له‌سه‌رپێغه‌مبه‌رایه‌تی نه‌هێناوه ,وهیچ به‌ڵگه‌یه‌كیشیان له‌م ئایه‌ته‌دا له‌سه‌ری ده‌ست نه كه‌وتووه كه ده‌فه‌رمووێت:﴿ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴾ له‌گه‌ڵ

ئایەتی : ﴿ قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ ﴾ ئەوەی لێکی دەدەنەوە هیچ جێگیرو چەسپاونی یە ,هەروەها ڕاوبۆچوونی جیاوازیشیان لەسەر ناوی هەیە . ئەوەی لەناو ئایەتەکاندا دەردەکەوێت , ئەو پاشایەکی باوەڕداربووە , خوای گەورە هۆکارو توانای پاشایەتی پێداوە , کە بتوانێت پێی بگاتە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەوی , کەسێکی دادپەروەر بوو , لەکەسانی باوەڕدارنزیك بۆتەوەو , فاسیق و لەسنوردەرچوان و یاخی بوان و خراپەکارانی سزادەدا , وەك لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت کە فەرموویەتی :-

﴿ وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾ ( الكهف / ٨٧- ٨٨ ) . ئەمە کاری پاشایەکی موسڵمان بوو کە ئەهلی دینی پایەدارکردو بەرزی کردەوەو کافران ولەسنوردەرچوانی سزادا , پێچەوانەی ئەوە بوو کە زۆرێك لەکاربەدەستە موسڵمانەکان پشتگیری لەبت پەرستان دەکەن و ئەهلی ئیسلام سزادەدەن , وزیندانەکانی سەرزەوی پڕکراون لەگەنجی موسڵمان , لەکاتێکدا کەئەوان ڕازین پەروەردگار ( الله ) خوایان بێت و ئیسلام دینیان بێت و محمد ( ﷺ) پێغەمبەریان بێت , ئەمانەش زۆرترینی کاربەدەستانن لە وولآتی موسڵماناندا , ئەگەر هەموویان نەبن ﴿ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾ ( التوبة / ٦٧ ) . واتە : ( دووڕوەکان فەرمان بەگوناهو خراپەو تاوان دەدەن و قەدەغەی خەیرو چاکە دەکەن و دەستیان دەنوقێنن ( ماڵ و سامان بەشی کەس نادەن ) ئەوانەی خوایان فەرامۆش کردوە , خوایش ئەوانی پشت گوێ خستووە ) .

خوای گەورە باسی باوەڕدارانی ڕاستگۆدەکات و دەفەرمووێت :- ﴿ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴾ ( الحج / ٤١ )

واتە : ( ئەوانەی کە پایەدارمان کردن لە زەویدا , نوێژو دروشمەکانی بەچاکی ڕادەگرن , زەکاتیش بەتەواوەتی دەدەن , فەرمان بەچاکە دەکەن , وقەدەغە لەخراپە دەکەن , سەرئەنجامی هەموکاریکیش هەربۆلای خوا دەگەڕێنەوە ) .

لە ڕوکارە چاکەکانی ئەم پاشایە , ئەوە بووە کەدەست پاك بووە بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە لەدەستی خەڵکیدابووە , کاتێك پێی ووترا :- ﴿ فَهَلْ

نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾ .

واتە : ( ئایا خەرجیەك و پارەیەكت بۆ كۆبكەینەوە تا بەربەستێك لە نێوان ئێمە و یەئجوج و مەئجوجدا دروست بكەیت ؟ ) . ئەو لەوەلاًمیاندا ووتی : ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ ﴾ واتە : ( ئەو دەسەلاًت و زانیاری و شتانەی پەروەردگارم پێی بەخشیوم چاكترە بۆ من ( لەپارەو سامان ) . وەك سولەیمان ( علیه السلام ) فەرمووی : ﴿ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم ﴾ ( النمل / ٣٦ ) . واتە : ( سولەیمان ( علیه السلام ) بەتوڕەیی یەوە بە نوێنەرەكانی ( بەلقیس ) ی ووت :- ئێوە دەتانەوێت بە ماڵ و سامان و دیاری كۆمەكیم بكەن؟! من دڵنیام كە ئەو شتانەی خوا پێی بەخشیوم , لەوە چاكترو بەنرخترە , كەبە ئێوەی بەخشیوە ) .

ئەوەی لە چیرۆكەكە بەدەست هاتووە , پاشا بووەو ڕۆژهەلاًت و ڕۆژئاوای بۆ نزیك خراوەتەوە , و یارمەتی ئەهلی ئیمانی داوەو سزای بتپەرستانیشی داوە , ئەو كاری لەبەرژەوەندی بەردەستەكانی كردوە , هەستاوە بە ئەنجامدانی چاكسازی لەسەر زەویدا , هەموو ئایەتەكان ئاماژەیان بەمەداوە , وەك لەم ئایەتەدا هاتووە :

﴿ وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾ واتە : ( لەمەو دوا قسەی خۆش و فەرمانی ئاسان و كاری سوكی دەدەین بەسەر دا . ) ئایەتەكان لەكۆتاییدا ئەوەیان دەربڕیوەكە ﴿ سَدًّا ﴾ بەربەستێكی دروستكردوە , ئەوەیش لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆكراوە :- ﴿ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾ واتە : ( بینی خۆر هەڵدێت لەسەر قەومێك كە پەناگەیەكیان نی یە تا لە تینی خۆیان بپارێزن ) . وەك ئەوەی بیناو باڵەخانەی بۆ دروستكردبن , كە جەستەیان لەگەرمی تیشك و تینی خۆر بپارێزێت , یان جل و بەرگی بۆ ئامادەو دەستەبەر كردبن , ئەمەش لەناو ئایەتەكەوە وەردەگیرێت .

**دێینە سەر ماناكردنی ئایەتەكان :-**

﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾ ( الكهف / ٨٣ ) .

ئایەتەكانی چیرۆكەكە بەو پرسیارە دەست پێ دەكات , كە هاوەڵدانەران ئاڕاستەی پێغەمبەر ( ﷺ ) یان كرد , ئەویش ئەو پرسیارە بوو كە ( یهود )

جولەکەکان , هاوەڵدانەرەکانیان فێرکرد کە لە پێغەمبەر (ﷺ) ی بکەن , ووتیان : پرسـیاری لێ بکـەن دەربـارەی ئـەو پیـاوەی دەسـوڕایەوە , بـە ڕۆژهـەلأت و ڕۆژئاوای زەویدا, چیرۆك و بەسەرهاتەکەی چۆنە ؟ .

ئایەتەکـە دەڵێت :- ئـەی محمـد (ﷺ) ئـەوان پرسیارت لێ دەکـەن دەربـارەی هـەواڵی ( ذي القـرنين ) تـۆیش پێیـان بڵـێ : گۆشـەیەك لەبەسـەرهاتی ئـەوتان بۆباسـدەکەم . گێڕانـەوەی ئـەم بەسـەرهاتە و چیرۆکە لەلایـەن پێغەمبەرخۆیـەوە نەبوو, بەڵکو لەلایەن خوای گەورەوە فێرکرا .

لێـرەدا تێبینـی ئـەوە دەکـەین کـە خـوای گـەورە چـۆن پیشـتیوانی لـە پێغەمبەرەکـەی کـرد , و ئەوبەڵگـە گەورەیـەی دایـە , ئـەوان پرسـیار دەربـارەی ( ذی القـرنین ) دەکـەن , خـوای گـەورەیش وەلأمـی ڕاسـت و دروسـتیان لەسـەر زمـانی پێغەمبـەرەوە بۆ ئامادەدەکـات . کاتێك پێغەمبـەر ( ﷺ ) ئـەو هەواڵـەیان پێ بگەیەنێت , واتە : قسەکەی ڕاست و حەقە , و ئەو هەواڵەی کە ئەو دەیـدات لە خوای گەورەوە وەریگرتوە ﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا (٨٤) فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ ( الكهف / ٨٤ – ٨٥ ) .

بێگومان خوای گەورە هێزێکی گەورەی جەستەیی و بیرکردنەوەیەکی ڕونـاکی پێ بەخشی بوو , و بەسوپایەکی گەورەو بە هێزیش پشتیوانی لێ کرد بوو , و خوای گەورە تواناو دەسەلأتی لەسەر زەویدا پێ بەخشی بوو کەدەسـتی بەسـەر هەموو شتێکدا دەگەیشـت و دەیتـوانی دوژمنـانی ژێـر دەسـت بخـات و سـود لـە خەیر و بەرەکەتی زەوی وەربگرێت , هەموو ڕێگاو بان و سەرچاوە ئـاوی یـەکان لە ژێر دەسەلأتی ئەودا بوون , هیچ شتێك لە دەسـتی یـاخی نـەدەبوو , تەنانـەت دەریـا گـەورەکانیش . ( السـبب ) واتـە : ئـەو هۆکـار و ڕێگایەیـە کـە دەیگەیانـدە مەبەسـتی خـوازراوو دیـاریکراو , خـوای گـەورە هـەموو هۆکـارێکی بـۆ ژێربـار خستبوو کە توانی بە هەموو جیهاندا بسوڕێتەوەو ڕزگاری بکات و ئامۆژگـاری و ڕێنمایی خەڵك بکات و لە بواری چاکسازیدا کاربکات .

( إبن عباس و قوتـابی یـەکانی ( السـبب ) یان بـە زانسـت لێکداوەتـەوە , واتـە خوای گەورە زانستێکی وای پێ بەخشی بوو کە بتوانێت لەسـەر زەویـدا سـەقام گیرو دامەزراوی بکات و دەسەلأتی ڕزگار کردن و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنانـدا هەبێت .

﴿ حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴾ ( الكهف / ٨٦ )

( خۆی و لەشکرەکەی ) کەوتنە ڕێ هەتا کاتێك گەیشتنە ئەو پەڕی ناوچەکانی خۆرئاوا ,( کە وا دەهاتە بەرچاو) لە گۆمێکی قوڕاودا خۆرئاوا دەبێت , لەو شوێنەدا ڕێی کەوت لە قەومێکی ( خوا نەناس و بێ دین ) , ئێمەیش پێمان ووت :- ئەی ( ذو القرنین ) یان ئەوەیە بە سزا لە ناویان دەبەیت , ( ئەگەر لەسەر کوفرو تاوانیان بەردەوام بوون ) یان چاکەیان لەگەڵدا دەکەیت , ( ئەگەر شوێنی ئیمان و چاکە کەوتن ) . لەڕاستیدا خۆر لەئاسماندایە و لەسەر هیچ شتێکی زەوی ئاوا نابێت کە ئەو بیشارێتەوە , بەڵکو ئەو ئاوابونە لەبەر چاوی بینەرەکە وا دەرکەوتووە , ئەگەر ئاخۆ جەمسەرەکانی خۆر بە ( سەد و نۆ ) جار لەجەمسەرەکانی زەوی گەورەترە , ئیتر چۆن , ئەو خۆرە گەورەیە لەسەر چاوەکی ئاوی ڕەش بووی سەر زەویدا ئاوا دەبێت ؟ ئەمەش نابێت تەنها لەبەر چاوی ئەو کەسە وا دەردەکەوێت کە سەیری دەکات , وەك ئێمە دەیبینین لە پشت شاخێکەوە یان دەریایەکەوە ئاوا دەبێت . پاشان چووە ئەو شوێنە قەومێکی بینی لە دەوری ئەو سەرچاوە ئاوە نیشتە جێ بوون , لەو ناوچە گەرمە , کە پێویستیان بەبەرگ و داپۆشەری ئەستور بووە تا لەگەرمی و تینی خۆر بیان پارێزێت . ﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ﴾ پاش ئەوەی بانگەوازی ئەو قەومە بێ باوەڕەی کرد بۆ حەق و ڕاستی و نیشاندانی ڕێگای خوا پەرستی , ئەوا هەرکەس ئەو بانگەوازەی ڕەتکردەوە , ئەو ستەمی لەنەفسی خۆی کردوە بەمانەوەی لەسەر هاوەڵ پەرستی و ڕەتکردنەوەی ئیمان , ئیتر ئەو کەسە شیاوی سزادان دەبێت لەلایەن ( ذو القرنین ) ەوە , و ﴿ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُّكْرًا ﴾ ( الكهف / ٨٧ ) .

بەو جۆرە لە ڕۆژی قیامەتیشدا , کاتێك بێ دین و هاوەڵ دانەران فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە , بەڕاستی سزاکەیان توندو بە ئازار دەبێت .

﴿ وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾ ( الكهف / ٨٨ ) .

هەرکەس لەوان ئیمان بهێنێت و ببێتە شوێن کەوتوی ( ذي القرنین ) خوابە تاك و تەنها و بێ هاوەڵ بزانێت , بێگومان ئەو کەسە لە ڕۆژی وەرگرتنەوەی

پاداشتدا لای خوای گەورە پاداشتی چاکە وەردەگرێت . و لەدنیاشدا کاریان ئاسان دەبێت و ژیانێکی خۆش و کامەرانی بەسەر دەبەن و لەلایەن ( ذي القرنين ) ەوە مامەڵەی باشیان لەگەڵ دەکرێت و قسەی جوانیان بۆ دەکرێت . زەوی بۆ ئەوان دەبێتە لانکەو شوێنی حەوانەوەی ئارام , خراپەو کوشتنیان تووش نایەت , و ماڵ و شوێنەواریان تێك نادرێت و وێران ناکرێت .

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ ( الكهف / ٨٩ ) .

ئینجا ڕۆیشتنەکەی بەرەو ئاراستەیەکی تر گۆڕی پاش ئەوەی کە چاکەو دڵنیایی لەو ناوچەیەدا سەقامگیر کرد , بەرنامەی ئیسلام ی تیا بڵاوکردەوە و , ئەو هۆکارانەی گرتە بەر کە خوای گەورە ڕامی کرد بوون لە بواری خەیرو چاکەی گشتی , لەسەر زەویدا .

﴿ حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا (٩٠) كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾ ( الكهف / ٩٠ – ٩١ ) .

ئینجا ( ذو القرنين ) ڕووی کردە خۆرهەڵات , لەو شوێنەی کە خۆری لێ هەڵدێت , خۆر چەند شوێنێکی هەڵهاتنی هەیە , چونکە هەر قەومێك شوێنی خۆرهەڵاتنی خۆی هەیە , واتە هەریەکەیان خۆر هەڵاتێکیان هەیە .

گرنگ ئەوەیە کە ئەم قەومە پەناگەیەکیان نەبوو کەلە تینی خۆر بیانپارێزێت لە کاتی هەڵاتن و دەرکەوتنیدا .

ئەم لێکدانەوەیەش جیاوازی ڕاو بۆچوونی زانایانی لەسەرە :-

١- هەندێکیان دەڵێن : لەناو دەشت و تەختایی دا نیشتە جێ بوون , ناوچەکە شاخی تیا نەبووە تا سێبەریان بۆ بکات لە تیشکی خۆر پارێزراو بن , کە هەڵدەهات یەکسەر لەناو ماڵەکانیان دا بوو .

٢- هەندێکی تریان دەڵێن : خانوو ماڵیان نەبوو تا لەتیشکی خۆر و گەرمی یەکەی بیانپارێزێت و لێیان نەدات , لەبەر ئەوە یەکەم دەرکەوتنی لەسەر ئەوان بوو .

٣- هەندێکی تریان دەڵێن : شتێکیان نەبوو لە جل و بەرگ جەستەی خۆیانی پێ داپۆشن , واتە ڕووت و ڕەجاڵ بوون . پێش ئەوەی قورئان باسی خۆی لەسەر ( ذي القرنين ) تەواو بکات و فتوحاتەکانی باس بکات , و پێش

ئەوەی باسی کارە گرنگەکەی بکات لەناوچەی باکوری زەویدا . قورئان دان دەنێت بەڕاستیەکی بنەڕەتی دا , کەدەفەرمووێت : ﴿ كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾ ( الكهف / ٩١ ) .

واتە : بەڕاسی خوای گەورە زاناو شارەزایە بەحاڵی ( ذو القرنين ) ئاگای لەهەڵس و کەوتەکانیەتی , ئاگاداری هەواڵی خۆی و سوپاکەیەتی , هەنگاوەکانیان بە پشتیوانی خوا دەنێن , بگەنە هەر شارێك و ناوچەیەك یان پیای بڕۆن و دەستی بەسەردا بگرن , خوا ئاگادارە لێیان [1] . پاش ئەوەی کەگەیشتنە ناوچەی خۆرهەلأت و ناوچەی خۆرئاوا , یاسای دادپەروەرانەی دانا بۆ کۆمەڵگاکان و بانگەوازی ڕێنمایی ڕێگای ڕاستی پێ گەیاندن , کەپابەند بن پێوەی , هەرکەس پابەند بێ پێوەی , ئەوە مامەڵەی چاکی لەگەڵ دادەکرێت , و هەکەسیش ڕەتی بکاتەوەو ئینکاری بکات , ئەوە سزادان باشترین کارە بۆی . لەبەر ئەوە لەهەموو ناوچەیەکی ئاوەدانی دا بانگەوازەکەی تازە کردەوەو بەهەموو خەڵکی گەیاند , بەهۆی ئەو دەسەلأت و هۆکارەی کە خوای گەورە بە ئەوی بەخشیبوو . [2]

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا (٩٢) حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لاَّ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً ﴾( الكهف / ٩٢- ٩٣ ) .

زانا ( القاسمي ) دەڵێت : واتە ڕێگای سێیەمی گرتەبەر کەلەنێوان خۆرهەلأت و خۆرئاوای زەویدا بوو , هەتا گەیشتە نێوان دوو شاخ کەدوو بەربەستی گەورەو بەهێز لەنێوانیاندا دروست کرابوو .

دکتۆر ( صلاح عبدالفتاح خالدی ) دەڵێت : ئەم ناوچەیە دەکەوێتە باشوری چیایی ( قوقاز ) ەوە , کەئێستا بە ( ئەرمینیاو جۆرجیاو ئازەربایجان ) ناودەبرێت .

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل ( ٥٢٩ – ٥٣٠ )

٢ / ( قصص القرآن الكريم وسيرة سيد المرسلين ) ل ٣٠٦ .

دکتۆر ( محمدمنیر الجنباز ) دەڵێت : ئەم قەومە لە قەومەکانی پێشتر زیاتر دواکەوتوو نەزان بوون , وا دەردەکەوێت کەئەمانە قەومی ( مغول ) بوون , قسەکردن و دەربڕینیان لە قۆناغی تازە دروست بووندا بووە, هیچیان نەدەزانی تەنها ئەوانە نەبێت کەلەنێوان خۆیاندا بەکاریان دەهێنا , لە زمانی کەسانی غەیری خۆیان تێ نەدەگەیشتن , هەرچەندە لێشیان نزیك بووایە , قورس و گران بوو لەسەریان , بەلاَم ( ذو القرنين ) بەو زانست و هۆکارانەی خوا پێی بەخشیبوو توانی لەزمانیان تێبگات , وەداواکاریەکانیان ببیستێت , ئەو داواکاریەی ئەوانیش بریتی بوو لە ئامــاژەدان بەســکاڵاکردن لەدەست دراوسێکانیان کە ئازاریان دەدان ,

﴿ قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾ ( الكهف / ٩٤ ) . دراوسێکانیان بریتی بوون لە ( يأجوج ) و ( مأجوج ) .

( يأجوج ) لە ( الترك ) ن و ( مأجوج ) لە ( الجبل و الديلم ) ن , وتراویشە یەك قەبیلەن و ئەم ناوەیان هەڵگرتووە, چونکە دەچنەوە سەر ( يافث ) ی کوڕی ( نوح ) . ئەم قەبیلەیە دەردەچن و دادەبەزن بۆ زەوی قەومە دراوسێکانیان لەوەرزی بەهاردا , هەرچی شتێکی سەوزی تیا ببینن دەیخۆن , وتراوە مرۆڤیش دەخۆن , و ووتراوە کاری کوشتن و ستەم و دەست درێژی ئەنجام دەدەن لەسەر دراوسێکانیان , ئەمەی دەربارەیان باسکراوە زۆر لەناو شەڕو خراپەدان و , خۆپاراستن لێیان زۆر پێویستە , لەبەر ئەوە داوایان لە ( ذي القرنين ) کرد , کە ماڵ و سامان و خەرجی بدەنێ , تا بەربەستێك لە نێوان ئەوان و ( يأجوج و مأجوج ) دا دروستبکات . دەڵێین : کە ئەوان ئەوەندە ماڵ و سامان و خەرجیان بووە , بۆچی خۆیان ( سد ) بەربەستەکە دروست ناکەن ؟ ڕەنگە قورسی و ناڕەحەتی زۆریان توش بێت , لەوانە :- نەبونی شارەزایی لەدروستکردنیدا , ڕەنگە بەهۆی ناکۆکیانەوە نەتوانن تەواوی بکەن , پێویستی بە هێزێکی گەورەیە کە بیپارێزێت , لەبەر ئەوە ئەوان ئەو ماڵ و سامانەیان پێشنیار کرد بۆ ( ذو القرنين ) .

﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴾ ( الكهف / ٩٥ ) .

( ذو القرنين ) ئەو هێزو توانایەی هەیبوو , نیسبەتی دایە پاڵ خوای گەورە , کە قودرەتی خوایە توانای ئەو کارانەی داوەتیٚ و یارمەتیدەرێتی , ووتی : خوای گەورە هێزو توانای داومەتیٚ و بە توانای کردوم لەسەر جیٚ بەجیٚ کردنی قورسترین کار , جا ئەمە خەیرەو چاکترە , بەڵام ئێوە بەجەستەو هێز و توناتان یارمەتیم بدەن و کارم لەگەڵ بکەن , پارەو سامان و خەرجیم لە ئێوە ناوێت , ئەو بەربەستە لەبەرژەوەندی خۆتانە , دەبێت توانای خۆتان بەگەڕ بخەن بۆ دروستکردنی , تا هەست بەنرخی کارکردن بکەن , بێگومان دروستکردنی هیچ شتێك بیٚ کارکردن و بەتەمەڵی و پاڵدانەوە نایەتە بەرهەم , بەڵکو بە هەوڵدان و ماندو بوون پێك دێت , بەو جۆرە ( ذو القرنين ) پشتی بە خوای گەورە بەست لە پێشدا , پاشان بەبەشداریکردنی کەسە سود بەخشەکان , لەگەڵ ئەو کەسانەی کە شارەزاییان هەبوو لەو کارەدا هەستان بەنەخشە دانان , بۆ دروستکردنی بەربەستێکی بەهێزو سەر سوڕهێنەر , کە پێشتر هاو شێوە نەبووبێت , و دواتریش دروستنەکرێت , کارەکەی دابەش کرد بەسەر کەسەکاندا , بەپێی ی تواناو تایبەتمەندی و شارەزایی یان . ﴿ آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴾ ( الكهف / ٩٦ ) .

( ذوالقرنين ) داوای لەخەڵکی ئەوقەومەکرد کە پارچەی ئاسنی بۆ ئامادەبکەن , تاله نێوان هەردوو شاخەکەدا دایبنێت و هەڵی بچنێت .

پارچە ئاسنی گەورەوپتەوبوو ,کە لەناو چەیەك دەیانبڕی و دەیانهێنا , کە ماددەی کانزایی زۆری تیابوو , کە ناوچەی ( أرمينيا و جورجيا ) بوو , ئاسن و مس زۆربوو , هەروەها ڕوەك و دارستانیش زۆربوو , هەروەها گیانلەبەرو ئاژەڵی باری هە بوو , کەپێتان دەگوێزرایەوە بۆ ئەو ناوچە دورە پارچە ئاسنی گەورەیان هێنا , و لەو ناوەندەدا دایاننا , و لەسەر یەك هەڵیانچنی , بەردەوام بەرزیان دەکردەوە , هەتا ئەمپەڕو ئەو پەڕی شاخەکەی پڕکردەوە تائاستی لوتکە بەرزەکانی , پاشان فەرمانی پیٚ کردن کە ئاگر لەژێر ئەم ئاسنانەدا داگیرسێنن و فوی پیابکەن , دەبێتە ئاگرێکی زۆرگەورە وبەتین .

لەهەمان کاتدا ( ذوالقرنینِ ) فەرمانی کرد بەکۆمەڵێکی تر , کە ( مس ) بتوێنەوەو ئامادەی بکەن و بۆی بهێنن .

ئینجا قۆناغی دوای ئەو دێت کە مسە تواوەکە بکات بە سەر ئاسنەکەدا کە گەرم کراوە , ئینجا هەردووکیان تێکەڵ بەیەك بوون , و بوونە دارِشتەیەکی بەهێزو پتەو.

بەڕاستی ( ذوالقرنین ) ئەندازیارێکی شارەزاو کارامەبووە , خاوەنی هێزو تواناو هەستکردنێکی گەورەو ناوازەبووە .

خوای گەورە ڕێنمایی کردبوو بۆ ڕێگایەکی بەهێزو سەیر , لە قایم دروستکردنی ئەو بەربەستە بەهێزە , بەوکارە توانی مس و ئاسنی تواوە بەسەر یەکدا تێکەڵ بکات .

( سید قطب ) دەربارەی ئەمە دەڵێت :- ( ئەم ڕێگاو شێوازە لەسەردەمی نوێشدا بەکاردێت , بۆبەهێزکردنی ئاسن , بینراوە تێکەڵ کردنی نیسبەتێك مس بەئاسن , ئەوا بەهێزەو بەرگرییەکەی چەندجاردەکاتەوە , خوای گەورە ( ذوالقرنین ) ی بۆ ئەم کارە ڕێنمایی کرد , ولەناوقورئاندا تۆماری کرد , بوو بەپێشینە بۆ زانستی بەشەری لە چەرخی نوێدا , چەند سەدەیەکی بەسەردا تێپەڕبوو, کە خوای گەورە هەرخۆی دەیزانێت .[1]

کاتێك ( ذوالقرنین ) لەدروستکردنی بەربەستەکە تەواوبوو , ( یأجوج ومأجوج ) هەروەك عادەتی خۆیان هاتن بۆ ئەوەی لەبەربەستەکە تێپەڕن و فەسادوخراپە بلاوبکەنەوە , بەلاَم لەپڕێکدا لەگەڵ ئەو بەربەستەدا ڕوو بەڕوو بوونەوە , ڕێگەی نەدان تێپەڕن , ویستیان بەسەریدا سەرکەون و خۆیانی پیا هەڵزنن , بەلاَم نەیانتوانی , چونکە لەئاسنی ساف و لوس دروستکرابوو , وشوێنی دەست پێوەگرتنیشی نەبوو , , کەس نەیتوانی خۆی هەڵزنێت پیایا , هەوڵیاندا بیپوخێنن و لایبەرن , ئەوەشیان نەتوانی , چونکە لە ماددەیەکی بەهێزو کاریگەر دروستکرابوو .

١/ ( مع قصص السابقین في القران ) ل ( ٥٢٧- ٥٢٨ ) بەکورتی .

ئایەتەکە هەوڵە بێ ئەنجامەکەیانی تۆمارکردو فەرمووی : ﴿ فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا ﴾( الكهف / ٩٧ ) .

ئەم بەربەستە هۆکارێك بوو بۆ ڕێگەگرتن لە هێرش و پەلامارەکانی ( یأجوج ومأجوج ) وخراپەکارییەکانیان . خوای گەورە لەئایەتە کەدا جیاوازی لەنێوان دوو ( فعل ) کرداردا کردوە , ئەویش بەلابردنی پیتی (ت ) تاء لەیەکەمیاندا , ئەمەش بۆئەوەیە کە سەرکەوتن بەسەر بەربەستەکەدا سوکترو ئاسانترە لە چاو کونکردنەکەیدا , کە ئەوان نەیانتوانی هیچیان ئەنجام بدەن , ئەمەش لە بەشە ئایەتی ﴿ فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ ﴾ .

وەك ئەوەی ئەم ( فعل ) کردارەبیەوێت یارمەتی ئەو کەسە بدات بۆ سەرکەوتن و خۆهەڵزنان . بەلأم ( فعل ) کرداری دووەم ﴿ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا ﴾ لەم بەشەی ئایەتەکەدا پێمان دەڵێت : کارەکە لەگەڵ دەربڕینەکەدا زۆر لەباروگونجاوە .

چونکە کونکردن و ڕوخاندنی بەربە ستەکە پێویستی بەهێزو هەوڵدانێکی زۆرگەورە هەیە و زۆرقورسە و کاتی زۆری دەوێت , پێویستی بەچەندەها ئامێرو ئامڕازی کونکردن و بڕین هەیە , وپێویستی بە پیاوانی بەهێزو کارامە و زۆربەتوانا هەیە , کە هەمووتواناو ووزەی خۆیان بەکاربخەن و زۆرخۆڕاگرو ئارامگربن .

کەواتە لابردنی ( ت ) تاء لەبەشی یەکەمدا بۆسوکی و ئاسانی بوو .

ومانەوەیشی لەبەشی دووەمدا , بۆقورسی و گرانی بوو . لێرەدا ئەوە بەبیرماندا دێت کە ووشەو دەربڕینی قورئانی ووردەکاری تیا بەکارهێنراوە , و لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایەتەکانیشدا گونجاوە ﴿ قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاء وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاء وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾ ( الكهف / ٩٨ )

ئینجا ( ذوالقرنین ) سەیری بەربەستە گەورەکەی کرد کەخەڵکی لەهێرش و پەلامارەکانی ( یأجوج ومأجوج ) پاراست , ووتی :﴿ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾ [1]
بەڕاستی ئەم بەربەستە مایەی هێنانی ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارم بوو بۆئەو دراوسێیانەی کە سکالاو شکاتیان لەدەست ( یأجوج ومأجوج ) هەبوو , ئەوانی لە ئازاری ئەو کۆمەڵە خراپە پاراست و ژیانێکی وای بۆ سازاندن کە بەئارامی و ئەمانەوە بژین , بەڵام تا ماوەیەکی دیاریکراو , کاتێك ئەو ماوەیە تەواوبوو کۆتایی هات , ئەوا بەڕاستی ئەو بەربەستە لەبن دێت و کەلێ تێدەکەوێت و ڕێگا بۆدەرچوونی ( یأجوج ومأجوج ) دەکرێتەوە , ئەمەش لەبەرەو کۆتاچوونی دنیادا , لەبەربەست و زیندانەکەیان دەربازدەبن و دەست دەکەنەوە بەخراپە و وێرانکاری , هەروەکو چۆن لەسەری ڕاهاتبوون , هیچ هێزێك لەبەردەمیاندا خۆی ناگرێت , وەك ئەوەی کە (ذوالقرنین ) توانی ئەوان لەخراپەکاری و ئازاردانی دراوسێکانیان قەدەغە بکات . بەڵکو لە داهاتوودا بەناو هەموو جیهاندا بلاودەبنەوە , خوای گەورە لەسورەتی (الانبیاء ) دا دەربارەیان دەفەرمووێت :-

﴿ حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ (٩٦) وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾ ( الأنبياء / ٩٦- ٩٧ ) .

واتە : ( تائەو کاتەی بەربەستەکەی ( ذوالقرنین ) لەسەر ( یاجوج ومأجوج ) دەکرێتەوە ( ئەمە یەکێکە لەنیشانەکانی نزیکبونەوەی کۆتایی دنیا ) و ئەوانە ئەوکاتە لەهەمووکون و کەلێنێکەوە بەلێشاوپەیدادەبن وزۆردەبن , ئەوسا ئیتر بەڵێنی ڕاستی نزیك دەبێتەوە و دەست پێدەکات , ئینجا دەبینیت چاوی ئەوانەی بێباوەڕن ئەبڵەقەوزەق دەبێت , ئینجا دەڵێن : هاوار بۆئێمە چاك بێئاگابووین لەم ڕۆژە , لەم سەرئەنجامە , نەك لەبەرئەوە , بەڵکو ئێمە هەرستەمکارین !! ) .

---

١ / ( مع قصص السابقين في القران ) ل ( ٥٣٩- ٥٤١ ) بەکورتی و کەمێك دەستکاری کردنەوە.

ئەو ڕێگە گرتنە لەوان لەپشت ئەو بەربەستەوە دەبێتە هۆکاری زۆربوون و نەوەخستنەوەی ئەوان , کاتێك ڕێگەدران دەرچن , ئەوا بە لێشاو دەردەپەڕن و دەستە دەستە و کۆمەڵ کۆمەڵ کە ژمارەیان لەبن نایەت .

﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴾ ( الكهف / ٩٩ ) واتە : ( لەو ڕۆژە بەدواوە وازمان لێهێناون تاوەك شەپۆل بەناو یەكدابێت , یان وازمان لێهێناون بۆ ئەوڕۆژەی ( کە بەربەستەکە دەشکێت و بەپەلە وەکو لێشاو دێنە دەرێ ) و بەناویەکدا شەپۆل دەدەن , ئینجا فوودەکرێت بە – صور دا , بەو هۆیەوە هەرهەموو خەڵکی بەتەواوی کۆدەکەینەوە ( بۆ لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت ) .

﴿ پەندو وانە بەسوودەکانی چیرۆکەکە ﴾

١– زانا ( القاسمی ) دەڵێت :– لەوپەندە بەسوودانە :–

– خوای گەورە هەندێك کەس لەبەنەکانی بەسەرکەسانی تردا پلەوپایەداردەکات و بەرزی دەکاتەوە , ولەوەی کە خۆی بیەوێت بەبێ حیساب لە موڵك و دەستەلاّت و پاشایەتی پێ دەبەخشێت , کەئەمەش حیکمەتی شاراوەی تیایە و دەستەلاّت و قودرەتی خوای گەورە دەردەخات .

– ئاماژەدان بەگرتنەبەری هۆکارەکان , وڕێکخستن و گەڕان بەدوای سوننەتەکانی خوا لەبونەوەردا بەهەوڵدان و کارکردن , بەپێی هەوڵدان و توانا بەگەڕخستن , دەسکەوتت دەست دەکەوێت و پەی بەشتەکان دەبەیت , ئەوەی دەربارەی ( ذوالقرنین ) گێڕدرایەوە , لەگەڕان بەسەرزەویدا بۆشوێنی هەڵهاتنی خۆرو شوێنی ئاوابوونی و باکوری زەوی , وکۆڵنەدانی و , حەزکردنی بەگەیشتنی شوێنە دووروجیاوازەکان , وڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ مەترسی یەکان و , سەرکەوتنی بەسەر نارەحەتی و بەربەستەکاندا و پەڕینەوەی لەدەریاکان , پاشان بەدەستهێنانی ئەوفەخرو شانازییە گەورە کە کەلی تێ ناکەوێت , ئەمانە گەورەترین پەندن بۆخاوەن بینایی یەکان .

– لەسەر پاشا و کاربەدەستان پێویستە دەستپاك بن بەرامبەر ماڵ و سامانی خەڵکی و بەردەستەکانیان ,و بێ تەماع و دنیا نەویست بن لەوەرگرتنی کرێ بەرامبەر کارێك کەدێتەپێش بۆیان , ئەوەی کەخوای گەورە بەوی داوە

پاراستنی ڕێزوشەیدا بوونێتی بۆ خۆشەویستی .[1]

٢- ( القاسمی ) دەڵێت :-

- یەکێکی تر لەپەندەکان ئەوەیە کە , تواناو هیمەت چالاك بکرێت بۆلابردنی بەربەستەکان .
- دەستپێشکەری بکرێت بۆ کارە بەرزو بالأکان .
- هەرکەس بەسەر دوژمنەکانیدا سەرکەوت , ناگونجێت سەرشۆڕیان بکات و بیانکاتە بەندە , بەڵکو بەدادپەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵ بکات , پاداشتی چاکە بەچاکە بدات و سزای خراپەکارانیش بدات .
- لەسەرپاشاوکاربەدەست پێویستە , توانای خۆی بەگەڕبخات لەسەرپاراستنی وولأت , ودەستە بەرکردنی ئەمن و ئاسایش بۆ هاولأتیان .
- باسکردنی نازونیعمەتەکانی خوای گەورە کاتێك بە پایان دەگات .
- ناساندنی بەرهەمی کاری گرنگ بەکەسانی تر , تائاستەکەی بزانن , وبتوانن شوکرانە بژێری بکەن .
- ڕاگەیاندنی دەنگ وباسی قیامەت و کۆتاهاتنی دنیا بەکەسانی تر , تادڵەکان پابەندبن بەڕۆژی قیامەتەوە ویادی لایان زیندوبێت .[2]

٣- هەرچەندە ئینسان بەهێزو دەسەلأت بێت لە بە جێ گەیاندنی کارەکانیدا ، لەسەری پێویستە لەخۆی نەگۆڕێت ، بێگومان ( ذوالقرنین) لە هەمووکارەکانیدا پشتی بە توانای خوایی بەست ، پاش تەواوکردنی کاری بەربەستەکە ووتی :- ﴿ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾ و کاتێك پێشنیاری یارمەتی ماددی و سامانیان بۆ کرد ووتی:- ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ لە کۆتاییشدا کاتێك دەربارەی لەناوچوون و فەوتانی بەربەستەکە دەدوێت ، بێگومان بیری ناچێت دیاری کردنی کاتەکەی نیسبەت بداتە پاڵ خوای گەورە .[3]

---

١/ بەکورتی و دەستکاریەوە لە ( محاسن التأويل ) ( ١١ / ٨٧- ٩٠ )

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل (٥٤٦ ) بە کورتی .

٢/ ( الأمثل في تفسير كتاب الله المُنَزل ) ( ٩/ ٣٢٣ ) .

٤- جیاوازی نێوان ووشەی ( الخَبَر ، و الخُبْر ):-
ووشەی ( الخَبَر ) لە چیرۆکی موسادا دوو جار هاتووە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت :-
﴿إِذْ قَالَ مُوسَى لأَهْلِهِ إِنِّي آنَسْتُ نَارًا سَآتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾ ( النمل / ٧ )
هەروەها ئایەتی :
﴿نَارًا قَالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾ ( القصص / ٢٩ ) .
موسا ( علیه السلام ) کاتێك لەگەڵ خێزانەکەی چونە ناو دەشت و دەر و بیابانێك بۆ میسر دەگەڕانەوە ، ڕێگاکەی لێ وون بوو ، پاشان ئاگرێکی بینی لە دوورەوە ، چوو بۆلای تا بەڵکو لەوێ کەسێك ببینێت و هەواڵی لێ بپرسێت و ئەویش ڕێگای نیشانبدات ، حەزی دەکرد لەوێ هەواڵی دەست بکەوێت .
بەلام ووشەی ( الخُبْر ) تەنها لە سورەتی ( الکهف )دا هاتووە:-
لە چیرۆکی پێشترماندا ( خضر ) بە مووسای (علیه السلام) ووت :- ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا ﴾ ( الکهف / ٦٨ ) خوای گەورە لەم چیرۆکەدا دەربارەی ( ذو القرنين ) فەرمووی :- ﴿ كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾ ( الکهف / ٩١ ) جیاوازی نێوان هەردوو ووشەکە :
( الخَبَر ): ( هُوَ العلمُ بالأشياء المعلومة من جهة الخبر ) واتە : ( زانینی شتە دیارو ناسراوەکان لە ڕێگەی هەواڵەوە ) .
بەلام ( الخُبر ) واتە : ( فَهُوَ المعرفةُ بِبَواطِنِ الأمرِ ) [١] واتە : ( زانینی ناوەڕۆك و شاراوەو نهێنی کارەکان ) .
واتە : ئەگەر هات زانستەکە پەیوەندی دار بوو بە هەواڵی دەرەکی شتەکە ، و شتەکەیش دیارو ئاشکرابوو کارەکەش ئاشکرابوو ، ئەوە ( الخَبر )ە ئەگەر پەیوەندی دار بوو بە کاری ناوەڕۆك و نهێنی و شاراوەکانەوە ، و شاراوەیی

---

١/ المفردات ( ١٤١ ) .

شتەکان و نهێنی یەکانیان و پێچ و پەنادار بوو ، ئەوە ( الخُبْر )ە .

ئەم ووشەیەش بۆیە تەنها لە سورەتی ( الکهف ) دا هاتوە چونکە سورەتەکە زانستی بە نهێنی شاراوەکان تیایە – بەفەرمانی خوا – و نهێنی و شاراوەیی و وردی هەندێك لە کارەکان دەردەخات .

موسا ( علیە السلام ) هەندێك شت لە ( خضر ) دەبینێت ، کە ڕاستی یەکانیان نازانێت ، و نازانێت نهێنی یەکەی چی یە ، لەبەر ئەوە ئینکاری دەکات .

﴿ زانینی ناوەڕۆك و شاراوەو نهێنی کارەکان ﴾

واتە :ئەگەر هات زانستەکە پەیوەندی دار بوو بە ﴿هەواڵی دەرەکی شتەکە ، و شتەکەیش دیار و ئاشکرابوو کارەکەش ئاشکرابوو ، ئەوە ( الخَبَر )ە ئەگەر پەیوەندی داربوو بە کاری ناوەڕۆك و نهێنی و شاراوەکانەوە ، و شاراوەیی شتەکان و نهێنی‌یەکانیان و پێچ و پەنادار بوو ، ئەوە ( الخُبر )ە .

ئەم ووشەیەش لە سورەتی ( الکهف ) دا هاتووە ، چونکە سورەتەکە زانستی بە نهێنی شاراوەکان تیایە – بەفەرمانی خوا – و نهێنی و شاراوەیی و وردی هەندێك لە کارەکان دەردەخات .

موسا ( علیە السلام ) هەندێك شت لە ( خضر ) دەیبینێت ، کە ڕاستی یەکانیان نازانێت ، و نازانێت نهێنی یەکەی چی یە ، لەبەر ئەوە ئینکاری دەکات .

( خضر ) پێی دەڵێت :– ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا ﴾ (الکهف / ٦٨ )

( ذو القرنين ) هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی هەندێك کار ، کە زۆرێك لە خەڵکی هیچ زانستێکیان پێ نیە ، ئەوەی لە ویژدان و دڵو نیەتی ئەودایە لای خەڵکی شاراوەیە ، بەڵام خوای گەورە زانستی پێی هەیە ، و لێی ئاگادارە .[1]

١/ ( مع قصص السابقين في القرآن ) ل( ٥٣٠ – ٥٣٢ ) بە کورتی و دەستکاری کردنەوە .

## ﴿ چیرۆکی قارون ﴾

خوای گەورە لە سورەتی ( القصص ) دا دەفەرموێت :- ﴿إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ (٧٦) وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ (٧٧) قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ (٧٨) فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ (٧٩) وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الصَّابِرُونَ (٨٠) فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ المُنتَصِرِينَ (٨١) وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَوْلا أَن مَّنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ (٨٢) تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ( القصص / ٧٦ - ٨٣ ) .

**کورتەی چیرۆکەکە :-**

قارون یەکێك بوو لە قەومی موسا ، ئیسرائیلی بوو نەك ( قبطي ) , خوای گەورە هەر چۆن موسای بۆ فیرعەون و هامان نارد , بۆ ئەویشی نارد .

خوای گەورە ماڵ و سامانێکی زۆری بەخشی بە قارون , لەگەڵ گەنجینەی زۆردا , چەند گەنجینەیەکی پڕ کرد لەماڵ و سامان و سەرمایەی بە نرخ , کە هەڵگرتنی ئەم گەنجینانە زۆر قورس و گران بوو , بە جۆرێك کلیلی گەنجینە و قاسەکانی بەچەند پیاوی بەهێزو بە توانا , بەگرانی هەڵدەگیران .

بەڵام قارون ئەم سامانەی لەلادان و ستەم و دوژمنایەتیدا بەکارهێنا , و خۆی بەگەورە نیشانداو پۆزی لێدەداو شانازی و کەش و فشی پێوەدەکرد , بوو بەفیتنە بۆ فەقیرو هەژارو لاوازەکانی نەوەی ئیسرائیل .

نەوەی ئیسرائیل لە تێڕوانینیاندا بۆ قارون و گەنجینەکانی دابەش بوون بۆ دوو دەستە .

- دەستەیەکیان باوەڕیـان بـەخوا هێنـا و , ئـەوەیان هەڵبـژارد کـە لای خـواوە دێت .

لەبـەر ئـەوە هەڵنەخەڵـەتان بـەوەی کـە قـارون هـەیبو , و هیـواو خۆزگەیشـیان نەخوارد کە نموونەی ئەو بن , بەڵکو ئینکاری قارونیان کرد لە خۆبەگـەورەزانین و لادانـی و خراپـەکاری یەکەیـدا , و داوایـان لـیٚ کـرد ماڵەکەی لـە پێنـاو خـوادا بەکاربهێنێت , و لەڕێگەی خوادا بیبەخشێت , تابەندەکانی خـوا لێـی سـودمەند بن .

- دەستەی دووەم , هەڵخەڵـەتان بەوەی کە قارون هـەیبوو , چونکە تـەرازوی هاوسـەنگی و یاسـایان لـە دەسـتدا , والێکیـان دایـەوە, کـە دەوڵەمەندی یەکـەی قارون نیشانەی ڕازی بوون و خۆشەویستی خوایە بۆ ئـەو , ئاوات و خۆزگەیان خواست نمونەی ئەوبن , چونکە خاوەنی بەخت و شانسێکی گەورەیە .

بـەهۆی لـەزەتی مـاڵ و سـامان و دەوڵەمەنـدی یـەوە , قـارون هـۆش و عـەقڵی خۆی لەدەستدا , لەئاستی حەق چاوی کوێر کـرد بـوو , و لەئاستی وەرگرتنـی ئامۆژگـاری بـاوەڕداران کـەڕی کردبـوو , و کاتێـك داوایـان لـیٚ دەکـرد شـوکرانەی خوا بکات لەسەری و لە خەیر و حەڵاڵ دا بەکاری بـەرێت , و هـەواڵیان پێـدا کـە ماڵی خوایە, ئەو بەم شێوازە وەڵامی دانەوە : ﴿ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾ ! . واتـە : - ( ووتـی : بێگومـان ئـەم سـامان و دارایـی یـەم هەربـەهۆی زانسـت و زانیـاری و نەخشـەی خۆمـەوە پێم دراوە ) . ئینجا ڕۆژێك قارون خـۆی سـازداو بـەڕازاوەیی چـووە دەرەوە بـۆ نـاو قەومەکـەی , کـە ئەمەشـی بـۆ خۆگـەورە نیشـاندان و کەشـخەکردن بـوو , تـا دڵـی فـەقیرو هـەژارەکانی پـیٚ بشـکێنێت , و چاویانی پیٚ پەردە پۆش بکات کاتێك بەو جۆرە بینیان ووتیان :

﴿يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ ( القصص / ٧٩ )

واتە : ( ئەوانەی کە ئاواتیان ژیانی دنیایە ووتیـان : - ئـای خۆزگـە ئێمـەیش وەکـو قـارون , سـامان و دەسـەلاتمان ببوایـە , بەڕاسـتی خـاوەنی بـە ختێکـی گەورەیـە ) ! بـەلام باوەڕدارەکـان کـە زانسـتیان پێـدرابوو , هەڵخەڵـەتاوەکانیان ئامۆژگاری کردوو ووتیان : ﴿ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ﴾ واتـە : ( هـاوار بـۆ ئێـوە , بۆبیرکردنـەوە , پاداشـتی خـوایی زۆر چـاکترە بـۆ ئـەو کەسەی باوەڕی دامەزراوی هێناوەو کارو کردەوەی چاکی ئەنجام داوە ) .

سوننەتی خوایی لەسەر قارون هاتەدی و جێ بەجێ بوو , و خەشم و توڕەیی خوای توشهات , ماڵ و سامانەکەی بونە هۆکاری لەناوبردنی و سزادانی , کاتێك کە خوای گەورە خۆی و ماڵ و سامان و گەنجینەکانی برد بەناخی زەویدا , کەبەشێوازێکی سەیر زەوی لەت بوو کرایەوە بۆی و قارون هەرچی هەیبوو قوتی دا .

ئەوەش بەبەرچاوی نەوەی ئیسرائیلەوە , قارون کەسێکی دەستکەوت پشتیوانی لێ بکات و بیپارێزێت , و ماڵ و گەنجینەکانیشی سودی پێ نەگەیاند .

کاتێك نەوەی ئیسرائیل بینیان چی بەسەر قاروندا هات بە ماڵ و سامانەکەیەوە , باوەڕدارە دامەزراوە ئارامگرەکان زیاتر ئیمانیان دامەزرا . بەڵام ئەوانەی هەڵخەڵەتابوون و کە دوێنێ خۆزگە و ئاواتیان خواست نموونەی قارون بن , بێگومان ڕاستیان بۆ دەرکەوت , و پەردەڕەش و تاریکەکە لەسەر چاوەکانیان لاچوو , و سوپاسی خوایان کرد کە وەك قارون نەبوون , ووتیان : ﴿ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَوْلا أَن مَّنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾ ( القصص / ٨٢ ) .

واتە : ( ئەی هاوار , بەس نەبوو کە وەکو ئەو تیانەچوین , دیارەکە خوا ڕزق و ڕۆزی زۆر دەبەخشێت , بەهەر کەس بیەوێت , یاخود کەمی دەکاتەوە ( بێ حیکمەت نی یە ) , ئەگەر فەزڵ و بەهرەی خوایی نەبوایە لەسەرمان , ئێمەیش بەناخی زەویدا ڕۆچوو دەبووین , ئای کە ڕوون و ئاشکرایە کافر و خوا نەناسان سەرفراز نابن ) .

دێینە سەر ماناکردن و ڕونکردنەوەی ئایاتەکان :-

﴿إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴾ ( القصص / ٧٦ ) .

بەڕاستی قارون یەکێك بوو لەدەستەی موسا ( علیه السلام ) , ( النخعي و قتادة و کەسانی تر ) دەڵێن : کوڕی ماحی بووە , واتە : ئامۆزا . خۆی بەگەورەو کەشخەپیشاندا و فیزی دەکر بەسەر خەڵکیدا , بەهۆی ئەو ماڵ و

سامان و دارایی یە زۆری پیٚ درابوو , ( الطبري ) دەڵێت : لە خۆبەگەورە زانین و زۆرداریدا لەسنوری خۆی تێپەڕی کردبوو , خوای گەورە فەرمووی : ئێمە ماڵ و سامانێکی زۆر فراوان و گەنجینەی زۆرمان پیٚ بەخشی بوو , کە چەند کەسێکی گەورەو بەهێزو بەتوانا زۆر بەگرانی ئینجا دەیانتوانی کلیلی گەنجینەکانی هەڵبگرن , ئەوەندە زۆرو قورس بوون . ( لەکاتی لوت بەرزییەکەیدا ) هەندێك لەباوەڕداری خزمی خۆی پێیان ووت :- کەشخەمەکەو لەخۆت بایی مەبە بەم سامانە , چونکە بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت کەکەشخەدەکەن بەسەروەت و سامانیانەوەو لە خۆیان بایی دەبن.

زانا ( الزمخشري ) دەڵێت :- کەسێك بەدنیا دڵ خۆش نابێت مەگەر پێی ڕازی بێت و لێی دڵنیا بێت , و ئەو کەسەی ئەم دڵخۆشی یەی گۆڕیوە بۆ قیامەت , و دەزانێت کە هەرچی لە دنیادا هەیە لێی جیادەبێتەوە لەماوەیەکی نزیکدا , ئەوا هەرگیز دڵی بۆ ئەو خۆشی یەی دنیا لێی نەداوە . دەربارەی کۆکردنەوەی ئەم سەروەت و سامانەی زۆر شت ووتراوە , بەڵام ئەوەی کە زۆر دیار و ئاشکرایە , ئەو خزمەتکاری فیرعەونی کردوە , و ئیتر لەوەوە زۆر دیاری و شاباشی وەرگرتووە , لەسەر ئەو باج و سەرانەی کەلەنەوەی ئیسرائیل کۆدەکرانەوە , ماڵ و سامانی ترکێش دەکات تا دەگاتە گەنجینە و قاسەی گەورەو کلیلدار , کە چەندین دەرگا و دەروازەیان دەبێت.

﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾ ( القصص / ٧٧ ) .

( الرازي ) دەڵێت :- خوای گەورە ڕونیکردەوە کەلەناو قەومەکەیدا کەسێك هەبووە بەچەند کارێك ئامۆژگاری کردووە : -

یەکەم :- بەئایەتی : ﴿ لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴾ واتە : لەسەر کەشخەکردن و لوتبەرزی ئەمێنێتەوە و دەستی بە دنیاوە بێت , بە جۆرێك کەلەکارو باری قیامەت بیٚ ئاگای کات .

دووەم :- ﴿ وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ ﴾ بەئاشکرا دیارە کە شوێنی ئارامگرتنی هەمیشەیی قیامەتە واتە, ئەو ماڵ و سامانە بە جۆرێك بەکاربهێنە کە بتگەیەنێتە بەهەشت , و ڕێگەی لێبوردەیی پیٚ بگریتە بەر .

سێیەم : ئایـەتی : ﴿ وَلا تَـنسَ نَصِـيبَكَ مِـنَ الـدُّنْيَا ﴾ ئـەم ئایەتـەش چـەندڕوکارێکی هەیـە : لەوانـە :- کاتێـك کەسـە دڵسـۆزەکە ئامۆژگـاری کـرد بەخەرج کردنی ماڵ و سامانەکەی بۆ کڕینی بەهەشت لـە قیامەتـدا , بـەم قسەیە بۆی دەرکەوت , کەهیچ خراپەیـەکی تیانی یـە لـەزەت لەشتەڕێگە پێدراوەکانی دنیا بەحەلاڵی وەربگرێت . هەروەها , مەبەست لـەوە : بەخشینێتی بەفەرمان و گوێڕایەڵی کردنی خوا , بێگومان ئەوە بەشی ئینسانە لەدنیادا بەدەر لەوەی کە دەیخوات و دەیخواتەوە .

چوارەم : ﴿ وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ کاتێك فەرمانی پـێ کـرد بـە چاکە کردن بەماڵ و سامان , ئەوە ئەو فەرمانە بـە شێوەیەکی ڕەهـا بـوو , یارمەتیـدان بـە مـاڵ و سـامان و گـەورەیی و نـاوو شـۆرەت دەگرێتـەوە , هـەروەها ڕوخـۆش بوون و جوان بەیەك گەیشتن , و جوان باسکردن .

پێنجـەم : - ئایـەتی ﴿وَلا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ﴾ واتـە : ئـەوەی ئـەو لەسـەرێتی سـتەم کـردن و لادانـە ووتـراوە : ئـەو کەسـەی ئامۆژگـاری کـردوە , موسـا ( علیـه السـلام ) بـووە , هەنـدێکی تـر بۆچـونیان وایـە : بـاوەڕدارا نـی قەومەکـەی بـوون , کـە چۆن کۆمـەڵێك هەسـتان بـەو ئامۆژگـاری کردنـە , ئەگـەر قبـوڵ بکرایـە , زیـاتری نەویسـت بـوو , بـەڵام ڕەتـی کـردەوە کـە قبـوڵی بکـات , بەڵکو زیاتر کوفرانەی نیعمەتی خوای کرد , ووتی :

﴿ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾ [1]

ڕەنگە حیکمەتی لێکدانەوەی نـاو ئایەتەکە بـە ووشـەی ( کنـوز ) بۆ سـامان و دارایی یەکەی قارون , چەند شتێك بگەیەنێت : -

١- ئـەم مـاڵ و سـامانە بەئاسـانی وەرگـیراوە , و لەنزیکـەوە دەسـتکەوتوە و کۆکراوەتـەوە , بەکـەمترین توانـا دەسـتی کـەوتووە , و وەك ئـەوەی گەنجینـەی داپۆشرابووبن و لێی وەرگرتبێتن .

---

١ / ( التفسير الكبير ) ( ١٣ / ٢٥ ) .

٢- قارون ئەو ماڵ و سامانە دەپارێزێت , و لەسەر یەك دایان دەنێت , و زیادی دەکات و گەشەی پێ دەدات , و سور دەبێت لەسەر قۆرخ کردنیان لەگەنجینەکانیدا .

٣- قارون حەقی فەقیرو هەژارانی لێ دەرنەکرد , و زەکاتیشی لێنەدا , ماڵی لەگەنجینە کراو , ماڵێکی کۆکراوەیە , کەزەکاتی لێ نەدراوە , و لەرێگەی خوایشدا لێی نەبەخشی بوو بەسەر هەژاران و خاوەن پێویستی یەکاندا .

دەربارەی ئایەتی : ﴿ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ ﴾ ئیمامی ( الرازي ) دەڵێت :- سێ لێکدانەوەی هەیە : -

١- ئەو کۆمەڵە پیاوە بەهێزە بێ توانا بوون لەهەڵگرتنی کلیلی گەنجینەکان . ئەمە بۆچونێکی لەپێشترە .

٢- ئەو کۆمەڵە پیاوە بەهێزە بێ توانا بوون لە هەڵگرتنی گەنجینەکان , ئەمەش گونجاوەو دەشێت وابێت .هەڵگرتنەکەی لەم دوو لێکدانەوەیەدا , هەستپێکراو بووە .

٣ – مەبەست لە هەڵگرتن , بریتی بووە لە پاراستنی و ژماردنی و چاودێری کردنی .

هەر ئیمامی ( الرازي ) خۆی دەڵێت : - (( مەبەست لە ( المفاتِح العلم و الإحاطة ) بریتی یە لە : ئەوەندە گەنجینەی لەلایەن خواوە پێبەخشرابووکە پاراستنی و ئاگاداربوونیان , قورس و گران بوو , تەنانەت بە کۆمەڵێکی بەهێزو بەتوانا , کە بتوانن چاودێری بکەن . واتە : ئەم گەنجینانە لە زۆری و جیاوازی جۆرەکانیاندا , ئەو کەسانەی ماندوو دەکرد کە دەیانپاراست و چاودێرییان دەکرد )) .[١]

﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ ﴾ (القصص ٧٨)

---

٢/ ( التفاسير الكبير ) ( ٢٥ / ١٥ ).

بەڕاستی ئەو نازو نیعمەتەی کە خۆی پێوە بادەدا و دەستکەوتنی بە هۆی زانست و نەخشەو هەوڵی خۆیەوە ، وەك ئەوەی لە کارەکەدا شتێك بووبێت ، بەڕاستی ئەوەی نەخۆش دەکەوێت و لاواز دەبێت و پیر دەبێت و دەفە وتێت ماندوو دەبێت و دەمرێت ،لە دروستکراوەکانە ، بەندەیەکە تەنها شوێن شتەکان کەوتووە ، لە کارەکەدا هیچ شتێك نەبووە ، تەنانەت ئەگەر ببێتە خاوەنی گەورەترین سامان لە زێڕو زیو ، ناتوانن ئازارێکی توندی لێ دوور خەنەوە ، یان لە مەترسی یەك بیپارێزن .

باشە مەگەر قارون نەیدەزانی ، بەڕاستی خوا پێش ئەم چەندەها قەوم و هۆز و گەلانی لەناوبردوە ، کەلەو زیاتر بە دەستەلاَتتر و خاوەن سەروەت بوون ؟

ئەم قسەیە بۆ قارون بوو ، چونکە وەك ئەوە بووە کە بیری بخرێتەوە ئەو وەك – مامۆستاو لێکۆڵەر بووە لە ئاگاداربوونی لە مێژووی نەتەوەکانی پێش خۆیدا ، کە چ سزایەك توشی هاتووە بە هۆی کەللەڕەقی و کافر بونیانەوە ، ئەو لە قەومی موسا بووە ، ئەو هەواڵانە ی بیستووە کە دەربارەی قەومی نوح و عاد و ثمود و لوط و شعیب گێڕراونەتەوە .

پاشان خوای گەورە ئایەتەکە بە یاسایەکی گشتگیر کۆتایی دێنێت ، دەفەرموێت : ﴿وَلا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ﴾ واتە : ( تاوانباران پرسیاریان لێ ناکرێت دەربارەی گوناهەکانیان ،( چونکە تۆمارکراوە و لای خوا ئاشکرایە ) .

تاوانباران ناویان لە تۆماری ئەهلی دۆزەخدا نوسراوە و وتراوە ( دوای کافربوون تاوان نی یە ) ئەو سەرکەشانە تەنها ئاگری دۆزەخ پاکیان دەکاتەوە.[1]

﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ (القصص / ٧٩ ) .

---

١/ ( قصص القرآن الكريم و سيرة سيد المرسلين ) ل ( ٢٠٧ – ٢٠٨ ) .

زانا ( إبن كثير ) دەڵێت : زانایانی تەفسیر دەڵێن: قارون لەو پەڕی کەشخەیی و خۆڕازاندنەوەدا لە جل و بەرگ و سواری و خزمەتکار و خەڵکی دەوری خۆیدا هاتەدەر بۆ ناو قەومەکەی ، کاتێك بینیان ، ئەو کەسانەی کە جوانی دنیا و ڕازاوەیی یان لا گەورە و مەبەست بوو ، ئاوات و خۆزگەیان خواست کە وەك نموونەی قارون بن ، و حەزیان کرد ئەوانیش ئەوەی ئەویان هەبێت و وەك ئەو بن ، بەڵام کاتێك کەسە زانا و تێگەیشتوو و خاوەن ژیرییەکان قسەکەی ئەوانیان بیست ووتیان : وای بۆ حاڵی ئێوە ، پاداشتی خوا لە قیامەتدا باشترو چاکتر و هەمیشەیی یە ، ئەو کەسانەی کە بە بینینی قارون هەڵخەڵەتابون ، وایان لێکدایەوە کە قارون خاوەنی بەختێکی گەورەیە ، بە هۆی ئەو ڕازاوەیی و ماڵو سامانەی هەیەتی ، چونکە پێوانەکردنە لای ئەوان تەنها لەسەر ڕواڵەت بوو ! ئەگەر ئەوان دنیایان نەویستایە هەڵنەدەخەڵەتان ، و تووشی ئەو فیتنەیە نەدەهاتن .

بەڵام ئەوکەسانەی کە قیامەتیان مەبەست بوو ، و داوای نیعمەتی هەمیشەیی یان دەکرد ، و دەیانزانی ژیانی دنیا چی یە ، هەڵنەخەڵەتان ، وئاواتیش ناخوازن بەوەی کە لای نموونەی قارون بوو .

بێگومان ڕواڵەتی ژیانی دونیا و ڕازاوەیی یەکەی هەمیشەیی نی یە ، بەڵکو کاتی یەو لەناو دەچێت .

لەزەت وەرگرتن لەم ڕازاوەیی و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و زیادەڕەوی یە ، ئەویش هەمیشەیی نی یە و نامێنێت ، بەڵکو لەناو دەچێت ، ئیتر لە کوێ خاوەنەکەی بەختێکی گەورەی هەیە .؟

لە ڕاستیدا قارون خاوەنی بەختی گەورە نەبووە تەنها لەزەتێکی کاتی بێ سوود بوو .

لەڕاستیدا کەسێك لەبەختی گەورەدایە ، کە خاوەنی کارە ڕاست و دروستەکان بێت ، کە لەناو ناچن، و دیمەنی هەڵخەڵەتاندنیان نی یە ، ئەو کەسەیە کە بەڕاستی بزانێت بۆچی دەژی ، و لەزەت لەو ژیانە وەربگرێت ، و ئەو کەسەیە کە ئیمانی دامەزراوو ڕەزامەندی خوای دۆزیوەتەوە ، و دڵنیایی و بەختەوەری هەڵبژاردوو ، و هەنگاوی ناوە بۆ نیعمەتی هەمیشەیی ، ئەوەش تەنها بۆ باوەڕداری ڕاستگۆ و ئارامگر و تێکۆشەرە .

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ ﴾ (القصص/ ٨٠).

ئەمە هەڵوێستی باوەڕدارانە ، تێڕوانینێکی جوان و ئامۆژگاری بوو بۆ ئەو کەسانەی کە بە ڕواڵەت هەڵدەخەڵەتان ، ئەوان لە ڕووی زانست و تێگەیشتنەوە ڕوانیان بۆ قارون ، وایان بینی کە خاوەنی هیچ شتێك نی یە ، وایان بینی فەقیر و موحتاجە ، و خەسارەتمەند و لەناوچوو بێ بەش دەبێت ، و توشی سزاو دورکەوتنەوە لە ڕەحمەتی خواو تیاچوون دەبێت .

وتیان :- پاداشتی خوایی لە ماڵ و سامان و ڕازاوەیی یەکەی قارون خەیرو چاکترە ، ئەو پاداشتە لە جوانی و ڕازاوەیی دنیا چاکترە ، و لە هەموو ئەو شتانەش باشترە کە دەسەلأتدارەکان هەیانە ، چونکە عەقڵیان تێکەڵ و شێواوە و بیری پێ ناکەنەوە ، ناتوانن پێی بگەن .

خوای گەورە دەفەرموێت : ئەو زانست و باوەڕ و کردەوەیە بەکەس نادرێت ، تەنها خۆڕاگرو ئارامگران نەبێت .

ئەوەی ئارامگر نەبێت بێ بەش دەبێت .

کام ئارامگرتن ؟ بێگومان لەسەر ناڕەحەتی و تاقیکردنەوەکان و فیتنەی ستەمکاران .

ئارامگرتن توێشویەکی گەورەیە ، و هاوکارێکی نەبڕاوەیە ، و بەخششێکە لەناو ناچێت .

ئارامگران ئەو کەسانەن کە دەزانن پاداشتی خوایی چاکترە ، و ئەوەی لای خوایە خەیرو چاکەیە ، و نیعمەتەکانی خوایە و بەهەشتی نەبڕوایە .

﴿ فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُنتَصِرِينَ ﴾(القصص/٨١).

زانای تەفسیر ( الشوکانی ) دەڵێت : خوای گەورە خۆی و ماڵەکەی وسامان و دارایی یەکەی برد بەناخی زەویدا و ونی کرد تیایدا ، دەستەو کۆمەڵێك نەبوون بتوانن لەوە بیپارێزن و ڕزگاری بکەن ، و خۆیشی نەیتوانی کاری ئەو ڕۆچوونە لە خۆی دوور بخاتەوەونەهێڵێت .

ئەمە سزای خۆبە گەورە زانین و لە سنور دەرچوون بوو ، بەم کۆتایی یەی قارون لەبەر چاوی خەڵکی ، هاواری دەکردو دەیقیژاند و داوای یارمەتی دەکرد

، بەڵام کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە و بە دەمیەوە بچێت ، فەرمان فەرمانی خوا بوو ، تەنها ئەو دەتوانێت فریای بکەوێت بەلاّم بە هانایەوە نەچوو ،قارون خۆی بە دەستی خۆی قەبری بۆ خۆی هەڵکەند .

دەربارەی قارون هاتووە : ( قارون زۆر ڕقی لە مووسا بوو ، لەبەر پێغەمبەرایەتی و خۆشویستنی نەوەی ئیسرائیل بۆ ئەو ، قارون ویستی نەخشەیەکی فێلاّوی بۆ موسا بکێشێت ، ئافرەتێکی خراپەکاری بە کرێ گرت و بە ماڵ و سامانێکی زۆر هانی داو هەڵی خەڵەتاند ، کە بڵێت موسا زینای لەگەڵ کردوە ، لەگەڵی ڕێك کەوت کە بیهێنێتە ناو کۆمەڵێك خەڵکەوە کە موسایشی تیا بێت ، پاشان قارون هات بۆ لای موسا و پێی ووت : ئەی موسا نەوەی ئیسرائیل کۆبکەرەوەو هەواڵی ئەوەیان بدەرێ کە پەروەردگارت پێی گەیاندویت و فەرمانی پێداویت ، مووسا وتی : بەڵێ باشە ، ئینجا کۆی کردنەوەو بە مووسای ووت : پەروەردگارت فەرمانی چی پێ کردوویت ؟ فەرمووی : فەرمانی پێ کردوم کە خوای گەورە بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن و پەیوەندی هاتوچۆتان چاك بکەن و. ئەوە و ئەوە ، بنەماکانی شەریعەتی بۆ باسکردن ، ئینجا قارون ووتی :

ئەی مووسا سزای ئەو کەسە چی یە دزی بکات ؟

مووسا وتی : دەستی ببڕیت .

قارون ووتی : ئەی ئەگەر تۆ بویت ؟

مووسا وتی : بەڵێ با ئەگەر منیش بم .

قارون ووتی : سزای زینا کردن چییە ؟

مووسا وتی : بەردباران بکرێت .

قاروون وتی :ئەی ئەگەر تۆ بوویت ؟

موسا ووتی: بەڵێ با منیش بم .

قارون ووتی : بێ گومان تۆ ئەو کارەت کردووە .

موسا ووتی : لەناو چوون بۆ تۆ قارون ! لەگەڵ کێ ئەنجامم داوە ؟

قارون ووتی : لەگەڵ فلاّنە ئافرەت ، ئینجا موسا ئافرەتەکەی بانگکرد و ووتی : سوێندت دەدەم بە خوا ئایا من ئەوەم کردووە کە ئەوان دەیڵێن ؟

ئافرتەکە ووتی : نەخێر , بەڵکو درۆیان کرد , بەلاّم ئەوان کرێیەکیان دا بەمن

، تاتۆ بەوکارە تۆمەتباربکەم ، موسا ( علیه السلام ) دەربازی بوو دەستی کرد بەگریان و سوژدەی برد بۆ خوای گەورە ،خوای گەورە وەحی بۆ نارد : چی تۆی گریاند ئەی موسا ؟.

موسا ووتی :-ئەی پەروەردگارم ، دوژمنەکەت منی ئازاردا ، وە ویستی ئابڕوم بەرێت ، ئەی پەروەردگارم من زاڵ بکەیت بەسەریدا .

خوای گەورە فەرمووی : ئەی موسا سەرت بەرزکەرەوە بەڕاستی فەرمانم کرد بەزەوی ، کە گوێڕایەڵی تۆ بکات .

ئینجا موسا ووتی : ئەی زەوی بیانگریت ، ئینجا زەوی یەکە کەوتە جوڵەو قڵیشاو قارون و ئەو کەسانەی لەگەڵیدابوون گرتنی ، تاقولە پێیان لە زەوییەکەدا گیراو توندبوو ، ئینجا قارون ووتی : ئەی موسا بەزەییت پێمدا بێتەوە و ڕەحمم پێ بکە ، موسا ووتی : ئەی زەوی بیانگرە ، ئینجا ماڵەکەشی لەگەڵیدا گرت تانوقم بوو ، ئینجا قارون و هاوەڵەکانی کەوەك خۆی بوون نوقمی کردن بەزەویدا تا ئەژنۆیان ، ئەو هەر لە موسا دەپاڕایەوە ، وموسایش بە زەویەکەی دەوت :- بیانگرە ، ئینجاخۆی و هاوەڵەکانی و ماڵ و سامانەکەی بەتەواوی نوقمی ناوزەویەکە کرد .

ئینجا خوای گەورە وەحی بۆ موسا نارد : ئەی موسا ، بەڕاستی زۆر ڕەق و توندبوویت ! سوێند بە عیزەت و جەلالی خۆم ، ئەگەر هاواری لەمن بکردایە وبپاڕایەوە ، وەڵامم دەدایەوە .

بەڕاستی خوای گەورە هەموو ڕۆژێك قارون و شوێنکەوتوانی دەکات بەناخی زەویدا ،و بەردەوام دەیان بات بەرەو ناخی زەوی تاڕۆژی قیامەت ناگەنە بنەکەی .[١]

﴿ وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَوْلا أَن مَّنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾(القصص/٨٢ ) .

---

١ / ( قصص القران الكريم وسيرة سيد المرسلين ) ل ( ٢١٠- ٢١١ )

ئینجا ئەوانەی دوێنێ ئاواتیان بە قارون دەخواست دەیانووت : ئەی هاوار , بەس نەبوو وەکو ئەوتیانەچووین : دیارە کەخوا ڕزق و ڕۆزی زۆردەبەخشێت بەهەرکەس بیەوێت , یاخود کەمی دەکاتەوە ( بێ حیکمەت نی یە ) ئەگەر فەزڵ و بەهرەی خوایی نەبوایە لەسەرمان , ئێمەش بەناخی زەویدا ڕۆچوو دەبووین , ئای کە ڕوون و ئاشکرایە کافروخوانەناسان سەرفرازنابن .

دەربارەی ووشەی ﴿ وَيْكَأَنَّ ﴾ , ( قتادە ) دەڵێت : واتە : ( اَلَم تَر ان ) واتە ئایا نەتبینی کە , هەندێك لەکەسانی تر دەڵێن : ئەم ووشەیە , لەدوو ووشە پێك هاتووە : (وی ) کە حەرفی ( تعجب ) و ( تنبیە ) واتە سەرسوڕمان و ئاگادارکردنەوە ., و( كأنَّ ) واتە : ( اظَنُ واحسب ) [1] واتە : واگومان دەبەم و وای دادەنێم .

بەڕاستی ئەو دەستەیەی کە ڕزگاریان بوو سەریان سوڕما لەوەی کە بەسەرقاروندا هات , شڵەژان و هەڵچونێکی سەیریان بەسەردا هات . باش زانیان کە قارون بەختی گەورەنەبوو , بەڵکو باوەڕداران بەختیان گەورەبوو , وزانییان کە ماڵ و سامانی کەم بەرەکەتدارەو بەخششی ڕاستەقینەی خوایە , وزانییان کە کافران سەرفرازنابن.

زانین و دەرکەوتنی ڕاستی یەکان , کارێکی کوت و پڕە , کە نەبینراوەو نەهاتۆتەدی , مەگەر دوای ڕوودانی کارەساتەکە و ئاگاداربوونی کۆمەڵەکە لەسەری و باوەڕ پێ کردنیان .

﴿ تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ ( القصص / ٨٣ ) .

( جاباخەڵکی دڵنیابن ) کە ئەو ماڵی قیامەتەو ئەوبەهەشتی بەرینەمان ئامادەکردوە بۆئەو کەسانەی کە نە لووت بەرزی وگەورەییان دەوێت لە زەویدا نەفەسادوگەناهو خراپە , وسەرئەنجام سەرفرازیش هەر بۆ پارێزکاران و خواناسانە .

---

٢/ تەماشای تەفسیری ( أبن كثير ) بكة ( ٣/ ٤٠١ )

لەم ئایەتەدا خوای گەورە تێڕوانین و دڵ وژیانی گوێ بیستانی ئەم چیرۆکەی ئاراستەکرد بۆماڵی کۆتایی و بانگی کردن کە لەدنیا جیاببنەوەو نەیکەنە هەم و غەمی خۆیان و ئەو پەڕی زانست و هیواکانیان .

- باسکردنی سیفاتی ئەو کەسانەی قیامەت و بەهەشتیان دەویست , و خوای گەورەش بەوە باسی کردن کە ئەوانە کەسانێکن لووت بەرزی و بەرپاکردنی فەسادو خراپەیان لەسەر زەویدا ناوێت .

لە تێڕوانینی ئەم سیفەتانەوە نهێنی تیاچوونی قارونمان بۆ دەردەکەوێت , کەدنیای ویستوەو قیامەتی نەویستووە , وحەزی بەلووت بەرزی و نانەوەی خراپەو ئاشوب و فەسادبووە لەسەر زەویدا .

- هەرکەس لووت بەرزی و بەرپاکردنی گەندەڵی بووێت لەسەر زەویدا , ئەوا ژیانی دەبێت بە هۆکارێك بۆ بڵاوکردنەوەی لووت بەرزی و بەرپاکردنی گەندەڵی , بێ گومان هەردوو دنیای لەدەست دەچێت , ژیانی دونیای کە سزای خوای گەورەی تووش دێت , وژیانی قیامەتیشی کە چارەنووس و بەشی ئاگری دۆزەخ دەبێت . لێرەدا قارون دیارترینی ئەم نمونەیەیە , پەندە بۆئەو کەسانەی پەندی لێ وەربگرن .

- چارەنوس و سەرئەنجامی باش و سەرفرازی و بەختەوەری بۆ لەخوا ترسان و پارێزکارانە , تەقوا نهێنی دامەزراوکردنی ئینسانە لەدنیادا , و کارەکانی لای قبوڵ و وەرگیراودەبێت و , دەگاتە بەهەشت .

﴿ وانە ئیمانی و سودو پەندە گرنگەکانی ئەم چیرۆکە ﴾

١- دکتۆر ( احمد جمال العمري ) دەڵێت :- چیرۆکی قارون لەقورئاندا نمونەیەکە لەلادانولەسنور دەرچون بەهۆی ماڵ وسامان وزانستەوە , کەچارەنوس و سەرەنجامی بەرەو لەناوچون چۆن بوو ,کاتێك هەواوئارەزوەکان زاڵبوون و تەماع دەستی درێژکرد , و ئینسان لە دروستکراوێکەوە گۆڕابۆ حاڵەتی لەخۆبایی بوون و لووت بەرزی نواندن وخۆزاڵ کردن بەسەر خەڵکدا , وشانازی دەکات بەسەریانداو بە تێڕوانینی لووت بەرزانە بۆیان دەڕوانێت , وئەم چیرۆکە لە قورئاندا لەسەر شێوازی پەندوئامۆژگاری هاتووە , تاجێگیری بکات کە هەموو شتێك سەرئەنجامی تیاچونە و ئەوەی دەمێنێتەوە پاداشتی

خوایی یە .[1]

٢- هۆکـاری لادان و لەسنوردەرچـون لای خراپـەکاران جیـاوازن , هەیانـە بـەهۆی دەسـتەلاّتەوە لەسـنور دەردەچێت , هەیانـە بـەهۆی ماڵـەوە , هەیانە بەهۆی وەزیفەوکاری دەوڵەتەوە , ئەوەی کەلەمانەوە دەردەچێت و بەرهەم دێت تەنها ئەوە دەگرێتەوە کە ناوی ( طغیان ) ی لیٰ بنرێت .

٣- خوای گەورە قارونی بە زۆری سامان و ماڵ و گەنجینەکانی تاقی کردەوە , هەرئەوەش هۆکاری لەناوچون و خەسارەتمەندی بوو بۆی .

٤- دابەش بوونی نەوەکانی ئیسرائیل بۆ دوو دەستە لە تێڕوانیان بۆ قارون , و هەڵوێستیان لەسەر فیتنەکەی هەربەوجۆرە هەموو ئوممەتەکان , بەشێوازی ئەم دابەش بوونە دەبنە دوو دەستە .

٥- زۆرینەی ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێگای قارونەوە دەڕۆن , و بەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیون لەسنور دەردەچن و یاخی دەبن , و زۆرینە ئەو کەسانەن کەبە نمونەکانی قارون هەڵدەخەڵەتێن .

٦- دەبێت باوەڕداری چاکەکارو ئارامگربوونی هەبێت , تائامۆژگاری لەسنور دەرچوان بکەن , وەك ئەوەی باوەڕداران لەگەڵ قاروندا کردیان .

٧- یاسایەکی قورئانی گشتگیر هەیە : کە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کەکەشخە دەکەن بەسەروەت و سامانیانەوە و لەخۆیان بایی دەبن .

٨- دڵ خـۆش بـوونی ڕاسـتەقینە تـەنها لەشـتێکدا دەبێـت کـە بـاقی و هەمیشـەیی بێـت , کـە بریتـی یـە لەفـەزڵ و ڕەحمـەتی خـوا و نیعمەتـەکانی وبەهەشت , بەڵام دڵخۆش بوون بە شتێکی کاتی و بڕاوە وەك دنیا و جوانی یەکانی , بەڵگەیە لەسەر ساویلکەیی و بیٰ ئاگایی خاوەنەکەی .

٩- ئیسلام هانی خەڵکی دەدات لەزەت لەنیعمەتە ڕێگەپێدراوەکان وەربگرن و ئینکاری ئەو کەسەیش دەکات کەبە حەرامیان دابنێت , و ئەو لەزەت وەرگرتنە

---

١ / ( دراسات في التفسير الموضوعي للقصص القراني للدكتور احمد جمال العمري ) ( ٢٩٢ )

بەعیبادەت دادەنێت و خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

١٠- موسڵمان دژایەتی ماڵ و سامان ناکات و قەدەغەی ناکات لە خۆی , بەڵکو بەپێی یاسا شەرعی یەکان وەریدەگرێت و , و لەو ڕوانگەیەوە تەماشایان دەکات .

١١- کەسی لەخۆبایی و هەڵخەڵەتاو ئەو کەسەیە نیعمەتەکانی خوای لای خۆی لەبیردەچێتەوە, وا دەزانێت کە بەهەوڵی خۆی , دەستی کەوتووە , یان لەبەر زیرەکی و کەسایەتی خۆی پێی بەخشراوە هەروەك قارون ووتی , ئەویش دەڵێت : ﴿ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾ .

١٢- بنەمای ڕێزگرتنی خوایی بۆ ئینسان , هیچ ڕۆژێك نەماڵ و سامان و نەناوبانگ و نەجوانی و نەبنەماڵەو نەڕەگەزو نەپلەو پایە نەبووە , بەڵکو ئیمان و تەقوا و کردەوە چاکەکان و سود گەیاندن بەخەڵکی و پێشکەش کردنی خەیر بووە پێیان .

١٣- لەسنور دەرچوان و گەندەڵچیان هەمیشە سورن لەسەر شکاندنی دڵی کەسانی تر , و چاندنی هەستکردن بەتاڵی و بێ بەش بوون لەدەرونیاندا , کەشخەدەکەن بەسەریاندا و بە جوانی و ڕازاوەیی و لەخۆبایی بوونەوە دەردەچن بۆ ناویان , و خراپەو فەساد و ناڕەحەتی یە کانی خۆیان بەسەریاندا بلاو دەکەنەوە .

١٤- ویستنی ژیانی دونیا و حەزکردن بەزۆر بوونی ماڵ و سامان و جوانی یەکانی , خاوەنەکەی دەخاتە هەڵەی گەورە و ئابڕو بەرەوە , هەروەك ئەوەی نهێنی ڕووخانی ئەو کەسانە بێت لەبەردەم کەسە خۆشگوزەران و خراپەکارەکاندا .

١٥- خاوەنی بەختی گەورە , ئەو کەسانەن کەگەیشتوون بە نیعمەتی ئیمان و ئارامی و ڕەزامەندی دڵنیایی و , و ڕزگاربونیان دەستکەوتووە , لەگەڵ نیعمەتی نەبڕاوە .

١٦- ئەگەر ویستنی ژیانی دونیا نهێنی کەوتن و تیا چوون و سەرشۆڕی و خەسارەتمەندی بێت , ئەوا بێگومان دەستکەوتنی زانست و ژیان لەگەڵیدا , نهێنی زاڵ بوونە بەسەر ناڕەحەتی یەکان , و دامەزراوی یەکانی فیتنەو بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گەورەیە .

١٧- ئارام گرتنی جوان پشتیوانێکی بەردەوامە و , تویێشویەکە لەناو ناچێت , لەڕوبەڕو بوونەوەی هێزی فیتنەو شتە گومڕاکەرەکاندا , ئەمەش تەنها دەست کەسە ئارامگرەکان دەکەوێت .

١٨- قارون فیتنە بوو بۆ قەومەکەی , هەبوو بەهۆیەوە توشی فیتنە هات , هەیشبوو سەرکەوت و ئارامی گرت و دامەزراو بوو , کاتێك فیتنەکە تەواو بوو , قارونیش دەورەکەی خۆی تەواو کرد , و کاتێك هات بینرا کەبەخەشم و لەعنەتی خواوە دنیای جێ هێشت , و تووشی سزا هات !

١٩- خوای گەورە ماڵی کۆتایی و بەهەشتی بۆپاکان و چاکان داناوە , ئەو کەسانەی کە لووت بەرزی و خراپەیان لەسەر زەویدا ناوێت .

٢٠- سەرئەنجامی باش لە دنیا و لە قیامەتیشدا , تەنها بۆ لەخوا ترسان دەبێت .

٢١- خوای گەورە بەرەحمەت و بەزەیی خۆی مامەڵە لەگەڵ چاکەکاراندا دەکات , و پاداشتیان بۆ چەند قات دەکات , و دادپەروەرانەیش مامەڵە لەگەڵ خراپەکاراندا دەکات و , ئەنجامی خراپەکاری یەکەیان پیشاندەدات , ئەمەش سوننەتی هەمیشەیی خوایە .

## ﴿ چیرۆکی ( سبأ ) ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ (١٥) فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَى أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ (١٦) ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلاَّ الْكَفُورَ (١٧) وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ (١٨) فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ (١٩) وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلاَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢٠) وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴾ ( سبأ / ١٥- ٢١ ) .

**دەسپێکی چیرۆکەکە :-**

پاش ئەوەی خوای گەورە لە سورەتی ( سبأ ) دا , چیرۆکی داود و سلیمان نی بۆ گێڕاینەوە , کە پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی پێ دا بوون , و نمونەی کەسانی سوپاسگوزار بوون , خوای گەورە نیعمەتی بەردەوامی پێ بەخشین و لەفەزڵ و میهرەبانی خۆی چەند شتێکی بۆ زیاد کردن کەبە کەسانی تری نەبەخشی بوو لە جیهاندا , خوای گەورە باسی چیرۆکی شاری ( سبأ ) ی کردوە , کە هۆزی ( سبأ ) ی تیا نیشتە جێ بوون , کە خوای گەورە خەیرو بەرەکەتی زۆرو ڕزق و ڕۆزی و نیعمەتێکی بێ شوماری پێ بەخشیون , بەلێخۆشبونی خۆی و فەزڵ و میهرەبانی مامەڵەی لەگەڵ کرد بوون , کشتوکاڵ و باخ و میوەهاتی زۆریان هەبوو , و ڕێگای سەفەری بۆ ئاسان کردبوون , و لەنێوان و وولاتی شامدا کە بۆی دەچوون شوێنی حەوانەوە و نوستن و ئیسراحەتی بۆ فەراهەم کردبوون , بەجۆرێك کە هەستیان بە ناڕەحەتی سەفەر نەدەکرد , بەلام ئەوان نەیانتوانی لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەتە سوپاسگوزار بن و سپڵەو پێنەزان بوون بەرامبەری و بێ باوەڕ بوون , و شوکری خوایان لەسەر نەکرد . بەلام خوای گەورە پەلە ناکات و بەئارامەو لێخۆشبوو سوپاسکراوە , تەنها ئەو کەسانە بەسزای قورس و لەبن دەرکێشان سزا دەدات , کەلە بێباوەڕیدا ڕۆچوون , وبە لێخۆشبوون و بەزەیی خۆی مامەڵە لەگەڵ باوەڕدارانددا دەکات . بەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات : ﴿ وَهَلْ نُجَازِي إِلاَّ الْكَفُورَ ﴾ واتە : بەنموونەی ئەم سزایە ئینجا خوای گەورە ئەو باخە پڕ لە گەڵاو سەوزو سێبەرو بەرو بومەی بۆ گۆڕین بە کۆمەڵە درەختێکی دڕکاوی و بێ گەڵاو بەرو بووم تاڵ و درەختی بێ بەری وەك دار گەزۆ و کەمێك درەختی ( سدر ) یش کەبەرو بومێکی کەمی هەیە , کەئەم ( سدر ) ە باشترینیان بوو ﴿ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾ هەموویانی لەیەکتری دوورخستەوە , و بەناو دەشتی چۆڵ و ووشکدا دەڕۆیشتن , و شوێنی سێبەر و حەوانەوەیشیان لەدەستدا , و هۆزەکەیشیان پەرت و بلاوبوون و هەریەکەیان بۆ لایەك , خوای گەورە نیعمەتەکەی بۆ گۆڕین بە سزاو ئازاردان , و ئیسراحەتەکەی بۆ کردن بە ناڕەحەتی , کۆبوونەوەیانی , تەفرو توناکرد و لێکی دابڕین , بوون بەنیشانەیەك بۆ کەسانی ئارامگرو شوکرانەبژێر و کردنی بەپەند بۆ پەند

وەرگران و یادەوەری بۆ هەموو جیهان .

دێینە سەر ڕوونکردنەوەی مانای ئایەتەکان :-

﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾ ( سبأ / ١٥ ) .

مێژوونوسان و هەواڵ گێڕەوەکان دەڵێن : ( سبأ ) یەکەم کەس بووە کە پاشایەتی وولاتی یەمەنی کردوە , و ناوی ( عبدُ شمس بن يَشْجُبْ بن يَعْرُب بن قَحطان ) بوو .

بە ( سبأ ) ناوبراوە , چونکە یەکەم پاشا بووە , قسەی بە دووژمنەکانی خۆی وتوە .

هەروەهاش پێشی وتراوە ( الرائيش ) چونکە ماڵ و سامانی غەنیمەی جەنگی کۆکردۆتەوە و پێشکەشی قەومەکەی دەکرد , و عەرەب ماڵ و سامانیان ناوەناوە ( ريش ) يان ( رياش ) ە .

زۆرێك لەکەسانی ( سلف ) پێشین , لەوانە : ( قتادة ) باسیان کردوە , ئافرەتێکیان دەچووە ناو یەکێك لەباخەکانیانەوە و بەژێر درەختەکاندا دەڕۆیشت کە زەمیلە یان سەبەتەیەکی بەسەر سەرەوە بووە , بەری دارەکان خۆیان دەکەوتنە خوار بۆ ناوی تا پڕ دەبوو , بەبێ ئەوەی پێویستی بەهەوڵدان و لێکردنەوە بێت , ئەمەش لەبەر زۆرییان و پێگەیشتووییان , ئەم ناوچەیە بە ( مـأرب )کەشارێکی ئەوێ بووە، ناوی هاتووە , و(سدّ) بەنداوێکی گەورەی تیابووە، ئاوی زۆری گل دەدایەوە ، دوری نێوان شاری (مأرب) و ( صنعاء ) سێ ڕۆژ ڕێگا برین بووە . هەندێکی تر ووتویانە لەم شارەدا نەمێش و مەگەز و نەمێشولە و نەکێچ و ئەسپێ نەبووە , هەروەها هەواکەی فێنك و مام ناوەند بووە , و دانیشتوانەکەی لەتەندروستی یەکی باشدا بوون , و خوایان بەتاك و تەنها دەزانی و دەیانپەرست وەك خوای گەورە دەربارەیان فەرمووی :- بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لەوولاتی خۆیاندا بەڵگەو نیشانەو دەسەلاتی خوا ئاشکرایە , پاشان بەئایەتی ﴿ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾ ڕونیدەکاتەوە , واتە کەئەویش دوو باخی زۆر گەورە بوو لەلای ڕاست و چەپی ناوچەکەدا ,

﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾ . ئەو دوو باخچەیە نیشانەیەك بوون لە بەپیتی و بەرەکەتی و ڕژانی فەزڵ و ناز و نیعمەتی خوایی

، و دیمەنێکی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشیان هەبووە .
دەبێت ئینسان لەوە زیاتر چی بوێت کەبە ناو باخەکانی خۆیدا بڕوات و نازو نیعمەتێکی زۆری تیا بێت ، وبە لای ڕاست و چەپیدا هەنگاو بنێت ؟ .
ئەم نازو نیعمەت و باخانە تا کاتێك بەردەوام دەبن کە خاوەنەکانیان چاکەکارو لە خواترس بن و حەقی خەڵکانی تری لێ بدەن . ئەگەر کافرو بێ بڕوا بوون ئەوا نیعمەتەکەیش لەناو دەچێت و نامێنێت .
قەومی ( سبأ ) و خاوەنی دوو باخچەکەی کەلەسورەتی ( الکهف ) دا باسکران و ، خاوەنی ئەو باخەی کەلەسورەتی ( القلم ) دا باسی هاتووە ، و قەومی فیرعەون و قەومی ( صالح ) ( علیه السلام ) و هەموویان باخی جوان و ڕازاوەیان هەبووە ، بەڵام هەمووی لەناو چووە . چونکە خاوەنەکانیان پشتیان کردۆتە خواو خاوەنی ئەو نیعمەتەیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە . ئەمەش سوننەتی خوایەو ، ئەم سوننەتە بەردەوامیش دەبێت .
خوای گەورە بەقەومی ( سبأ ) ی فەرموو : ئێوە لەبەر بوونی ئەو باخانە بخۆن و سوپاسگوزار بن بەرامبەر بەنازونیعمەتەکانی خوا ، چونکە ڕزقێکە پەروەردگارتان پێی بەخشیون .
﴿ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَى أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾ ( سبأ / ١٦ ) .
خوای گەورە فەرمانی بەقەومی سەبەء کرد لێی بخۆن و هەروەها فەرمانیشی پێ کردن سوپاسگوزار بن ، و ئاماژەی کرد بۆ ئەوەیش کە وڵات و ناوچەکەی ئەوان ( طیب ) ە ، و پەروەردگاریشیان لێخۆشبووە .
پێشەوا ( الراغب الأصبهاني ) دەڵێت : ( الطیب ) واتە : ئەوەی هەستەکان و نەفس بەخۆشی دەزانن و لەزەتی لێ دەبینن .
بەڵام ئایا قەومی سەبەمچییان کرد ؟ و چۆن مامەڵەیان لەگەڵ نیعمەتی خوادا کرد ؟
بەڕاستی ئەوان پشتیان هەڵکرد ، واتە : بێباوەڕ بوون ، بەندایەتی و شوکرانە بژێری خوایان وەلانا ، پشتیان کردە فەرمانەکانی خوا ، هەواو ئارەزوویان هەڵبژارد و شوێن هەنگاوەکانی شەیتان کەوتن ، و نیعمەتەکانی خوایان لەسەر پێچی فەرمانەکانیدا بەکارهێنا ، بەم کارەیش ، سوننەتی خوابەسەریاندا جێ

بە جێ بوو ، هیچ ئوممەتێك نەبووە کە بێباوەڕ بێت بەخوا ، و نیعمەتەکانی لە کوفر و خراپەکاریدا بەکاربهێنێت ، مەگەر خوای گەورە سزای تووش هێناون ، و نیعمەتەکانی لێ وەرگرتونەتەوە ، و بەرەو لەناوچوونی بردوون . خوای گەورە بەخێرایی سزای بۆ ناردن ، وەك فەرمووی : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ﴾ واتە : ئێمە لافاوێکی وێرانکەرمان بەسەریاندا بەرەڵا کردوو ( کە باخ و بێستانی کاول و وێران کردن ) .

﴿ سَيْلَ الْعَرِمِ ﴾ : بریتی بوو لەبەربەستی ( مآرب ) کە ئاوی بۆ گل دابوونەوە بۆ کشتوکاڵ و باخەکانیان ، بەڵام خوای گەورە تێکی شکاند ، و ئاوەکەی لە پشتیانەوە کردە لافاو بەسەریاندا ، پاشان بەسەر باخەکانیاندا هات و هەمووی لەناو برد .

ئاو یەکێکە لەنیعمەتەکانی خواو ، باخەکانی پێ گەشە دەکات و ، بەڵام ئەوان لە پشت ( سدّ ) بەربەستەکەوەگلیان دابویەوە ، بەو هۆیەوە ژیانێکی بەختەوەریان بەسەربرد .

بەڵام هەر ئەم ئاوە خوای گەورە دەیکاتە هۆی سزاو ناڕەحەتی ، هەربەم ئاوە باخەکانیان وێران دەکات و کشتوکاڵەکانیان لەناو دەبات .

بەڕاستی ئەمە یەکێکە لەنیشانەکانی خوای گەورە ، بەئاوباخیان بۆ سەوزو بەرهەمدار دەکات . هەر بەو ئاوەیش لە ناوی دەبات و لەبنی دێنێت ، بەهۆی ئاوەوە بە دەوڵەمەندی و بەختەوەری دەژیان . هەر بەهۆی هەمان ئاوەوە سەرشۆڕو هەژارکەوتن .

پاش ئەوە خوای گەورە ئاماژە دەکات بۆ گۆڕان کارییەك دەفەرموێت :-
﴿ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَى أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ (السبأ ١٦)

لەڕواڵەتدا هەردوباخەکە مانەوە ، بەڵام لەڕووی ڕاستی و حەقیقەتەوە نا ، درەخت و بەروبەمەکانیان تیاچوون ، بەڵام خوای گەورە لەباتی ئەوانە درەختی بیابان و بەروبوومی تاڵ ودڕکاوی بۆ ڕواندن . ئەمەش نیشانەی خەشمی خوا بوو لەسەر قەومەکە ، بەهۆی کوفرو لادانیانەوە .

هەروەها وێنەیەکی جوانمان نیشان دەدات کە وەك ئەوەیە ڕووەکەکانیش خەشم و تورەیی خۆیان بۆ قەومەکە دەربڕیبێت کە بەو شێوەیە ڕواونەتەوە بەو

مانایەی کە ئیتر لەمە و دوا ئەم جۆرە ڕووەکانە شیاوی ئێوەیە .
( اثـل ) ڕووەکێکـی بیابـانی یـە و ( الطرقـاء ) یشـی پـێ دەوترێـت , زووگڕدەگرێت ئەگەر سەوزیش بێت .
( السدر ) : ڕووەکێکە بەری کەمەو سودی وای لێ نابینرێت , بچوکە و کە بەشـی خـواردن و سـود لێ وەرگـرتن ناکـات و هـەروەها ( النبّـق ) یشـی پـێ دەوترێت .
﴿ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلاَّ الْكَفُورَ ﴾ ( سبأ / ١٧ ) .
واتـە : ئابـەوجۆرە سـەختە تۆڵـەمان لێسـەندن , بـەهۆی ئـەوەوە کـە بێبـاوەڕو سپڵە بوون , ئایە ئێمە تۆ لە هەرلەکافرو سپڵە ناسێنین !؟.
خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى ﴾ ( الکهف / ٨٨ )
واته : ( بەڵام ئەوەی باوەڕبهێنێت و کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدات , ئەوە پاداشتی چاك بۆ ئەوە .
هەروەها دەفەرمووێت :- ﴿ وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ ﴾(الشورى ٤٠) واتـە: تۆڵـەی هەرتاوانێك بەئەندازەی تاوانەکەی خۆیەتی .
( الزمخشري ) دەڵێت :- ئەم ئایەتە واتـە : جۆری ئـەم سزایە تـەنها شیاوی کافرانـە کـە سـزایەکی بەپەلەیـە , وتـراوە بـاوەڕدار چاکەکانی دەبنەکـە فارەتی خراپـەکانی , وکـافر هـەمووکارەکانی تیادەچـێت و خەسـارەتمەند دەبێـت , و سزای کردەوە خراپەکانی وەردەگرێت .
﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ (١٨) فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ .( سبأ / ١٨- ١٩ )
خوای گەورە لافاوی بەسەر قەومی سەبەئدا نارد و باخەکانی تێکدا , تاپەنـدو ئامۆژگاری لێ وەربگرن , بگەڕێنەوە بۆلای خوا , بەڵام چاوەکانیان کوێربوون و دڵەکانیان مۆری لێدراو , پەندیان لێوەرنەگرت .
مامۆستا ( سید قطب ) دەربارەی ئایەتـەکانی سـەرەوە دەڵێت :- ( قـەومی سەبەء تائەو کاتە لـەناو ماڵ و شارو شوێنەکەی خۆیاندا مابوونـەوە , وخوای

گەورە ڕزقی خۆی لەسەر تەسك و کەم کردبوونەوە , لە حاڵەتی خۆشگوزەرانی و نازونیعمەتەوە , حاڵیانی گۆڕی بۆ ناڕەحەتی و قورسی ژیان , بەلاَم هێشتا پارچە پارچەی نەکردبوون و لێکی جیا نەکردبونەوە .

هێشتا ئاوەدانی مابویەوە بۆیان وە لە ناویاندا هەبوو, و هەروەها لەشارەکانی دەوروبەریشیاندا , وەك مەککە لە (جزیرة ) و ( بیت المقدیس ) لە شام و , هەروەها ( الیمن ) بەردەوام هەرئاوەدان بوو کە لەباکوری وولاَتی (سبأ)دابوو , پەیوەندیان بەشوێنە بەرەکەتدارەکانەوە مابوو , و ڕێگاکانی نێوانیان ئاوەدان و ئارام بوو . ووتراوە : گەشتیارێك لەشارێکەوە دەردەچوو بۆشارێکی تر پێش ئەوەی تاریکی دابێت . سەفەرکردن ماوەکەی دیاری کراوبوو , ئارام بوو بۆ گەشتیارەکان , کارەکە ئاسان بوو , لەبەر نزیکی شوێنەکان لەیەکەوە .

﴿ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا﴾ ( کەچی لەو نازونیعمەتەیش بێزاربوون ) و ووتیان : پەروەردگارا نێوانی ڕێگەی سەفەرکانمان لەیەك دوور بخەرەوە .

﴿ وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ﴾ ئەم داخوازییە یان وەلاَم درایەوە و ستەمیان لە خۆیان کرد بەم کارە .

﴿ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ﴾ . ئێمەیش کردمانن بەداستان و باسی سەرزاری خەڵکی و پارچەپارچەکردن بەلاَم زۆر بەخراپی , جیابوونەوەو بلاَوبوونەوە بە ناو ( جزیرة ) دا , هەموو پەیوەندی و نزیکی یەکیان پچڕاو بەش بەش بوون . بون بەپەندی زەمانە و , هەرکەس هەڵدەسا باسی سەرزاری ئەوان و گێڕانەوەو بەسەرهاتیان بوو .

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ ( سبأ / ١٩ ) بەڕاستی ئالەو ڕووداوو حاڵەتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەیە بۆکەسانێك زۆر خۆگرین لەکاتی تەنگانەو ناخشیدا و , لەکاتی خۆشیدا سوپاسگوزاربن , ( هەوڵ بدەن وەکو ئەوقەومەنالەبارە بیانووگرەمەبن ) .

بەڕاستی ئەو لێکدانەوەیە زۆرجوان هاتووە کەووتی : لەچیرۆك و بەسەرهاتی قەومی ( سبأ ) دا چەند بەڵگەو نیشانەیەك هەیە :-

لەسەرەتاوە خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ ﴾ , کاتێك لەباسی چیرۆکەکە تەواو بوو فەرمووی :- ﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ ﴾ , ڕەنگە

حیکمەت لەمە دوو لایەنی هەبێت :-

- لایەنی یەکەم :لەگەڵ ئەو بابەتەدا دەگونجێت کە دەربارەی دەدوێت , قەومەکە کاتێك لەناو نازونیعمەتی خوادا ژیان , بەختەوەرو خۆشگوزەران بوون , هەموویان کۆو یەك بڕیاو یەك ئاڕاستە بوون وەك یەك پیاو وابوون , لەبەرئەوە زۆرگونجاوە کە بە ( آ یة ) تاك تەعبیریان لێ بکرێت .

هەروەها ووشەی (الایـة ) لەگەڵ ( المسـکن ) دا دەگونجێت , چونکە هەردوکیان تاکن .

بەلام پاش ڕوخانی بەربەستەکەو پارچەپارچەکردنیان و بلأوبوونەوەو لێکپچڕانیان , یەك نەتەوە گۆڕا بۆ چەند نەتەوەیەك , ویەك قەبیلە بۆ چەندین قەبیلە , ویەك شوێن بۆچەند شوێنێك , لەبەر ئەم دابەشکردن و

جیاکردنەوەیە گونجاوە کە بە ( جمع ) کۆ تەعبیری لێ بکرێت .نیشانەکە لەسەر قەومەکە بوو بەچەند نیشانەیەك.

- لایەنی دووەم:- ﴿ لآيَاتٍ ﴾ نیشانەکان , چەند (ایە ) نیشانەیەك دەگرێتەوە : سەبەء بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرایان هەبوو , کەخوای گەورە جێگیری کردبوون , وەهەروەها نیشانەیەکی تریان لەدابینکردنی ئەو خۆشگوزەرانی و خەیرە زۆرەدا هەبوو , هەروەها نیشانەیەکی ترلە ستەم و کوفری خەڵکی و لادانەکانیاندا هەبوو, ئەوەش نیشانەیەك بوو کەنیعمەتەکانی پەروەردگاریان لەشتانێکدا بەکار هێنا کە خوای گەورە نەیدەویست . هەروەها لەبێئاگایی خەڵکیشدا نیشانەیەکی ترهەبوو , کەپەند و ئامۆژگایان وەرنەگرت . لەوەشدا کەتوشی ئینسان دێت بەهۆی کارو کردەوەی خۆیانەوە , نیشانەیەکی ترهەبوو . ولەجێ بەجێ بوونی سونەتی ڕەبانیشدا لەهەموو کاتێکدا بەسەر خەڵکیدا نیشانەیەك هەبوو , وەنیشانەیەکیش لە تۆڵەسەندنی خوای لەستەم کاراندا هەبوو و....هتد.

لەبەر ئەمانە لەسەر ( سَبَأٌ ) کۆمەڵە نیشانەیەك هەبوو , کەئینسان لەبەر ئەمیاندا هەڵوێستە دەکات , وەبەڵگەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرن .

بەلام ئایا هەموو کەس هەست بەم نیشانانەدەکات و , بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و لێ یان تێ دەگات ؟

بەڵێ ڕاستە کە هەموو نیشانەکان بۆ کۆمەڵ بەگشتی ئاڕاستە کراون . بەلام

بێ ئاگایان و کافران و ستەم کاران و هەڵخەڵەتاوان و ئەوکەسانەی کەپشتیان لەخوا کردوە لێی تێناگەن .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ وَكَأَيِّن مِّن آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴾

( یوسف / ١٠٥) واتە: ( چەندەها بەڵگەو نیشانە لەئاسمانەکان و زەویدا هەن ( لەسەر دەسەلاتداریەتی و جوانکاری خوای پەروەردگار ) , کەچی زۆربەی خەڵکی بەلایدا تێ دەپەڕن و تێ نافکرن و پشتی تێ دەکەن ) .

قورئان ڕای دەگەیەنێت کەبەڕاستی تەنها ئەو کەسانەی زۆر ئارامگر و سوپاس گوزارن سود لەو نیشانانە دەبینن و هەرئەوان لێی تێدەگەن و دەتوانن بگەن پێی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرن .

﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلاَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢٠) وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴾ ( سبأ ٢٠- ٢١ ) .

واتە: لەڕاستیدا گومانی شەیتان بەڕاست دەرچوو بەرامبەر ئەو جۆرەکەسانە ( کەڕوو بەڕوو بەپەروەردگار کاتی خۆی , وتبووی : دەبینیت زۆربەی خەڵکی سوپاس گوزار نابن ) کەچی خەڵکی بێباکانە هەرشوێنی کەوتن , جگە لەدەستەیەك لەبڕواداران , جاوەنەبێت ئیبلیس هیچ دەسەلاتێکی بەسەریاندابێت , بەڵکو ئێمە ویستوومانە ڕوون بێت و دەربکەوێت , کێ باوەڕی بەقیامەت و ڕۆژی دوای هەیەو کێش لەشك و گوماندایە .

( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیابە کە پەروەردگاری تۆ ئاگادارو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێکی لێ بزرنابێت ) خوای گەورە لەچەندین ئایەتی قورئاندا باسی( شەیتان ) ی کردوە , یەکێك لەو ئایەتانە , مەبەستی شەیتانمان بۆ ڕون دەکاتەوە کەهەموو ژیانی خۆی وەقف کردوە بۆ سەرلێ شێواندنی ئینسان و بەردەوام نەخشەی خۆی دەکێشێت , هەرجارەی بەشێوازێك , تائامانجی خۆی بەدی بهێنێت ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ (١٦) ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ ﴾ ( الآعراف / ١٦-١٧ ) .

واتە : ( شەیتان ووتی بەهۆی ئەوەی کە تۆمنت گومڕاو سەرگەردان کرد ,

ئەوە سوێند بێت منیش لەڕێگە ڕاستەکەدا بۆیان دادەنیشم ( لایان بدەم ) پاشان سوێند بەخوا , لەبەر دەمیانەوە , وەلەپشتیانەوە , وەلەلای ڕاستیانەوە , وەلەلای چەپیانەوە , بۆیان دێم و ( دونیایان لاخۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەم ) نابینیت و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاس گوزار بن ) .

خوای گەورە ئاگادارمان دەکات لەشەیتان , وبۆمان ڕوندەکاتەوە کەچەندە دوژمنێکی ڕق لەدڵ و سەرسەختە , وەداوای لێکردووین بەدوژمنی خۆمانی بزانین , تالەسەرلێتێکدانماندا سەرکەوتو نەبێت .شەیتان دەسەڵاتی بەسەر ئینساندانی یە , لەبەر ئەوە خۆیان بەرپرس دەبن لەشوێنکەوتنی , لەسەر شوێنکەوتنی شەیتان موحاسەبە دەکرێن, چونکە بەویستی خۆیان شوێنی کەوتوون , ووەڵامی شەیتانیان داوەتەوە و ڕازی بوون بەبۆچونەکانی , و دڵ و هەستەکانی خۆیان بۆ کردۆتەوە .

لەکاتێکدا کەشەیتان شوێن کەوتووە ساویلکەکانی خۆی هەڵخەڵەتاندووە لەڕۆژی قیامەتدا بەرائەتیان لێ دەکات و دەڵێت من تەنها بانگم کردوون و ئەوانیش وەڵامیان دامەوە .

﴿ پەندوو وانە گرنگەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- دەربارەی ئایەتی :-﴿ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلاَّ الْكَفُورَ ﴾ ( سبأ / ١٧ ) . : ( مجاهد ) دەڵێت : ( يجازي ) واتە ( يعاقب ) , سزادەدرێت , لەبەر ئەوە خوای گەورە بۆ باوەڕدار بەهۆی چاکەکانی یەوە لەگوناهەکانی خۆش دەبێت , بەڵام کافر بەهەموو کارێکی خراپی سزا وەردەگرێت . بەڵام باوەڕدار پاداشت وەردەگرێت نەك سزا , چونکە ( يُجْزِي) جیاوازە لە( يُجازى )

٢- لەئایەتی :- ﴿ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا ﴾ چەند بۆچونو ئاماژەیەکمان دەربارەی نیعمەتەکانی خوا بۆ دەردەکەوێت :-

- فەرمانەکە لێرەدا بۆ خواردنێکی ( مباحة ) نەك ( واجب ).

- ( مِن ) بۆ ( تبعيض ) ە واتە هەندێك ڕزقی پەروەردگارتان بخۆن , ڕەنگە ئاماژەبێت بۆ کەم خواردن , کەبەشێکی بخورێت نەك هەمووی تەنها بۆ ئەوەی کاری جەستە بەڕێوە بچێت , ئینسان ئەوەندە بخوات کە بەسی بێت نەك ورگی پڕبکات .

- دانانی ( الرزق ) لەگەڵ ناوی ( الرب ) واتە پاڵ دانە پاڵ پەروەردگار , ئەمەش بۆ مانای ئیمانی و تەربەوییە بێ گومان ڕزق تەنها لای خوایە , ناگونجێت و دروست نیە , نیسبەت بدرێتەلای کەس بێجگە لەو , تەنها لەڕێگەی هۆکارەوە نەبێت , کەخاوەنی هۆکارەکانیش هەرخوایە .

- شوکرانە بژێری خوایەکی ڕزق دەر , بەڵگەیە لەسەر خەیرو چاکەو ئیمان لای باوەڕدار , وەبەڵگەیشە لەسەر لێ بووردەیی و سەرف کردنی لەخەیردا و بەخشندەیی . ئەگەر ئینسان سوپاس گوزاری خوا نەبوو بۆ ئەم نیعمەتانە, ئەوە بەڵگەیە لەسەر بەخیلی و کەللە ڕقی و گومڕایی

- سوپاس گوزاری لەسەر نیعمەتەکان بەڵگەیە لەسەر بەردەوام بوونی ئەو ڕزقەو زیاد کردنی هەروەها سپڵەیی بەرامبەر نیعمەتەکان , هۆکارە بۆلەناوچونیان و بڕینی ئەو ڕزقە , وەبێبەش بوون لەخواردن , وەك ئەوەی بەسەر قەومی سەبەء داهات .

زانراوو ئاشکرایە کەشوکرانە بژێری تەنها بەزمان جێ بەجێ نابێت , بەڵکو بەهەموو جەستە , بەزمان و عەقڵ و دڵ و خەیاڵ و ئەندامەکان , ئەوەشوکرانە بژێریەکی کردارییە , وەشوێنەواری بەکارهێنانی نیعمەتەکانی تیا ڕەنگ دەداتەوە و سوود بەخاوەنەکەی دەگەیەنێت .

- لەئایەتی :- ﴿ وَاشْكُرُوا لَهُ ﴾ دا ئەو ( ل ) ە ی کەلەدوای ( فعلی ) ( شکر ) ەوە هاتوە بۆ ( تقوية ) یە , چونکە خوای گەورە نەی فەرمووە ﴿ وَاشْكُرُوا﴾ , هەروەها ئەو ( ل ) ە پێی دەوترێت ( لام ) ی ( الإخلاص ) , چونکە شوکرانە بژێری تەنها دەبێت بۆ خوا بێت . ئەو کەسە بەکاری شوکرانە بژێریەکەی کەسێکی دڵسۆزە بەرامبەر بەخوا .

هەروەها دەش گونجێت ناوی بنرێت : ( لام ) ی ( الإستعانة ) , چونکە سوپاس گوزار لەڕوانگەی ڕزق و نیعمەتەکانی خواوە سوپاسی خوادەکات . وەپاشان ئەو ڕزقەبەکار دەهێنێت لەکارانێکدا کە گوێڕایەڵی خوای پێی دەکات و , داوای یارمەتی لەخوا دەکات کەلەسەربەندایەتی کردنەکەی یارمەتی بدات .

زۆربەی ( فعل ) ە کانی ( شکر ) لەقورئاندا ( لام ) ی بەدواداديێت , کەبۆ بەهێزکردن و پشت بەخوا بەستن و دەربڕینی دڵسۆزی یە - خوا زاناترە - .

## ﴿ چیرۆکی خەڵکی ئەو شارەی چەند پێغەمبەرێکیان بۆ هات﴾

خوای گەورە دەفەرموێت :- ﴿ وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ إِذْ جَاءهَا الْمُرْسَلُونَ (١٣) إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوا إِنَّا إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ (١٤) قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَا أَنزَلَ الرَّحْمن مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ تَكْذِبُونَ (١٥) قَالُوا رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ (١٦) وَمَا عَلَيْنَا إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ (١٧) قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٨) قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ أَئِن ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ (١٩) وَجَاء مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ (٢٠) اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ (٢١) وَمَا لِي لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢٢) أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَن بِضُرٍّ لاَّ تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلاَ يُنقِذُونِ (٢٣) إِنِّي إِذًا لَّفِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ (٢٤) إِنِّي آمَنتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ (٢٥) قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ (٢٧) وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِن بَعْدِهِ مِنْ جُندٍ مِّنَ السَّمَاء وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ (٢٨) إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ (٢٩) يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُون ﴾ ( يس / ١٣-٣٠ ) .

پێش دەستپێکی چیرۆکەکە :-

ئەم چیرۆکە نمونەیەکە لەبانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە , بانگ خوازان تواناکانی خۆیان بەگەڕدەخەن بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی و ئامۆژگار کردنی خەڵکی و لەو پێناوەشدا قوربانی دەدەن بۆ هیدایەتدانی خەڵکی و قەومەکەیان , ئەو قەومە لەوپەڕی بێمێشکیدا بوون و کافرو لەسنور دەرچوو بوون و باوەڕیان بەپێغەمبەران نەدەکرد. هیچ ئامۆژگاری کردنێك سودی پێ نەگەیاندن , لەگەڵ ئەوەشدا کە باوەڕداران و کافرانیش ماوەیەکی کورت و براوە لەدنیادا بەسەر دەبەن , بەڵام بێ باوەڕان ئینکاری قیامەتیان دەکرد , خوای گەورە دەورەی هەموو شتێکی داوە زانستی تەواوی بەهەموو شتێکی نهێنی و ئاشکرا هەیە و هەموو بینراوو شاراوەکان دەزانێت و هیچی لێ وون نابێت , بۆی ڕونکردوینەتەوە کەباوەڕداری ڕاستە قینە لەکاتی کوشتن و شەهید بوونیدا دەردەکەوێت . شەهید هێندەی پێوەدانی مێشولەیەك ئازاری پێ دەگات ,

پاشــان دەگاتــە پلــەی ڕێــز لای خــوای گــەورە ، کەســی بــانگخواز پــەیامی بانگەوازەکــە دەچێتە نــاودڵی یــەوە و لەگــەڵ ئەوەشــدا هیدایەتــدانی خــەڵکی بەدەست ئەو نی یە ، بەڵام خۆی سورە لەسەر هەوڵدان لەسەر هیدایەت دانی قەومەکەی . ئــەو بــاوەڕدارەی لــەم چیرۆکەدا نــاوی هــاتووە ،.کاتێك لــەدنیاوە بەرەو قیامەت دەچێت دەڵێت :-

﴿ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴾ ( یس / ٢٦-٢٧ ) . ئاواتی خواست کە قەومەکەی بیان زانیایە کوشتنی ئەو پشــتگیری کــردن بــووە لەناحــەق و بــرەو دان بــووە بــە کــوفرو بــێ بــاوەڕیی . وبیانزانیایە ، کە ئەو بەو هۆیەوە گەیشتۆتە چ نازو نیعمەتێکی پــەروەردگاری و ، ئێستا لەخوای گەورە نزیك بۆتەوە. خۆزگە ئەم کارە ببوایەتە هۆکارێك ئــەوان بەخۆیانــدا بچونایەتەوە و بیریــان لــەخۆیان بکردایەتــەوە ولای پــەروەردگاریان تەوبــەیان بکردایــە . باشــترین چــارەنوس و پاداشــتی چــاك بۆبــاوەڕدارە ، کەهەڵســاوە بەکاری بانگەوازکردن بۆلای خواو ڕونکردنــەوەی پــەیامی خــوای . وچــارەنوس و دواڕۆژی کــافران بــەدترین و خــراپ تــرین و ناشــیرینترین ســزای تیایە بۆیان :- ﴿ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِن بَعْدِهِ مِنْ جُندٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ (٢٨) إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ ﴾ ( یس / ٢٨-٢٩ ) . واتە: ( خوا دەفــەرموێت : وەنــەبێت هیچ لەشــکرێکمان لەئاسمانــەوە نەناردبێتــە خوارەوە بۆ ســەر قەومەکەی دوای شــەهیدکردنی ، وەنــەبێت هــیچ لەشــکرێکمان ڕەوانــە نــەکردبێت بــۆ لــەناوبردنیان . بــەڵکو تــەنها یــەك دەنگــی گــەورەو شــریخەیەکی بەهێز نــەبێت ، هیچــی تــر نــەبوو، جائــەوان دەست بــەجێ مــردن و خامۆش بوون ) . خوای گەورە ئەمەی بۆ بێ نرخ کردنی کاری ئەوان فەرموو.

ئینجــا دێینــە ســەر ڕونکردنــەوەی چیرۆکەکە لەڕوانگــەی ئایەتــە قورئــانی یەکانەوە :- خوای گەورە دەفەرمووێت :- ﴿ وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ إِذْ جَاءهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾ (یس /١٣ ) .

واتــە : ئــەی ( محمــد ) (ﷺ) چــیرۆکی خــەڵکی ئــەو شــارەی کــە چــەند پێغەمبەرێکیان بۆ هات بۆ قەومەکەت باس بکە کە باوەڕیان پێنەکردیت .

زۆرێك لە زانایانی تەفسیر ئەو پرسیارە دەکەن ، ئایا ئەو کەسانە پێغەمبەر بوون لەلایەن خواوە یان لەلایەن پێغەمبەر عیسا ( علیە السلام ) ەوە نێردرابون؟

زۆرێك لە زانایانی تەفسیر هەواڵ گێڕەوەکان لەسەر ئەوەن کە ئەم پێغەمبەرانە لەلایەن خواوە نەنێردراون بۆلای خەڵکی ئەو شارە ، بەڵکو لەلایەن عیسا پێغەمبەرەوە نێردراون .

دەگێڕنەوە : ئەم پێغەمبەرانە لەلایەن عیسا ( علیه السلام ) ەوە نێردراون ، ناردنی بۆ شاری ( إنطاکیة ) ، ئینجا خوای گەورە فەرمووی : ناردنی عیسا ( علیه السلام ) بریتی یە لە ناردنی ئێمە ، نێردراوی پێغەمبەری خوا بە پشتیوانی خوا ، نێردراوی خوایە ، بێگومان ئەی محمد (ﷺ) باوەڕنەکردن بەو پێغەمبەرانە وەك باوەڕنەکردنە بە تۆ ،[1]

هەروەها هەندێك لە زانایانی تەفسیر ووتویانە : ئەم پێغەمبەرانە ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە بۆ ئەو قەومە نێردراون . ئەوە کارێکی غەریب نی یە کە سەرەتا دوو پێغەمبەر بێن و پاشان بە سێهەم پێغەمبەر پشتیان قایم بکرێت .

دەربارەی ئەمە مامۆستا ( سید قطب ) دەڵێت :- ( ئەوە شارێك بوو خوای گەورە دوو پێغەمبەری بۆ نارد ، هەروەك چۆن موسا و هارون ی بەیەکەوە بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی نارد ، خەڵکی ئەو شارە باوەڕیان بەو دوو پێغەمبەرەنەکرد ، پاشان خوای گەورە بە سێهەم پێغەمبەر پشتیوانی لێ کردن و بەهێزی کردن . خوای گەورەیش دڵنیای دەکاتەوە کە ئەوانە پێغەمبەرانێك بوون لەلایەن خواوە .

﴿إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ دوو پێغەمبەر بوون لەسەرەتادا ، بەڵام خەڵکی شارەکە باوەڕیان پێ نەکردن ، بەڵکو ئازاریان دان و زۆر ناڕەحەتیان کردن ، دەڵێن : زیندانییان کردن ، دواتر بۆ ئەوەی دەنگیان بگاتە خەڵکی و ، بانگەوازەکەیان بەردەوان بێت ﴿فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ واتە بەهێزمان کردن و پشت قایمان کردن بە سێهەم پێغەمبەر ، کە ئەمەش بە شێوازێك بوو کە لەگەڵ بارودۆخی شارەکەدا گونجاو بوو ، بەم کارە کاروانی بانگەوازەکە بەردەوام بوو ﴿ فَقَالُوا إِنَّا إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴾ ئەم سێ پێغەمبەرە

---

[1] ( تفسير الرازي ) ( ٢٦: ٥١ ) .

خۆیا پێشکەشی ئەو شارە کردو ، ووتیان :- ( بەڕاستی ئێمە بۆ ئێوە نێردراوین ) .

بەڵام خەڵکی شارەکە لێکچونێکی نێوان خۆیان و ئەوانیان بەرامبەریان ووروژاند ، ﴿ بشريه الرُسُل ﴾

( واتە : بەشەر بوونی پێغەمبەران ) لەسەرئەم لێکچواندنە ئەنجامێکی خراپیان بنیات نا ، کە ووتیان ، ئێوە درۆزنن و پێغەمبەر نین :- ﴿قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَا أَنزَلَ الرَّحْمن مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ تَكْذِبُونَ ﴾ ( يس / ١٥ ) .

ئەمە تۆمەتێکی ناڕەوایە کە هەموو قەومێك ئاراستەی پێغەمبەرەکانی خۆی کردووە ، و کردویانە تە هۆکارێکی ڕێگر بۆ باوەڕنە هێنان پێیان ، و داوایان کردوە کە پێغەمبەرەکە فریشتە بێت ، ئیمان هێنانی خۆیانیان پابەند کردووە بەو کارەوە .

( إبن كثير ) دەڵێت :- قەومەکە ووتیان : چۆن دەبێت خوای گەورە وەحی بکات بۆ ئێوە ، لە کاتێکدا کە بەشەرن ، و ئێمەیش بەشەرین ، و بۆچی وەك ئێوە وەحیش بۆ ئێمە نانێرێت ، ئەگەر ئێوە پێغەمبەر بونایە دەبوو فریشتە بونایە ، بەڕاستی ئەمە تۆمەتێکی ناڕەوایە لە ناو زۆرێك لەو ئومەتانەدا کە باوەڕیان نە هێناوە .

هەروەك خوای گەورە لە ئایەتی : ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾ ( التغابن /٦) .

واتە : ( پێغەمبەران بە جۆرەها بەڵگەو موعجیزە ، پەیامی خوایان ڕاگەیاند ، کەچی وتیان : ئەمانە بەشەرن وەك خۆمان ، چۆن دەبنە پێغەمبەر و چاو ساغمان ؟ ) سەریان لەم کارە سوڕماو ئینکارییان کرد .

هەروەها خوای گەورە لە سورەتی ( إبراهيم ) دا ، کە ئەمە ماناکەیەتی ، فەرمویەتی :- ( خوا نەناسان بە پێغەمبەرانیان ووت :- ئێوە تەنها بەشەرن وەکو ئێمە ، هیچی تر نین ، ( لە باتی سوپاسی خوا بکەن کە ئەوەندە ئادەمیزاد ڕێزدارە ، نوێنەر لە خۆیان هەڵدەبژێرێت ) کەچی ڕەخنەیان گرت و ووتیان : ئێوە دەتانەوێت ڕێگرو دژ بەوە بن ، کە باوك و باپیرانمان دەیانپەرست ( دەی ئەگەر ڕاست دەکەن ) بەڵگەیەکی ئاشکرامان بۆ بهێنن و نیشانمان بدەن ) .

ئینجا پاش ئەم تۆمەتبارکردنە و لێکچواندنە ، پێغەمبەران کاری گرنگی

خۆیان بۆ خەڵکی شارەکە ڕونکردەوە و ووتیان :- ﴿قَالُوا رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ (١٦) وَمَا عَلَيْنَا إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ ( يس / ١٦ – ١٧ ) .

بێگومـان ئەوانـە پێغەمبـەربوون ، چـونکە خـوای گـەورە نـاردبونی ، و هـەر خۆیشـی دەزانێـت کـە پێغەمبـەرن ، زانسـتی خوایـەو کاربەدەسـتە ، و چـونکە شـایەتی بۆ دان و پشتی گرتن ! باوەڕنـەکردنی خـەڵکی پێیـان هـیچ زیانێکیـان پێ ناگەیەنێت ، و ڕەخنەگرتنیشیان بێ بنەمایە .

کاری گرنگی ئەوان لەناو قەومەکەدا ، ( البلاغ المبين )ە ، واتـە بـە ڕوونـی و ئاشکرا پەیامی خوا ڕادەگەیەنن .

کاری پێغەمبەران بریتی نی یە لەوەی کە بە زۆر ئیمان بە خەڵکی بهێنن لەناو دڵەکانیانـدا ، بـەڵکو کـاری سـەرەکی و هـەرە گـەورە و گـرنگ ، ڕاگەیانـدێکی ئاشکرای پەیامی خوایە .

ئـەو پەیامـە ڕادەگەیـەنن و ، بەڵگـەو داواکـاری خـوا لەسـەر ئـەوان جێبـەجێ دەکـەن ، تـا بـەبێ پـەیام و بەرنامـە جێنـەهێڵرێن ، پاشـا وازیـان لـێ دێـنن ، و قەومەکـەیش تـەنها لەسـەر یانـە ئیختیـاری خۆیـان دیـاری بکـەن ئـەویش بـە ئازادانەو ویست و هـەوڵ و توانـای خۆیـان ، یـان ئـەوەتا ڕێگـای باوەڕهێنـان بە پێغەمبەران هەڵدەبژێرن و شـوێنیان دەکـەون و سەرکەوتوو دەبن ، یـان ئـەوەتا ڕێگـای بێبـاوەڕی و بـە درۆ خسـتنەوەی ئـەوان هەڵدەبـژێرن و لـەناو دەچـن و سزای خوایان تووش دێت ، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خۆیان هەڵیان بژاردووە ، و دەبێت بەرگەی لێپرسراویش بگرن ، و ئەنجامەکەیشیان قبوڵ بێت .!

﴿ قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٨) قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ أَئِن ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ ( يس / ١٨ –١٩ ).

واتە : خەڵکەکە ووتیـان : ئێمـە بەڕاسـتی بـەهاتنتان توشـی نەگبـەتی بـووین ، سوێند بە خوا ئەگـەر وازنـەهێنن و کۆڵ نـەدەن ، بـەربارانتان دەکـەین و لەلایـەن ئێمەوە تووشی ئازارێکی بە ئێش دەبن ، پێغەمبـەرەکان وتیـان : ئێـوە نەگبـەتی و شومیتان لەگەڵ خۆتاندایە ( بە هۆی بێباوەڕیتانەوە )

ئایا ئەگـەر ئامۆژگـاریی و یـادەوەری بکـرێن ، ئـەوە دەبێتـە نەگبـەتی و شـووم بۆتـان ؟! نـەخێر وانیـە ، ئێـوە هـەر خۆتـان قـەوم و هـۆزێکی سـەرە ڕۆن ، و لـە گوماندا ڕۆچوون بۆیە شووم و نەگبەتی یەخەی گرتوون .

ئیسلام ڕەشبینی و بە شووم سەیرکردنی حەرام کردووە ، چونکە هەرچی خەیر و شەڕێك کە توشی ئینسان دێت ، بە هۆی کاروکردەوەکانی خۆیەوەتی ، و ئەگەر تووشیشی نەهات بە هۆی هۆکارێکەوە ، ئەوە تەنها لە خواوە بوە ، و دەستی هیچ کەسی تری تیا نی یە .

کاتێك هەر سێ پێغەمبەرەکە وتیان :- ﴿طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾ مانایەکی تریش هەڵدەگرێت ، کە هەڕەشە کردن بوو لێیان بە سزا ، وەك ئەوەی پێیان بڵێن :- ئەوەی ئێوە چاوەڕێی دەکەن لە سزاو لەناو چوون و فەوتان بە هۆی ئێمەوە نی یە ، بەڵکو بە هۆی خۆتانەوە یە کە لەسەر کوفر و بێباوەڕین .

ئەگەر ئەوەی چاوەڕێی دەکەن لە مەترسی و شەڕ ، و دەتانەوێت لایبەرن ، ئەوا لەسەرتان پێویستە کە بەنەفسی خۆتان بیگۆڕن ، و دەست لە بێباوەڕی یەکەتان هەڵبگرن .

ئەوە ماوەتەوە بڵێین کە ئەم شومی و ڕەش بینی یە تەنها پیشەی ئەم قەومەنە بووە بەرامبەر پێغەمبەران ، بەڵکو قەومی ( ثمود ) یش بەرامبەر بە ( صالح ) پێغەمبەر ( علیه السلام ) وتیان : ( کە ئەمە ماناکەیەتی ):- ( خەڵکەکە وتیان ) : ئێمە تووشی شووم و نەگبەتی بووین بە هۆی تۆ و ئەوانەی لەگەڵ تۆدان ، ( صالح ) (علیه السلام ) ووتی :- نەخێر وا نی یە ، نەگبەتی و شومتان لەلایەن خواوە بۆ دێت ( ئەگەر بەردەوام بن لەسەر یاخیبونتان ) بەڵکو ئێوە قەومێکن کە تاقی دەکرێنەوە .

قەومی فیرعەونیش بە مووسا ( علیه السلام ) یان ووت ، هەروەها کافرانی قوڕەیش بە پێغەمبەریان ووت :-

کە ئەمە مانەکەیەتی :- ( دوو ڕووە کان ئەگەر خەیریان بێتەڕێ دەڵێن : ئەمە لەلایەن خواوەیە و ، ئەگەر تووشی ناخۆشی و زیانێك بێن ( بە پێغەمبەر (ﷺ) ) دەڵێن :- ئەمەیان بە هۆی تۆوەیە ، پێیان بڵێ :- هەر هەمووی (هەرچی پێش دێت ) لەلایەن خواوەیە و ( بۆ تاقیکردنەوەیە ) ئەوە بۆچی ئەو خەڵکە (باوەڕ لاوازە ) هیچ شتێك تێناگەن و لەڕاستی یەکان حاڵی نابن ) ( النساء / ٧٨ ) .

ئینجا خەڵکی شارەکە چەکێکی کوشندەیان ئاراستەی پێغەمبەرەکان کرد و ، وا گومانیان برد کە زۆر کاریگەرە ، ئەوە بوو کاتێك ووتیان : ﴿ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا

لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ کافران بەم چەکەیان ئەوەی لە ناخیاندا بوو دەریانبڕی ، وزۆرداری و ناحەزی و ستەمی خۆیان ئاشکرا کرد ، شێوازێکی زۆر توند و ڕەق و ناشرینیان بەکارهێنا ، لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە هیدایەت دراوانە بە توندو تیژی و خراپەکاری و زۆرداری و سزادان مامەڵەیان کرد .

بە بوونی ئەوان زۆر ناڕەحەت دەبوون و بەرگەی ئەوەیان نەدەگرت بیان بینێت ، و ئەوەیان قبوڵ نەبوو لەگەڵیاندا بن ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بێتوانا و بێ دەستەلات بوون ، کە بە شێوەی ( منطق ) گفتوگۆی جوان و گونجاو ڕووبەڕویان ببنەوە . و بتوانن بەڵگەکانیان بە بەڵگەی شیاو بە تاڵ بکەنەوە ، و بیر و بۆچوون ڕووبەڕوی بیرو بۆچون ببنەوە ، چونکە ئەوان ( منطق ) بەڵگە و بۆچونیان لانە بوو تا پێی ڕوو بە ڕوو ببنەوە ، لەبەر ئەوە پەنایان برد بۆ چەکێکی سەرەتایی ئاژەلانە ، کە چەکی هەڕەشەو بەرد باران کردن و سزادان بوو .

قەومە بێبڕواکان هەمیشە ئەم چەکانەیان لە هەموو سەردەمێکدا بەکار هێناوە ، کافران دژی نوح و هود و صالح و ئیبراهیم و لوط و شوعەیب و موسا و پێغەمبەرانی تریان بەکارهێناوە .

ئەوان بەم چاکانە دەیان ویست دەنگی حەق و ڕاستی کپ بکەن ، و دەست بەسەر بانگەوازی خوادا بگرن و کۆتایی پێ بهێنن ، ئەی ئەنجامەکەی چی بوو؟

بەڕاستی بانگەوازەکە بەهێزو دامەزرا و و سەقامگیر بوو ، و فراوان بوو پێشکەوت و بلاوەی کرد ، لەگەڵ ئەوەی کە ناڕەحەتی و بەربەستی زۆری تووش هات و لەگەڵ ئەوەی هەڵگرانی ئازارو قوربانی یەکی زۆریان تووش هات ، چونکە بانگەوازی خوایی بە ناڕەحەتی و توندی نواندن بەرامبەری و تاقیکردنەوە زیاتر بە هێز دەبێت .

هیچ بانگەوازێك نەبوو ، مەگەر بە چەك و چەوساندنەوە و ئازاردان ڕوو بە ڕووی بونەتەوە ، و هیچ بانگخوازێك نەبووە مەگەر چەکی بەردباران کردن و ئازاردانی ڕوو بە ڕووکراوە تەوە ، و هیچ دوژمنێکی دین نەبووە کە وەکو ئەم قەومە مامەڵەی لەگەڵ بانگخوازاندا نەکردبێت .

بانگخوازان پەیڕەوی ئەم سێ پێغەمبەرە بەڕێزەیان کردوە ، و چۆن ئەو پێغەمبەرانە ڕوو بە ڕووی قەومەکانیان بونەتەوە .

- لە چیرۆکەکەدا ، دیمەنێکی تر دێتە پێش ، کەئەویش هاتنی پیاوێکی

باوەڕدارە لەو پەڕی شارەکەوە بەپەلە ، تاپشتیوانی لە پەیامی ئەو پێغەمبەرانە بکات و خەڵکی بانگەواز بکات بۆ شوێنکەوتنیان .

مامۆستا ( سید قطب )دەڵێت :- کاتێك دڵی ئەم پیاوە هەستی بە ڕاستی و حەقیقەتی ئیمان کرد ، ئەم ڕاستی یەلە ویژدانیدا جوڵاو نەیتوانی بەبێ دەنگی بمێنێتەوە ، و خۆی بە باوەڕەکەیەوە لە ماڵەکەیدا سجن نەکرد ، ئەو هەستی بە گومڕایی کرد لە دەورو بەری خۆیدا ، بەو حەقەی بۆی دەرکەوتبوو بە پەلە ڕۆیشت بۆ لای قەومەکەی ، کە ئەوان باوەڕیان بە پێغەمبەرەکان نەکردبوو ، و ئینکارییان دەکردو هەڕەشەیان لێدەکردن ، ئەو بەپەلە لەو پەڕی شارەکەوە هات بۆ ناو قەومەکەی بۆ لای حەق و ڕاستی ، و دەستیان لە خراپە و لادان پێ هەڵگرێت و ، بەرەنگاری دوژمنە خراپەکارەکان بکات ، کە نزیکە بدەن بەسەر پێغەمبەرەکاندا وا دیارە کە ئەم پیاوە کەسێکی ناودار و خاوەن دەسەڵات نەبووە ، و لەلایەن قەومەکەیەوە پشتگیری نەکراوە یان لەلایەنعەشیرەتەکەوەقەدەغەی لێکراوە ، بەڵام ئەو عەقیدەو بیرو باوەڕە زیندووەی کەلە ویژدانیدا بوو پاڵی پێوە دەنێت و بە پەلە لەو پەڕی شارەوە دەیهێنێت .[1]

﴿ وَجَاء مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ (٢٠) اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ( يس / ٢٠- ٢١ ) .

زانا ( فخر الرازی ) دەربارەی ئەم ئایەتانە ( کە ئەمە کورتەی ماناکەیەتی ) دەڵێت :- لە ئایەتی ﴿وَجَاء مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾ ( يس / ٢٠ ).چەند شتێکی تیا دەردەکەوێت :-

یەکەم : دەرخستنی بوون وکاری ئەو پێغەمبەرانەیە کە هاتوون بۆ ڕوون و ئاشکرا گەیاندنی پەیامی خوا ، بە جۆرێك ئەو پیاوەی بەپەلە هات باوەڕی پێهێنان ، و لەسە (مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ ) دەڵێت : دەربڕینێکی ناوازەو جوانی

١/ ( مع قصص السابقين فى القرآن ) ( ٦٨٥ - ٦٩١ ) به كورتى .

تیایە ، چونکە کاتێك لەو پەڕی شارەکەوە هات ، ئەو باوەڕی هێنابوو ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاگادارکردنەوەو دەرخستنی کاری ئەو پێغەمبەرانە گەیشتبویە ئەو پەڕی شارەکە .

*دووەم :* هێنانەوەی نموونە لەوەی کە ڕوویدا ، دڵ دانەوەو دڵنەوایی کردن بوو بۆمحمد (ﷺ) کە پاش تەواو بوونی باسی پێغەمبەران ، باسی ئەو پیاوە باوەڕدارە هات کە باوەڕی بە پێغەمبەران کرد و ئارامی گرت لەسەر ئازاردان ، تا گەیشت بە باشترین پاداشت .

- لە تەفسیری ئایەتەکانیشدا چەند مەسەلەیەك هەیە .

*مەسەلەی یەکەم :* ئایەتی : ﴿وَجَاء مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ﴾ پیاوەکە نەناسێنراوە ، لەگەڵ ئەوەی کە لە لای خوا زانراوو ناسراو بووە ، ئەمەش دوو سودی تیایە :-

یەکەم : بەگەورە نیشاندانی کار ئەو پیاوە بووە , واتە: پیاوێك بووە بەوپەڕی سیفەتی پیاوەتیەوە .

دووەم :- بەسود بووە بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی حەق و ڕاستی کەلەلای پێغەمبەر بووە , بەجۆرێك کە پیاوێك باوەڕ دەهێنێت و ئەوان نەیان ناسیوە , وئیتر ناوترێت : پەنایان بۆ بردووە .

*مەسەلەی دووەم :* وشەی ( يَسْعَى ) بەرچاوڕونی و هیدایەتە بۆ باوەڕداران , بۆ ئەوەی لە ئامۆژگاری کردندا تواناکانی خۆیان بەگەڕبخەن .

ئایەتی ﴿ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾ مانای زۆر جوانی تێدایە :-

یەکەم :- لەووشەی ﴿ يَا قَوْمِ ﴾ دا , ئەم پیاوە هەوڵی ئەوە دەدات کە زۆر بەسۆزو شەفەقەتە بۆ قەومەکەی , کاتێك قەومەکەی پاڵ دەدات پاڵ خۆی , ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە تەنها خێر و خۆشی ئەوانی دەوێت , ئەمەش قسەی باوەڕدارەکەی قەومی فیرعەون بوو. ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا ﴾ ئەی قەومەکەم شوێنم بکەون . ئەگەر ووترا : ئەم پیاوە ووتی : ﴿ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾ وئەویش ووتی : ( إتّبعونِ ) , جیاوازی نێوانیان چی یە ؟ دەڵێین :- ئەم پیاوە هات بۆ لایان و لەیەکەم هاتنیدا ئامۆژگاری کردن , کەئەوان ژیانیان نەبینیبوو ونەزانیبوو . ووتی شوێن ئەو کۆمەڵە پێغەمبەرە بکەون کەبەڵگەیان بۆ ئێوە دەرخست و ئاشکرا کرد , وەڕێگاکەیان بۆ ڕوون کردەوە , بەڵام باوەڕدارەکەی

قەومی فیرعەون , هەر لەناو خۆیاندابوو , وەشوێن کەوتووی موسا بوو , وەچەند جارێك ئامۆژگار کردبوون , وتی :- شوێن من بکەون لەباوەڕهێنان بە موسا و هاروون ( علیهما السلام ) وبزانن ئەگەر خەیرو چاکە نەبوایە من بۆ خۆمم هەڵنە دەبژارد , ئێوە باش دەزانن من خۆم هەڵم بژاردووە , بۆ ئەو پیاوەنەبوو کەبە پەلە لەو پەڕی شارەوە هات بڵێت :- ئێوە دەزانن شوێنکەوتوانی من لەوانن .

دووەم :- دەرخستنی ئامۆژگاریەکەو دەرخستنی ئیمانی خۆی پێکەوە کۆکردەوە ﴿ اتَّبِعُوا ﴾ ئامۆژگاری بوو , و ﴿ الْمُرْسَلِينَ ﴾ دەرخستنی ئەوە بووە ,کە ئەو باوەڕی هێناوە .

سێیەم :- دەرخستنی ئامۆژگایەکەی بەسەر دەرخستنی باوەڕهێنانی خۆیدا پێش خست , چونکە ئەو بەپەلە هەنگاوی نا بۆ ئامۆگاری کردنەکە , بەڵام بۆ ئیمانەکە , ئەو پێشتر بەڕاستی ئیمانی هێنابوو . وئایەتی

﴿ رَجُلٌ يَسْعَى ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شارەزابووە لە ئامۆژگاریکرندا.

پاشان خوای گەورە فەرمووی :- ﴿ اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ ( یس / ٢١ ) . ئەمەش لەو پەڕی جوانیدایە , ژونکە کاتێك ئەو ووتی :- ﴿ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾ وەك ئەوەی قەدەغەیان کردبێت بوونی ئەوان پێغەمبەر بێت , پاشان پلەیەك دابەزی و ووتی : بێگومان خەڵکی لە دونیادا ڕێگەیەك دەگرنە بەر , داوای بەردەوامیش دەکەن , ئەگەر ڕێگاکە دەرکەوت , ئەوا بەڵگەی تێدایە لەسەر پێویستی شوێن کەوتنی , قەدەغەکردنی ئەم شوێنکەوتنەیش جوان نابێت تەنها لە دوو حاڵەت دا نەبێت : یان ئەوەتا ڕێگە نیشان دەرەکە داوای کرێ دەکات , یان ئەوەتا , هۆکاری پشت پێبەستن نی یە بۆ هیدایەت دانی و دۆزینەوەی ڕێگاکە. بەڵام ئەو پێغەمبەرانە داوای کرێ

ناکەن , و هەروەها هیدایەت دراوو زانا و شارەزان بەرێگا ڕاستەکە کە دەگات بە حەق و ڕاستی , وای دابنیٚ کە ئەوان پێغەمبەری هیدایەت دراو نین , ئەی ئایا هیدایەتدەر نین ؟ کەواتە شوێنیان کەون .[1]

﴿ وَمَا لِي لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢٢) أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَن بِضُرٍّ لاَّ تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلاَ يُنقِذُونِ (٢٣) ﴾ ( یس / ٢٢-٢٣ ) .

دکتۆر ( محمد منیر الجنباز ) دەڵێت :- واتە: ئەو پێغەمبەرانە ئێوە بانگەواز دەکەن بۆ باوەڕهێنان بە بەدیهێنەرەکەتان , ئایا ئەمە عەیبە ؟ بێگومان ئەوان بانگەوازی ئێوە بۆ لای هیچ شتێکی تر ناکەن , بانگەوازتان دەکەن بۆ لای بەدیهێنەرتان , ئایا ئەم بانگەوازە نەشیاوو نادرووستە ؟ ئەگەر بەدیهێنەرەکەتان ناپەرستن ئەی کەواتە کێ دەپەرستن ؟ بانگەوازەکە ڕوون و ئاشکرایە و هیچ کەم و کورتی یەکی تیانی یە و بانگەوازە بۆ پەرستنی خوای گەورە و دان نان بە توانا و تاك بوونی خوادا , ومن هیچ ڕێگرێك لەبەر دەمم دا نیە ئەو کەسە بپەرستم کەلە نەبوونەوە بەدیهێناوم , بەڵکو ئەوە ئەرکی سەر شانمە , چونکە گەڕانەوەم هەر بۆ لای خوایەو هەر ئەو پاداشتی خەیر و سزای شەڕو خراپەکاری دەدات , پاشان بەندایەتی خوازراوی بۆ ڕون کردنەوە , و ووتی : ئەگەر من ڕوم لەغەیری بەدیهێنەرەکەم بکەم , ئەوا کێ لەدەسەلاتی خوا ڕزگارم دەکات ئەگەر ویستم زیانێك بگەیەنم ؟ ئەمە داوامان لێدەکات کەبیربکەینەوە تاکەسێکی باوەڕداربین بە خوا . ئایا ڕەوایە لەجیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نی یە , خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت توشی ناخۆشیەکم بکات , تکاو پاڕانەوەی ئەو

١/ بەکورتی لە ( التفسیر الکبیر ) ( ١٣/ ٢٦ / ٤٨/ ٤٩ )

پەرستراوانە هیچ سودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و ڕزگارم ناکەن. ﴿ إِنِّي آمَنتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ (٢٥) قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴾ ( يس / ٢٥-٢٧) .

بەو جۆرە ئەم پیاوە ئیمانی خۆی ڕاگەیاند و ئاشکرای کرد , ووتی من باوەڕم بەپەروەردگار و بەدیهێنەری ئێوە هێناوە تابەم کارە بێتە پێشەنگ و ئەوانیش لەسەر ئەم ڕێگایە شوێنی بکەون , بەڕاستی ئەم پیاوە واجبی بانگەوازەکەی جێبەجێ کرد و پاداشتێکی گەورەی دەستکەوت لەسەر هیدایەتدانی ئەوان و ڕزگارکردنیان لەو گومڕایی یە , بەڵام قەومەکە زۆریاخی و بەد خۆو بوون و ئامۆژگاری کاری تێنەدەکردن , وهەموو ئەم قسانەیان لەپشتیانەوە دانا, ئینجا بە پیاوە باوەڕدارەکەیان ووت :- ئەگەر تۆ باوەڕت بەوە هەیە کە خۆت دەیڵێیت , ئەوا بەتەنها بچۆ بۆ بەهەشت . ﴿ قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ﴾ ( يس /٢٦ )

زانایانی تەفسیر هەڵوێستەیەکیان لەبەر دەم ئەم قسەیەدا کردووە و , هەندێکیان بۆ ئەوە چون کە فریشتەکان هاتوون ئەم پیاوەیان بردووە و خستویانەتە ناو بەهەشتەوە , وەبەڕاستی لەوێدا دەژی .

وەهەندێکیشیان بۆ ئەوە چون کەهێشتا نەچۆتە بەهەشتەوە بەڕاستی , چونکە باوەڕداران دوای زیندووکردنەوەومحاسەبە دەچنە بەهەشتەوە , و دەڵێن تەنها ئەمە دەربڕینێك بووە , کە ئەم پیاوە بەهۆی ئیمانەکەیەوە هەقی خۆیەتی بچێتە بەهەشتەوە , وەمژدە پێدانی بەم کارە بۆ ئەوە بووە زوو بگاتە ئەم مژدەیە .[1]

بەڕاستی هەرکەس لایەنی حەق هەڵبژێرێت و پشتیوانی لەدینی خواو سەربازەکانی بکات , وپابەندبێت بە بانگەوازی خواوە , وڕوو بەڕووی دوژمنانی خوا ببێتەوە , وبێگومان بەو کارانە دەچێتە بەهەشتەوە , و مافی

١/ ( تفسير القرطبي ) ( ١٥:١٩) .

ڕاستی خۆیەتی کەبچێتە ئەو نازونیعمەتەوە , ومژدەی پێ بدرێت لەگەڵ ئەوەی کە قەومەکە ئازاریان دابوو , بەڵام ئەم ئاوات و خۆزگەی خواست کە قەومەکەی بزانن ئەم بەچ پاداشتێك گەیشتوە تائەوانیش باوەڕبهێنن و بگەنە ئەو نازونیعمەتەی بەهەشت , بەڵام بێ بەش دەبن و دووردەبن لەڕەحمەتی خوایی , ئەو کەسانەی کە باوەڕبەپێغەمبەران ناکەن و باوەڕداران دەکوژن , و دڵەکانیان بەژەنگی گوناهوتاوان داپۆشراوە , وهیدایەت نادرێن بۆ حەق و ڕاستی , بەڵکو ئەوان بەو کارەیان , شیاوی سزای خوایی دەبن .

﴿ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِن بَعْدِهِ مِنْ جُندٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ (٢٨) إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ ﴾ ( یس / ٢٨ -٢٩ )

خەڵکەکە بانگەوازەکەیان ڕەت کردەوە و باوەڕیان بەپێغەمبەرەکەیان نەکرد و ئازاریان دان ,و ئەو پیاوە شیان چەوساندەوە کە باوەڕی هێنابوو .

بەهۆی ئەو تاوانەوە کە ئەنجامیاندابوو سزاو تۆڵەی خوایی دەستی پێکرد بۆیان , بەخێرایی بۆیان هات , خوای گەورە هیچ لەشکرێکی لە مەلائیکە لە ئاسمانەوە بۆ لەناوبردنیان نەنارد بەڵکو تەنها یەك دەنگی گەورە و شریقەیەك بوو ئەوانی گرت . ئینجا دەست بەجێ هەموویان خامۆش بوون و مردن , هەروەکو ئاگر کەپاش کوژانەوە خامۆش دەبێت و دادەمرکێتەوە , پاش ئەوەی کەسەر زەویان پڕکردبوو لە چالاکی و جموجوڵی خۆیان و کوفرو فەسادیان بڵاوکردەوە بوونە جەستەی بێ جوڵەو کەوتو بەنسبەت خەڵکی ئەم شارەوە .

زانای تەفسیر ( الزمخشری ) هەڵوێستە دەکات حیکمەتی ئەوە ڕون دەکاتەوە کەخوای گەورە فریشتەی بۆ لەناوبردنی ئەم قەومە لەئاسمانەوە دانە بەزاند , بەڵکو بەدەنگێکی گەورە لەناوی بردن , ئەمە لەکاتێکدا کە خوای گەورە لە ڕۆژی بەدرو خەندەقدا بۆ پشتیوانی پێغەمبەر ( ﷺ) فریشتەی دابەزاندوو کافرانی قوریش و دەستەو تاقمی ئەوانی پێ لەناو برد .

هەرخۆی ئەمە ڕون دەکاتەوە و دەڵێت:- ( خوای گەورە لەناوبردنی هەر قەومێك لەسەر شێوەیەکی جیاواز بەڕێوە دەبات , هیچیان لە هیچیان ناچێت , ئەمەش تەنها بە پێی حیکمەتی خۆی بڕیاری داوەو , خۆی بەو شێوەیە پێویستی کردوە , ئایا نەتڕوانیوە بۆ ئەم ئایەتە کەدەفەرموێت :- ﴿بِذَنبِهِ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ

الأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ﴾ ( العنكبوت / ٤٠ ) .

واتە:– ( هەیان بوو بەردبارانمان کرن , هەیان بوو دەنگ و سەدای بەهێز لەناوی بردن , هەیان بوو بەناخی زەویدا بردماننە خوارەوە , وەهەشیان بوو نوقمی دەریامان کرد ) .[1]

کەی ئەم سزایەی خوایان پێ گەیشت ؟ و دەنگە گەورەکە گرتنی ؟ بێگومان پاش ئەوە ی باوەڕیان بە پێغەمبەر نەکردوو ئازاریان دان , ئەوان بەم کارە ئەنجامی کارەکانی خۆیانیان کۆکردەوە , و بەروو بوومی کاری لەسنور دەرچونی خۆیان کۆکردەوە .

ئەمە سونەتی خوابوو بۆ لەناوبردنی قەومە بێبڕواکان , بە جۆرێك بەهۆی لادان و سەرکەشی و بێباوەڕییانەوە دەیانگرێت . خوای گەورە چیرۆکەکە بەچەند ئایەتێك کۆتای دێنێت : دەفەرمووێت :– ﴿ يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُون (٣٠) أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنْ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لاَ يَرْجِعُونَ (٣١) وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾ ( يس / ٣٠– ٣٢ ) .

مامۆستا( سید قطب ) دەڵێت :– ( الحسرة ) : پەشیمانی و داخ هەڵکێشان هەڵچونێکی دەرونیە لەسەر حاڵە تێکی خەفەتاوی , کەهیچ شتێك لەو کاتە دا سود بە ئینسان ناگەیەنێت , تەنها ئەوەنەبێت مەگەر هەر حەسرەت هەڵبکێشێت و نەفسی ئازار بکێشێت . خوای گەورە داخ و حەسرەت بۆ بەندەکانی هەڵناکێشێت بەڵکو دان دەنێت بەوە دا کەئەوە حاڵی بەندەکانە کەشیاوی حەسرەت لەسەر هەڵکێشان بوون ! بەڕاستی حاڵی خەفەتاویە, بەشەڕو تاقیکردنەوەی ناڕەحەت کۆتای بەخاوەنەکانی دەهێنێت !

﴿ يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ ﴾ : مۆڵەتی ڕزگاربوونیان پێدەدات بەڵام پشتی لێ هەڵدەکەن , وەشوێنی لەناوچوان لەبەر چاویان بوو کە پێش خۆیان لەناو چوو

---

١/ ( الكشاف ) ( ٣/ ٣٢٠ ) بەکورتی و دەستکاریەوە .

بوون , نەبیری لێدەکەنەوە و نە سودی لێوەر دەگرن , خوای گەورە بەناردنی ئەو پێغەمبەرانە دەرگای ڕەحمەتیان لیّ دەکاتەوە سات لەدوای سات , بەلاّم ئەوان لەو دەرگای ڕەحمەتە جیا دەبنەوە و ئەدەبی ناشیرین بەرامبەر خوا دەردەبڕن .[١]

بێگومان کافران لەوەی کەپێش خۆیان ڕویداوە دەرس و پەند وەرناگرن , وەلەڕووداوەکانی مێژوویش ئامۆژگاری وەرناگرن , وەبەسادەو ساویلکەیی مامەڵە لەگەڵ بانگخوازانی دڵسۆز و چاکەکاردا دەکەن , وستەمیان لیّ دەکەن و ئازاریان دەدەن و دەیان کوژن , وەسونەتی خوایش لەسەر ئەوان بەدی دێت و لەناویان دەبات . باوەڕ نەکردنی کافران بەحەق و ڕاستی و هەڵگرانی ؟ ئەمە سونەتێکی هەمیشەییە , وەگاڵتە جاڕییان بەدۆستانی خواو دژایەتی کردنیان , ئەمەیش هەرسونەتێکی هەمیشەییە بەلاّم خوای گەورە پشتیوانی لە دۆستانی خۆی کردووە و ڕزگاری کردوون , ئەمەیش سونەتی خوایە , وەلەناو بردنی کافرانیش سونەتێکی ڕەبانیە .

﴿ پەندوو وانە گرنگەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- زانای تەفسیر ( القرطبي) دەڵێت :- لەئایەتی ﴿ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴾ ( يس / ٢٦-٢٧ ) .

لەوخۆزگەی دەری بڕی دووبۆچون هەیە :-

یەکەم : ئاوات و خۆزگەی خواست کە بەحاڵی بزانن , بۆ ئەوەی بزانن کە ئەو گەیشتووە بەچی و وەپاشەڕۆژێکی باشی هەیە .

دووەم : ئەو ئاوات و خۆزگەی بۆ ئەوە خواست کە ئەوانیش وەك ئەو باوەڕبهێنن , تا حاڵیان وەکو ئەوی لێبێت,

---

١/ ( الظلال ) ( ٥ - ٢٩٦٦- ٢٩٦٧ ).

( ابن عباس ) دەڵێت : قەومەکەی بەزیندوو مردووەوە ئامۆژگاری کرد . ولەم ئایەتـەدا ئاگادارکردنەوەیـەکی گـەورەو گـرنگ هەیـە , بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کەواجبـە ڕق و هەڵچـوونی نـاو دەروون بخورێتـەوەو دەرنـەبڕێت , و بـەئارام و لەسـەرخۆبێت بەرامبـەر نەزانـەکان , و زۆرنـەرم بێت بەرامبـەر ئەوکەسانەی کـە نەفسـی خۆیـان بردۆتـە نـاو توونـدوتیـژی و کەسـانی لادەر , و زوو ڕاپـەڕێت بـۆ ڕزگارکردنی , وزۆربەسۆزو میهرەبان بێت بۆ ڕێنمـایی کردنـی بـۆ ڕێگـای ڕاسـت و سەرقاڵ بکات پێوەی , وبەو جۆرە لەئەنجامدانی خراپە بیگێڕێتەوە و دوعـای بۆ بکـات , ئایـا بینیت چۆن ئاواتی خواست بەخـەیر بـەهۆی کوشتنەکەیەوە و خراپەکاران لە نەخشەی خراپدا بوون بۆی , کە کافران و بت پەرستان بوون .[1]

٢- زانـای تەفسیر ( الـرازي ) دەڵـێت : لەئایـەتی :- ﴿ وَمَا لِي لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ( يس/ ٢٢ )

خـوای گـەورە کاتێـك فـەرمووی :- ﴿ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ چـۆنێتی هیدایەتدانەکەیانی ڕوونکردەوە , بەوەی کە بانگەوازی ئەوانی کرد لەپەرستنی شتی بێگانـەوە , بۆ پەرستنی خوایـەکی هەمیشـە زینـدوو بەدەسـتەڵات بەسـەر هەموو شتێکدا , و لە پەرستنی شتێکەوە کە سود بـە بەنـدەکان ناگەیـەنێت ,بۆ پەرستنی ئەوەی کە هـەموو سودوچاکەیەکی تیایە , هـەروەها ( لطیفة ) یـەکی تیایـە : لەئایـەتی ﴿ مَالِيَ ﴾ واتـە : هـیچ بەربەسـت و ڕێگرێـك لـە دەوروبـەری منـدانی یـە , ئامـاژەیـە بۆئـەوەی کـە فەرمانەکـە لەلایـەن پەرسـتراوەوە دیـارو ئاشکرایە و هیچ شاراوەو نهێنـی یـەکی تیـانی یـە , هەرکـەس لـە پەرستنی ئـەو قەدەغـە بکرێـت , ئـەوا لـە دەوروبەریـدا ڕێگرێـك هەیـە , بـەڵام هـیچ ڕێگرێـك لـە دەوری مـن نـی یـە , هـیچ تاوانێـك نـی یـە پەرسـتومە , ولـە حاڵـەتی لادانـی

---

١ / بەکورتی لە ( الجامع لاحكام القران ) ( ٦/ ٥٤٦٤ ) بەدەستکاری یەوە .

گفتوگۆکردن لەگەڵ قەومەکەدا بۆ حاڵەتی نەفسی خۆی حیکمەتێکی تر هەیە ، بریتی یە لە : ئەگەر ئەو بیوتایە : ﴿مالکم لاتعبدونَ الَّذي فَطَرَنِي﴾ ئەوا لەڕوونکردنە وەکەدا ووشەی ﴿ مَالِيَ ﴾ نەدەبوو ، چونکە کاتێك ئەمەی ووت ، هیچ کەسێك حاڵەتی نەفسی ئەوی لاشاراوەنابێت ، و هەموو کەس دەزانێت کەداوای هیچ هۆکارێك و ڕوونکردنەوەی لە هیچ کەس ناکات ، چونکە خۆی شارەزاترە بەحاڵی نەفسی خۆی . ئەو نەبوونی ڕێگرەکان ڕووندەکاتەوە ، ئەگەر بیوتایە :- ( مالکم ) ئەوا ڕێگاپێدراوبوو لەوەوە تێگەیشتن هەبوایە کە ئەو داوای ڕونکردنەوەی هۆکارێك دەکات لەبەرئەوەی خۆی بەنەفسی خۆی شارەزاترە ، ئەگەر ووترا :- خوای گەورە فەرموویەتی :-

﴿ مَّا لَكُمْ لا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴾ ( نوح / ١٣ ) ئەوا دەڵێین : لێرەدا قسەکەرەکە بانگ کراونی یە ، بەڵکو ئەو کەسەیە کە بانگەوازی کردوە ، ئەوەتا پیاوێك بانگ کراوە بۆ ئیمان ووتی :-﴿ وَمَا لِي لاَ أَعْبُدُ الَّذِي ﴾ بەڕاستی داوای ئەوەی لەمن کرد .

دووەم :- ئایەتی :- ( الذي فطرني ) ئاماژەیە بۆ بوونی شتێك کە پێویستە ، ئایەتی ( ومَالِيَ ) ئاماژەبوو بۆ نەبوونی ڕێگر ، ئایەتی ( الذي فطرني ) هەواڵی شتێك دەدات کە پێویستە ، بێگومان خوای بەدیهێنەر لەسەرەتاوە خاوەنی هەموو شتێك بووە ، کە لەلایەن ئەو شتانەی کە ئەو خاوەنداری کردوە پێویستە ڕێزی لێبگیرێت و بەگەورە تەماشا بکرێت .

سێیەم :- ڕوونکردنەوەی نەبوونی ڕێگرەکە بەسەر ڕونکردنەوەی بوونی شتە پێویستەکەدا پێش کەوت ، لەگەڵ ئەوەی کەوا جوانتر بوو پێویستە کە پێش بکەوتایە ، کاتێك کە پێویست هەبوو ڕێگر نی یە ، دەبینرێت کە پێویست لە دەرکەوتنیدا پێویستی بە ڕوونکردنەوە نی یە ، لەوە کەمتر نی یە پێش بخرێت ئەوەی کە لە پێشترە بەڕوونکردنەوە لەبەر پێویست بوونی .

چوارەم :- لەنیشانەکان ، بەدیهێنانی نەفسی خۆیی هەڵبژارد، چونکە کاتێك ووتی :- ( ومالِيَ لا أعبُدَ ) بەوەی کەپەرستنەکەی گێڕایەوە بۆ لای خۆی ، ئەوەی کە نزیکتر بوو لەپێویست بوونی عیبادەتەوە لەسەرخۆی ،

ئـەوەی هەڵبـژارد , ڕوونکردنـەوەی ئـەوەش بریتـی یـە لـەوەی کـە ئـەو بەدیهێنـەری عومـەرە , پێویسـتە زەیـدیش عیبـادەتی بکـات , چـونکە ئـەو کەسەی ( عمر ) ی بەدیهێناوە خاوەنی سیفەتی قودرەتی تـەواوە , هـەموو زانستێکی لایە , بوونی تـەواوی هەیە و هیچ گومانێکی تیا نـی یـە , ئەو شـیاوی پەرسـتنە بـۆ هـەموو کەسـێك کـە تـەکلیفی لەسـەرە , بـەڵکو بەدروستکردن و بەدیهێنانی ( زید ) ئەوا عیبادەتکردن لەسەری بە ئاشکرا پێویستترە . ئایەتی :- ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئاماژە دەدات بەترس و ئومێد , هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی :-

﴿ وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾ ( الأعراف / ٥٦ ) .واتە : ( بەردەوام هانا و هـاوار بـۆ خوابـەرن لەترسـی سـزای دۆزەخ و بـە ئومێـدی بەدەسـتهێنانی بەهەشت ) چونکە هەرکەس شوێنی گەڕانەوەی هەبێت , لێی دەترسێت و هیوایشی پێیەتی , هەروەها مانایەکی جوانیشی تیایە کە بریتی یەلە : زۆر جار باسمان کردوەکە بەندەکان بەسەر سێ جۆردا دابەش بووە :-

یەکەم :- بەندەیەك خوا دەپەرستێت لەبەر ئەوەی خوایەو خاوەنی هەموو شتێکە , وەك یەکە ئیتر نیعمەتی دوای ئەمەی پێدرا بێت یان پێی نەدرابێت , وەك ئەو خزمەتکارەی کە خزمەتی گەورەکەی خۆی دەکات و پێویستە لەسەری , وەك یەکە ئیتر چاك بێت لەگەڵی یان خراپ .

دووەم :- بەندە لەبەر ئەو نیعمەتەی پێی گەیشتووە خوا دەپەرستێت .

سێ یەم : بەندەیەك لەترسدا خوا دەپەرستێت .[١]

---

١ / ( التفسير الكبير ) ( ١٣ / ٢٦ / ٤٩ - ٥٠ ) بەکورتی و دەستکاریەوە .

﴿ چیرۆکی باوەڕدارەکەی قەومی فیرعەون ﴾

خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الأَرْضِ الْفَسَادَ (٢٦) وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لاَّ يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ (٢٧) وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ (٢٨) يَا قَوْمِ لَكُمُ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ظَاهِرِينَ فِي الأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِن بَأْسِ اللَّهِ إِنْ جَاءنَا قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلاَّ مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلاَّ سَبِيلَ الرَّشَادِ (٢٩) وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ الأَحْزَابِ (٣٠) مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ (٣١) وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ (٣٢) يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ (٣٣) وَلَقَدْ جَاءكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءكُم بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولاً كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ (٣٤) الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ (٣٥) وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ (٣٦) أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلاَّ فِي تَبَابٍ (٣٧) وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ (٣٨) يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ (٣٩) مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلا يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ (٤٠) وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ (٤١) تَدْعُونَنِي لأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ (٤٢) لا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلا فِي الآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ (٤٣) فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (٤٤) فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ (٤٥) النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ ﴾ ( غافر / ٢٦ – ٤٦ ) .

**پێش دەسپێکی چیرۆکەکە :-**

ململانێی نێوان ئیمان و کوفر چیرۆکێکە , کەسەکانی لە ستەمکاران و کافران و باوەڕداران جیاوازن , بەلاَم ململانێ یەکە یەك شتە , بەڵگەی باوەڕداران لەسەر باوەڕەکەیان یەك شتە و , گومان و تۆمەتی یاخی بوان و زۆردارانیش هەریەك شتە , هەروەها کۆتایی یەکەشی یەکە , ناحەق دەپسێت و دەکەوێت , بەهەموو هۆکارەکانی کە لەسەر زەویدا بەدەستی گرتبوو وای دەزانی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە , بەلاَم کاتێك ڕوو بەڕووی حەق وڕاستی دەبوویەوە , کە حەق پشتی بەهێزی خوا بەستبوو , پاشەڕۆژی چاك وپەسەند بۆ پارێزکاران دەبوو ,و لەناوچون و سزایش بۆ یاخی بوان و لووتبەرزان دەبوو .ئەوکەسەی لەم چیرۆکەدا لەگەڵ ئێمەدایە , یەکێك نی یە لە پێغەمبەران , بەڵکو باوەڕدارێکی ڕاستگۆیە , وبەڵگەکانی بەهێزن , بەحیکمەت بانگەوازدەکات بۆلای خوا , وئامۆژگاری و نمونەی جوان پێشکەش دەکات . بەو شێوازەی کە ئیمانەکەی دەشارێتەوە , دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی ئامۆژگاری و قسەکانی لەکاتێکی زۆربەسود دا وەردەگیرێت , و بانگەوازەکەیشی وەردەگیرێت , ئینجا ئیمانەکەی خۆی ئاشکرا دەکات لەکاتێك کە ناکۆکی و بەربەرەکانی و جیاوازی لەنێوان یاخی بوونی ئەوکاتەی فیرعەون و پێغەمبەری خوا موسادا توونـد دەبێت :- ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الأَرْضِ الْفَسَادَ ﴾(عافر ٢٦)

واتە : ( فیرعەون ووتی : وازم لێبهێنن باموسا بکوژم , باهەر هاوار لەپەروەردگاری بکات , چونکە بەڕاستی من دەترسم , کەدین و ئاینتان بگۆڕێت , یاخود دوبەرەکی و خراپە و شەڕو شۆڕ لە وولاَت و سەرزەویدا بەرپابکات !! ) .

موسا ( علیه السلام ) خۆی پاراست بەخوای گەورە , کە باوەڕدارانیش خۆیان هەر بەو دەپارێزن , و پارێزگارانیش متمانەیان پێیەتی , ئینجا موسا ووتی :-

﴿ وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لاَّ يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴾ ( غافر / ٢٧ ) .

واتە : ( موسایش ووتی : بێگومان من پەنادەگرم بەپەروەردگاری خۆم کە

پەروەردگاری ئێوەیشە لەهەموو لوتبەرزو خۆبەزلزانێك , باوەڕی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نەبێت , ( ڕاستی یەکان ئاوەژووبکات ) ) .

ئەو باوەڕدارە لە تێروانینەکانیدا بەقسەی جوان و بەهێزو بەڵگەی یەکلایی کەرەوە پێشەوایەتی ئەوان دەکات , سەرەتا ئینکاری ئەوەدەکات چۆن کەسێك دەکوژن کەبڵێت : ( الله ) پەروەردگارمە هیچ بەرژەوەندی یەك لەمەدانی یە , چونکە ئەگەر درۆزن بێت , ئەوە تۆڵە لێسەندنی لەسەر خوایە , وئەوەی بەسە , ئەگەر ڕاستگۆیش بێت , ئەوا سزای ئەوان دەدات , پاشان هەواڵی پێدان بەوەی کە دژایەتی کردنی دۆستەکانی خوای گەورە لە گەورەترین هۆکارەکانی تیاچوونی نەتەوە جیاجیاکانە , ونەمانی دەسەڵات و حوکمیانە , پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی نەتەوە بێباوەڕەکانی قەومی ( عادو ثمود ) و ئەوانی دوای ئەوان , هەروەها پێغەمبەر یوسفی بیرهێنانەوە , کە لەگەڵ دەورو بەرەکەیدا حاڵی چۆن بوو چی بەسەرهێنرا , پاشان بەراوردی کرد لەنێوان بانگەوازی خۆی لەسەر ئەوان و بانگەوازی نەتەوەکانی پێشوو , هەروەك چۆن بانگەوازکردنی بۆلای خوا , بانگەوازە بۆڕزگاربوون و بەختەوەری هەتاهەتایی , وبانگەوازی ئەوانیش بۆکوفرو بێباوەڕی و هاوەڵدانان , بانگەوازە بۆ ئاگری دۆزەخ , پاشان کاری خۆی دەداتە دەست خوا گومانی تیانیە کە ئەوان نەخشەیان بۆ داڕشت و فێڵیان لێکرد , و عاقیبەت وەك خوای گەورە فەرموویەتی بۆ پارێزکارانە بەختی ئەو باش بوو , کە لە نەخشە و فێڵی دنیاو سزای قیامەت ڕزگاری بوو , بەختەوەری دنیاو قیامەتی دەستکەوت , بەڵام عاقیبەت و چارەنوسی فیرعەون و کەس وکارو دەستەودائیرەکەی تیاچوون بوو بەنوقم بوون لەدەریادا , و ڕۆحەکانیان چووە ئاگرەوە لەگۆڕەکانیاندا , ئەوە تابەرپابوونی قیامەت بەردەوام دەبێت , پاشان خوای گەورە فەرمان دەدات بە بە هێزترین سزابۆیان , وپەنادەگرین بەخوا لەهۆکارەکانی زیانمەندی و سەرشۆڕی .

* دێینە سەر ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکە لە ڕوانگەی ئایەتە قورئانی یەکانەوە:-

– خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الأَرْضِ الْفَسَادَ ﴾ ( عافر / ٢٦ ) .

چیرۆکی باوەڕدارەکەی قەومی فیرعەون , چیرۆکێکی سەربەخۆنیە , بەڵکو بەشێکەی لەچیرۆکی موسا ( علیه السلام ) لەگەڵ فیرعەوندا , کە لە چەند سورەتێکی قورئاندا هاتووە .

بەلاّم چیرۆکی ئەم پیاوە باوەڕدارە تەنها لەسورەتی ( غافر ) دا هاتووە . ئەم سورەتیش دوونـاوی هەیـە , ئـەوانیش : ( غافر ) و ( مؤمن ) . سورەتەکە بەشێکی زۆری چیرۆکەکەی باس نەکردوەکە چۆن موسا لە ( مدین ) ەوە دێت و دەچێت بۆ کێوی ( طور ) و قسە لەگەڵ خوادا دەکات , هەروەها باسی دارگۆچانەکە و دەستی موسای نەکردوە , وچۆن چوە بۆلای فیرعەون و قەومەکەی ......... هەروەها باس باوەڕهێنانی ساحیرەکانی نەکردوە .

ئایەتەکە پێمان دەڵێت :- فیرعەون نەخشەو فێڵ و ڕق و دوژمنایەتی خۆی ئاراستەی موسا کرد ,و ویستی بیکوژێت , تابەوکارە چرای بانگەوازەکەی بکوژێنێتەوە , و داوای لە قەومەکەی کرد کە ڕێگەی بدەن لەسەر ئەو کارە , ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ﴾

ئەم داوایەی فیرعەون سەیرە کەبەقەومەکە دەڵێت ڕێگەی بدەن بە کوشتنی موسا ! ئەو ماوەیەکی زۆری حوکمی لەناویاندا کردوە و , نەی بینیوە کەس سەرپێچی فەرمانی بکات , لەگەڵ هەموو بۆچونەکانیدا بوون , تەنانەت ئەو کاتەیش کە بانگەشەی خوایەکی بۆ خۆی کردوە .

ئیتر ئەمە مانای چی یە داوای مۆڵەتیان لێبکات بۆ کوشتنی موسا ؟ ئەوان بەرەنگاری ناکەن ئەگەر ئەم کارەیش بکات ! ڕەنگە بەم داوایە بیەوێت سور بێت لەسەر ئەوەی کە قەومەکەیشی بەشداری بکات , بۆ ئەوەی ئەوانیش هەست بکەن کە مووسا تەنها دوژمنی ئەو نی یە , بەڵکو هی ئەوانیشە , و هەموویان خاوەنی یەك مەسەلەن .

ستەمکاران - لەهەر شوێنێك بن - لەدژایەتی کردنی حەق و ڕاستیدا ڕێگای فیرعەون دەگرنە بەر .

فیرعەون دەیەوێت موسا ( علیه السلام ) بکوژێت , حیساب بۆ پەروەردگاری ناکات , لێی ناترسێت و شەرمی لێ ناکات ئەمەش بە ووشەی ﴿ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ﴾ لێك دەداتەوە , فیرعەون بەم کارە ناترسێت و دەست لە کوشتنی موسایش هەڵناگرێت .

نەبوونی ترس لەخوا , هۆکارە بۆ هەنگاو نانی یاخیبوان بۆ دژایەتی کردنی بانگخوازانی حەق و ڕاستی و ئازاردانیان و کوشتنیان ,

– فیرعەون وای لێك دەداتەوە کە پارێزگاری لە دین و ئەمن و ئاسایش دەکات:–

**ئەو هۆکارەی کە فیرعەون دەیگرێتە بەر لای قەومەکەی بریتی یە لە :**

﴿ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الأَرْضِ الْفَسَادَ ﴾ .دوو هۆکار بوو :

یەکەم :– پارێزگاری لە دین , کەواتە موسا دوژمنی دین بووە , و فیرعەون هاندەرو سورە لەسەر دین .

دووەم :– پارێزگاری لە ئەمن و ئاسایش , کەواتە موسا دوژمنی ئارامی و ئاسایشە , و فیرعەون پارێزەری ئارامی و ئاسایشە .

فیرعەون ئەو کەسە بوو بە قەومەکەی خۆی ووت : ( أنا ربُّكم الأعلى ) واتە ( من پەروەردگاری بەرزوو بالاّی ئێوەم) هەروەها پێی ووتن : ( ماعلمتُ لَكُمْ مِن الهٍ غيْري ) واتە : ( من غەیری خۆم خوایەك شك نابەم بۆ ئێوە ) . بەلاّم لەسەر دەستی موسادا هەڕەشەی لێدەکرێت .

فیرعەون کەسێکی یاخی و لەسنوردەرچوو گەندەڵە بەهۆی کوفرەکەیەوە , بە زۆرداری و لوتبەرزی یەکەی کەسێکی وێرانکەرە . بەلاّم بۆتە کەسێك بانگەواز بۆ چاکەو خەیرو ئارامی و خۆشگوزەرانی دەکات .

ئەمە لێکدانەوەیەکی فیرعەونیانە بوو , کە هەموو یاخی بوویەك لە دژایەتی حەق و ڕاستیدا پەنای بۆ دەبات ئەم کەسە یاخی یانە خۆیان بەسەر خەڵکدا پێش دەخەن وای دادەنێن باوەڕدارو ئیندارن , و پارێزگاری لە ئیمان دەکەن , و پارێزەری ئەخلاق و ڕەوشتی جوانن , و حەزیان لە ئاوەدانی و پێش کەوتن و ئارامی یە لەکاتێکدا ئەم یاخیبووە وای دادەنێت کە باوەڕداری بانگخواز , خراپەکارو تێکدەرە , و گومڕاو گومڕاکەرن , و دوژمنی خواو نەتەوەو نیشتیمانن , و لایەنگری شەیتان و پێشەوای فیتنەن , و بانگەواز بۆ سەر لێتێکدانی خەڵکی دەکەن , لەبەر ئەوە پێویستە دەستیان بەسەردا بگیرێت پێش ئەوەی ئامانجەکانیان بەدی بێت .

ئەمە شێوازێکی دەربڕینە , هەموو جارێك کە حەق و ناحەق و ئیمان و کوفر

و چاکەکاران و یاخیبووان , بەیەکدەگەن دوو بارە دەبێتەوە , لە هەموو کات و زەمانێکدا مەسەلەکە کۆنە و لەچەند کاتێکدا دەردەکەوێت .

– لەم کاتە ناڕەحەتە دا موسا ( علیە السلام ) پەنا دەبات بۆ پەروەردگاری و دەڵێت :– ﴿ وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لاَّ يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴾ ( غافر / ٢٧ ) .

بێگومان موسا پەنای گرت بە پەروەردگاری و پشتی پێی بەست , و کاری خۆیشی دایە دەستی , چونکە دەزانێت خوای بەسەو چاودێرێتی و , بەڕاستی خوایش پەنای ئەو دەدات و بەدەمی یەوە دەچێت و لە فێڵ و نەخشەی فیرعەون و دوژمنەکانی ڕزگاری دەکات .

ئەمە هەڵوێستێکی ئیمانی گەورەبوو لە موساوە , پێویستە بکرێتە نمونە و تەحەدی بەرامبەری پێ بکرێت .

موسا ناخی دەرونی کەسە یاخی و سەرکەشەکان شی دەکاتەوە و هۆکاری ئەو یاخی بوونەو نهێنی یەکەیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە , و کە دوو هۆکاری هەیە بۆ ڕاکێشانی خاوەنەکەی بەرەو لادان و یاخی بوون , ئەوانیش :–

یەکەم :– خۆبەزل زانین , کەپاڵ بەخاوەنەکەیەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی تاوان و خراپە , و هەروەها نایەڵێت دەست لەو کارو دەستکەوتە حەرامانە هەڵبگرن کە پیشەیانە , هەروەها ڕێگریشە لەوەی خۆیان بۆ لایەنی حەق و ڕاستی یەکلایی بکەنەوە و ملکەچ بن و شوێنی بکەون . تەنها کەسی لوتبەرزو خۆبەزلزان حەق و ڕاستی ڕەتدەکاتەوە , و هەر ئەوانیش دژایەتی دەکەن .

دووەم :– بێ باوەڕ بوون بە ڕۆژی لێپرسینەوە , کەسی لە خوایاخی بوو , وا گومان دەبات کە ژیانی دونیا هەموو شتێکە , و بڕوای وایە کە هێزو دەسەلاتەکەی هەر دەمێنێت . ئەگەر ئەم کەسە باوەڕ بهێنێت بە ڕۆژی دوایی و لە لێپرسینەوە بترسێت , ئەوا دەست لە یاخی بوونەکەی هەڵدەگرێت .

هۆکاری تاوان و لادانەکان , بریتی یە لە بێباوەڕی بە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە .

دەرکەوتنی پیاوە باوەڕ دارەکە لە کاتێکی گونجاودا :– خوای گەورە فەرموی : ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ وَإِن يَكُ صَادِقًا

يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾ ( غافر ٢٨ )

ئەم پیاوە ئیمانەکەی خۆی شاردبوویەوە , بەڵام دواتر ناچار دەبێت کە ئاشکرای بکات , ڕەنگە ئەوەی پاڵی پێوە نابێت بۆ ئاشکرا کردنی , قسەکەی فیرعەون بێت کە ووتی :- ﴿ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ﴾ واتە : وازم لێ بێنن بە موسا بکوژم و ئەویش هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات . ئەمە هەڕەشەیەکی ڕاستەو خۆ بوو لەسەر ژیانی موسا ( علیه السلام ) .

موسا ( علیه السلام ) سەرکردەو پێشەوای ئەو پیاوە بوو , ئەگەر ژیانی سەرکردە لەمەترسیدا بێت , ئیتر شاردنەوەی ئیمانی ئەو چ سودێکی دەبێت ؟ ئایا دەبێت بەو جۆرە بمێنێتەوە کە ئیمانەکەی هەر شاراوە بێت ؟ ئەگەر پێشتر ڕێگە پێدراو بوو بێت بۆی , ئەوا بارودۆخەکە ڕێگە پێدراوە , بەڵام ئێستا بارودۆخەکە بۆ ئەو لەبار نی یە . بێگومان ئەم پیاوە ئیمان و باوەڕەکەی ئاشکرا کرد , بەڕاستی گەورەیی نیشاندا , هەروەك پێشتریش لە شاردنەوەیدا پیاوێکی ئازاو گەورە بووە ! .

لەکاتێکی زۆر گونجاودا چویە پێش و ئیمانەکەی ئاشکرا کرد , ڕوو بە ڕووی فیرعەون و ستەمکاری یەکەی بویەوە , و لەقسەکانیدا سەرکەوتنێکی گەورەی تۆمار کرد , و لەو کارەیدا کۆمەڵێك هۆکاری جوانی گرتە بەر .

پیاوەکە ووتی : ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن , ئایا چۆن پێیان دەڵێت ( اتقتلونَ ) ئەوەی کە دەکوژێت تەنها فیرعەونە , نەك ئەوان ؟ بێگومان فیرعەون داوای مۆڵەتی لێ کردن کە موسا بکوژێت , ئەگەر ئەوان ڕێك کەوتن لەسەری , ئەوا لەتاوانەکەدا بەشدارن , ئەوانیش وەك فیرعەون بکوژ دەبن , ئەم پیاوە باوەڕدارە دەیەوێت بیانترسێنێت لەوەی کە هەنگاوی بۆ دەنێت , و کوشتنەکە بدات بەسەر شانی هەموویاندا چونکە هەر کەس ڕێك کەوت لەسەر کوشتنی کەسێك , ئەگەر لەکارەکەدا بەشداریش نەبوو بێت , ئەوا هەر حسابی کەسی بکوژی بۆ دەکرێت .

ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت : ( الله ) پەروەردگارمە ؟! ئەم ناوە چی یە کەوا ئەم پیاوە شیاوی کوشتن بکات ؟ ئەو ووتویەتی ( ربّی الله ) ئایا ئەمە تاوانە ؟ ﴿ وَقَدْ جَاءَكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ بێگومان ئەم پیاوە – واتە موسا – بەڵگەو نیشانەی پێ یە لەسەر بانگەوازەکەی , بۆ لای ئێوە هاتووە و بەڵگەو نیشانەی بۆ هێناون , لەپەروەردگارتانەوە , کە ( الله ) یە , نەك فیرعەون .

﴿ وإن يك كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ إنَّ ﴾ شێوازێکی لەبانگەوازی پڕ لە جوانی و قسەی حەکیمانەی دەربڕی , بێگومان ئەو دەیەوێت گرنگی بدات بەو کەسانەی کە بانگەوازییان دەکات , سەرنجیان بۆ لای شتێکی گرنگ ڕادەکێشێت , تا بیربکەنەوە و عەقڵیان بەکاربهێنن . ئەویش ئەوەتا , موسا لەبانگەوازەکەیدا , یان درۆدەکات یان ڕاستگۆیە ! کەلەم دوانە تێناپەڕێت . باسی درۆکە پێش دەخات , ئەگەر موسا درۆ بکات و درۆزن بێت , ئەوە ئەنجامەکەی لەسەر خۆیەتی و هەرگیز خوا بەهۆی ئەوەوە ئێوە ناگرێت ! بەلاَم ئایا ناگونجێت لەبانگەوازەکەیدا ڕاستگۆ بێت ؟! ئەگەر ڕاستگۆ بوو چی ڕوو دەدات ؟

﴿وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ ﴾ واتە : خۆ ئەگەر ڕاستگۆ بێت , هەندێك لەو بەلاَیانەتان بەسەر دێت کە پێی ڕاگەیاندون . بەوەی کە خوای گەورە موسای ڕێنمایی کردوە بە موعجیزەکان پشتیوانی لیّ کرد , بێگومان ئەو کەسێکی ڕاستگۆیە نەك درۆزن .

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾ ( غافر / ٢٨ ) .

بەڕاستی من دڵنیام خوا هیدایەت و ڕێنمونی کەسێك ناکات زیادەڕۆو درۆزن بێت ( واتە : ئەگەر موسا درۆزن بوایە , لەلایەن خواوە ئەو هەموو پشتیوانییەی لیّ نەدەکرا ) .

﴿ يَا قَوْمِ لَكُمُ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ظَاهِرِينَ فِي الأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِن بَأْسِ اللَّهِ إِنْ جَاءَنَا ﴾ .

زانا ( إبن كثير ) دەڵێت : ئاگاداری کردنەوە کە ئەو موڵك و دەسەلاَت و سەربەرزیەی هەیانە لێیان وەردەگیرێتەوە , بێگومان هەرکاتێك دەوڵەت لە دین جیا کرایەوە , ئەوا دەسەلاَتەکەیان لەدەست دەچێت و سەرشۆڕ دەبن . هەروایش بوو بۆ فیرعەون و کەس و دەوروبەرەکەی , ئەوان بەردەوام لە گومان سەرپێچی و دژایەتی کردندا بوون , بەرامبەر ئەوەی کە موسا هێنا بووی , هەتا خوای گەورە هەموو دەسەلاَت و سامان و بینا و نازو نیعمەتە هەمە جۆرەکانی لێسەندنەوە , پاشان گۆڕی بەدەریایەك کە ڕیسوای کردن , ڕۆحەکانی لەشوێنی بەرزەوە گوێزایەوە بۆ شوێنی نزم و بێنرخ . لەبەرئەوە ئەو پیاوە ڕاستگۆ باوەڕدارە ووتی :- ئەی قەوم و هۆزم , ئەمڕۆ ئێوە دەسەلاَتتان

هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا و بەئارەزووی خۆتان فەرمانڕەوایی تیا دەکەن . جا بیربکەنەوە و تێفکرن کێ دەتوانێت فریامان بکەوێت , کێ دەتوانێت ڕزگارمان بکات لە تۆڵەو سزای خوا ئەگەر یەخەی پێگرتین ؟ فیرعەون قسەکەی پێ بڕی و ووتی : من تەنها هەر ئەو ڕاو بۆچونە بەچاك دەزانم و لام پەسەندە , کە پێم ڕاگەیاندن , من تەنها ڕێبازی چاك و دروستم نیشانداون ؟؟ . فیرعەون لەهەردوو قسەکەیدا درۆی کرد فیرعەون چاك دەزانێت ئەوەی موسا هێناویێتی , لەلایەن خواوەیە و هیچ چارەیەکی نی یە , بەلام ئەو هەر بەزۆرە ملێ و سەرکەشی و مل هوڕانە دژایەتی دەکات .

هیچ بۆچونێکی پەسەندو دروستی لانەبوو , بەڵکو لەگومڕایی و سەرلێشێواویدا بوو , وەیەکێك بوو لەو کەسانەی کە بتی دەپەرست .

﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ الأَحْزَابِ (٣٠) مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ (٣١) وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ (٣٢) يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ ( غافر / ٣٠ – ٣٣ ) .

زانای تەفسیر ( الرازي ) دەڵێت : ( کەئەمە ماناکەیەتی بە کورتی ) :– خوای گەورە دەربارەی ئەم باوەڕدارە کۆمەڵێك ووشەو دەربڕینی گێڕایەوە کە ئاراستەی فیرعەونی کرد .

یەکەم : ﴿ يَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ الأَحْزَابِ ﴾ .

واتە : ( ئەی قەومەکەم بێگومان من دەترسم , ڕۆژێکتان بەسەربێت وەکو ئەو ڕۆژەی بەسەر گرۆو قەومە نالەبارەکانی پێشوداهات ) کە بەقەومی نوح و عادو ( ثمود ) بۆی ڕونکردنەوە , ئەوکاتە دەرکەوت کە هەموو دەستەیەك ڕۆژێکی دیاریکراویان هەبوو لەتاقی کردنەوەو نارەحەتی و دابارینی بەلابەسەریاندا , بەلام بەشێوەی کۆ باسی کردن , پاشان ڕوونیکردەوە بە ﴿ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾ واتە : ( وەك ئەوەی کە بەسەرقەومی نوح و عادو پمود و ئەوانی دواتریشدا هات ) کە بەهۆی بێباوەڕی و سەرپێچی کردنەوە بوو . واتە: ئەوانی ترساندبەتیاچوونی خێراوبەپەلە لەدنیادا , وەهەروەها بەتیاچوونیش لەقیامەتدا , وەك دواتردەفەرموویێت :– ﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ مەبەست لەمە ئاگادارکردنەوە یانە لەسزای ڕۆژی قیامەت .

دووەم : لە ووشەکانی ئەم پیاوە باوەڕدارەکە دەریبڕی بریتی بوو لە :- ﴿ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ﴾ (غافر/٣١) واتە : لەناوبردنی ئەو کۆمەڵ و دەستە خراپانە کارێکی دادپەروەرانە بوو , چونکە بەهۆی باوەڕنەکردنیان بە پێغەمبەران ئەو سزایەیان لەسەر واجب بوو . ئەمانە یەك دەستەبوون , کەواتە پێویستە ئەو حوکمەیان بەسەردا بدرێت .

سێ یەم : هەروەها ووتی :- ﴿ وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ ﴾ ( غافر / ٣٢ ) . ئەمەش چەند مەسئەلەیەکی تیایە :-

مەسەلەی یەکەم :- ووشەی ﴿ التَّنَادِ﴾ لە ( النداء ) پێك هاتووە , ووتراوە ( تنادي القوم ) واتە : هەندێکیان بانگ و هاواریان لە هەندێکی تریان دەکرد , زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ﴿ يَوْمَ التَّنَادِ﴾ ڕۆژی قیامەتە . لەبەرچەند هۆکارێك ئەو ناوەی لێنراوە :-

یەکەم :- خەڵکی ناوئاگر بانگ لە خەڵکی ناوبەهەشت دەکەن , وەهەروەها , ئەهلی بەهەشت بانگی ئەهلی ناوئاگردەکەن .

دووەم :- ( الزجاج ) دەڵێت :- دوورنی یە کە لەبەرهۆکاری بوونی ئەم ئایەتە بێت :- ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ ﴾ ( الاسراء / ٧١ ).

سێ یەم :- هەروەها هەندێك لەستەمکاران بانگ لەهەندێکی تریان دەکەن , هاواری تیاچوون بۆ یەکتری دەردەبڕن و دەڵێن :- ﴿ يوَيْلَنا ﴾ ( الانبياء ٩٧ )

چــوارەم :- بانگ دەکرێن بۆ کۆبوونەوە لەساحەی لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەتدا .

پێنجەم :- باوەڕدار بانگ دەکات و دەڵێت :- ﴿ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ ﴾ ( الحاقه / ١٩ ) وکافریش هاواردەکات و دەڵێت :- ﴿ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ ﴾ ( الحاقه / ٢٥ )

شەشەم :- بەنەفرەتەوە بانگ لەستەمکاران دەکرێت .

حەوتــەم :- مردن لەسەر شێوەی بەرانێکی گەورەی شاخدار دەهێنرێت , پاشان سەری دەبڕن و هاوار دەکرێت: ئەی هاوەڵانی ڕۆژی قیامەت : ئەوا مردن نەما , ئینجا هاوەڵانی ناوبەهەشت زیاتر دڵیان خۆش دەبێت , و هاوەڵانی ناو ئاگری دۆزەخیش زیاتر داخ و مەراق و خەفەتیان زیاد دەکات .

- مەسەلەی دووەم :- ووشەی ﴿يَوْمَ التَّنَادِ ﴾ بە ( منصوب ) ی هاتووە , لە

دوو ڕووەوە : یەکێکیان : کاتێکە بۆ ترسان , وەك ئەوەی کە لەو ڕۆژەدا زۆردەترسن لەئەنجامی ئەم سزایەی توشیان دێت , ئەگەر باوەڕیان نەبوو بێت , ئەوەی تریان :- وادادەنرێت :- بە ڕاستی من دەترسم کە ئێوە سزای ڕۆژی قیامەتتان بۆدێت , ئەگەر وابوو , ئەوە ﴿يَوْمَ التَّنَادِ﴾ دەبێتە ( مفعول به ) و ( منصوب ) دەبێت .

پاشان ووتی :- ﴿ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ ﴾ کە ئەمە لە باتی ووشەی ﴿يَوْمَ التَّنَادِ﴾ . لە ( قتادە ) ەوە دەڵێن : لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا ڕوویان بەرەو ئاگر وەردەگێڕن .

پاشان هەڕەشەکە دڵنیا دەکاتەوە و دەڵێت :﴿ مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ﴾ واتە : کەس نیە پەناتان بدات لە خەشم و قینی خوا ، پاشان لە گومڕایی و نەزان ی یەکەیان بە ئاگایان دێنێتەوە و دەڵێت :﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾[1] ( غافر / ٣٣ ) . واتە : ( هەر کەس خوا گومڕای بکات بە هۆی خراپەکاری خۆیەوە ، هیچ کەسی تر ناتوانێت هیدایەت و ڕێنموویی بکات .)

﴿ وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءَكُم بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولاً كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾ ( غافر / ٣٤ ).

ئەمە بە ئاگا هێنانەوەیەکی مێژوویی و بواری عەقیدە و ئیمانە ، بە جۆرێك کە یوسفیان یاد دەخاتەوە ، هەڵوێستی ئەوان بەرامبەری ڕووندەکاتەوە ، و ئەوان گومانیان هەبووە لە پەیامەکەیدا ، و دڵخۆشبوون بە مردنی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ، و واگومانیان برد کە ئیتر دوای ئەو پەیامی ئاسمانی دەبڕێتەوە و دانابەزێت ، ئەوان ئەم هەڵوێستە لە باوك و باپیرانیانەوە فێردەبن ، ئەویش تەنها یادیان دەخاتەوە ، بەڵام کاریگەری ئیمانی ، بریتی بوو لەوەی کە پەیامەکەی یوسف بەکاری هێنا لە جێگیرکردنی پەیامەکەی موسادا .

---

[1]/ بە کورتی ( التفسير الكبير ) ( ١٤ / ٢٧ / ٥٣ -٥٤ ) بە دەستکاریەوە .

بێگومان موسا ( علیە السلام ) پەیوەندیدارە بە یوسف ( علیە السلام ) لە ڕووی نەسەب و گەیشتنی پەیامەکەی مەسەلەی نەسەبەکە هیچ گومانێکی تیا نی یە و ، هەواڵی یەك دەنگ دەربارەی هاتووە .

بەڵام لە مەسەلەی پەیامەکەدا ، هەروەك چۆن جێگیر بووە ، یوسف ( علیە السلام ) پێغەمبەری خوایە ، هەر بەو جۆرەیش جێگیر بووە کە مووسا ( علیە السلام ) پێغەمبەری خوایە ، ئەو خوایەی کە پێشتر یوسفی بە بەڵگەو نیشانەکانەوە نارد ، هەر ئەو خوایەیە کە موسایشی بە بەڵگەو نیشانەو موعجیزەکانەوە نارد .

﴿فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءكُم بِهِ﴾ بێگومان ئەو هەڵوێستی خۆیانیان بیردێنێتەوە بەرامبەر یوسف ( علیە السلام ) کە لەسەر گومان و ئینکاری بنیاتیان نابوو .

بانگەوازیان دەکات کە ئەو هەڵوێستە لەگەڵ موسا ( علیە السلام ) دوبارە نەکەنەوە . بۆچی هەمان هەڵوێست دووبارە دەبێتەوە ؟ ئایا ئەوان پەندیان لە ڕابردوو وەرنەگرتووە ؟

﴿ كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾ ( غافر / ٣٤ ).

هەر بەو شێوەیە خوا کەسانی سەرکەش و گوناهکارو دڵ دانەمەزراو و ، ڕاڕا گومڕا دەکات .

﴿الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ ( غافر / ٣٥ ).

واتە :- ئەو کەسانەی کە موجادەلە و گفتوگۆ دەکەن دەربارەی ئایەت و فەرمانەکانی خوا ، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت ، ئەم موجادەلە و گفتوگۆیە زۆر بێزراوو تاوانە لای خواو لای ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە ، هەر بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر هەموو خاوەن دڵێکی خۆ بەزلزان وڕق ئەستور و ستەمکاردا .

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ (٣٦) أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلاَّ فِي تَبَابٍ﴾ ( غافر / ٣٦- ٣٧).

باوەڕدارەکەی قەومی فیرعەون – وەك بینیمان – لە گەیشتنی بە دڵی خەڵکی سەرکەوتنی بە دەست هێنا ، و توانی کاریان تێ بکات .

ڕەنگە فیرعەونیش تێبینی ئەمەی کردبێت . ئینجا ترسا لەوەی کە کارەکە لە دەستی دەربچێت و خەڵکەکە هەموو ڕوبکەنە پیاوە باوەڕدارەکەو پەنا بدەنە پاڵی و بانگەوازەکەی قبوڵ بکەن .

ئینجا فیرعەون ناچاربوو کە بە داواکەی پێشووی خۆیدا بچێتەوە – کە بریتی بوو لە مۆڵەت دان بە کوشتنی موسا – بەڵام ئەم جارەیان بڕیارێکی ناپەسەندتری دەرکرد ، و شانۆیی یەکی تازەی نیشانی خەڵکەکەدا تا سەرقاڵیان بکات .

داوای لە ( هامان )ی وەزیری خۆی کرد ، کە بورج و باڵەخانەیەکی بەرز و گەورەی بۆ دروستبکات ، تا بیگەیەنێتە بەرزایی ئاسمان ، بە ئامانجی ئەوەی کە سەرکەوێت بۆ هەر ( حەوت چین ) ەکەی ئاسمان و بە دوای خوای موسادا بگەڕێت ، و هەرگیز نایبینێت ،و دەیویست درۆکەی لەبەردەم هەموو خەڵکەکەدا ئاشکرا بکات و ڕاستیش پیشانی ئەو پیاوە باوەڕداره بدات کە پارێزگاری لە موسا دەکات .!

لە سورەتی ( قصص ) دا ئاماژە بەم ( بورج )ە دراوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴾ ( القصص / ٣٨ ) .

واتە :- ( فیرعەون بە سەرکەشانە ووتی : ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێت جگە لە خۆم ، ئەی هامان تۆ لە گڵ خشتی سورەوەکراوم بۆ دروستبکەو قەڵایەکی بەرز و پتەوم بۆ بینابکە ، بەڵکو پیایدا سەربکەوم ، تا خوای موسا ببینم ، هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە لە ڕیزی درۆزنەکاندایە ..)

لێرەوە تێ دەگەین کە ئەو قەڵایە لە خشتی سورەوەکراوە دروست دەکات ، و فیرعەون مێشکی خەڵکەکەی ئاخنی ،و وایدانا کە پیایدا سەرئەکەوێت و ، هەندێك هۆکاری دەست بکەوێت ، هۆکارەکانی ئاسمان بریتین لە ڕێگاو دەروازەو ڕێڕەوەکانی . تا بچێت بە دوای خوای موسادا بگەڕێت .

ئا بەو شێوەیە کارو کردەوە ناشرینەکان لای فیرعەون جوانکراو ، لە ڕێبازی

ڕاست و دروست لادرا ، بێگومان پلان و نەخشەی نادروستی فیرعەون هەر لە زەرەر و زیان و فەوتاندایە !

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ (٣٨) يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ ﴾ ( غافر / ٣٨ – ٣٩ ).

ئەم پیاوە باوەڕدارە زۆر زیرەك و وورریایە ، ئامانجی فیرعەونی بۆ دەرکەوت لە دروستکردنی بورج و قەلاّ بەرزەکەدا ، ئەم بە کارێکی بانگخوازی کرداری ڕەدی ئەم نەخشە پیسەی فیرعەونی دایەوە ، داوای کرد لەو خەڵکەی کە گوێیان لەو ولە فیرعەون گرتبوو ، داوای لیّ کردن ئیمان بهێنن و شوێن ئەو بکەون .

بە کورتی بۆی ڕونکردنەوە ، کە ڕاستی و بنەمای ئەو کارە چی یە ، تا بەڵگەیان پیّ ڕابگەیەنێت و بیانوی نەمێنێت .

بێگومان ئەو لە یەکەم بە یەك گەیشتنیاندا داوای لیّ نەکردن شوێنی بکەون ، ئەگەر وای بکردایە ئەوا بەرەنگاری قسەکەیان دەکرد ، و دەچوون بە گژ بانگەوازە کەیداو لێی دووردەکەوتنەوە پاش ئەوەی چەند زنجیرەیەك گفتوگۆی کرداری لەگەڵ کردن و گرنگی پێدان ، ئینجا داوای لیّ کردن ، پاش ئەوەی کە خۆی گەیاندبووە ناو عەقڵ و دڵیان .

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴾ ( غافر / ٣٨ ) .

واتە : ئەی قەوم و هۆزەکەم ، شوێنی من بکەون و بە قسەی من بکەن ، ڕینمویتان دەکەم بۆ ڕێبازی سەرفرازی و چاکەو چاکە کاری کەمێك قسەکانی لەگەڵیان درێژ کردەوە و ، پوختەی دین و بانگەوازەکەی پێشکەش کردن ، تا بە ڕوونی لەسەر کارەکانیان بن . لەم ڕوونکردنەوەیەدا جەختی لەسەر ئیمان کردەوەو هەروەها باسی دنیاو قیامەتیشی پێوە بەست ، بە جۆرێك کە دڵی ڕاکێشان بۆلای قیامەت .

فیرعەون بانگی دەکردن بۆ ناو ئاگر ، ئەمیش بانگی دەکردن بۆ بەهەشتی خوا ، خەڵکەکە توشی شڵەژان و سەر سوڕمان هاتبوون ، نەیان دەزانی کامیان هەڵبژێرن . تا ئەو کاتەی پیاوە باوەڕدارەکە ڕێگاکەی بۆ قەومەکەی ڕوون کردەوە ، وە هەموو تەم و مژێکی لابرد ، وە تا بتوانێت لەسەر چاك هەڵبژاردن یارمەتیان بدات :–

﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلا يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ ( غافر / ٤٠ ) .ئەوەی گوناه و هەڵەیەکی کردبێت ، تەنها بەقەدەر هەموو گوناهەکەی خۆی تۆڵەی لیٚ دەسەنرێت ، ئەوەش کە چاکەی کردوە لە پیاوان و ئافرەتان ، لە کوڕان و لە کچان لە کاتێکدا کە خاوەنی باوەڕی دامەزراون ، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و بیٚ سنووروو بیٚ حیساب ڕزقو ڕۆزی هەمە جۆرو هەمە چەشنیان پیٚ دەبەخشرێت .

ئینجا جیاوازی نێوان بانگەوازەکەی خۆی و بانگەوازەکەی فیرعەون دەکات و دەڵێت :- ﴿وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ (٤١) تَدْعُونَنِي لأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ (٤٢) لا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلا فِي الآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ( غافر / ٤١ – ٤٣ ) .

**کاتێك بڕوانینە ئەم بەراورد کردنە تێبینی چەند شتێك دەکەین :**

١- دوو بانگەوازە ، و سێیەمی تیا نییە ، بانگەوازێك بۆ حەق و ڕاستی ، و یەکێك بۆ ناحەقی و ناڕاستی .

بانگەوازێك بۆ بڕوا بە خوا ، وە بانگەوازێك بۆ هاوەڵ دانان ، بانگەوازێك بۆ گوێڕایەڵی فەرمانی خوا ، و بانگەوازێك بۆ سەرپێچی فەرمانەکانی .

٢- وەڵام دانەوە بۆ هەریەك لە بانگەوازەکان , پابەندبوونی تیادەردەکەوێت , هەرکەس بانگەوازی حەق و ڕاستی وەڵام بداتەوە و , باوەڕبهێنێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکات , ئەوا دەگاتە بەهەشت و خەیری دەست دەکەوێت و ڕزگاری دەبێت , وهەرکەس وەڵامی بانگەوازی ناحەقی و کافربوون بەخوا و سەرپێچی بداتەوە ئەوە خەسارەت مەندو تیا چوو دەبێت , وەدەبێتە ئەهلی ناو ئاگر .

٣- پیاوە باوەڕدارەکە هەردوو بانگەوازەکەی بەباشی ناساند , بەجۆرێك لەباسکردنەکەیدا هەریەکەیانی لەوی تریان جیاکردەوە:- ﴿ تَدْعُونَنِي لأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ ﴾

( غافر / ٤١ ). واتە: ( بانگم دەکەن تا باوەڕم بەخوا نەمێنێت و هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیاربدەم , بەبێ هیچ بەڵگەو زانست و زانیاریەك , لەکاتێکدا من بانگتان دەکەم بۆلای زاتێك کەزۆر بالادەستەو زۆریش لێخۆشبووە .

٤- دەربڕینی ووشەی( يَا قَوْمِ ) بۆخەڵکەکە : ئەمە حەزێك بوو لەوەوە تادڵیان کەمەند کێش بکات و کاریان تێ بکات , بەردەوام لێیان نزیك دەبویەوە و خۆشی دەویستن , تائەو هەستەیان بۆ دروست بکات کە ئەم لەوانە و ئەوانیش لەمن .

٥- لەئایەتی:- ﴿ النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ ﴾ ئاوڕدانەوەیەکی جوانی لەبانگەواز تیایە :- کێ ئەو بانگ دەکات بۆ ناو ئاگر ؟ بێگومان فیرعەونە , نەك قەومەکەی ! بەڵام بۆ چی نیسبەتی دایە پاڵ گشتیان لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان بانگیان نەکردوە ؟

بێگمان پێشتر ئەوانی بەشدارکرد لەگەڵ فیرعەوندا لەو ئایەتەدا کەپێی ووتن:-

﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ ﴾ لێرەشدا بەشداریکردن لە بانگەواز کردن بۆ ناو ئاگر , چونکە ئەگەر وەلامی بانگەوازەکەی فیرعەون بدەنەوە , ئەوا دەبن بەهاوبەش و بەشدار لەگەڵیدا , چونکە ئینکاری بانگەوازەکەیان نەکردوە , وبەرویدا نەوەستاونەتەوە .

٦- پیاوە باوەڕدارەکە دووان لە ناوە جوانەکانی خوایگەورەی باسکرد , کەدەیان ناسێنێت بەبانگەوازی خوا , و ئەنجامەکەیان بۆ باس دەکات :- ﴿ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ ﴾ ( غافر /٤٢ ) واتە : ( من بانگتان دەکەم بۆلای زاتێك , کەزۆر بالادەستەو زۆریش لێخۆش بوە ) ئەم دوو ناوە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایەتەکەدا زۆر گونجاوە . ئەمە هاندەرو دڵخۆشکەرێك بوو کە قەومەکە باوەڕ بەخوا بهێنن , ئەوا دەبنە خاوەن ڕێزو عیزەت و پاشان دەگەنە پلەیەکی بەرزو بەختیان چاك دەبێت و خوا لێیان خۆش دەبێت و تەوبەیان لێوەردەگرێت .

٧- لەقسەی پیاوە باوەڕدارەکەدا فەرمووی :- ﴿ لا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلا فِي الآخِرَةِ ﴾ واتە: ( شتێکی ڕاستەو گومانی تێدانیە , ئەوەی ئێوە من بانگ دەکەن بۆلای خاوەنی هیچ بانگەواز و بەرنامەو پرۆگرامێك نیە , نەلەدنیاو نەلەقیامەتیشدا ) . هەموو مانایەکی هێز و

کارلێوەشانەوە و کاریگەری لەفیرعەون داڕنی .
بەڕاستی ئینسان سەری لەم کارە سوڕدەمێنێت . ﴿ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ ﴾
( غافر / ٤٣ ) . واتە:- ( ئەوەنابێت لەیادبکەین کە بەڕاستی گەڕانەوەمان بۆ لای خوایگەورەیە , ئەوانەش تاوانی زۆر ئەنجام دەدەن و سەرکەش و لەسنور درچوون , ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن ) .
﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (٤٤) فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ (٤٥) النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾
( غافر ٤٤- ٤٦ ) .

لێرەدا دەگەینە کۆتای چیرۆکەکە :-

بەڕاستی دەرکەوت پیاوە باوەڕدارەکە پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا موسا ( علیه السلام ) کردوو , ڕەدی فیرعەون و بانگەوازەکەی دایەوە و خەڵکەکەی بانگ کرد شوێنی کەون و باگەوازەکە بۆ ڕون کردنەوە . ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾ . واتە: ( جالەئایندەدا ڕۆژێك دێت , ئەم قسانەی منتان بێتەوە یاد , وئێستاکەش من خۆم وکارو بارەکانم دەدەمە دەست خواو پشت بەو دەبەستم , چونکە بێگومان خوا بینایە بەبەندەکانی ) .
﴿ فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ ﴾
( غافر / ٤٥ ) . جاخوا ئەو باوەڕدارە ژیرەی پاراست لەپیلانی خراپ و دڕندەیان , دارو دەستەی فیرعەونیش سزایەکی زۆر سەختیان تووش بوو .
خوای گەورە کارە خراپەکەی شکاندەوە بەسەر خۆیاندا , و باوەڕدارەکە لە دونیاو قیامەتیشدا ڕزگاری بوو , وفیرعەون و قەومەکەی لە دنیاو قیامەتدا تیاچووبوون . ﴿ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ ( غافر /٤٦ ) . واتە: ( ئاگری دۆزەخە , بەیانیان و ئێواران نیشانیان دەدرێت , یاخود پیایاندا دەچرێنریت ( لەجیهانی بەرزەخ ) دا , ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت : ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە

ناو ئێش و ئازاری زۆر بەتین و ناخۆشەوە ) .
پاش ئەوەی ئەم پیاوە باوەڕدارە بەئەنجام دانی ئەرکەکانی خۆی هەستا, ڕەنگە فیرعەون هەڕەشەی لیَ کردبێت و ترساندبێتی و سزایشی دابێت, بەلاَم ئەو لەفیرعەون نەترساوە , بەڵکو فەرمانەکانی خۆی داوەتە دەست خوای گەورە . فەرمان دانە دەست خوا , ئەوە بریتی بووە لە کۆتایی هێنان بەدەرخستنی پەیامی ئیمانی بانگەوازەکەی , کەکۆتا ڕوداوی چیرۆکەکەیشە . قورئانی پیرۆز دەیەوێت ئەم هەڵوێستە لای موسڵمانان دامەزراوەو سەقامگیربکات , هەموو کەسێك لەخەیالَ و بیرکردنەوە و مێشکی خۆیدا دان بەم مانا جوانە دا بنێت وهەستی پیَ بکات . قورئانی پیرۆز دەیەوێت لەڕوانگەی ئەم چیرۆکەوە- باوەڕ بوون بەخواو پشت پیَ بەستن و پەنابردن بۆ خوا فێری موسڵمانان بکات.
پاش ئەمە لە درێژە دان بەڕوداوەکان و باسکردنیان بیَ دەنگ دەبێت , بۆی ڕوون نەکردینەوە پیاوە باوەڕدارەکە چی بەسەرهات , چونکە مەبەستی داواکراو نی یە , وڕونکردنەوەکەی سودی زۆر ناگەیەنێت . بێگومان خوای گەورە دەست لەدۆست و خۆشەویستانی خۆی بەرنادات , وتەسلیمی دەستی دوژمنەکانیشی ناکات , بەڵکو لەگەڵیاندا دەبێت و پشتیوانیان لیَ دەکات . ئەمە سونەتێکی خوایی یە و گۆڕانی بەسەردا نایەت, قورئانی پیرۆز زۆر شێوەی لەم نمونەیە تیاڕونکراوەتەوە, بەڕاستی فیرعەون و قەومەکەی , بەهۆی فێلَ و نەخشەی ناپاکیانەوە ئەنجامێکی خراپیان دەست کەوت , و بەرو بوومەکەیان کۆکردەوە , پلانی شەڕو خراپەکە توشی خۆیان هاتەوە. ئەمەش یاساکەی جێگیرە لە قورئاندا،یەکێکیشە لە سوونەتەکانی خوا.

## ﴿ گرنگ ترین پەندو وانەکانی چیرۆکەکە ﴾

١/گومانی تێدانیە، ئەوکارانەی کەئەم پیاوە باوەڕدارە پێی هەڵسا هەمووی لەوێوە سەرچاوەی گرت ، کەفیرعەون ووتی :.{ذروني اقتل موسى وليدع ربه} پاشان بانگەوازی فیرعەون و قەومەکەی کرد بۆباوەڕهێنان بەخواو دورکەوتنەوە لەکوفروستەم و لوت بەرزی . ئەمە گەورەترین جیهادو تێکۆشان بوو لەڕێگەی خوادا.
٢- ( ابو بكر الصدق ) ( خوا لێی ڕازی بێت ) هەمان هەڵوێستی ئەم پیاوە باوەڕدارەی دەربڕی :-

ئیمامی ( بوخاری و مسلم ) لە ( عروة بن الزبیر ) ەوە گێڕاویانەتەوە ، ( عروة) دەڵێت : پرسیارم کرد لە

( عبدالله بن عمرو ) دەربارەی ناڕەحەتترین کار ، کە هاوەڵدانەرەکان بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ ) ئەنجامیاندا . ووتی:- من ( عقبة بن أبي معیط ) م بینی ، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ ) بەتوندی عەباکەی سەرشانی لەملی پێغەمبەر ئالأند و ڕایکێشا خەریك بوو بیخنکێنێت ، ئینجا ( أبو بکر ) هات تالێی دوور خستەوەو فەرمووی :

( اتقتلونَ رَجُلاً ان یقولَ ربّي الله وَقَدْ جآدکم بالبیّنات مِن ربِّکُمْ ) [1]

٣- ستەمکاران و یاخیبوان کۆمەڵە هۆکارێك بەکار دێنن ، نەیاسایین ، نەئینسانین ، نە ئەخلاقین ، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حەق و سەربازەکانی ، لەوانە کوشتنی کوڕی باوەڕداران و هێشتنەوەی ئافرەتانیان بە زیندوویی ، وەك ئەوەی کە دەستەو تاقمی فیرعەون کردیان .

٤- یاخیبوان و سەرکەشان دەیانەوێت بەو هۆکارانەیان دژایەتی بانگەوازو بانگخوازان بکەن و بیانترسێنن .

٥- ستەمکاران سوورن لەسەر ئەوەی کەخەڵکی بکەنە هاوبەشی خۆیان لەبەرەنگاربونەوەی حەق و بکێشن بەسەریاندا و ، بەرپرسیاریتی ئەوەش بخەنە سەرشانی خۆیان ، و ئەو هەستە یان لا دروست بکات کەمەسەلەیەکی بنەڕەتی یەو هی خۆیانە .

٦- یاخیبوان لەبەردەم خەڵکیدا وا خۆیان دەردەخەن کە پارێزەری دینن ، و نوێنەری چاکە سازی و پارێزەری ئاسایشن .

٧- یاخیبوان ، بانگخوازان بە کوفرو فەسادو وێرانکار ، تۆمەتبار دەکەن ، و خۆیان دوژمنی دین و ئاسایش و چاکسازین .

٨- نهێنی یاخیبوون لە دوو کاردا دەردەکەوێت : خۆ بەزلزانین و بێباوەڕ بوون بە ڕۆژی لێپرسینەوە ، و نهێنی چاکە کاریش لە دوو کاردا دەردەکەوێت : لێبووردەیی و باوەڕ بوون بە ڕۆژی لێپرسینەوە .

٩- لەسەر بانگخواز پێویستە کە هەنگاوەکانی ڕێك بخات لەگەڵ هەڵوێستە

---

١/ ( بوخاري ) لة ( مناقب الأنصار ) دابە ( ٧ / ٢٠٣ ) ڕیوایەتی کردوە .

بـانگخوازی یەکەیـدا , ئینجـا دەزانێـت کـەی ئیمانەکـەی دەشـارێتەوەو کـەی ئاشکرای دەکات , ئەو کاتەی کە بانگخواز توانای دەبێت سەربکەوێت , نابێت ئیمانەکەی بشارێتەوە .

١٠- بـانگخواز بەشـێوازی بـانگخوازی سـەرکەوتوی , و ئیمـانی کاریگـەری , دەتوانێت ناحەق و کوفر و گومڕایی بڕوخێنێت , چونکە ئەمانە لەسەر بنەما بنیات نەنراون , خاوەنی بەڵگەو دەسەلاتیش نین .

١١- جیاوازی لە نێوان ( منطق ) قسەی کافران بۆ خەڵك و قسەی باوەڕداران بۆ خەڵك , بریتی یەلە : کافران بە لوتبەرزی و خۆبەزلزانانە قسەدەکەن , بەلاَم باوەڕداران بە خۆشەویستی و نزیك بوو نەوەو ڕێزلێگرتن .

١٢- یـاخیبوان ڕێگـا نـادەن قسـە لـەدژی بۆچـونەکانیان بکرێـت و ڕێگـەیش نادەن بەهیچ کەس سەرپێچیان بکات و بەرامبەریان بوەستێتەوە .

١٣- سـتەمکاران و یـاخیبوان هۆکـاری ( کـات ) بـەکاردەهێنن بـۆ ئـەوەی بانگەوازی پێ بکوژێن لای خەڵکی , و ژیان و زیندوێتی ئەو بانگەوازە لەناوبەرن , ئەوەی لەسـەر بـانگخوازان پێویسـتە , دەبێـت بـەردەوام بـن لەسـەر گەیانـدنی پەیامەکەو و لەکاردا بن , و بەزیندویی لای خەڵك بیهێڵنەوە .

١٤- ستەمکاران و یـاخیبوان زۆریـان لـە ووزەو توانـا و مـاڵ و سامان و کاتی نەتەوەکەیان بردو بەخشی لەکاردا , بەلاَم نەسوودی تیابوو نەخێر , تەنها ئـەوە شانۆگەری بوو بۆ گوێ ئاخنینی خەڵکی و سەرقاڵ کردنیان .

١٥- پێویسـتە بـانگخوازان هۆکـاری ( چاوەڕوانکردن ) لەگـەڵ بانگلێکراوانـدا بەکاربهێنن , و بۆ داهاتوو بۆیان بڕوانن , تا ڕاستی قسەکانیان بۆ دەردەکەوێت , و ئەوەی کە پێشتر پێیـان ووتـوون بیریـان بخەنـەوە , و ئاگاداریـان کەنـەوە کە نەکەونە ناو خراپەو مەترسی یەوە , بۆ ئەوەی بتوانێت بانگەشـەی ئـەوە بکـات شوێنی خۆیان بخات .

١٦- خـوای گـەورە لەگـەڵ بەندەکانیدایـەو جـێگیرو دامـەزراویان دەکـات و ئاراسـتەیان دەکات و , پشتیوانیشـیان دەکـات , هـەروەها دژایـەتی دووژمنـانی خـۆی و ئـەوانیش دەکـات و دەیانڕوخێنێـت و نەخشـەو پیلانـەکانیان بـەتاڵ دەکاتەوە .

١٧- بانگخوازان لەدنیاو لە قیامەتدا خۆیان و ئومەتەکەیشـیان ڕزگاردەکـەن , و یـاخیبوان و سـتەمکاران خۆیـان و ئومەتەکەیشـیان لـەدنیاو قیامەتـدا لـەناو دەبەن .

**﴿چیرۆکی ( أصحاب الجنّة ) خاوەن باخەکە﴾**

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ (١٧) وَلَا يَسْتَثْنُونَ (١٨) فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ (١٩) فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ (٢٠) فَتَنَادَوا مُصْبِحِينَ (٢١) أَنِ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ (٢٢) فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ (٢٣) أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ (٢٤) وَغَدَوْا عَلَى حَرْدٍ قَادِرِينَ (٢٥) فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ (٢٦) بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (٢٧) قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ (٢٨) قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ (٢٩) فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ (٣٠) قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ (٣١) عَسَى رَبُّنَا أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا رَاغِبُونَ (٣٢) كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ ( القلم / ١٧- ٣٣ ).

**پێش دەستپێکی چیرۆکەکە :-**

خوای گەورە ئەم چیرۆکەی لەکتێبە پیرۆزەکەی خۆیدا باس کرد , پاش ئەوەی کە ( ولیدی کوڕی مغیره ) یان ( اخنس ی کوڕی شُرَیق ) یان ( أسودی کوڕی عبد یخوث ) تانەو تەشەرێکی زۆری لەپێغەمبەرو بانگەوازەکەی دا . خوای گەورەیش فەرمووی :﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ (١٠) هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ (١١) مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ (١٢) عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ (١٣) أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ (١٤) إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (١٥) سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ ﴾ ( القلم / ١٠-١٦ ) .

واتە : ( ئەی موحەممەد ( ﷺ ) بەقسەی هەموو ئەوانە مەکە , کە زۆر سوێند دەخۆن و زۆر سوك و ڕیسوان . ئەوانەی کە بە شوێن عەیب و عاردا دەگەڕێن و دوژمنایەتی دەکەن و فیتنە دەگێڕن و حەزیان لە ئاشوبە . زۆر دژی خەیر و چاکەن و دەستدرێژی دەکەن و گوناه ئەنجام دەدەن و پیلان دەگێڕن . لەهەمان کاتدا ئێسك تاڵ و ڕەوشت ناشیرین و ناکەس بەچە و باوك نادیارن .

هەریەکەیان بەوە دەنازێت کە هەندێك ماڵ و سامان و کوڕی هەیە . کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا , دەخوێندرێتەوە , دەڵێت : ئەمە داستانی پێشووەکانە , ئەمە بەسەرهاتی دێرینە . ئێمە سەرئەنجام لووتی داخ دەکەین و سەری لووتی ڕەش دەکەین . ) .

ئینجا خوای گەورە گلەیی لەخەڵکی مەککە کردوو فەرمووی :﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ ﴾ واتە : بەڕاستی خوای گەورە ئەو خەڵکانەی تاقی کردەوە هەر وەك چۆن خاوەنی ئەو باخەی تاقی کردەوە , کەخەیرو نازو نیعمەتێکی زۆری پێدا , بەڵام شوکرانە بژێر نەبوو , و بێ بڕوا بوو , کە پێویست بوو شوکرانە بژێر بوایە و زەکاتی بەروبوومەکەی بدایەو , بەپێی ئایەتی ﴿ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ ﴾ ( الأنعام / ١٤١ ) . کاری بکردایە , واتە :- ( لەڕۆژی کۆکردنەوەی بەرهەمەکەیدا مافی هەژارانیان لێ دەدا ) . بەڵام ئەوان فەقیرو هەژارەکانیان لێ بێ بەش کرد , بەو هۆیەوە تووشی سزابوون و ڕەنج بەخەسارو خەسارەتمەند بوون , و پەشیمانیان دەربڕی . ئەگەر چی ئەم سزایە لەسەر خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی قورسە , بەڵام لەسەر ئەو کەسانە زیاتر قورسترە کە دڵیان بەدنیاو شتە ڕازاوەکانی یەوە هەڵواسیوە . ئەو خۆشەویستی یە زۆرەیان بۆ دنیا , لێی قەدەغە کردوون کە مافی خوا بدەن , دەبێت حاڵیان چۆن بێت کە دنیایان لەدەست بچێت و هۆکاری خۆشی ژیان و بەختەوەرییان لێ تەسك و تەنگ ببێتەوە , و بەو داخ و حەسرەتەشەوە بمرن , خوای گەورە پاش ئەوەی چیرۆکەکەیان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت :﴿ كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ ( القلم / ٣٣ ) , واتە : ( سزای ئەم ژیانە ئاوایە و , سزاو ئازاری قیامەتیش سەختترە , ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە ) . ئەو کەسانەی شوکرانە بژێری نیعمەتەکان ناکەن و حەق و مافی لێ دەرناکەن , ئەوا بەرسزای خێراو بەپەلەدەکەون , بەوەی کە نیعمەتەکەیان لەدەست دەچێت و لێی بێ بەش دەبن , و تووشی سزای دواخراوی ڕۆژی قیامەتیش دەبن , هەروەك چۆن سوپاسگوزاری بۆ نیعمەتەکان هۆکارێکە بۆ بەردەوامیان و زیاد بونیان و پاداشتی قیامەت و بەختەوەری , وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ ( آل عمران / ١٤٤ ) واتە : ( لەمەو دوا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە . ) .

هەروەك چۆن خوای گەورە خاوەنی ئەم باخەی تاقی کردەوە , هەر بەو شێوازەیش خەڵکی شاری مەککەی تاقی کردەوە , و هەموو خەڵکیش بەخەیرو بەشەڕ تاقی دەکاتەوە , وەك فەرموویەتی :﴿ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ ( الأنبياء / ٣٥ ) . واتە : ( بێگومان ئێمە ئێوە تاقیدەکەینەوە

بەشەڕو ناخۆشی و بەڵاو خەیرو خۆشی دارایی و توانایی , سەرئەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە ( تاپاداشتتان بدەینەوە ) .

– دێینە سەر ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکە لەڕوانگەی ئایەتەکانەوە :–

خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ (١٧) وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴾ ( القلم / ١٧– ١٨ ) .

( ابن كثير ) دەڵێت : ئەمە نمونەیەکە خوای گەورە بۆ کافرانی قورەیشی هێنایەوە , لەوەدا کە هیدایەتیان بدات بۆ ڕەحمەت و بەزەیی بێپایانی خۆی , و نازو نیعمەتێکی زۆری پێ بەخشی بوون , کە بریتی بوو لەناردنی محمد ( ﷺ ) بۆیان , بەڵام ئەوان باوەڕیان پێ نەکردوو بەرەنگاریان کردوو دژایەتیان کرد , بۆ ئەمەش خوای گەورە فەرمووی :﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ﴾ واتە : ئێمە تاقییمان کردنەوە ﴿ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ ﴾ هەروەك چۆن خاوەنی باخەکەمان تاقی کردەوە , کە بریتی بوو لەباخ و بێستانێك , زۆر جۆری لەبەروبوم و میوە تیا بوو , ﴿إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴾ واتە : لەنێوان خۆیاندا سوێندیان خوارد کەبەرو بوومەکەی لێبکەنەوەو کۆی بکەنەوە لە شەودا , تا فەقیرو هەژارەکان پێیان نەزانن و داوایان لێ نەکەن , تا بۆخۆیان بەکاری بهێنن و خەیری لێ نەکەن و لێی نەبەخشن . ﴿ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴾ ( القلم / ١٨ ) .واتە : بێ ئەوەی بڵێن بەپشتیوانی خوا , ( یان بەو مەبەستەی هیچی پێوە نەهێڵن بۆ هەژاران ) . لەوەدا کەسوێندیان لەسەر خواردبوو , کە سوێندی درۆیان بەناوی خوا خوارد .[١]

لەوە دەچێت خەڵکی شاری مەککە هەواڵی خاوەنی ئەو باخەیان زانیبێت , کە دەڵێن : باخەکەیان لە نزیکی

( صنعاء) بووە , هەروەها ووتراوە ئەوان لە ( ثقیف ) بوون , و خاوەنی باخەکەیش لە ( یمن ) ئینجا لەوێ وەهەواڵەکە گەیشت بە قورەیش لەڕێگەی

١ / ( تفسير القرآن العظيم ) ( ٤ / ٤٠٦ ) .

دراوسێی ( ثقیف ) ی یەکانیانەوە . بێگومان ئەوان لەکاتی کۆکردنەوەی بەروبوومەکەیاندا نەیان ووت ( إن شآء الله ) , چونکە ئەوان ویستیان ئەو نەخشەیە جیٚ بە جیٚ بکەن کە دایان ڕشتبوو .﴿ فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ (١٩) فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ ﴾(القلم/ ١٩-٢) .

ئەوان وا نەخشەیان کێشا کە فەقیرو هەژارەکان لەحەقی خۆیان مەحروم و بیٚ بەش بکەن , کە خوای گەورە چاودێرە بەسەر کردەوەکانیانەوە , و ئاگای لە دڵەکانیانە کە چی تێدایە , بەڵام بەهۆی ئەم بەخیلی و ڕەزیلی یەیانەوە خوای گەورە لەتاریکیدا بەلاو ئافاتێکی بۆ ناردن , کەئەوان لەخەودابوون , وچاوەڕێیان دەکرد ڕۆژبێتەوە و ئەو نەخشەیە جیٚ بەجیٚ بکەن کە فەقیرو هەژاران هەڵبێن و مافەکانیان نەدەنیٚ , هەر خەونیان بەکۆکردنەوەی بەرو بوومەکەوە دەبینی کەپێش ڕۆژ بوونە هەموویان لیٚ کردبێتەوە , و تەواو بوبێتن , وکاتێك هەژارەکان هاتن هیچ بەدارەکانەوە نەبێت و ئیتر نائومێد ئەبن و بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێنەوە و منداڵەکانیشیان هیچیان دەستناکەوێت بۆ خواردن . بەڵام خوای گەورە قسەکانیان دەبیستێت و چاوی لێیانە و ئاگای لە کارەکانیانە و دەزانێت چ نەخشەیەکیان کێشاوە , ئینجا پەروەردگاربەلایەکی دابەزاند بەسەر باخەکەدا , لەکاتێکدا کە ئەوان خەوتبوون , وەك ئەوەی سوپایەکی زۆرو بێشومار لە دوژمن هاتبێت و وێرانی کردبێت , وکردی بەزەویەکی مردو بیٚ دارو درەخت . ﴿ فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ ﴾ ئیتر وەك باخێکی لێهات کەهەمووی چنرابێتەوە و هیچی پێوەنەمابێت , یان وەکو شەوی تاریك و ڕەشهەڵگەڕاوی لیٚ کرد , دەڵێن:- سوتاو بوو بەخەڵوزو خۆڵەمێش و بەردبا بوو .[1]

﴿ فَتَنَادَوا مُصْبِحِينَ (٢١) أَنِ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ (٢٢) فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ (٢٣) أَن لاَّ يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴾ ( القلم /

---

١/ ( قصص القرآن الكريم وسيرة سيد المرسلين ) ل ( ٣١٨ ) .

٢١-٢٤ ) . ئینجا ڕۆژ بوویەوە و هەندێکیان ئەوانی تریان بەخەبەر هێنایەوە , بۆ ئەوەی بەنهێنی بچن بۆ ناو باخ و بەرو بومەکەیان . خوای گەورە دیمەنێکی جوانی کێشاوە لەباسکردنی حاڵیاندا , ئەوان خەبەریان دەبێتەوە و یەکتری بانگ دەکەن , بۆ ئەوەی بچن بۆ ناو باخەکەیان بۆ باخ ڕنین و کۆکردنەوەی بەرو بومەکەی , وەك ئەوەی بچن بۆ کارێکی ناپەسەند و نایانەوێت کەس پێیان بزانێت , ئینجا بەو پەڕی بەئاگا لەخۆبوون و شاراوەیی و خۆدزینەوە و دوور لەچاوی خەڵکی هەژارەکان دەرچوون و, بەرەو باخەکە هەنگاویان دەنا بەبێ ئەوەی دەنگ و ژاوە ژاویان هەبێت , تەنانەت قسەی نێوان خۆیشیان بەهێواشی و نزمی و سوکی بوو , ئاخۆ دەبێت ئەمە لەبەرچی بێت؟ ﴿ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴾

( القلم / ٢٤) . هەموو ئەم نهێنی و خۆشاردنەوەیە لەدەرچونیان بۆ ناوباخەکە , لەبەر ئەوە بوو کەنەهێڵن هەژارەکان بچنە ناو باخەکە , وئەو خەیرەی کە خوا بڕیاری دابوو ئەوان وەری نەگرن . ﴿ وَغَدَوْا عَلَى حَرْدٍ قَادِرِينَ ﴾ ( القلم / ٢٥ ) . بەڕاستی ئەوان نەخشەکەیان لەدژی هەژارەکان داڕشت , و دڵنیایش بوون لەوەی کەدەتوانن لەلایەن هەموویانەوە بەوردی جێ بەجێ ی بکەن , کارەکانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردو , هەرکەسە کاری خۆی بەرکەوت , پاشان دەرچوون بۆ ناو باخەکە , بەڵام کاتێك گەیشتن , ئەوەی کەچاوەکانیان بینی بڕوایان نەدەکرد و ئینکاریان کرد . بێگومان ئەوان سووربوون لەسەر بێبەشکردنی هەژارەکان , لەهەمان کاتدا دەیان توانی یارمەتیان بدەن و سودیان پێ بگەیەنن , بەڵام توشیماڵێك هاتن کەخۆیان بێ بەش و بەش فەوتاوبوون , بەڕاستی نیەتێکی ناپەسەندیان هەبوو , خوای گەورە سزای دان بەوەی کەباخەکەیان تیاچوو, وبێ بەشی کردن لەبەرهەمی خۆی ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ (٢٦) بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (٢٧) قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ (٢٨) قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾ ( القلم / ٢٦-٢٩ ) .

کاتێك باخەکەیان بینی سوتابوو , نەیانناسی یەوە , چونکە ڕۆژی پێشتر بەساغی و سەوزی جێ یان هێشتبوو, وکەڕەنگی جوان و سەرنج ڕاکێش بوو, ئینجا ووتیان :- بەڕاستی ئەمە خۆی نەبوو , بێگومان ئێمە ڕێگاکەمان لێ وون

بووه و سەرمان لێ تێك چووه, وەرن بابەدوای باخ و کێڵگەکەی خۆماندا بگەڕێین , بەڵام خۆئەوان لەوکاتەدا غەریب ونەشارەزا نەبوون لەو شوێنە , بەچاکی شوێنەکەیان دەناسی یەوە , بەڵام دەیان ویست ئەو ناڕەحەتیەی کەتوشی دەرونیان هاتبوو , لەسەر خۆیان سوکی کەن , وئەوەی بینیویانە بەڕاستی نەزانن , بەڕاستی ئەوەی کەبینیان ترسناك بوو, وئەوان بەنەمانی بەروبووم و باخ و بێستانەکەیان سزادران . دوای ئەوە دڵنیابوون کەڕێگەیان هەڵە نەکردوە , ووتیان نەخێر , بەڵکو ئێمە بەشبڕاو کراوین , ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەویستمان هەژاران بێ بەش بکەین لەبەشەکەی خۆیان تیایدا. ﴿ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴾

( القلم / ٢٨) . ئینجا ئەو کەسەیان کەلە هەموویان ژیرترو خاوەن بۆچونی ڕاست و تەواوی مەبەستداربوو , کەئامۆژگاری کردبوون لەسەر ڕێڕەوی باوکیان بڕۆن , ووتی:- بەڕاستی من پێم وتن لەخوا بترسن و خوا بەپاك ڕاگرن و تەسبیحاتی خوا بکەن و بەرەو خراپەو شەڕ هەنگاو مەنێن , وەك کە زۆر جار ئینسان نیەتی خراپە و ستەمکردن دێنێت , چاکە کاران پێی دەڵێن:- بڵێ ( لاإلـه إلاّ الله ) ئەمەی بۆ دوبارەدەکەنەوە تاخوای بیربخەنەوە و هەنگاو بۆ خراپەنەنێت . کەسەژیرەکە هەروەك ئەم کارەی کرد, وتراوە: کاتێك سوێندیان خوارد کەبەیانی بەروبوومی باخەکە دەچنن , ئەو داوای لێ کردن کە بڵێن : ( إنشاء الله ) , ئەگەر ئەوەیان بکردایە , باخەکەیان وای بەسەر نەدەهات . بەڵام ئەو نیەتە دروست نی یە کەلەسەر شەڕو خراپەبێت , واتە ڕاست نی یە بڵێیت:-

( إنشاء الله ) سبەینێ فلان دزی دەکەم. ﴿ قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾ ( القلم /٢٩ ) . ئینجا هەموو وتیان :-پاکی وبێگەردی بۆ پەروەردگارمانە , بەڕاستی ئێمە ناحەقیمان کرد . بێئاگایی لەسەریان لاچوو , بیرو هۆشیان بۆگەڕایەوە , وەك وتراوە : دەبێت( صدمة ) کارەساتێکی قورس و ناڕەحەت بەئاگای هێنابنەوە , کەئەویش سوتانی باخەکەبوو , لەبەرئەوە - ئەوان کوڕی پیاوی چاك بوون- گەڕانەوە سەر ڕێڕەوی ڕاست و تەسبیحاتی خوایان کردو خوایان بەپاك و بێگەرد ڕاگرت, وداوایلێخۆشبوونیان لەخواکرد و نەفسی خۆیانیان بەتاوان بارو کەمتەر خەم دانا و , ئەو ستەمەی لەهەژارانیان کردبوو

، بۆیان دەرکەوت کە ڕێگربووە لەوەی ئەوان بەرهەمەکەیان بفەوتێت . هەمیشە فەشەل هێنان لە کاردا کەسە هاوبەش و شەریکەکان دەخاتە جیاوازی و لۆمەکردنی یەکتریەوە :- ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ ﴾ ( القلم / ٣٠ ) . ئینجا هەرکەسە دەستی کردبەلۆمەکردنی ئەوی تر ، بۆ دەرخستنی ئەوەی کە هەرکەسە و ڕاوبۆچونی باشی خۆی پێشنیار بکات بەرامبەر ئەوکەسەی کە فەشەلی بەکارەکە هێناوە و هۆکاربووە و دەستی بالای هەبووە لەنانەوەی ئەو کارەساتەدا :-

﴿ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ ﴾ ووتیان : هاوار بۆ ئێمە ، بەڕاستی ئێمە پیاو خراپ و لەسنور دەرچوو، بووین ( کەی ئەو ڕەزیلیە ڕاستە ؟! ). ئینجا هیوایان وابوو کە تەوبە بکەن و ڕجایان لای خوای گەورە وەرگیراو بێت:-
﴿ عَسَى رَبُّنَا أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا رَاغِبُونَ ﴾ ( القلم / ٣٢) .

ووتیان : ئومێدەوارین کەپەروەردگارمان لەم باخە باشترمان پێببەخشێت ( ئێمە تەمێ بووین ، دەرس و ئامۆژگاریمان وەرگرت ) ئیتر ئێمە بەڕاستی بە هیوای ڕەزامەندی خوا هەوڵ دەدەین و بە هیوای بەخشیشی ئەوین. تکایان لای خوا وابوو کەقەرە بویان بۆ بکاتەوە لەم خەسارەتە، بێگومان ئیتر ئەوان لەڕێگەی باوك و باپیرانیانەوە دەڕۆن ، لەوەی کەمافی فەقیرو هەژارەکان بپارێزن ، ئێستا ئەوان تکایان وایە خوالێیان خۆش بێت و خۆیان دەدەنە دەست ویستی خوای گەورە ، بێگومان دوای ئەم ڕاگەیاندن و داوای تەوبەکردنە ، خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە بۆ خەڵکی ، خوا خاوەنی بەخشندەیی فراوان و بێ سنورە ، بێگومان لەقەرەبووی ئەوەدا خەیرو چاکەی باشتریان دەداتێ ، پاش ڕونکردنەوەی ئەم چیرۆکە بۆ قورەیش تابیربکەنەوە و پەند و وانەی لێوەربگرن :- ﴿ كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ ( القلم / ٣٣ ) . ئەمە نمونەیەك بوو لە سزا لە دنیادا ، هەرکەس خراپە و ستەمی بوێت لەسەر ئەم زەوی یەدا ، ئەوا بێگومان لەقیامەتدا سزای لەمە سەختتر چاوەڕوانی دەکات ، بابەئاگاو بێداربێت لە پاشەڕۆژی و لەسەر ڕێگای گومڕایی یەوە نەڕوات .

﴿ لە پەند و وانە گرنگ و بەسودەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- زانای تەفسیر ( الرازي ) دەڵێت :- باسکردنی ئەم چیرۆکە دوو مەبەستی تیایە :-

یەکەم : خوای گەورە فەرمووی :﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ (١٤) إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ ﴾

( القلم / ١٤-١٥ ). واتە: خوای گەورە ماڵ و کوڕ و نەوە نابەخشێت بەکەس لەبەر ئەوەی بێباوەڕ بێت بەخوا , بەڵکو لەبەر تاقیکردنەوەیە , ئەگەر لەبیٰ باوەڕیدا بەکاریهێنا , ئەوا خوای گەورە وێرانی دەکات و دەیشکێنێتەوە بەسەر خۆیدا , بەبەڵگەی ئەوەی کە خاوەنانی باخەکە کاتێك ئەو ئەندازە کەمەیان لە سەرپێچی ئەنجامدا , خوای گەورە باخەکەیانی لەناو بردو وێرانی کرد . دەبێت ماڵی کەسێك چۆن بێت کە دوژمنایەتی پێغەمبەر ( ﷺ) بکات و لەسەر کوفرو سەرپێچی کردن سووربێت .

دووەم : خاوەنانی باخەکە دەرچوون تاسوود لە باخەکەیان وەربگرن , وەهەژارانی لێ بێ بەشبکەن , بەڵام خوای گەورە کارەکەی بەسەر خۆیاندا شکاندەوە , خەڵکی مەککەیش هەربەو جۆرە بوون , کاتێك دەرچوون بۆ جەنگی بەدر سوێندیان خوارد کەلەگەڵ محمد (ﷺ) و هاوەڵانی بجەنگن و بیان کوژن کاتێك گەڕانەوە بۆ مەککە بچن (تەواف ) ی دەوری کەعبە بکەن , وەعەرەق و سەرخۆشکەر بخۆنەوە , خوای گەورە گومانەکەیانی پێچەوانە کردەوە , زۆریان لێ کوژراو زۆریان بەدیل گیرا ,هەروەك هاوەڵانی خاوەنی ئەم دوو باخەیان بەسەر هات .

٢- ( القرطبي ) دەڵێت :- هەندێك لەزانایان وتویانە : ئەو کەسەی کەبەروبوومی باخ و کوشتوکاڵەکەی کۆکردەوە و بەرەکەی بەرهەم هێنا , پێویستە لەسەری بەیەکسانی بە شی ئەو کەسانەی لێبدات کەلەو شوێنەدا ئامادە دەبن ئەمەش مانای ئەم ئایەتەیە .﴿ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ ﴾( الانعام /١٤١ ) . ئەمە زەکات نیە , بەڵکو خەیر و بەخششە .

٣- هەروەها دەڵێت : لەم ئایەتەدا بەڵگەیەك هەیە , کەهەرکەس بڕیاری دا کارێك بکات ئەوا لەسەری حساب دەکرێت و دادەنرێت , ئەوان ویستیان و بڕیاریان دا ئەو کارە ئەنجامبدەن , بەڵام پێش ئەوەی ئەنجامی بدەن سزادران , هاوشێوەی ئەو ئایەتەش بریتیە لە :﴿ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾

( الحج / ٢٥ ). واتە: ( ئەوەی بیەوێت بەهۆی یاخی بوون و لادانەوە ستەم بکات , ئەوە سزایەکی بەئازاری پێدەچێژین ) .

٤- زانا ( القاسمي ) دەڵێت :- ( إبن الضريس ) لە ( الإكليل ) دا ووتویەتی :- ( عبد الوهاب ) بەم چیرۆکە بەڵگەی هێناوەتەوە , هەرکەس لەزەکات ڕابکات و هەڵ بێت پێش ئەوەی بگاتە ( حول ) کاتی بەخشینی , یان تێکەڵی بکات , ئەوا بەم کارە لەسەری لاناچێت , هەروەك ئەمەش : ئەو کەسانە ویستیان بەرو بوومی باخەکە لێبکەنەوە تابەشی هەژارانی لێ نەدەن و لەسەریان لاچێت خوای گەورە بەلەناو بردنی بەروبوومەکە سزای دان , هەروەها تیایدا هاتووە : کۆکردنەوە و چنینەوەی بەرو بووم لەشەودا ( كراهة ) ی هەیە , هەروەك لە فەرموودەدا نەهی لێکراوە [١].

## ﴿ چیرۆکی ( أصحاب الأخدود ) ﴾

## خاوەن چاڵ و لەغەمەکان

( صهیب ) ( خوا لێی ڕازی بێت ) دەڵێت :- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( کەئەمە مانای کوردی فەرموودەکەیە ) - لەوانەی پێش ئێوەوە پاشایەك هەبوو , کە جادوو گەرێکی هەبوو , کاتێك جادووگەرەکە پیر بوو , بەپاشای ووت :- من چوومەتە ساڵەوە منداڵێکم بۆ بنێرە , با فێری جادووی بکەم , ئەویش منداڵێکی بۆ نارد تافێری جادووی بکات , لەڕێگەکەیدا کە هاتوو چۆی پیادەکرد , خواناسێکی گۆشە گیر هەبوو , ئەویش لای دانیشت و گوێی لەقسەکانی ڕاگرت پێی خۆش بوو , جا کاتێك دەچوو بۆ لای جادووگەرەکە بەلای خواناسەکەدا ڕائەبوورد و لای دائەنیشت و , ( دوا دەکەوت ) کاتێك دەچوو بۆ لای جادووگەرەکە لێی دەدا ,

( چونکە دوا دەکەوت ) سکاڵای ئەوەی لای خواناسەکە کرد , ئەویش ووتی : ئەگەر کاتێك لەجادووگەرەکە ترسایت بڵێ :- لەماڵەوە دوایان خستم ,

---

١/ ( محاسن التأويل ) ( ١٦ / ٢٦١ ).

کاتێکیش لەماڵەوە ترسایت بڵێ : جادووگەرەکە دوای خستم , لەکاتێکدا ئەو لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بوو , ڕۆژێکیان هات بەسەر دەعبایەکی گەورەدا کە ڕێی لەخەڵکی گرتبوو , ووتی :- ئەبێت ئەمڕۆ بزانم , داخۆ جادووگەرەکە باشترە یان خواناسەکە ؟ بەردێکی هەڵگرت و ووتی : خوایە ئەگەر ئیشی خواناسەکەت لاخۆشەویستترە لە ئیشی جادووگەرەکە , ئەم دەعبایە بکوژە , تا خەڵکی دەرباز بین , بەردەکەی تێ گرت و دەعباکەی کوشت و خەڵکەکە دەرباز بوون , ئینجا هات بۆلای خواناسەکە و ئەمەی بۆ باس کرد , کابرای خواناس پێی ووت :- ئەی کوڕی خۆم , ئەمڕۆ تۆ لە من باشتریت , کارت گەیشتۆتە ئەوە ڕادەیەی کە من دەیبینم , دڵنیابە کە تۆ تووشی گیرو گرفت دەبیت , جا ئەگەر گرفتار بوویت خەبەر لە من نەدەیت , ئەمە و منداڵەکە وای لێهاتبوو کوێری زگماك و بەڵەکی چاك دەکردەوە , و لە دەردو نەخۆشیەکانی دیکەیش چارەی دەکرد , هاودەمێکی پاشا کە کوێر بوو ئەمەی بیست , بەخەڵات و بەراتێکی زۆرەوە هات بۆ لای , ووتی :- هەموو ئەم دیاریەم بۆ تۆ , ئەگەر چاکم بکەیتەوە , ئەویش ووتی : خۆ من کەس چاك ناکەمەوە , بەڵکو هەر تەنها خوای بەرزوو باڵا دەست خەڵکی چاك دەکاتەوە , ئەگەر تۆیش باوەڕ بە خوا بێنیت , داوات لەخوای گەورە و باڵا دەست بۆ دەکەم کە چاکت بکاتەوە , ئەویش باوەڕی بە خوا هێنا و , خوای گەورە و باڵادەست چاکی کردەوە , هاتەوە بۆ لای پاشاو لەلایەوە دانیشت هەروەك چۆن لەوەو پێش دا ئەنیشت , پادشا پێی ووت :- کێ چاوی پێدایتەوە ؟ ووتی : پەروەردگارم , ووتی بۆ پەروەردگارێکی ترت هەیە جگە لەمن ؟! ووتی : پەروەردگاری من و تۆیش هەر خوایە . ئەویش گرتی و دەستی کرد بە ئازارو ئەشکەنجە دانی , تا وەکو خەبەری لە منداڵەکە دا , ئینجا منداڵەکەیان هێنا , پادشا پێی ووت :- کوڕە بچکۆلەی خۆم لە جادووگەریدا گەیشتوویتە ئاستێك کە کوێرو بەڵەکی زگماك چاك دەکەیتەوە , و ئەوە دەکەیت و ئەوە دەکەیت ,ووتی :- من کەس چاك ناکەمەوە , تەنها هەر خوای گەورەو باڵادەست , خەڵکی چاك دەکاتەوە , ئەویشی گرت و دەستی کرد بە ئازارو ئەشکەنجە دانی , تاخەبەری لەکابرای خواناس دا , خواناسەکەیش هێنراو پێی ووترا :- لە دینەکەت پاشگەزبەرەوە , ئەویش ڕازی نەبوو , بانگی کرد هەڕەیەکیان ( مەبەست مشارە ) بۆ هێنا ,

هەڕەکەی لەسەر تەوقی سەری دانا , تا کردی بە دوو کەرتەوە , پاشان هاودەمەکەی پادشا هێنرا , پێی ووترا : لە دینەکەت پاشگەز بەرەوە , ئەویش ڕازی نەبوو , هاڕەی لەسەر سەری داناو ئەویشی کرد بە دوو پارچەوە , ئینجا منداڵەکەیان هێناو پێی ووترا : لەدینەکەت پاشگەز بەرەوە , ئەمیش ڕازی نەبوو , دایە دەست کۆمەڵێك لەپیاوەکانی و ووتی بیبەن بۆ شاخی ئەویٚ و ئەویٚ سەری خەن بۆ سەر شاخەکە , کە گەیشتە لوتکەکەی , ئەگەر لە دینەکەی پاشگەز بوویەوە باشە , ئەگەرنا فڕێیبدەنە خوارەوە , ئەوانیش بردیان و بەشاخەکەدا سەریان خست , ووتی : خوایە چۆن دەتەوێت ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە , شاخەکە کەوتە لەرزین , ئەوان کەوتنە خوارەوە , ئەمیش هاتەوە بۆ لای پادشا پێی ووت :- هاوەڵەکانت چییان کرد ؟ ووتی :- خوا لەکۆڵمی کردنەوە , ئەویش دایەوە دەست چەند کەسێکی دیکە لە پیاوەکانی و ووتی :- بیبەن لەبەلەمێکدا هەڵی گرن تادەگەنە ناوەڕاستی دەریاکە , ئەگەر لەدینەکەی پاشگەز بوویەوە باشە , ئەگەرنا , فڕێیبدەنە ناوی , ئەوانیش بردیان , ئەویش ووتی :- خوایە چۆن دەتەوێت ئەمانەم لەکۆڵ بکەرەوە , کەشتی یەکە پێیانەوە قلْپ بوویەوە و هەموو نقوم بوون و ئەویش هاتەوە بۆ لای پادشا , پادشا پێی ووت : هاوەڵەکانت چییان لێهات ؟ ووتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە , ئینجا بە پادشایی ووت : تۆ ناتوانیت من بکوژیت , تاچیت پێدەڵێم , ئەوە دەکەیت , ووتی :- ئەوە چییە ؟ ووتی : خەڵکی هەموو لەیەك گۆڕەپانێدا کۆبکەرەوە و بمبەستە بەدارخورمایەکەوە پاشان تیرێك لە تیرو کەوانەکەم دەربهێنە , و تیرەکە بخەرە ناو جەرگەی کەوانەکەوەو پاشان بڵیٚ :- بەناوی خوای پەروەردگاری منداڵەکەو دوای ئەوە تیرەکەم تێبگرە , ئەگەر تۆ ئەمەت کرد ئیتر دەمکوژیت , ئەویش خەڵکی هەموو لەیەك خاکدا کۆکردەوە و , بەبنکی دارخوارمایەکەوە شەتەکی دا و پاشان تیرێکی لەتیر دانەکەی هەڵگرت و خستی یە ناو جەرگەی کەوانەکەوە , و ووتی :- بەناوی خوا , پەروەردگاری منداڵەکە , تیرەکەی تێگرت , بەر لاجانگی کەوت , دەستی نایە سەر شوێنی تیرەکەو مرد , خەڵکی هەموو ووتیان :- باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری منداڵەکە , باوەڕمان هێنابەپەروەردگاری منداڵەکە , زەلامێك هات بۆلای پادشاو پێی ووت : ئایا دەزانیت ئەوەی لێی دەترسایت , سوێندبەخوا ئەمڕۆ ڕوویدا

لێت ، خەڵکی تازە باوەڕییان هێنا ، ئەویش فەرمانی کرد بەلە غەم لێدان ، لەسەر کوچە و کۆڵانەکان لەغەم لێدراو ئاگری تێدا کرایەوە ، و ووتی :- هەرکەس لەدینەکەی پاشگەزنەبوویەوە ، تیایدا بیسوتێنن ، یان پێی بووترێت خۆتی تێفرێدە ، ئەوانیش وایان کرد ، تاوەکو تەنانەت ژنێك هات منداڵێکی خۆی پێبوو ، سڵی کرد لەوەی خۆی تێفرێدات ، منداڵەکەی پێی ووت :- دایە ئارام بگرە ، چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر حەقیت .[1]

**پێش دستپێکی چیرۆکەکە :-**

ئەمە چیرۆکێکی زۆر جوان و ناوازەیە کە خوای گەورە لە جوزئی کۆتایی قورئانەکەیدا بۆی تۆمار کردووین ، پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتاو ناوەڕۆکی چیرۆکەکەی بە جوانی ڕونکردۆتەوە ، و بەهێزی و کاریگەری ئیمانی بە ڕوونی تیا دەردەکەوێت ، کە چۆن بەندەیەك شیرینی ئیمان دەچێژێت ، ئەمە سەرقاڵی دەکات کە جەستەی هەست بە ئازاری سزادان نەکات . دڵی ئەسیری دەستی ئیمانی دەبێت ولەگەڵ فیترەتی ساغ و سەلیمدا یەکانگیردەبێت . باوەڕداران بەرگەی بەهێزترین و ناڕەحەتترین شێوازەکانی ئازاردان دەگرن و ، ئەوە زۆر ئاسانە بۆ باوەڕدار کە ڕۆحی لە جەستەی دەربچێت ، بەلاّم ئیمان لە دڵی دەرنەچێت ، گومانی تیانی یە کە ئەم سورەتە- سورەتی البروج - سورەتێکی مەککی یە ، ئەم چیرۆکەیش دڵنەوایی و دڵ دانەوە بوو بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە لە شاری مەککەدا بە دەست جۆرەها سزاو ئازارەوە دەیانناڵاند ، و بەزەیی و لوتفی خوایش بۆ باوەڕداران تیا دەردەکەوێت ، و جێگیر و دامەزراویان دەکات ، هەرکەس مەبەستی وەرگرتنی هیدایەتی خوایی بێت و

---

1 / ( پوختەی صە حیحی موسلم ) ل ( ١٠٥٤ - ١٠٥٦ ) چاپی دووەم .

ڕێگاکەی گرتبێتە بەر ، ئەوا خوای گەورە بە هۆکاری دامەزراوی کۆمەکی کرد و وەپشتی گرتووە ، و ڕێنمایی زیاد کردوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴾ ( مريم / ٧٦ ).

هەروەها فەرموویەتی :- ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴾ (محمد /١٧).

هەروەها هەرکەس گومڕایی بوێت و دوژمنایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەرە بەڕێزەکانیدا بکات ، ئەوا بێگومان خوای گەورە لە هیدایەت و ڕەحمەت و یارمەتی خۆی بێ بەش ی دەکات ، و دەیداتە دەست نەفسی خۆی شەیتانەکەی ، و ئەویش گومڕاو سەر لێشێواوی دەکات ، تەنها بە کافر بون لێی ڕازی دەبێت ئەوەی بتوانێت ئەو ڕێگایەی پێ دەگرێتەبەر ، ئەهلی ئیمان بە هۆی ئیمانەکەیانەوە خەڵاتی ئیمانەکەیان وەردەگرن . و ئەهلی گومڕایی و لادەران و یاخی بوانیش بە هۆی یاخی بوون و سەرشۆڕییانەوە سزای یاخی بونەکەی خۆیان وەردەگرن ،سەرنج بدە کە چی بەسەر ئەو پاشا بێ باوەڕا هات ، تا گەیشتە ئەوەی چاڵ و لەغەمی بۆ باوەڕداران لێدا ، ئینجا پڕی کرد لە ئاگر و ، ئەو کەسانەی تێفڕێدا ، کە ڕازیبوون ( الله) پەروەردگاریان بێت و ئیسلام دینیان بێت ، بەڵام باوەڕدار متمانەی بە بەڵێنی خوایە و باوەڕی وایە کە دنیا نمایشێکە و دەڕوات ، و قیامەت ماڵی ژیانی هەمیشەیی یە و دەمێنێەوە ، دەیزانێت کە دنیا ساتێکە و تێدەپەڕێت و دەگاتەوە بە خوا ، کەسی شەهید هێندەی پێوەدانی مێشولەیەك ئازار دەچێژێت ، پاشان دەچن بۆ بەهەشتی خوایی ، و ئەو ئاگرەی تێی فڕێدراون بۆیان دەبێتە فێنکی و سەلامەتی ، بەڵکو چاڵە ئاگرینەکان دەبنە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت بۆیان .

بەڵام کافرانی خراپەکار ئاگرەکەیان بۆ فێنك و ساردو ئارام نابێت ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ ( النساء / ٥٦ ) .

بە هەمیشەیی لە سزای بە ئازاردا دەمێنێننەوە ، چونکە نەفسەکانی ئەوان تەنها بۆ ئەوە چاکە و دەشێت .

هەروەها لە چیرۆکەکەدا سونەتێك لە سوننەتەکانی خوا بەدیدەکرێت ، کە

تاقی کردنەوەیە ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴾ ( العنكبوت / ٢ -٣ ) .

واتە :- ( ئایا خەڵکی وایان زانیوە وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە ، لە کاتێکدا ئەوان تاقینەکرێنەوە و تووشی سزاو ئازار نەکرێت ؟! سوێند بە خوا بێگومان ئێمە ، ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقی کردۆتەوە بە جۆرەها شێوە ، تا خوای گەورە ( لە جیهانی واقیعدا ) ئەوانەی ڕاستیان کردوە بیانناسێت و دەرکەون ، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون ) .

هەروەها ئادابی بانگخوازیشی تیایە کە خۆی لە زۆر تێکەڵ بوونی دنیا بپارێزێت ، و بە خوای گەورە و پاداشتی خوایی ڕازی بێت و هەروەها سووربوونی بانگخواز لەسەر ئیمانی قەومەکەی ، ئەگەر بە هۆی ئەو باوەڕهێنانی قەومەوە زانیبێتی نەفس و ڕۆحی تیا دەچێت .

هەروەها چیرۆکەکە ڕێزو پلەی دۆست و خۆشەویستانی خوای جێگیر و دامەزراو کردوە ، کە چۆن بۆتە هۆکارێك بۆ دامەزراوی باوەڕداران و زیادبوونی باوەڕیان .

خوای گەورە دەفەرموێت :-﴿ قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ ﴾ ( البروج / ٤ ).

واتە : نەفرینیان لێ بێت ، بەکوشتچن ، ئەوانەی کە چاڵ و لەغەمیان هەڵکەند بۆ ( ئیمانداران ) .

لەسورەتی ( البروج) دا خوای گەورە سوێند دەخوات و دەفەرمووێت : ﴿ وَالسَّمَاء ذَاتِ الْبُرُوجِ (١) وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ (٢) وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴾ ( البروج / ١ -٣ ) .

واتە :- سوێند بە ئاسمانی خاوەن ئەستێرە و هەسارەی گەورە ، کە بریتی یە لە سوێند خواردن بە ئاسمانی دونیا کە دوانزە ( بورج )ی هەیە ، کە بە قەدەر ژمارەی مانگەکانی ساڵە ، کە لە کۆمەڵە ئەستێرە پێك هاتوون و ، هەر کۆمەڵە وشێوەی تایبەتی خۆی هەیە ، کە مانگەکانی ساڵ خۆری پێ دەژمێردرێت ، ﴿ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ﴾ خوای گەورە سوێندی خوارد بە ڕۆژی قیامەت کە هاتنی ئەو ڕۆژە گومانی تیانی یە ، ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴾ سوێند بە

شایەت و شایەتی لەسەر دراو، یاخود بە شایەت و بینراوەکان ، کە ئەوەش بریتی یە لە دوو ڕۆژ ، کە ڕۆژی ( جمعـة ) و ڕۆژی ( عرفـات )ە ، چونکە ﴿أَصْحَابُ الأُخْدُودِ ﴾ بەبێ ئەوەی تاوانیان ئەنجام دابێت کوژران ، تەنها وتیان خوا پەروەردگارمانە ، ﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ ﴾ ( ماناکرا ). ﴿ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ﴾(البروج / ٥ )

خوای گەورە لێرەدا باسی ئاگری داگیرساوی بە تینی کرد کە لەناو چاڵولە غەمەکاندا هەڵیانگیرساندبوو ، کە لە دارو تەختە و بابەتی سوتەمەنی بوو ، بەردەوام بڵێسەی دەسەند و ، باوەڕداریان تێ فڕێدەدا ، بۆ ئەوەی بە سوتاندن بمرن و تیا چن ، ئەمە ئەو پەڕی ستەمە کە ئەم کابرا یاخی بووە مومارەسەی کرد ، تا ئەوە بە خەڵك ڕابگەیەنێت کە ئەو خوایانەو نەیارەکانی دەسوتێنێت .

﴿ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴾ ( البروج / ٦ ) واتە :- ( ئەو کاتەی کە بە دەوری ئاگرەکەدا دانیشتبوون ، ( إبن الجوزی) دەڵێت : پاشا و کاربەدەستەکانی لەسەر کورسی لە لێواری چاڵی ئاگرەکەدا دانیشتبوون و هەوڵیان دەدا باوەڕداران کافرو بێ بڕوابکەنەوە هەرکەس ڕەتی بکردایەتەوە فڕێیان دەدایەوە ناوی ، لە هەمان کاتدا ئەوان خۆشییان دەردەبڕی بەم کارە ، ئایا کەسێك باوەڕداران فڕێبداتە ناو ئاگرەوە دەبێت چۆن دڵی خۆش بێت و دەروونی ئاسوودە بێت ؟ ئایا دەبێت ئەوان بەشەربووبن ؟ ئایا هیچ شتێك لە سۆز و عەتف و هەستی ئینسانی لای ئەوان هەبووە ؟ نەخێر ، بەڵکو هەموو ئەوانەیان لە دەست دابوو ، وەکو بێگیانیان لێ هاتبوو ، هیچ هەستێکیان نەبوو .﴿ وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴾ (البروج / ٧ )

واتە: لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەساتەیان دەکرد ، کە بەسەر باوەڕداران دەهێنرێت و خۆیان لە نزیکەوە سەرپەرشتییان دەکرد . هەرگیز ئەوان ناتوانن ئینکاری ئەو کارە بکەن کە ئەنجامیان داوە ، ڕۆژی قیامەت هەمووی نیشانیان دەدرێتەوە .

﴿ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾ ( البروج / ٨ ) ئەم ڕق و داخەیان لە ئیمانداران کە ئەوان باوەڕی بە تینیان دەهێنا بە خوای بالآدەستی شایستەی سوپاسگوزاری ئەوان بەرگەی ئەوەیان نەدەگردت کە ئەهلی خەیرو چاکە لەناو کۆمەڵگاکەیاندا ببینن ، ئەوان تەنها سزایان دەدان و دەیانکوشتن .

﴿ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ ( البروج / ٩ ) .

واتە : ( ئەو زاتەی کە خاوەنی هەموو شتێکە لە ئاسمان و زەویدا ، ئەو خوایەی شایەتە لەسەر هەموو شتێك و ئاگای لە هەموو شتێکە .

لەم کارەی ئەوان بەسەر باوەڕداراندا هێنایان ، هیچ شتێکی لیٚ شاراوە نی یە ، لێرەدا هەڕەشەیەکی توونـد هەبوو بۆ خاوەنی چاڵە هەڵکەندراوەکان ، لە هەمان کاتیشدا خەیری تیا بوو بۆ باوەڕداران کە سزادرا بوون لەسەر دینەکەیان ، پاشان خوای گەورە ڕونیدەکاتەوە کەچ پاداشتێکی بۆ ئەو باوەڕدارانە ئامادەکردووە :- ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ ﴾ ( البروج / ١٠ ) .

واتە : ( بەڕاستی ئەوانەی بەلاٌو ناخۆشیو تەنگانەو پیلان دژی پیاوانی ئیمانـدارو ئافرەتانی ئیمانـدار خستە کارو پاشان هەر بەردەوام دەبن و کۆڵنادەن و پەشیمان نابنەوە ، سزای دۆزەخ و سزای سوتێنەر بۆ ئەوانەیە .

بەڕاستی ئەوان باوەڕدارانیان بە ئاگری ناو چاڵ ولە غەمەکان سوتاند ، زۆر گونجاوە کە خوای گەورە بە سزای ئاگر سزایان بدات و بیانسوتێنێت ، واتە سزاکە لە جۆری کارەکەیە . خوای گەورە ستەم لە بەندەکانی ناکات .

ئەو کەسانەی بەلاٌکەیان هێنا بەسەر باوەڕداراندا ، باوەڕیان نەهێناو تەوبەیان نەکرد ، سزاکەیان ئاگری دۆزەخ دەبێت کە چەند قاتی ئاگری دنیا بەهێزو بەتین و ئازاراوییە ، ئەم سزایە تایبەت نەبو تەنها بەوان ، بەڵکو هەموو ستەمکاران و یاخیبوان دەگرێتەوە و گشتی یە .

ئینجا خوای گەورە باسی پاداشتی باوەڕدارانمان بۆ دەکات ، دەفەرموویێت :-﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ ﴾ ( البروج / ١١ ) .

واتە : بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە ، باخەکانی بەهەشت کە چەندەها ڕووبار بە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات ، بۆیان ئامادەیە ، هەر ئەوە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتن و سەرفرازی یەکی زۆر گەورە و بێسنو رو بیٚ وێنەیە .

بەڕاستی باوەڕداران ئەو پاداشتە چاکەیان دەست دەکەوێت ، بەڕاستی ئەو کەسەی بەهەشتی دەست بکەوێت گرەوی بردۆتەوە ، وەك خوای گەورە

فەرموویەتی :- ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ ( آل عمران / ١٨٥ ) .

واتە : ( هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت ، تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتتان بە تەواوی پێدەدرێت ، ( دەر ئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە ڕێتان ) ئینجا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە ، ئەوە بە ڕاستی سەرفراز بوو ، ژیانی دونیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە ، شتێکی تر نی یە ) .

دنیا کۆتایی نی یە ، بەڵکو قیامەت کۆتایی یە ، کارەگرنگەکە و پاداشت لەوێ یە ، ئەوە ڕاستە لە چیرۆکەکەدا باوەڕداران بەم دنیایەدا تێ پەڕین و وایان لێکدایەوە کە خەڵکی ستەمکار خەسارەتمەند و لەناوچووە ، بەڕاستی ستەمکاران لە ڕۆژی قیامەتدا دەگەن بە سەرئەنجامی خۆیان و سزای ئەو ئازارە وەردەگرن . باوەڕدارانیش لەناو نازو نیعمەتی نەبڕاوە دا دەژین و ڕووباری ئاو بە ژێر باخەکانیدا دەڕوات .

﴿ پەند و وانە گرنگەکانی چیرۆکەکە ﴾

١- ( عطیة محمد سالم ) بە کورتی دەربارەی پەند و حیکمەتەکانی ئەم چیرۆکە دەڵێت :-

یەکەم : سیحرو جادو بە کاری فێرکردن دەبێت .

دووەم : دەگونجێت خەیر و شەڕ بەیەکەوە کۆ ببنەوە ، ئەگەر هات و کەسەکە بە حاڵی شەڕ نەشارەزابوو.

سێ یەم : ڕوودانی هەندێك کاری لە عادەت دەرچوو لەسەر دەستی بانگخوازاندا .

چوارەم : زانا دان دەنێت بە فەزڵی کەسانی تردا ، کە فەزڵ و ڕێزو پلەو پایەیان لەو بەرزتربێت .

پێنجەم : تاقیکردنەوەی بانگخوازان لای خوایە ، و پێویستە ئارام لەسەر ئەوە بگرن ، و خەڵکیش پلەی جیاوازیان لەوەدا هەیە .

شەشەم :جێ بە جێ کردنی کارەکان پاڵ بدەنە پاڵ خوا( إنمّا یشفی اللهُ ) بێگومان خوای گەورە شیفای بۆ نارد

حەوتەم : پەنا بردن بۆ توندوتیژی و ئەشکەنجەدان لە کاتی بێدەسەڵاتیدا لەوەی کە قەناعەت بکات و تێ بگات ، ئەمە ڕەفتاری کەسە نەزان و نەفام و زۆر دارەکانە .

هەشـــتەم : قوربـانی دان بـە نـەفس لـە ڕێگـای خـوادا بـۆ بڵاوکردنـەوە ی بانگەوازی خوا .

٢- هاتنی ووشەی ( قبلکم ) لە فەرمووودەکەدا کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :- ( کانَ فیمن کانَ قبلکم ..) ڕابردووی بەستەوە بە کاتی حازر و سەردەمی خۆیەوە ، بە جۆرێك هەواڵی (أصحاب الآخدود ) ی بەستەوە بە حاڵی هاوەڵانی مەککەوە کە لاواز بوون ، هاوەڵانی مەککە درێژکراوەی ئەو بانگەوازە بوون کە ( أصحاب  الآحذود ) لە پێناویدا شەهید بوون .

٣- پاشاکە منداڵێکی نارد بۆ کابرا جادوگەرەکە کە فێری سیحر و جادوی بکات . بەڕاستی منداڵانی ئێستا لەبەردەم  فیتنەو نارەحەتیدان ، نریکە (فطرة) فیترەتیان تێك بدرێت و کۆتایی بەو حاڵەتە تەندروستە بهێنرێت ، نەزانەکانیش هەر بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ منداڵاندا دەکەن ، وەك پێغەمبەر نوح ( علیه السلام ) فەرموویەتی :

﴿ نُوحٌ رَّبِّ لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا (٢٦) إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلا يَلِدُوا إِلاَّ فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾

( نـوح / ٢٦ – ٢٧ ) واتـە :- ( نـوح ووتـی :- پـەروەردگارا هـیچ کەسـێك لـە بێبڕوایـان لەسـەر زەویـدا مەهێڵـە و تۆویـان ببڕە . چونکە بەڕاسـتی ئەگـەر تـۆ وازیان لێ بهێنیت ، هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت ، ( لەنەوەی تازە ) مەگەر خراپەکار و تاوانبار نەبێت ) .

٤- پاشـاکەو جادوگەرەکە زۆریـان هەوڵـدا ویسـتیان منداڵەکـە تێـك بـدەن و فێری سیحرو جادوی بکەن ، بەڵام خوای گەورە ویستی کارەکەی ئەوان فەشەل بهێنێت ، و ویستی منداڵەکە باوەڕدار دەربچێت و بانگخوازو شەهیدی ڕێگەی خوا بێت ، هەر بەو جۆرە بوو کە خوای گەورە ویستی بوو .

٥- منداڵەکـە لای خواناسـەکە دانیشـت و گـوێی لـە قسـەکانی گـرت و پێـی سەرسام بوو ، لەمەدا ئاماژەیەك بۆ کاری خەیرو مامەڵەی جوان و بانگەواز بۆ ڕێگەی خوا هەیە .

٦- جادوگەرەکە لە منداڵەکەی دەدا ، هەر کاتێك دوا بکەوتایە ، لەمەدا ئاماژە هەیە بۆ زۆرداری و تووند و تیژی نەفامەکان لەسەر منداڵآن ، و بەکاریان دەهێنا بۆ لێدان و ئازاری جەستەیی .

٧- خواناسەکە کاتێك سکاڵاو ناڕەزایی منداڵەکەی بیست ، چارەسەری بۆ دیاری کرد ، چونکە ئەو پەروەردشیاو سەرکردە بوو ، هەر بەو جۆرە سەرکردە چارەسەری گرفتی سەربازەکانی دەکات .

٨- بوونی ئاژەڵێك کە ڕێگای لە خەڵکی گرتبوو ، بوارێکی تیا بوو بۆ تاقی کردنەوە پاشان بۆ دڵنیا بوون ، مژدەی خەیری تیا بوو و پاشان گەشبینی ئەو ئاژەڵەکە ڕێگەی لە خەڵکەکە گرتبوو ، نوێنەرایەتی پاشای ستەمکاری دەکرد ، کە خەڵکی دەکردە بەندەی خۆی و لە دین و پەرستنی خوا دووری دەخستنەوە کوشتنی ئەو ئاژەڵە بە بەردێك ، ئەوە دەگەیەنێت منداڵەکە هۆکاری ڕزگارکردنی خەڵکی بوو لە دەستی ئەو پاشا یاخیبوە ، وە دەیانخاتە سەر ڕێگای خواناسی و بەرەو بەهەشتیان دەبات .

٩- بوونی منداڵەکە بە بەڕێزتر و لە پێشتر لە خواناسەکە ، کە قوتابی ئەو بوو ، و خواناسەکەیش لە پێش ئەوەوە بوو لە جیهانی باوەڕو ئیماندا و چەندین ساڵی لە ڕێگەی خوادا بەسەر بردبوو ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێزو پلەو پایە لە بانگەوازدا بە تەمەن نی یە کە موسڵمان بەسەری دەبات ، بەڵکو بە ئەندازەی ئیمان و لە خوا ترسان و دڵسۆزی و خۆیەکلایی کردنەوەیە بۆ خوا .

١٠- پاش ئەوەی منداڵەکە ناسێنراو ، دەنگ و باسی بە ناو خەڵکیدا بڵاوبویەوە ، ئینجا بە پەیامی بانگەوازەکەیەوە دەرچوو بۆ ناو خەڵکەکە ، ئەمە هەنگاوێك بوو بۆ ئاشکراکردنی بانگەوازەکەی کە پێشتر نهێنی بوو .

١١- منداڵەکە دەستەواژەی ( بإسم الله ربِّ الغلام )ی بۆ کوشتنی خۆی هەڵبژارد ، مەبەستی ئەوە بوو کە خوا بە خەڵکی و پاشا بناسێنێت ، بە ڕاستی خەڵکەکە خۆشیان ویست کاتێك ئەو خەیرو سودەی پێشکەشی پاشاکرد، ومنداڵەکە پێش ئەوەی دنیا جێ بهێڵێت لەگەڵ پەروەردگاریدا مایەوە .

هەروەها ویستی کە ئاستی لاوازی و بێدەسەڵاتی پاشا پیشانی خەڵکەکە بدات ، ئەو کەسێکی یاخی و لە سنوور دەرچوو و زۆردار بوو ، بانگەشەی خوایەتی دەکرد ، هەر کەس دانی نەنایە پیایدا دەیکوشت ، وەك ئەوەی ئەو کارەی لەگەڵ خواناسەکە و خەڵکەکەدا کرد ، بەوە کۆتایی هات کە ووتی : بەناوی پەروەردگاری منداڵکەوە ، بە هۆی ئەو ناو هێنانەوە توانی بیکوژێت .

## ﴿ چیرۆکی ( فیل ) ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :- ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ (١) أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ (٢) وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ (٣) تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ (٤) فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ (٥) ﴾

( الفيل /١-٥) . ئەم چیرۆکە – چیرۆکی فیل – بەسورەتێکی کورت لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە , بەچەند ئایەتێك کە چیرۆکەکە لەو پەڕی کورتی دایە و موعجیزەی زۆرگەورەی تیایە , سورەتەکە مەککی یەو لەچیرۆکی ( أصحاب الفيل ) خاوەن فیلەکان دەدوێت , کە مەبەستیان بوو کەعبەی پیرۆزی ماڵی خوا بڕوخێنن , بەلاّم خوای گەورە نەخشەو فێڵەکەی بەسەرخۆیاندا شکاندەوەو پشتی خۆیانی پێ شکاند و ماڵەکەی خۆی لەداگیرکاری و ستەمی ئەوان ڕزگارکردو , کە چەندسەربازێکی لەلاوازترینی دروستکراوەکانی خۆی – کەباڵندەبوون– ناردبۆ( ابرهة الأشرم ) , کە بەقاچ و دەنوکەکانیان بەردی بچوکی سورەوەکراویان هەڵگرتبوو , بەلاّم زۆر توونـدترو کاریگەرتربوون لەفیشەك و تەقەمەنی جەنگی , هەتا خوای گەورە هەموویانی لەناوبردوو کۆتایی پێ هێنان . بەڕاستی ئەمە ڕووداوییێکی مێژوویی گەورەو گرنگ بوو , لەساڵی لەدایك بوونی بەڕێزترین کەسدا بوو کە ( محمدی کوڕی عبدالله ) بوو , کە گەورەترین بەڵگەبوو لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) ئاماژە بۆئەم چیرۆکە کراوە :-

کاتێك خوای گەورە مەککەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ڕزگارکرد , پێغەمبەر لەناوخەڵکەکەدا هەستاو سوپاس و ستایشی خوای کردوو , فەرمووی :- ﴿ إن الله حَبَسَ عن مكة الفيل ، وسَلّطَ عليها رَسولَهُ و المؤمنِينَ ) [١] . واتە : – ( خوای گەورە فیلەکانی لە مەککە گرتەوە ، و پێغەمبەرو ئیماندارانی دەسەلاّتدار کرد بە سەریدا ) .

---

١/ ( رواه البخاري) ( ٥/ ١٠٤ – ١٠٥ ) ( اللقطة ) و ( مسلم ) ( ٩ / ١٢٨ ) ( الحج ).

﴿ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکە لە ڕوانگەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانەوە﴾

خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴾ ( الفيل / ١ ) .

( القرطبي ) دەڵێت :- ئایەتی :﴿ أَلَمْ تَرَ﴾ واتە : ئەی موحەمەد ئایا هەواڵت پێنەگەیشتووە ، ووتراوە : ئایا نەت زانیوە ، و ( إبن عباس ) ووتویەتی : ئایا نەت بیستوە ؟ ووشەکە بۆ پرسیارە بەڵام دانی پیا نراوە ، وە قسەکە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بووە ، بەڵام گشتیەو بۆ هەموو کەسیشە .

( إبن كثير ) دەڵێت :ئەمە لەو نیعمەتانە بوو کە خوای گەورە بەسەر قورەیشدا ڕشتی ، بەوەی کە هێرشی خاوەن فیلەکانی لەسەر لابردن ، کە دەیانویست کەعبە بڕوخێنن و شوێنەوارەکەی بسڕنەوە ، و خوای گەورە لەناوی بردن و لوتیانی شکاند ، و هەوڵەکانی پوچ کردنەوە ، و سەری لێ تێکدان ، و بە خراپترین کارەسات ڕەدی دانەوە ، ئەوان قەومی ( نصارى ) بوون ، و دینەکەیان زۆر لە قورەیشەوە نزیك بوو ، کە خەریکی بت پەرستی بوون ، ئەمە لە شێوازی لە ژێرەوە ڕێککەوتن بوو ، بۆ شوێنی ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)چونکە ئەو لەم ساڵەدا لە دایك بوو، بە پێی بەهێزترین بۆچون ، زمانحاڵی قودرەت دەڵێت : ئەی قورەیش ئایا ئێوە بەسەر حەبەشەدا سەرنەکەوتن ، بەوەی کە خەیرتان بەسەریاندا هەبوو ، بەڵکو بۆ پاراستنی ماڵە دێرین و ڕزگارکراوەکە بوو ، کە بەڕاستی لەمەودوا ئێمە زیاتر ڕێزداری دەکەین و بەناردنی پێغەمبەر شکۆدار و پایاداری دەکەین ، کە کۆتای پێغەمبەرانە .﴿ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴾ ( الفيل / ٢ ) .

ئایا سەری لێ نەشێواندن و پیلان و نەخشەکانیانی پووچ نەکردەوە .

زانا ( الرازي ) دەڵێت :- خوای گەورە باسی کرد کە چی بەسەریاندا هێنا و فەرمووی ﴿ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴾ , لەمەدا چەند مەسەلەیەك هەیە:-

مەسەلەی یەکەم :- بزانە کە ( كيد ) فێڵ و ویستێکی زیان بەخشە لە شێوەی شاراوەو نهێنیدا , ئەگەر ووترا : بۆچی ناوی ناوە فێڵ و کارەکە ئاشکرایە , و دانی بەوەدا ناوە کە ( البيت ) بڕوخێنێت ؟ دەڵێیین : بەڵێ وایە , بەڵام ئەو کەسەی کە لەدڵیدا شەڕ هەیە , لەوە گەورەترە کە دەری دەخات , چونکە حەسودی خۆی دەشارێتەوە بەرامبەریان , بەڵام دەیەوێت ئەو ڕێزەی کە عەرەب بەهۆی ( كعبە ) وە هەیانبوو بیگۆڕێت و نەیهێڵێت .

مەسەلەی دووەم :- ( معتزلي ) یەکان دەڵێن :- خوای گەورە . ( كيد ) ی خستەپاڵ ئەوان , بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا بەشتی پیس و ناپەسەند ڕازی

نی یە , ئەگەر پێی ڕازی بووایە دەیخستە پاڵ ناوی خۆی , وەك لەفەرمووده دا هاتووه : ( الصَّوْمَ لي ) [1]

واتـه : ( ڕۆژوو بـۆ منـه ) , وەلاّم : لەزانسـتی ( نحـو ) دا هـاتووه کەکـەمترین هۆکار بەسه بۆئەوەی ( إضـافة ) خستنه پـاڵ پێك بێـت . بـەلاّم بۆچی بۆ ئەم ( الأضـافة ) خستنه پاڵـه بـەس نـەبێت , کـه ڕوودانـی کارەکـه لەگـەڵ ویسـت و هەڵبژاردنی خۆیان دابووە ؟

مەسەلەی سێیەم : ﴿ فِي تَضْلِيلٍ ﴾ واته : لەدەست دان له شتی پوچ دابوه , دەوترێت :– ( ضَلَّلَ كَيْدَهُ ) ئەگەر کاتێك سەری لـێ تێك بچێت و وون ببێت , هاوشێوەکەی وەکو ئەم ئایەتەیە ﴿وَمَا دُعَاء الْكَافِرِينَ إِلاَّ فِي ضَلالٍ﴾ ( غافر / ٥٠ ) واتـه : بێگومـان داخوازی و پاڕانـەوەی کافران بـه هـیچ ناچێت , تازه هیچ نرخێکی نیـەو گیرا نابێت ) [2] ﴿ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴾ ( الفيل / ٣) .

ئایه پۆل پۆل باڵندەی نەناردە سەریان ؟ ! ئەو باڵندانه سەربازی خـوا بوون و پۆل پۆل و کۆمەڵ کۆمەڵ و دەسته دەسته بەشوێن یەکتریـدا دەینـاردە سـەریان و لەهـەموو لایەکـەوە گـەمارۆی دەدان و نـەیان دەتـوانی ڕزگـار بـبن . ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ ( الفيل / ٤ ) واته : تا بەبەردی سـەن گڵ ( واتـه تێکـەڵ لەبـەردو گـڵ ) —وەك خشـتی سـورەوەکراو – بـەرد بارانیـان بکـەن . یـانی گڵـی سورەوەکراو بووە تا هێندە ڕەق بووە تـاوەك بـەردی لـێ هـاتووه , وەك فیشـەکی نوك تیژوو گەرم وابووە کە بەر هەرچی بکەوتایە کونی دەکرد و لەناوی دەبرد .

﴿ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴾ ( الفيل / ٥ ) . سـەر ئەنجام وەك پوشـو پـەلاّش و کای خوراوی لـێ کردن , یان وەکو کشتو کاڵ و گەلاّی درەخت کاتێك ئاژەلاّن دەیخۆن و دەیجـوون , ودواتـر پاشـەڕۆکەی فڕێـدەدەن و بـلاّو دەبێتـەوە , بـاس کراوە کاتێك بەردوو گڵـەکان دەیـدا بەسـەری پیاوەکانـدا , گۆشتوو خوێنەکەی لـێ جیـا دەکـردەوەو تـەنها پەیکـەری ئێسـکەکان دەمایـەوە کـه هـیچ گۆشـت و پێست و خوێن و دەماری پێوە نەمابوو .

---

١/ رواه البخاري ( ٤ / ١٠٣ ) ( الصوم ) , ومسلم ( ٨ , ٣٢ ) ( الصيام ) .

٢ / ( التفسير الكبير ) ( ١٦ / ٣٢ / ٩٤ ) بەکورتی و دەستکاری کردنەوە .

## وانه و پەندە گرینگەکانی چیرۆکەکە

١- ( شیخ الأسلام ) دەڵێت : چیرۆکی ( اصحاب الفیل ) لە زۆر ڕێگەوە گێڕدراوەتەوە , وکەسانی حەبەشی , کە ( نصاری ) بوون بە سوپایەکی گەورەو بێ شووماروەوە ڕۆیشتن و فیلیان لەگەڵ دابوون , تا سووکایەتی بە ( کعبة ) بکەن , کاتێك هەندێك لەعەرەبەکان ویستیان سوکایەتی بەکەنیسەکەی ئەوان لەیەمەن بکەن , ئەوانیش خۆیان ڕێکخست و مەبەستیان بوو سوکایەتی بە ( کعبة ) بکەن , وەکەنیسەکانی خۆیان بەگەورەو پیرۆز رابگرن , خوای گەورە پۆل پۆل باڵندەی بۆ ناردن , هەموویانی لەناو برد , ئەو ساڵەی ئەمە ڕویدا , ساڵی لەدایکبوونی پێغەمبەر ( ﷺ ) بوو , دراوسێکانی ( بیت ) هاوەڵدانەر بوون بتیان دەپەرست , دینی ( نصاری ) لە دینی بت پەرستی ئەوان باشتر بوو , زانرا کە ڕوودانی ئەم نیشانە ڕوون و گەورەیە لەبەر خاتری دراوسێکانی ( کعبة ) نەبوو , بەڵکو لەبەر خاتری ڕێزوو پیرۆزی ( بیت ) خۆی بوو , یان لەبەر خاتری پێغەمبەر ( ﷺ ) بوو کەلەو ساڵەدا لەتەنیشتی ( بیت ) دا لەدایك بوو , یان لەبەر خاتری هەموویان بووە , هەرکامێکیان بووبێت , بەڵگە بووە لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ ) [1] .

٢- ( القاسمي ) دەڵێت : ( القاشاني ) ووتویەتی : چیرۆکی ( أصحاب الفیل ) بەناوبانگەو لەنزیکی سەردەمی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ڕوویداوە , یەکێکە لەنیشانەکانی دەسەڵات و قودرەتی خوا , هەروەها شوێنەوارێکیش بوو لە خەشم و تورەیی خوای گەورە لەسەر ئەو کەسانەی کە جورئەتیان کرد ڕێزی ماڵی خوا بشکێنن .

هەروەها ووتی : لەم سەردەمە نوێ یەشدا نمونەی ئەوە ڕویدا , کە ژمارەیەکی زۆر لە مشك دەستیان بەسەر شاری ( ابیورد ) دا گرت و گشت کشتوکاڵ و سەوزایی یەکیان فەوتاند و , وەك زەوی یەکی ڕوتیان لێکردەوە , هەموو بەروبوومەکەی فەوتا , کە لە گوێ ڕووبارەکاندا دارەفەوتاوەکانیان بەکاردەهێنا بۆ پەڕینەوە , وەك بەلەم سواری دەبوون [2] .

---

١ / ( الجواب الصحیح ) ( ٤ / ١٢٢ ) بەکورتی .

٢ / ( محاسن التأویل ) ( ١٧ / ٢٦٢ ) بەدەستکاری یەوە .

**سەرچاوەکان :**

١- تيسير المنان في قصص القرآن . //جمع وترتيب احمد فريد
٢- صحيح قصص الأنبياء : إبن كثير // بتحقيق : عبد السلام الهلالي
٣- الأعلام و المواقع في القرآن الكريم .//الدكتور : أيوب درباس موسى الكلي
٤- مَعَ قصص السابقين في القرآن . // الدكتور : صلاح عبدالفتاح الخالدي
٥- قِراءة جديدة و رؤية في قصص الأنبياء . عمرو خالد
٦- قصص القرآن ويلية قصص الأنبياء //
للإمام : أبي الفرح عبدالرحمن بن علي بن الجوزي .
الدكتور : عبدالسلام علوش ئامادەی کردوە .
٧- تەفسیری خاڵ جزمی یەکەم //شێخ محمدی خاڵ .
٨- صفوة التفاسير // محمد علي الصابوني .
٩- قصص القرآن // جمع وترتيب : محمود المصري .
١٠- قصص القرآن // عمرو خالد .
١١- قصص الأنبياء و مَعَهُ سيرة الرسول ( ﷺ ) // محمد متولي الشعراوي .
١٢- قصص القرآن الكريم وسيرة سيد المرسلين // د. محمد مُنير الجنباز .
١٣- تفسير الشعراوي // محمد متولي الشعراوي .
١٤- تفسير الكبير // الفخر الرازي .
١٥- تەفسیری ئاسان // بورهان محمد امين .
١٦- تەفسیری قورئانی پیرۆز// عثمان عبدالعزيز محمد .
١٧- تەفسیری //مامۆستا زمناکۆیی .
١٨- تەفسیری قورئانی پیرۆز // مامۆستا هەژار موکریانی .
١٩- الأمثل في تفسير كتاب اللهِ المنزل // العلاقة : ناصر مكارم الشيرازي .
٢٠- فەرهەنگی شیرین// فاضل نظام الدين .
٢١- پوختەی صەحیحی موسلیم // لیژنەیەکی پسپۆڕ .